# خڵتەی

# بیرێکی ژاراویی

حوسێن محەمەد عەزیز

2700ک/2000ز

بۆ هەموو ئەوانەی کورادنە بیردەکەنەوە
و
باوەڕیان بە بیری کوردستانیزم هەیە.

# ناوەڕۆک

# چەن ووشـــەیەک ...!

کاتی خۆی، چەن گوتارێکم نووسی و بڵاوکردەوە. لە سەرەتای گوتاری یەکەمدا نووسیبووم: (ماوەی پتر لە ساڵێ دەبێ، لە سەر هەر دوو قوتابخانەی هۆنراوەی کلاسیک و نوێی کوردیی، پرۆژەیەکی لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی وێژەییم بە دەسەوەیە. تا ئەو ڕۆژەی پرۆژەکە تەواودەبێ و چاپدەکرێ، هەوڵدەدەم، بە زنجیرە گوتارێ، هێندێکی لێ بڵاوکەمەوە.)«3،22» ئەوەبوو، سێ گوتاری درێژم بۆ « دەزگای سەردەم » نارد. گوتاری یەکەم « چەند سەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینیی و نەتەوەیی "خەلیل منەوەر" » لە گۆڤاری « ئێستا » و گوتاری دووەم « ڕێوەر لە نێوان کوردایەتیی و عێراقچیێتییدا » لە گۆڤاری « ئایندە »دا چاپ و بڵاوکرانەوە. گوتاری سێیەمیش « دڵزار دوێنێ و ئەوڕۆ » بوو. نازانم، چی بەسەرهات ! چونکە، تا ئێستە بڵاو نەکراوەتەوە، لەوە دەچێ، سەری تێداچووبێ!

هەروەها، لە پێشەکیی ئەو گوتارەدا هاتبوو: (بە داخەوە، زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوە وێژەییانەی، دەربارەی ژیان و بەرهەمی هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد بڵاو کراونەتەوە، زۆربەی زۆریان، پیاهەڵدان و ستایشکردن بووە. خاڵە لاواز و بەهێزەکانیان وەک یەک، بە تەرازوویەکی ڕەخنەگرانە نەکێشاوە. بۆیە، بە ئاشکرا دەبینین، چاوپۆشیی لە کەموکوڕییەکانیان کراوە، وەک ئەو هۆنەرانە، فریشتە بووبن و لە ئاسمانەوە بۆ کورد باریبن، لە ژیانی وێژەیی خۆیاندا، هیچ جۆرە هەڵەیەکیان نەکردبێ! ئێمە لێرەدا، تەنیا لەو کەموکورتییانە دەدوێین، کە پێوەندییان بە « ژیانی وێژەیی، ناوەڕۆکی بەرهەم، کێشەی زمان و هەڵوێستی نەتەوەیی »یانەوە هەیە. بە هیچ شێوەیە، پەنجە بۆ ڕەوشت و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان ڕا ناکێشین. چونکە، ئەو جۆرە شتانە، پێوەندیی بە ژیانی تایبەتیی خۆیانەوە هەیە، کەس بۆی نییە، لێیان بدوێ و ڕەخنەیان لێ بگرێ. لەبەرئەوەی، هەموو مرۆڤێ ئازادە، پێویستە چۆنی دەوێ، هەر بەو شێوەیەش بژی، گەر دەسەڵاتی هەبێ و بۆی بلوێ!)«3،22»

ئەز، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆم چاک دەناسم. زۆر باش، شارەزای خەسڵەتەکانیان هەم. هێشتا، کۆمەڵی کوردەواریی، بەو ئاستە شارستانیی و کەلتوورە بەرزە نەگەیشتووە. هێشا، بە تەواویی سەرەتاکانی باوەڕی ئازادیی و دێمۆکراسیی، لە نێو ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمدا بڵاو نەبۆتەوە. هێشتا، لە یەکدی گەیشتن و لە یەکدی بووردن، بە تەواویی بنجی دا نەکوتاوە. هێشتا، زمانی توندوتیژیی باوە و تا

ئێستەش، زەمانی ئاشتیی و هێمنیی، باڵی بە سەر هەموو دەمەتەقێ و دیاردەکانی ژیانی « ڕامیاریی، وێژەیی و کەلتووریی »دا نەکێشاوە. هێشتا، شێوازی کارکردنی پارتەکانی کوردستان باوە. هێشتا، هەر لە سەر مۆدێلی کۆنی سالانی پێشووی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە کلاسیکییەکان دەڕۆین. هێشتا، کاری چاک و لێکۆڵینەوەی زانستانە، لە کاری خراپ و نازانستانە جیا ناکەینەوە و هەر بە یەک چاو تەماشایاندەکەین.

لەبەرئەوە، کارێکی سەیر نییە، کاتێ هاوینی سالی « 1999 »، لە کوردستان بووم. گوتاری « زێوەر ... »م بلاوکردەوە. لە گوتارەکەدا، ڕەخنەم لە هێندێ لایەنی هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی گرتبوو. هێندەی نەبرد، « مەحموود زێوەر » تێلێفۆنی بۆ کردم و داوایلێ کردم، یەکدی ببینین. منیش بە خۆشییەوە، داواکەیم پەسەندکرد. لەگەڵ دوکتۆر « سەروەت محەمەد ئەمین » چووینە لای.

کاتێ، سەردانمانکرد، سەرەتا، تووڕە و زوێر دیاربوو، بە ڕوویەکی گرژومۆنەوە، تەماشایدەکردم، « ڕووس » گوتەنی: « دەتگوت، بۆرژوازییە و تەماشای ˚ لێنین ˚ دەکا! » پاشان، لە بری ئەوەی، گەر تێبینییەک یا ڕەخنەیەکی بەجێی، دەربارەی ناوەڕۆکی گوتارەکە هەبێ، نووکی پێنووسەکەی تیژکاتەوە و بە شێوەیەکی زانستانە وەڵامبداتەوە، گلەییکرد و لۆمەی مامۆستا « نەجمەدین مەلا »ی کرد. گوایە، ئەو، ئەو زانیارییانەی دەربارەی باوکی بلاوکردۆتەوە! ئیدی بێ ئەوەی، هیچ بەلگەیەکی پێ بێ، یا ڕەخنەیەکی بەجێی لە نووسینەکەی من هەبێ، دەربارەی کار و پیشەکەی خۆم، هێندێ پرسیاریکرد و پاشان گوتی: بۆ هەر بە تەنیا، باسی « زێوەر »ت کردووە، خۆ « گۆران »یش هۆنراوەی لەو چەشنانەی هەیە؟ بەلام، دوای ئەوەی، سەروبەری پرۆژەکەم بۆ ڕوونکردەوە، کە ئەو گوتارە تەنیا بۆ « زێوەر » تەرخانکراوە، لە لێکۆڵینەوەکەدا، باسی هەموو ئەو هۆنەرانە کراوە، کە هۆنراوەی لەو بابەتانەیان نووسیوە. ئیدی کەمێ هێوربۆوە و گوتی: گوتارەکەت زۆر ئەکادیمییانە نووسیوە!

دواتریش، « ئەحمەد سەیید عەلی بەرزنجیی »، گوتارێکی درێژی، لە ژێر ناوی « پێویستی ئەو شیعرانەی پێویستنین لە وەلامی عێراقچێتیەکەی زێوەردا »، لە گۆڤاری « کاروان »دا، بە چەن زنجیرەیەک بلاوکردەوە. تەنیا، بەشی یەکەمی گوتارەکەم بە دەسکەیشت، وەلامێکی کرچوکاڵی گوتارەکەی منی دابۆوە، بە هیچ شێوەیە، پێوەندیی بە باسەکەی منەوە نەبوو. هەڵبەتە، ڕۆژەکەی وایە، هێندێ نووسەر هەن، لە سەر حسێبی ناوەڕۆک، درێژە بە باسەکە دەدەن و لێی لادەدەن!

« بەرزنجیی »، بە نووسینەکەیدا دیارە، چ لە رووی شێوە و چ لە رووی ناوەڕۆکەوە چرای نابووتیی هەڵکردووە. چونکە، نە زمان، نە ڕێنووس و نە داڕشتنەکەی باش نییە، نیشانەکانی خاڵبەندیی پێڕەو نەکردووە. لەوە دەچێ، خایە و مایەی تێنابێ!
هەر چەندە ویستم، لەو نووسینە بێ سەروبەرە خۆم بە دووربگرم، بێ دەنگبم و وەڵام نەدەمەوە، بەڵام نەمتوانی. چونکە، کاتێ ڕۆژی « 2000/07/23 »، نامەیەک و چەن پەرتووکێکم، لە مامۆستا « رەفیق سالح »وە پێگەیی، سەیرمکرد، جارێکی دیکەش، وەڵامەکەی بە « سیپارە »یەک بڵاوکردۆتەوە. جگە لەوەی، لە لایەکەوە بیرم لەوە کردەوە، گەر بێ دەنگبم، دوور نییە، چ خوێنەری کورد و چ « بەرزنجیی » خۆشی، بێ دەنگیم بە مایەی قایلبوون تێبگەن. لە لایەکی دیکەشەوە، بە هەلم زانی، لە ڕێی « بەرزنجیی »یەوە بتوانم، دەربارەی گەلێ گرفت و کێشەی گرنگی کۆن و نوێ، باری سەرنجەکانی خۆم دەربڕم. تا دەرگەیە بۆ دەمەتەقێ، لە بەردەم خوێنەواران و ڕووناکبیرانی کورددا بکەمەوە. بۆیە، بڕیارمدا، وەڵامێکی درێژی شیاوی پڕ بە پێستی خۆی و سیپارەکەی بدەمەوە، تا لەوە پتر و لەوە بەدوا، بە خۆڕایی، یەخەی هیچ نووسەرێکی دیکەی کورد نەگرێ و باش بزانێ، هەموو مەلێ گۆشتی ناخورێ و وەک مریشکەکە، لاسایی قاز نەکاتەوە!
هەر چەندە، لە هەموو ژیانی خۆمدا، هەرگیز حەزم نەکردووە، لە نووسیندا، پەنا بۆ بەر شێوەی « ساتیر »بەرم. بەڵام، هەر کەسێ، بەو شێوە پڕ لە « کاڵوکرچیی، ناشارازیی، کاڵتەجاڕیی و دەسپیسیی »یەوە پەلامارمبدا، ڕەخنە لە نووسینەکانم بگرێ، هەر بەو شێوەیە وەڵامیدەدەمەوە. وەک « مەحویی »ش گوتوویەتی:
لە پاداشی قسەی سەردا، هەمە ئاه و هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بـــەردم تێگرێ، من بەرقــــی تێدەگرم «219،57»
بۆیە، بە هەمـوو توانامەوە هەوڵدەدەم، هەمـوو ئەو ڕاستـییـیـە « مێـژوویی، جوگرافیایی، نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، کەلتووریی »یانەی، پێوەندیی بە باسەکەمانەوە هەیە، بە شێـوەیەکی ڕێکوپێک، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمی ڕوونکەمەوە. تا هەموو لایە، ئاگاداری ڕووداو و بەسەرهاتەکان بن!
گەر خوێنەری وریا، تەنیا گوتارەکەی خۆم « زێوەر لە نێوان ...» بخوێنێتەوە، ئیدی پێویست بە وەڵامدانەوە ناکا. چونکە جگە لەوەی، هەموو وەڵامەکان لە گوتارەکەدا هەن، گەر هەر دوو گوتارەکەی من و سیپارەکەی ئەویش بەراوردکا، زۆر بە ئاسانیی بۆی دەردەکەوێ، « بەرزنجیی » هیچی پێ نییە و هیچی نوێشی نەگوتووە، تا داکۆکیی لە دید و بۆچوونی خۆی و بیری « عێراقچێتیی »، هێندێ

له هۆنراوەکانی هۆنەر بکا. بۆیە، ئەو وەڵامی گوتارەکەی منی نەداوەتەوە، بەڵکوو ویستوویەتی، ژمارەی بەرهەمەکانی خۆی پترکا، گەر لە سەر حسێبی ناو و ناوبانگی خۆشی بێ، لە هەموو کاسەیەکدا ئەسکوێ بێ!

هەر چەندە، سەروبەری سیپارەکەی، لە « ئیرەیی، رقوکینە، مامەیی، نەزانیی، بێ ئاگایی، چەواشەکردن، بوختانکردن و دەسبیسیی »دا نقوومبووە، بە شێوەیەکی چەوت، کۆپلەی نووسینەکانی گواستۆتەوە. هێندێ جار، باسی بابەتێکی کردووە، ناوی سەرچاوەیەکی داوە، بە هیچ جۆرێ تێیدا نییە. بەڵام، من لێرەدا هەوڵدەدەم، لە بەرگەوە بۆ بەرگ وەڵامیبدەمەوە، هەموو هەڵە و کەموکورییەکانی، لە کاتی پێویستی خۆیدا دەرخەم. تا تۆزێ هۆشی بە بەر خۆیدا بێتەوە، چیدی لەوە پتر، پێ لە بەرەشرەکەی خۆی را نەکێشێ، سوکایەتیی بە خەڵک نەکا. شتی تایبەتیی و دەمەتەقێی « مێژوویی، نەتەوەیی، رامیاریی، کۆمەلایەتیی و وێژەیی » تێکەڵاو نەکا، تەنیا لە سنووری ئەو بابەتەدا بخولێتەوە، کە لێی دەدوێ، نەک وەک کەواسووری بەر لەشکر، پێشەنگی هەموو نوسینێکی بێ تام و چێژبێ، لە هەموو گەمەیەکی دۆڕاوی « مێژوویی، نەتەوەیی، رامیاریی و وێژەیی »دا بەشداربێ!

ئەوی راستییبێ، پرۆژەی لێکۆڵینەوەکەم کەمێ دوادەکەوێ. چونکە، لە لایەکەوە، لە بەر هەڵپەی ژیان و نان پەیداکردن، لە لایەکی دیکەشەوە، لە بەر کەمی سەرچاوە، ناچاربووم، پەلە لە بلاوکردنەوەی نەکەم. بەلام، گەر « بەرزنجیی »، کەمێ ئارامیی بگرتایە، پەلەی نەکردایە، بەری مێوەکەی بە بەرسیلەیی نەکردایەتەوە، نەک هەر ترێ، بەڵکوو فریاشدەکەوت، حەڵوای شیرین و بە تامیش بخوا!

هەڵبەتە، وەک چۆن بۆ « مەحموود زێوەر »م روونکردەوە، کاتێ ئەویش، سەرجەمی بەرهەمەکەی دەبینی و دەخوێندەوە، بۆچوونێکی دیکەی دەبوو. چونکە، بابەتێکی تایبەتییم، بۆ ئەو جۆرە باس و لێکۆڵینەوانە، بۆ ئەو جۆرە پیاهەڵدانانەی سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان تەرخانکردووە. هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، هەرچی دەنکە « جۆ »یەکی کوردی، لە کێڵگەی پیاهەڵدانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا چاندبێ، من پێم زانیبێ و بەرچاوم کەوتبێ، ئەوا چەن چەپکێکم لێ دووریوەتەوە، رێکمخستووە، بەستوومە و گوڵدانی لێکۆڵینەوەکەم پێ رازاندۆتەوە. هەر هۆنەرێکی کورد، دێرە هۆنراوەیەکی گوتبێ، ئەوەی دەسمکەوتبێ، تۆمارمکردووە بەلام، پێشینان راستیان فەرمووە، کاتێ گوتوویانە: ئەهریمەن پەلەیکرد، چاوێکی خۆی کوێرکرد. کەچیی، « بەرزنجیی »، نەک هەر چاوێ، بەڵکوو، هەر دوو چاوی خۆشی کوێرکردووە!

ئینجا، هەر ئەوە ماوە بڵێم: لەم نووسینەدا، هەموو ئەو سەرچاوانەی بەکارم هێناون، دەسکاریی ڕێنووسەکانیانم کردووە، تا یەک ڕێنووسی یەکگرتوو پێڕەو کەم. بەڵام، بە هیچ شێوەیە، دەسکاریی نووسینەکەی « بەرزنجیی »م نەکردووە، خۆی چۆنی نووسیوە، بە هەموو هەڵەیەکی « چاپ، ڕێنووس، زمانەوانیی و بۆشایی نێوان ووشەکان »یشەوە هەر بەو شێوەیە وەرمگرتوون و نووسیومنەتەوە، تا خوێنەری هێژا بزانێ، بە چ زمانێکی خراپ و کوردییەکی ئاڵۆز نووسیوێتی.
جگە لەوەی، بەپێی سیستێمێکی تایبەتیی « ڕووسیی »، سەرچاوەکانم تۆمارکردووە. هەر سەرچاوەیەک، کۆدێکی دیاریکراوی خۆی هەیە و لە دوو ژمارە پێکهاتووە. یەکەمیان، ژمارەی سەرچاوەکە و دووەمیشیان، ژمارەی لاپەڕەی ئەو کۆپلەیە نیشاندەدا، کە لێی وەرگیراوە.
لە کۆتایی ئەم چەن ووشەیەدا دەڵێم: بە پێویستم زانی، جارێکی دیکەش، کوتارەکەی خۆم بڵاوکەمەوە. چونکە، لە لایەکەوە، هەڵەی چاپ و ڕێنووسی زۆری تێدابوو. لە لایەکی دیکەشەوە، تا خوێنەری هێژا، باش ئاگاداری بابەت و دەمەتەقێکانی نێوانمان بێ. پاشان دەڵێم: سوپاس بۆ ئەو خوایەی، لە بەر هەر هۆیە بێ، نەخشی ژیانی بەم شێوەیە کێشام، ماوەی بیست ساڵ دەبێ، دەربەدەری وولاتانی « ڕۆژهەلات و ڕۆژاوای ئەورووپا »ی کردووم، تا لە نزیکەوە، لەباری ژیان و کەلتووری ئەم وولاتە پێشکەوتووانە وردبمەوە، ئاسۆی بیر و هۆشم فراوانترکەم. چەن زمانێکی زیندووی جیهانیی فێربم، پێیان بدوێم، بخوێنمەوە و بنووسم، لە سامانی مێژوویی و وێژەیی، ئەو نەتەوانەش ئاگاداربم. نەک وەک مامۆستا « بەرزنجیی »، لیسی کوێرانە بهاوێژم، بە زەڕەی کەر باوەڕبکەم و بە قسەی مەلا باوەڕ نەکەم. هێندە بەر چاوم تاریکبێ، بەر پێی خۆم نەبینم، نووسین و لێکۆڵینەوەی ڕاست و بێ مەبەس، لە نووسین و لێکۆڵینەوەی چەوت و مەبەسدار جیا نەکەمەوە، دۆست و دوژمن لێک نەکەمەوە، دۆستایەتیی و برایەتیی تێکەڵکەم، هەر ڕۆژەی هێلانەیە بگۆڕم، هەر ڕۆژەی لە سەر چڵێ بنیشمەوە، هەر ڕۆژەی لە ئاوازێ بخوێنم، باری کورد هەر چۆنێبێ، لە هەموو سەردەمێکدا، چارەنووسی خۆم، بە چارەنووسی ئەو لایەنە ڕامیارییە کوردستانییانەوە گرێدەم، کە ڕووکەی ڕاستەقینەی ژیان و تێکۆشانیان، پێتەختی « بەغدا »ی تاوان و تاریکیی بێ!

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز

ستۆکهۆلم

2000/10/10

## 1. زێوەر لە نێوان کوردایەتیی و عێراقچێتیدا :

بۆ ئەوەی، بە تەواویی لە مەبەسی سەرەکیی باسەکەمان بگەین، بە پێویستی دەزانم، پوختەیەکی ژیانی هۆنەر، بیر خوێنەرانی هێژا بخەمەوە. " عەبدوڵلا کوڕی محەمەد کوڕی مەلا ڕەسوڵ ـ زێوەر »، لەساڵی « 1875 »دا، لە شــــاری « سولەیمانیی » لەدایکبووە. لە حەوت ساڵیدا، لە حوجرەی « خواجە فەندی » دەسی بە خوێندن کردووە. قورئان و گولستانی تەواوکردووە و چوار ساڵیش لەوێ ماوەتەوە. پاشان گەڕاوەتەوە. ئیدی بە تەواویی لە « سولەیمانیی » جێگیربووە. سەرەتا لە خوێندنگەی « ڕووشدییەی سەربازیی »، دواتریش، لە سەردەمی حوکوومەتی عێراقدا، لە ئامادەیی « مولکی » دامەزراوە. تا ساڵی « 1943 » وەک مامۆستایەک کاریکردووە. ڕۆژی «1948/11/10»، لە تەمەنی حەفتاوسێ ساڵیدا، کۆچیدواییکردووە، لە شاری « سولەیمانیی » لە گردی « سەیوان » نێژراوە.*

« زێوەر » زۆر خۆناسبووە. لە خواردنەوەوە دووربووە. جگەرەی زۆر کێشاوە. دامە و شەترنجزانێکی بە ناوبانگبووە. زۆر حەزی لە سەیران کردووە. سوارچاکێکی باشبووە. هۆنراوەکانی « مەولەویی » و « نالیی »، کارێکی زۆری تێکردووە.

گەر بڵێین: لە سەرەتادا هەموو هۆنەرەکانی کورد، هەر بە هۆنراوەی ڕۆمانسیی دەسیانپێکردووە، هەرگیز لە ڕاستیی لامان نەداوە. چونکە، لەم جیهانەدا، کەم لاو هەیە، لە سەرەتای چرۆی ژیانیدا، دڵی بۆ پەریزادێ لێی نەدابێ، تەزووی گەرمی خۆشیییەکی ئەفسووناویی، بە نێو ئەندامەکانی جەستەیدا نەگەڕابێ، خەونی سەوز و سووری شیرینی، بە یاری ناسکۆڵە و نازدارەوە نەبینیبێ. بۆیە، « زێوەر »یش وەک هەموو هۆنەرەکانی دیکەی کورد، سەرەتا هەر بە هۆنراوەی ڕۆمانسیی دەسیپێکردووە، خەوی بە فریشتەی ئەندێشەوە بینیوە، تینوتاوی خۆشەویستیی، شادەمارەکانی هەست و هۆشی سڕکردووە، خۆی بۆ ژیانێکی پڕ لە ئاسوودە و کامەرانیی ئامادەکردوە، ووشەی زێڕینی کوردیی، بە ڕیز لە نووکی پێنووسەکەیەوە هەڵڕژاوە، کشتەکی هۆنراوەی ڕیزە مرواریی سپی لێ هۆنیوەتەوە. کاتێکیش هەلی بۆ ڕەخساوە، بە جوانترین شێوە، هەستی خۆی دەربڕیوە، چەپکە گوڵی بۆنخۆش و ڕیحانەڕەشەی هۆنراوەی، بە پەلکەزێڕینەی ئاسمانی ڕوون و خاوێنی دوای بارانی بەهار بەستووە، پێشکەش بە یاری نازەنینی کردووە. بە هەر لایەکدا ڕوانیبێتی، ڕوخساری یاری شیرین، چەقی ڕێگەی پێ گرتووە، پەیکەرێکی وای لە بیر و هۆشیدا هەڵکەندووە، توانای

بیرچوونەوەی نەبووە، بە تیشکی رووی گەشی، زەنگوڵزەنگوڵ، تکەی ئاونگی شەونمی ئارەقەی سەر کوڵمی ڕشتووە. هۆنەریش بەو تکە عارەقەی تکاوە، بە جارێ سەری مەستبووە و کەللەی سڕبووە. بۆیە، لە تاوا بە نۆ دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

تکانی ئابڕوی چەمەن، بە ڕوی ئابدارەوە
شکانی نرخی نەستەرەن، بە زوڵفی مشکبارەوە
چمە لە مەی؟ لە نەی! لە جام! ئەگەر بە لەنجە بێتە لام
بە ڕوی تابدارەوە، بە چاوی پڕ خومارەوە
عەرق نییە لە عالەما، کە لابەرێ لە دڵ غەما
جگە لە قەترە عارەقێ لە ڕووت، کە دێتە خوارەوە
نیشانی من، جەمالی تۆ، بەراتی من، وساڵی تۆ
خەیاڵی من، لە خاڵی تۆ، بە عیشوە لێم مەشارەوە
عەزیزەکەی حەبیبی من، نیگارەکەی تەبیبی من
با، شەق بەرێ ڕەقیبی من! وەرە بە سەد وقارەوە
فیدای خەد و قەدی تۆ، چەمەن بە فەرجی گولییەوە
بە بولبول و بە چلیەوە، بە قومریی و چنارەوە
فەرەنگ ڕوو، زەنگ موو، عەجەم سیاق و ڕووس خوو
نەناسرێ کە کوردە زوو، بە پێچی لار و خوارەوە
نیشانی زوڵفی عەنبەری، هەموو وولاتی کوڵعومەر
بە عەرد و بەرد و دارەوە، بە ئاوی سەرچنارەوە
ئەمن گەیاندمە نەنومری، فنونی شعر و شاعریی
ئەتۆش گەیانتە سامری، بە چاوی سحر کارەوە «2، 491-492»

« زێوەر » وەک هۆنەرێکی خاوەن بەهرە، بە هەموو لایەکدا پەلی هاویشتووە. گەلێ هۆنراوەی ڕەنگاوڕەنگ و جۆربەجۆری گوتووە. لە هەر باخەی گوڵێکی چنیوە، تا لە ئەنجامدا، چەپکێ هۆنراوەی جوان و بۆنخۆشی ڕازاندۆتەوە. لە باخچەی بە هەشتی وێژەی کوردییدا، لە سەر تەختی مامۆستای هۆنەرانی سەردەمی خۆی دانیشتووە. تاجی هۆنەرێکی « هەست ناسک، بیر تیژ، واتای بەرز، ئەندێشەیەکی پڕ لە پیت و فەڕ »ی لە سەر ناوە. لە لایەکەوە، دیمەنە جوانەکانی کوردستان، لە نێو قوولایی دڵ و شانەکانی مۆخیدا ژیاوە، بە خۆشەویستیی کوردستانەکەی، خوێنە گەشەکەی قوڵبیداوە. لە لایەکی دیکەشەوە، جەور و زۆرداریی داگیرکەران،

چەوساندنەوەی نەتەوەکەی، هێندەی دیکە چاوی کردۆتەوە و زۆری بۆ هێناوە، بۆ خەبات و کوردایەتیی بانگیکردووە و هانیداوە. جگە لەوەی لەو سەردەمدا، دەنگی زەنگی بیری کوردایەتیی، لە هەموو سەردەمێ پتر دەنگیداوەتەوە، لە هەموو بستێکی کوردستاندا ڕەنگیداوەتەوە. بە تایبەتیی، هۆنەر خۆی یەکێ لە نزیکەکانی « شێخ مەحموود »ی قارەمان بووە، وەک کوردپەروەرێ، گەلێ « ساردیی و گەرمیی، تاڵ و سوێریی، برسێتیی و تینوێتیی، دەربەدەریی و نەبوونیی »، لە سەر کورد و بۆ کورد چێشتووە. دیارە، تا لە ژیاندا بووە، دڵی هەر بۆ کورد و کوردستانەکەی لێیداوە. بۆیە، « بە ڕەنگێکی مات و زەردەوە، بە دەنگێکی پڕ لە پەژارە و کزەوە، بە زمانێکی ساکار و ڕەوان، بە کوردییەکی ڕەسەن و پەتیی »، گەوهەری بریقەداری ووشەی ساکار و خۆماڵیی ڕیزکردووە، ملەلیرەی هۆزاوەی کوردیی لێ هۆنیوەتەوە. تا توانیوێتی، هەرچی لە هەناویدا هەبووە، دەریبڕیوە، هەرچی دەردە دڵی خۆی هەبووە، بۆی هەڵڕشتووین. پاشان، هوشیاریکردوینەتەوە، هاواری لێ کردووین و گوتوویەتی:

ئەی « وەتەن ! چەند خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی
مەزرەعەی توخمی نیشات و باعسی ژینی منی
بێت و گەر من کۆهکەن بم، وەسڵی شیرینم ببی
تیشەیی نادەم لە بەردت، تۆی کە شیرینی منی
گەر چی ئەرزی، هێند بڵندی، وەختە لای من بچیە عەرش
واستەی سەربەستی ئیجرای ئایینی منی
ئیفتیخاری میللەتی، تۆی مادەرێکی میهرەبان
خوا هیلالیشی بە تۆ دا، ماه و پەروینی منی
نەوبەهاران، بەو هەوای زۆر سافەوە، وەک جەنەتی
فەسڵی زستانیش، سەراسەر باغی نەسرینی منی
بۆچی نەقدی جیسم و جانی خۆم، بە شاباشت نەکەم؟
خاکراهی حوکمڕانی عیزز و تەمکینی منی
ئارەزوو و فیکری سیاحەت ناکەم، ئیتر ئەی وەتەن
تۆ لە جێگای « قاهرە و تاران و بەرلین »ی منی «2، 496-497»

دیارە، « زێوەر »یش وەک هەر هۆنەرێکی نیشتمانپەروەری دیکەی کورد، هەستی بەو هەموو « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناتەبایی و دواکەوتوویی »یەی نێوان ڕیزەکانی کورد کردووە. لەبەرئەوە، کوڵی بە دەرد و کەموکورییەکانیەوە

هەڵگرتووە، گەلێ ئازار و ژانی بە دەسەوە چێشتووە و سوێی بە دڵدا چووە. بۆیە، زمانی گرتووە و چەن هۆنراوەیەکی دژی دووبەرەکیی و بۆ یەکێتیی هۆنیوەتەوە. بۆ نموونە : هۆنەر، باسی بێ بەختیی رۆڵەکانی کوردی کردووە، لە دەردەکانی دواوە، چۆن بە هەزار ناخۆشیی و سەختیی، تیکەیە نانی رۆژانە پەیدادەکەن، داگیرکەری بیانییش، لێیان ناگەڕێ و دەیانچەوسێنێتەوە. کەچیی، سەرەڕای هەموو ئەوانەش، خۆیان یەک نین و بە نۆ دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

سەرەڕای ئەوە دوژمن بە یەکن، جوملە عەشیرەت
حەقیانە ئەڵێن: کورد هەموو مەحکومی جنوونن
ئەم حاڵە، دەوامێکی تەبیعی هەیە بۆ کورد
تا غافڵ و بێ بەهرە لە عیلم و لە فنوونن «2،106-107».

لە هۆنراوەی « ئەی کوردینە »شدا، بە شێوەیەکی یەکجار بە سۆز، بە دڵێکی خاوێن و پڕ لە جۆشەوە، داوای تەبایی و یەکێتیی، لە رۆڵەکانی کورد کردووە و بە شەش نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

ئەی کوردینە! ئەی مەردینە! با دەست لە ناو دەست کەین هەموو
بۆ بەرزێتی خاکی « وەتەن »، بۆ یەکێتی بچین هەموو، کوردین هەموو
بێ کەس نییە دایکی « وەتەن »، ئێمەش « فیدا »کاری ئەوین
تا کورد لە « عالەم » دەرکەوێ، بۆ یەکێتی بچین هەموو، کوردین هەموو
« ئەجداد »مان شێری زەمان، حوڕبوون و سەربەستی جیهان
باکمان نییە، ئێمەش لە کەس،
بۆ یەکێتی بچین هەموو، کوردین هەموو «1،110».

هەروەها، لە رێی ئەم چەن دێڕە هۆنراوەیەشەوە، بە جوانترین شێوە، هەستی دەربڕیوە و گوتوویەتی:

وا « وەتەن » خەمڵیوە وەک گوڵ، ئەوبەهاری میللەتە
شادمانی « قەومی کوردە »، وەختی « لوتف و رەحمەتە »
زەرەیەک خاکی« وەتەن »، نادەم بە « قەسری قەیسەری »
« جوملە ئەنهاری »، وەکوو کەوسەر، هەوای وەک « جەننەتە »
میللەتی کورد، « موڵکی » سەربەستیشی، خستە دەستی خۆی
جان نیساری گەر نەکا، هەر کەس بەشی ئەو « لەعنەتە » ! 1* «1،113».

« زێوەر »، لە خۆشەویستیی نیشتمانەکەیدا تواوەتەوە، کوردستانەکەی بە بەهەشتی رازاوەی سەر رووی زەوی داناوە، داوای یەکێتیی و خوێندنی، لە

ڕۆڵەکانی گەلەکەی کردووە و گوتوویەتی:

وەتەنی من کوردستانە، یادگاری ئەجدادمانە
بەهەشتی ڕوی سەرزەمین، خاکی پاکی کوردستانە
با، هەموومان وەک برا بین، ڕەفیقی دین و دنیا بین
با، لە وەحشەت تەوەلا بین، نۆبەتی عیلم و عرفانە
کورد میللەتێکی ناسراوە، لە « مەعاریف » بە جێماوە
ڕۆژی « سەعی » و تێکۆشینە، بۆ ئەو کەسەی کوردزمانە
کورد میللەتێکی ناسراوە، لە مەعارف بەجێماوە
ڕۆژی سەعی و تێکۆشینە، بۆ ئەو کەسەی کوردزمانە
کورد میللەتێکی قەنیمە، ساحیبی تبعی سەلیمە
شاهدی ئەم مودەعایە، سەلاحەئەلدینی سوڵتانە «497،2»

پاشـــان، ئەم پەردەیە لای « زێوەر » دادەڕێتــەوە، پەردەیەکی نوێی شـــانۆگــەریی ڕامیاریی، لە ژیانی هۆنەردا دەسپێدەکا. با بزانین، چۆن؟ هەمـــــوومان دەزانین، « زێوەر » یەکێ بووە، لەوانەی لە شــۆڕشـــەکــەی ســـاڵی « 1919 » ی « شــێخ مـەحمـوود »دا بەشـداریـیکردووە. بەڵام، دوای ئەوەی هێـزی کـورد، لە « دەربەندی بازیان » تێکشـکاوە، « شـێخ »ی ئەمـر بە بریـنداریی گـیـراوە، ئیـدی « زێوەر »، شـاری « سـولەیمانیی » جێـهێـشـتووە، لەگەڵ خێـزان و منداڵەکـانی « شێخ »دا، ڕوویان لە ناوچەی « هەورامان » کردووە و ماوەیە لەو ناوە ژیانیان بەسەربردووە.
« زێوەر »، لەڕۆژهەلاتی کوردستـانیشـەوە، لە سـەر هۆنراوەگوتنی خۆی بەردەوام بووە. هۆنراوەی گـــوتووە و بۆ « ســـولەیمانیی » ناردووە، کـــارێکیکردووە، هۆنراوەکـانی دەس « مـێـجـەر سـۆن » کـەون. ئـەو کـاتە « ســۆن »، لە شـاری "سولەیمانیی" یەکەم پیاوی دەسەلاتـــــداری « ئینگلیز » بووە. « زێوەر »، بەو هۆنراوانە ویستوویەتی، « سۆن » هێورکاتەوە، دڵی بداتەوە و ملی خۆی لە پەتی سـێدارە ڕزگـارکـا. بەرژەوەندیی ئینگلیزیش وا دەبێ، خـەڵک لە کـوردایـەتیی و شـــۆڕش دوورخـــەنەوە. بۆیە، « ســۆن » لێی خـۆشـدەبێ. پاشـــان « زێوەر » دەگەڕێتەوە، لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا دادەنیشێ. دیـــارە، وەک مامۆستا « نەجمەدین مەلا »ش دەڵێ:
(مـامۆسـتا « زێوەر »، سـاڵی « 1919ز. »، لەبەرئەوەی هاوکاری شۆڕشی « شێخ مەحموود » بووە، هەڵاتووە، چۆتە کوردستـانی خۆرهەڵات، لە گوندی « زەنبیل » ئەم هەڵبەستەی وتووە و ناردوویەتی بۆ حاکمی سیاسی « مێجەر سۆن ». بەمە

خۆی لە تاوانی سیاسەت پەراندۆتەوە. « میجەر سۆن » یش لێی خۆشبووە و هەڵبەستەکەی لە ڕۆژنامەی « پێشکەوتن » دا چاپکردووە وە کردووشیەتی بە مامۆستا لە قوتابخانەی « نموونەی سەعادەت » دا.)«1،30»

هەرچەندە، « زێوەر » بە هۆنەرێکی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەر ناسراوە، هێندێ هۆنراوەی نیشتمانیی گوتووە. بەشداریی لە خەباتی گەلەکەیدا کردووە، چەرمەسەریی چێشتووە، نیشتمانەکەی خۆی خۆشویستووە. بەڵام، کاتێ دەوڵەتی داگیرکەری عێراق دامەزراوە، باشووری کوردستانیان بە زۆر پێوە لکاندووە، « زێوەر » وەک مامۆستایەک، لە خوێندنگەکاندا کاریکردووە، گەلێ گۆرانیی و سروودی جۆربەجۆری، بۆ خوێندکارانی کورد داناوە و بە« عێراق »یدا هەڵداوە.

لە سەردەمی « زێوەر » دا، گەلێ هۆنەری زرنگ و بالادەستمان هەبووە. بەڵام، هەرگیز باوەڕ ناکەم، هیچ هۆنەرێ بەو شێوەیە و بەقەدەر « زێوەر »، سروود و گۆرانیی بۆ « عێراق » گوتبێ. هۆنراوەی جۆراوجۆری بۆ هۆنیبێتەوە. بە پێچەوانەوە، چەندین هۆنەری ناسراو و گەورەی وەک: « ئەحمەد موختار جاف، حەمدیی ساحێبقران، بێکەس، پیرەمێرد، موفتی پێنجوینیی، بێخود، قانیع، شێخ نووریی شێخ سالح، گۆران، ا.ب. هەوریی، هەردیی » و گەلێکی دیکەشمان هەبووە، لەو سەردەمەی « زێوەر » دا ژیاون، بەڵام، تاکە یەک هۆنراوەیان، بۆ « خاکی عێراق، شا فەیسەڵ و ئاڵا »کەی نەگوتووە. لێرەدا دەتوانین، چەن نموونەیەک بێنینەوە:

کاتێ « شێخ مەحموود »، دژی ئیمپریالیزمی « بریتانیا » و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، شۆڕشی بەرپاکردووە، کورد لە باشووردا چەوساوەتەوە. لە سەر ویلایەتی « موسڵ »، لە نێوان « ئینگلیز » و « تورکیا » دا ناکۆکیی پەیدابووە. ئا لەو کاتانەدا، ڕێفراندۆم کراوە، زۆربەی کورد، داوای مافی خۆیان کردووە. بەڵام، بە هەر فڕوفێڵێ بووبێ، « ئینگلیز »ەکان دەسی کوردیان، بە پەیمانی درۆ بڕیوە. لە ساڵی « 1924 » دا، ویلایەتی « موسڵ »یان، لە « تورکیا » دابڕیوە و بە « عێراق »ی عەرەبییانەوە بەستووە.

هەر چەندە، « زێوەر » لەگەڵ گەلی عەرەبدا، تاقیکردنەوەی نەبووە، لە دەس زۆرداریی و ملهوڕیی تورکەکان، داد و بێدادی بووە. بەڵام، وەک ڕووناکبیر و هۆنەرێکی کورد نەدەبوو، هەر زوو تفەنگ بە تاریکەشەوەوە بنێ، مژدەی ژیانێکی خۆش، بە کورد بدا، ئەو بڕیارەی پێ باشبێ، خۆشیی خۆی دەربڕێ، بە شان و بازووی « بریتانیا » و « عێراق » دا هەڵدا. وا بزانێ، دواکەوتوویی و چەوسانەوەی

کورد، کۆتاییپێدێ، هەر لەبەرئەوەی، لە دەس تورک ڕزگاریدەبێ. دوایش پەشیمانبێتەوە. بەڵکوو دەبوو، ڕێگەی ڕاست، پیشانی ڕۆڵەکانی گەلی باشووری کوردستان بدا، بۆ خەبات و سەربەخۆیی هانینباندا، نەک بیگوتایە:

چ خۆشە، « حوکمی عەدالەت »، ئەمانی « مەحکومیی »
چ خۆشە، ڕەفعی سەفالەت، شیعاری مەزڵوومیی
لە بەینی « قەوم و میلەل »دا، چ خۆشە مەوجوودیی
چ ئافەتێکە، « حەقیقەت » بەڵایی « مەعدوومیی »
چ نەکبەتێکە، ئیلاهی « جەهالەتی » میللەت
چ دەوڵەتێکە، « مونەیەد » ئەساسی ــ مەعلومیی ــ
ئەما لە سایەی « عەدلی ئیلاە و لوتفی » خوا
لە سەر خراپەی ئەم کوردە، سایەی بوومیی
لە فەیزی لوتفی خواوە، « ویلایەتی موسڵ »
ــ نەجاتی ــ بوو بە تەواویی، لە پەنجەی ڕۆمیی
بەڵێ، « نەتیجەی زوڵم و جەفایە » بۆ هەر کەس
بەرۆکی خۆی ئەگرێ، « عاقیبەت » بە « مەشئوومیی »
کولاهی « فەخری » هەموو کوردەکان، گەیشتە فەلەک
کە « تورکی »دا بە زەویدا، خەیاڵی مەوهومی
کە « عوسبەت ئەلئومەم »، ئەم « حوکمە » عادیلانەی دا
حەیاتی دا بە « عراق » و نەماوە « مەحروومیی »
بژی بە ــ عەدلەوە عوسبە ــ لەگەڵ « بەریتانیی »
چرای وولاتە، قەراریان بە « لەفزی مەفهومیی »! «1، 46-47»

ئەمە، گەر شتێ بگەیەنێ، نیشانەی ئەوەیە، هوشیاریی ڕامیاریی « زێوەر »، وەک ڕووناکبیرێکی سەردەمەکەی خۆی، کەلێ لاوازبووە.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا، زۆر بە کوڵودڵەوە، گۆرانیی بۆ خاکی« عێراق » گوتووە. باسی سەروەت و سامانەکەی کردووە. لە کاتێکدا، زۆربەی ئەو باسکردنە، هەر بە سەر کوردستاندا دەچەسپێ. « عێراق »ی بە نیشتمانی کورد داناوە، وەک گیانێکی ڕەوان لێی ڕوانیوە و گوتوویەتی:

خاکی عراقم، سەربەسەر پڕ « مەعدەن » و دوڕ و « گەوهەر »
جێی « علم » و جێی فەزڵ و هونەر، باخاتی پڕ میوە و سەمەر
« کەوسەر » بە ناویا « جاری »یە، دڵ « عاشقی ئەنهار »یە

« بەحر »شی پڕ مرواریییە، شاخی هەموو پڕ سیم و زەڕ
بنواڕە شاخ و کێو و دەشت، وەک سەبزەزاری ناو بەهەشت
هەر « لایەقە » بۆ سەیر و گەشت، ئایا بە « شام » ئایا « سەحەر »
شیرین وەتەنمانە « عراق »، ڕۆحی ڕەوانمانە « عراق »
ڕەنگین چەمەنمانە « عراق »، تۆزی هەموو سوورمەی نەزەر «1،98-99»
هەروەها، بە هۆنراوەیەک « جوگرافیای عراق »ی، بۆ منالانی خوێندنگەکانی کوردستان هۆنیوەتەوە. زۆر بە شانازییەوە، زاراوەی « شیمال »ی بە گوێی منالانی کورددا داوە. وا دیارە، « زێـــــوەر » بە یەکجاریی بڕیاریداوە، زاراوەی « شیمال » لە بری نـــــاوی شیرینی « کوردستان » بەکاربێنێ! بۆیە، بە هیچ شێوەیە، ناوی « کوردستان » نابا! لەگەڵ ئەوەشدا بڵێین: هەر باشە، هەر دوو شاری « کەرکووک » و « موسڵ »ی بە « شیمال! » داناوە و گوتوویەتی:
بە سێ « منطقە عراق » بەشکرا ، « شمال و وسط و جنوب » ناونرا
هەموو شارێکی پێی ئەڵێن: « لیوا » ، چواردە « لیوا »یە بیزانە هەروا
چوار لەم شارانە کەوتۆتە شیمال ، « سولەیمانی و کەرکووک »ی خۆشحاڵ
« هەولێر و موصڵ » شاری مەشهورن ، بە « زەراعەت و سەنعەت مەسرورن »
منطقەی وسط هەموو شەش شارە ، یەکێ « بەغدا »یە ئەڵێی گوڵزارە
« دیالی و دلێم، حلە و کەربەلا » ، شاری « کووت »یشە دووربن لە بەلا
منطقەی جنوب: ئەویش چوار شارە ، شاری « بصرا »یە لەگەڵ « عەمارە »
سێیەم: « مونتەفیک » چوارەم: « دیوانی » ، لازمە ناوی هەمووی بزانی
لیوای « دیالی » شاری « بەعقوبە » ، مەرکەزێکی زۆر جوان و « مەحبوبە »
لیواکەی « دلێم »، شاری « رمادی » ، بۆتە مەرکەزێ، لە دەشت و « وادی »
« لیوای منتفک، ناصریە »یە ،
شارێکی جوان و بە « قاعیدە »یە ! .. «1،102»
پاشان، باسی « سنووری عراق »ی کردووە و گوتوویەتی:
سنووری « عراق، شەرقی ئێرانە » ، « غەربی سووریە » هەر بیابانە
هەموو شمالی هی: « تورکیا »یە ، « شمالی شەرقی ئێران »ی تیایە
« جنوبی خەلیج، ئەمارەتی کوێت »
« سەحرای نەجدیشە، مەعلوم » بێ لێت ! .. «1،102»
پاشتریش، لە شێوەی بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆی عێراق دواوە، هـــۆنراوەی « ئیدارەی عراق »ی پێشکەشکردووین و گوتوویەتی:

« ئیدارەی عێراق » بۆتە مەشرووتە ، حوکوومەتێکی جوان و مەزبووتە
« بەغدا پایتەختە، مەلیک » نشینە ، لەگەڵ « وەزیران، ئیدارە » بینە
« مەجلیسی میللەت، مەجلیسی ئەعیان » ، قانوون ڕێکئەخەن، بە دڵ و بە گیان
لەگەڵ ڕێکخرا « قانوون و نیظام »
« تطبیق » ئەکەن وەزیران تەمام ! .. «103،1»
لە باسی ڕووبارەکانی عێراقیشدا گوتوویەتی:
نەهری ناو عراق، « دەجلە و فورات »ن، ئەڵێی کەوسەر و ئاوی حەیاتن
« خێر و نەفعیان » ناکرێ ژمارە ، دروستە بڵێی: قەترەی « دینارە »
تێکەڵاوئەبن لای قورنە هەر دوو ، ئەمجا، گومئەکەن ناوەکەی پێشوو
بە « شط العرب »، شوشرەت وەرئەگرێ، بە هەموو « ئەوعێ، ئاوی » لێ ئەبڕێ
سەرچاوەی دەجلە، خواری گۆلی « وان »، بە « لیوای موصڵا » دێتە وولاتمان
فورات لە ناو تورک، دێتە سووریە، لە « دێر » بۆ : « عراق »، وەستانی نییە
هەر وەک « عاشقی مەجنون و موشتاق »
هەر دووکیان خۆیان ئەکوتن بۆ « عراق » «103،1»
دەربارەی بازرگانیی دەرەوەی « عێراق »یش گوتوویەتی:
« تجارێ عراق، تجارەت » ئەکا، دراوسێکانی « زیارەت » ئەکا
ئەچێتە « نەجد و کوێت و ئێران »، « فلسطین، اردن، سووریە، لبنان »
بۆ هندستان و ئەورووپاش ئەڕوا، لەو ماڵەی « عراق » کە ئەیبێ، ئەیبا
« ئەنواعی خورما، ئەنواعی خەلە »، حەیوانی ناڵدار، سمدار بە گەلە
کەتیرە و مازوو، بنێشت و خوریی ، هەتا هێلکەی زۆر لەگەڵ مامری
لە ساڵی هەزارونۆسەدوسیوچوار ، لە موصڵەوە ڕۆیی، مامر سەد هەزار
پێنج هەزار « سندۆق »، هێلکەیش نێررا !
یا خوا ئاوابێ ـ مەملەکەتی ـ وا! .. «104-103،1»
هەروەها، دەربارەی هاوردەی « عێراق» گوتوویەتی:
ئەوەی بۆ « عراق » دێ لە دەرەوە، « قاوە و چایی »یە بە شەکرەوە
کووتاڵی زۆر و ماڵی « عەتاریی »، عراقی پڕکرد، لای سەر و خواری
« ئەوعی عطریات، قسمی مەشروبات »،
« پوول و پارەیان »، بڕی لە وولات! «104،1»
هەروەها، دەربارەی دانیشتووانی ئەو سەردەمەی « عێراق » واتە: ساڵی «1932 »
گوتوویەتی:

چوار ملیۆن ئەبێ، « نفـوسی عـراق » ڕووی لە زیادییـە، بە ئەمـری خـلاق «104،1».

جگە لەو هەموو هۆنراوانەی بۆ « عێراق »ی هۆنیوەتەوە، هێندە « عێراقچێتیی »یەکەی خەستکردۆتەوە، بە جارێ شوولی لێ هەلکێشاوە، لە لووتکەی تێپەڕاندووە. بۆیە، بە ڕووناکیی چاوانی خۆی داناوە. هەر چەندە، هەموو خاکی « عێراق »ی عەرەبیی، یەک گردۆلکەی تێدا نییە، بەلام، مامۆستا « زێوەر »ی موچەخۆری دەولەتی داگیرکەری « عێراق »، هەموو چیا و دەشتەکانی باشوور، کە گیانی پێ دەبەخشێ، لە کوردستانی دابڕیوە و بە مولکی « عێراق »ی داناوە. ئینجا تا توانیوێتی، پڕ بە دەم هاواریکردووە، بە بژی بژی، « شا فەیسەل »ی بۆ بەرقەرار کردووین، بە ئاوازێکی خۆش و بە مۆسیقایەکی جوان، گۆرانیی بۆ « عێراق » چڕیوە و گوتوویەتی:

ئەی « عراق »! ئەی « عراق »م! ئەی نووری چاوان!
چەندە جوانی، لە نەزەردا بوویتە گولشەنمان
لە « شمال » و لە « جنوبا، مەنظەرەی فەتان »
دانیشتووانت وەک برامن ، وەک برای هاوجان
شاخەکانت، دەشتەکانت، « ڕۆح » ئەبەخشێ پێم
ئاوی « ساف »ت، جێی « طەواف »ت، لادەبا « ئەحزان »
ئاگری ـ عشقت ـ لە دلدا، ڕۆشنە بۆمان
تۆ « حەیاتی »، جێی بەراتی، « مەنبەعی ایمان »
هەر بژی « فەیصەل ملک، ابن الملک، ابن الملک »
ـ الی نبی، نسلی عەلی، لە بنی عدنان ـ ! .. «122-121،1»

لە کۆتاییشدا، بە کامی دل، گۆرانیی بۆ ئالای « عێراق » چڕیوە. بە ناوی گەلەوە دواوە و گوتوویەتی: ڕەنگی سوور و سپی و سەوزی ئالا، چاوی گەل گەشدەکا، خۆی بە پاسەوانی ڕادەگرێ، بە ئابڕووی گەلی دەناسێ، بە ڕێزەوە لە بەریدا ڕادەوەستێ، دەستی سلاوی بۆ بەرزدەکاتەوە و دەلێ:

ئەی « عەلەمی » بەرز و بلندی وەتەن، خاکی قەدەمتە، سەری دوور لە بەدەن
ئەی عەلەمی سوور و سپی و سەوز و ڕەش، دیدەیی میللەت، بە تەماشاتە گەش
ئەی عەلەمی خاصی « عراقی عەزیز »، لەنجەی تۆ، جیلوەی تۆیە « تەمیز »
« ڕۆحی منە، حاریسە » بۆ سێبەرت، بالی « ملائیک »، بوومتە ئەفسەرت
تۆی شەرەفی میللەت، هۆردووی عراق ، « نصرەتی حەق یارتە بالاتفاق »

لازمە بۆ ئێمە لە ڕووتا « سەلام »، « یا علم النصر لک الاحترام »!.. «122،1»
ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیەی « زێوەر »، لەو سەردەمەدا بۆ « عێراق »ی گوتووە، هەر هۆنەرێکی دیکە، لەم سەردەمەدا بیگوتایە، بە دەیان ناوونـاتۆرەی خراپیان دوادەخست، مۆری ناپاکیی و چاشایەتییان پێوەدەنا! کەچیی، سەرەڕای ئەو هەموو « عێراقچێتیی » و پیاهەڵدانە، « زێوەر » خۆی تووشی ناکۆکیی یەکی پڕ لە سەیروسەمەرە کردووە. گەر یەکێ ئەم هۆنراوانەی پێشووی بەرچاو نەکوتایە، دەیگوت: ئەم پیاوە، کوردێکی تەنگەتیلکە و نەتەوەپەرستبووە! چونکە، داوای جیابوونەوەی کردووە. سەیر ئەوەیە، هۆنراوەی « ماڵ جوێکردنەوە »ی لە ساڵی «1924»دا داناوە، کەچیی، هێندێ لەو هۆنراوانەی پێشووشی، هەر لە هەمان ساڵدا یا کەمێ دواتر گوتووە! با بزانین، ماڵی لەگەڵ کێ بەشکردووە؟ بۆچی ماڵی جیاکردۆتەوە؟

بابە! فەرزەن، تۆ شای سەر زەمینی
ڕازیم بە بەشی خۆم و « مسکینی »
« دەجلە و فورات »، با هەر بۆ خۆت بێ
منیش، « کوردوستان » شاخی ڕەنگینی
هەواکەی « شاهۆ »، ئاوەکەی « قەندیل »
لانەبا لە کورد، ئێشی برینی
قەت ڕێک ناکەوێ، دەس لە مل یەککەن
« حنتوش حلاوی » و ڕەسووڵ « سیرێن »یی
من لام باش نییە، سواری شانم بی
وا عەرزت ئەکەم، هەر بە شیرینیی
خورمای خۆت بۆ خۆت، مێوژم بۆ خۆم
« لکم دینکم و لی دینی » «36-35،1»

گەر یەکێ بە تەواویی، لە ناوەڕۆک و باوەڕی ئەو هۆنراوەیە وردبێتەوە، ڕەنگە بڵێ: ئەوەتەی « زێوەر » هەیە، داوای جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی کردووە! یا بە هەر جۆرێ بێ، تەنیا دەیەوێ، لە کولانە وێرانەکەی خۆیدا بژی و بحەوێتەوە. کەس نانێکی هەرزنی، لەگەڵ دوولەت نەکا! بۆیە، گریمان « بابە »ی عەرەب خۆی بە شای سەر ڕووی زەوی داناوە، ئەم وەک کوردێ، بەو بەشەی خودا داوێتێ، قایلبووە و هیچی دیکەی نەویستووە. تەنانەت، هەر دوو ڕووباری « دیجلە و فورات »یش، کە لە باکووری کوردستان هەڵدەقوولێن و موڵکی کورد خۆین، هەر

لەبەرئەوەی بە تەنیا بژی، پێشکەشیکردوون! چونکە، ئەو چیای سەرکەش و ڕەنگینی کوردستانی هەبێ، هەوای سازگاری چیای « شاهۆ »ی « هەورامان » و ئاوی سارد و کەللەتەزێنی شاخی « قەندیل »ی هەبێ، ئیدی ئەو دوو ڕووبارەی بۆچییە؟!! هەڵبەتە، ئەمانەش هەموویان دەتوانن، دەرد و ژانەکانی لە بیربەرنەوە.
جگە لە هەموو ئەوانەش، پێی وابووە، « حەنتوش »ی عەرەبی دانیشتووی شاری « حیللە »ی ناوەڕاستی « عێراق »، لەگەڵ « ڕەسووڵ »ی کوردی، خەڵکی گوندی « سیرێن »ی « شارباژێڕ »، لە باشووری کوردستان، هەرگیز پێکەوە هەڵ ناکەن و بە ئاشتیی ناتوانن، ساتێ پێکەوە بژین. بۆیە، بە ڕاشکاویی، باوەڕی خۆی دەربڕیوە، گەر مێوژی کوردستانی هەبێ، خورمای عەرەبستانی ناوێ، هەر وەک خواش دەفەرموێ: هەر کەس و هەر کەلەی ئایینی خۆی بۆ خۆی و لە سەر بیروباوەڕ و ئایین، بەگژ یەکدیدا مەچن!
جا ئێستە بۆمان هەیە، لە خۆمان بپرسین، « زێوەر » بۆچی، گۆرانیی بۆ برایەتیی کورد و عەرەب گوتووە، کە « حەنتووش » و « ڕەسووڵ » پێکەوە ڕێک ناکەون؟!! بۆچی ئەو جۆرە هۆنراوانەی، بۆ خاکی عێراق و ئالاکەی هۆنیوەتەوە، کە هەوای « شاهۆ » و ئاوی « قەندیل »ی ویستووە؟!!

تێبینیی لە سەر گوتارەکە :

* لە ڕاستییدا، « زێوەر »ی هۆنەر، لە گردی « جۆگە » نێژراوە. ئەم زانیارییەش، « مەحموود زێوەر »ی کوڕی هۆنەر بۆی ڕاسکردمەوە.

1* ئەم هۆنراوەیە، لەگەڵ ئەوەی لە نێو « سروود »دا چاپکراوە، زۆر جیاوازییان هەیە. من لێرەدا، لەسەر دیوانەکەی خۆی ڕۆشتووم.

سەرچاوەکانی گوتارەکە:


1. زێوەر، هۆنراوە، سۆزی نیشتمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، 1958.
2. عەلادین سوجادیی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعاریف، سردشت، پەرتووکخانەی زانیاری، خرداد، 1361.

## 2. شـــێوە و شـــێواز :

لە وەڵامی سیپارەکەی « بەرزنجیی »دا، هەوڵدەدەم، چ لە ڕووی شێوە و شێواز، چ لە ڕووی بابەت و ناوەڕۆکەوە، گەلێ شت ڕوونکەمەوە. بۆ ئەوەی، هەم خۆی کەڵک لە هەڵەکانی وەرگرێ. هەم خوێنەرانی هێژاش، لە نێوان هەر دوو لاماندا سەریشکێن. چونکە، وا نەدراوە، هەر وا بە ئاسانیی پێنەکرێ!

هەروەها، هەوڵدەدەم، بەپێی زنجیرەی باسەکان، هەرچی لە دیزەکەیدا بێ، دەریبێنم، تا، ئەوەی لە ژێر بەڕە شڕەکەیدایە، ئاشکرایکەم. هەموو ئەو هەڵانە پیشاندەم، کە « بەرزنجیی » کردوونی. بۆ ئەوەی، کارەکەشمان سەرکەوتووبێ، وەک مشتێ لە خەرواری هەڵەی « زمانەوانیی، ڕێنووس، داڕشتنی لاواز و ووشەی عەرەبیی »، چەن نموونەیەکی گرنگ، لە سیپارەکەی هەڵدەبژێرم. چونکە، گەر لە هەموو هەڵەکانی سیپارەکەی بدوێم، ئەوا دەبێ، وەڵامەکە زۆر درێژترکەمەوە.

### 1/2. لە بەرگەوە بۆ بەرگ :

گەر سەرەتا، تەماشایەکی بەرگی سیپارەکە بکەین، دەبینین: تەنانەت، ناوەکەی خۆشی بە هەڵە نووسیوە. چونکە، « سەید » و « بەرزنجی »، هەر دووکیان بە دوو « ی » دەنووسرێن. واتە: « ئەحمەد سەییید عەلی بەرزنجیی »، جگە لەوەی، ناونیشانی سیپارەکەشی، لە ڕووی زمان و ڕێنووسەوە، هەر بە هەڵە دادەنرێ. چونکە، « پێویستی » بە دوو « ی » و « پێویستنین » نێگێتڤە بە جیا و «عێراقچێتی » بە دوو « ی » دەنووسرێن. جگە لەوەی، نیشانەکانی خاڵبەندیی، لە نووسینەکەیدا پێڕەو نەکردووە. بۆ نموونە: « زێوەر » وەک ناوی مرۆڤ دەبێ، لە ووشەی ئاسایی جیاکرێتەوە و لە نێوان دوو کەوانەدا بنووسرێ. بەڵام، ئەو، ئەو لایەنەی فەرامۆشکردووە. واتە: ناوی سیپارەکەی دەبووایە، بەم شێوەیە بووایە: پێویستیی ئەو شیعرانەی پێویست نین لە وەڵامی عێراقچێتیی یەکەی « زێوەر »دا.

هەروەها، بەرگی یەکەمی سیپارەکەی، لەگەڵ بەرگی دواوە، کەمێ جیاوازییان هەیە. لە پێشەوە نووسیوێتی: (پێویستی ئەو شیعرانەی پێویستنین لە وەڵامی عێراقچێتیەکەی زێوەردا). کەچیی، لە پاشەوە تەنیا بەشی یەکەمی ناونیشانەکەی، بۆ ئینگلیزیی وەرگێڕاوە، واتە: The Necessity of the Un Necessary poems - و بەشەکەی دیکەی وەر نەگێڕاوە، کە « لەوەڵامی عێراقچێتیەکەی زێوەردا »یە! جگە لەوەی، بە ئینگلیزیی «A Critical Study»

بۆ زیادکردووە، کە لە بەرگی پێشەوەدا نییە! دیارە، ڕووی نەهاتووە، ئەو قسە هەلەقومەلەقانەی خۆی، بە « لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەگرانە » دابنێ. بۆیە، بە کوردییەکەی هیچی نەنووسیوە. وای زانیوە، کەس ئینگلیزییەکەی ناخوێنێتەوە و هەستی پێ ناکا! خۆزگە، ڕەخنەیەکی بەجێی بگرتایە، هێندێ لە هەڵەی زمانەوانیی و بۆچوونەکانمی دیاریکردایە، تا کەڵکم لە هەڵەکانی خۆم وەرگرتایە.
جا ئەو کاتە، پێش هەموو کەسێ، خۆم دەستخۆشانەم لێ دەکرد و کۆڵێ سوپاسم دەکرد! ناوی « سلێمانی »، لە « سلێمان »ەوە هاتووە. « سلێمان »یش ناوی مرۆڤە. دەبێ، جیاوازیی لە نێوان « سلێمان »ی مرۆڤ، « سلیمانیی » ناوی شاردا بکرێ. بۆ نموونە دەڵێین: « سلێمانی کوری عەلی ». بەڵام، کە بە دوو « ی » نووسرا، وەک « سلێمانیی »، ئەوا یەکسەر دەزانین، مەبەس لە ناوی شارە و لە ڕووی ڕێنووسیشەوە هەڵە نابێ!
لە لاپەڕە دوودا نووسیوێتی: « سلێمانی/کوردستان عێراق ». لە ڕووی زمانەوە، گەر « کوردستان » هی « عێراق » بێ، ئەوا دەبێ، بنووسین « کوردستانی عێراق » خۆ گەر « بەرزنجیی » بڵێ: مەبەسم ئەوەبووە، بڵێم: هەرێمی « کوردستان » و دەوڵەتی « عێراق »، ئەوا دەبووایە، نیشانەکانی خاڵبەندیی بەکاربێنایە و بینووسیایە: « کوردستان ـــ عێراق »، ئەو کاتە ڕاستربوو.
ئینجا، با بە شێوەیەکی گشتیی، لە شێوەی نووسین و هەڵەی زمانەوانیی سیپارەکەی بدوێین. « بەرزنجیی »، سیپارەکەی بە ڕێنووسێکی کۆن و هەڵە نووسیوە. هێندێ هەڵەی چاپی تێدایە. زۆر هەڵەی زمانەوانیی کردووە. بە زمانێکی کلاسیکیی نووسیوێتی. گەلێ ووشەی بیانیی بەکارهێناوە. بە شێوازێکی عەرەبیی لاواز دایڕشتووە. بە شێوەیە لاوازیی پێوە دیارە، پەنا بەخوا، دەڵێی عەرەبێکی دەشتەکیی « عێراقچیی » نووسیوێتی و فێری زمانی کوردیی بووە!
هەروەها، هێندێ کۆپلەی لە نووسینەکانەوە وەرگرتووە، بە شێوەیەکی دەسپاکانە نەیگواستوونەتەوە. با بزانین، چۆن؟!!

## 2/2. هەڵەی چاپ :

« بەرزنجیی »، سیپارەکەی هێندە بە پەلە نووسیوە و چاپکردووە، وای زانیوە، گەر زوو وەلام نەداتەوە، چاوی خوێنەر بەو « بەرزنجیینامە »یە ڕوون نەکاتەوە، ئیدی لە لایەکەوە، « زێوەر » لە گۆڕەکەی خۆی سەر دەردێنێ، یەخەی دەگرێ و گلەیی لێ دەکا. لە لایەکی دیکەشەوە، هەم دینگە سەرەکییەکانی بیری قرچۆک و نامۆی « عێراقچێتیی » دەلەقێ و دەتەپێ. هەم خێرا لە جێی ئەو، دەوڵەتێکی کوردیی لە

باشووری کوردستان دادەمەزرێ! لەبەرئەوە، فریای ئەوە نەکەوتووە، دوای تایپکردنی سیپارەکەی، کەمێ بە نووسینەکەی خۆیدا بچێتەوە، هەڵەکانی چاپی لێ بژارکا. بۆیە، بە دەیان هەڵەی چاپی تێدایە. بۆ نموونە: « سایسی، هربەدەر، گوزەرانیا، هوکمەت، تاوتۆ ، مامستا، گوزەرانیا، سەنگەرکورینی، کست و کاڵ، لاکردا، رەش دەچۆرێوە، بەچەنشنی، ناتەواوەی، لەناوەڕساتی، تروکیاو، بڕوودا، بێگومان، تەمموز، کۆتۆ زنجیر، نمەونەی، وا دیامر، هەڵنگارێ، تاوتۆو ... تاد»

## 3/2. ووشـەی بیانیی :

لای خۆی، دەورویەری سی ساڵێ دەبێ، مامۆستای خوێندنگەی سەرەتاییە. وانە بە منالانی کورد دەڵێتەوە و فێری زمانی کوردییان دەکا. خۆشی بە نووسەر دادەنێ، چەندین گوتار و نامیلکەی بڵاوکردۆتەوە. کەچیی، تازە بە زمانێکی تێکەڵی نیوە کوردیی ــ عەرەبیی دەنووسێ. هەر دەڵێی، مەلای مزگەوت و نووسەرە کلاسیکییەکانی کوردە، بە هەڵە لە سەدەی بیستدا لەدایکبووە! لە هێندێ شوێنیشدا، دەڵێی فەرهەنگی زمانی « کوردیی ــ عەرەبیی »، بۆ منالانی کورد داناوە. چونکە، واتای هێندێ ووشەی کوردیی، بە عەرەبیی نووسیوە، تا برا کوردەکانیشی لە کوردییەکەی بگەن. وەک ئەوەی، تەنیا هەر خۆی، واتای ئەو ووشانە بە کوردیی بزانێ!

جگە لەوەی، پێویستی نەدەکرد، ئەو هەموو ووشە بیانییانە بەکاربێنێ، چونکە، واتاکانیان زۆر لە مێژە، لە زمانی کوردییدا هەن. لە هەمان کاتیشدا، نەیزانیوە یا نەیتوانیوە، کوردییەکەی بە شێوەیەکی گونجاو بەکاربێنێ. بۆ نموونە: ئەم ووشە بیانییانەی، چەندین جار لە سیپارەکەیدا دووبارەکردۆتەوە. « شاعیر، زوڵم، مولحەق، قەدەرێک، حوکم، مەلیک، هاوسنف، قەڵەم، ڕادە، ئەدەب، حورمەت، قەبر، ئیفاع، حەرام، وەفا، کامیل، دنیا، عونسور، منەوەر، ئەمەل، عیبرەت، قەریحە، وەکیل، ڕەئیس، ئیعلان، ویقار، ئاغر، شەمع، عەسر، مەجلیس، لەعنەت، قەسەمخۆر، زەڕە، ختورە، فەرد، قەوم، عادیلانە، فەزا، تورەقی، سیارە، مەسائیل، الوضع السائد، وەزع، حوکمڕان، ئیدارە، زەمان، حاڵەت، منافق، محسنات البدیعیە، ئینکار، مانا و مەعنا، مجرد، تعیلمی، حکومەت، خەیاڵ، کتێب، ئەمانەت، عەشایەر، مەرکەزی، تەماع، خزمەت، نەفسیەت، قانون، تەبعی، تورەهات،، ئانی، مستجدات، علم الممکنات، یعنی، تەجاوز، بۆرە ثوریە، العمق الاستراتیجی، حرب طویلە الامد، اضرب و اهرب، سەعات، موحاکەمە، نوور، مسایەرە، مهادەنە، کەیف، مولتەزیم، مەسەلە، واقیع، حەسرەت، ڕەفز، قەدح،

مەحەک، ساحە، حیزب، تۆمەت، مەیدان، ئینساف، لامەرکەزی، عوسبە، لغات محلیە، زاتی و موضوعی، موقەتتەر، فاحیشە، ردالاعتبار، وەتەن، شەتر، عەجز، ئەخیر، حەڵاڵ، عەزرەت، ئاقیبەت، تەحلیلات، تەجرەبە، کەسیف، زەلیل، جومعە، ئەحواڵ، زەحمەت، خاتر، مەنطیق، سەقەت، دار المعلمین، تەمووز، حەقیقەت، ئیجاب و سلبی، ئیشارە، مستوسف، خەفەر، لزوم، مەحزەر، تەسلیم، ثقافە، مکافئە، عەریزە، اسنحالە، متواضع، واسیتە، الریاح هبت بما لا تشتهی السفن، حیساب، وەحشی، حوکم زاتی، غەیرە، ماقولیەت، شەرەف، ناموس، منطقە، ئەسڵ، حاڵی، لەوحە ... تاد » جا، گەر کوردییەکی باشی بزانیایە، چۆن ئەو هەموو ووشە بیانییانەی بەکاردێنا؟! باشتر نەبوو، لە بری ئەوەی خۆی ماندووکا و ئەم شاکارە بەرزە بنووسێ، کەمێ خۆی فێری زمانی نووسین بکردایە، تا کەڵکمان لە زانیارییەکانی وەرگرتایە!

## 4/2. ڕێنووس:

دەربارەی ڕێنووسی زمانی کوردیی، تا ئەوڕۆ گرفتێکی زۆرمان هەیە. چونکە، کورد وەک هەرگیز، لە هیچ شتێکدا یەککگرتوو نەبووە و نییە، هەروەها، لە ڕێنووسەکەشیدا، هەر یەککگرتوو نەبووە و نییە. بۆیە، لێرەدا ناچاردەبم، کەمێ بە درێژیی لەو باسە بدوێم. هێندەی پێوەندیی بە وەڵامەکەی « بەرزنجیی »یەوە هەبێ، لە سەرەتادا ڕوونیکەمەوە.

(بە باوەڕی من، لەبەرئەوەی نووسینی کوردیی، هێشتا بە تەواویی یەکی نەگرتووە، بۆیە، هەر نووسەرێ چۆنی بوێ، وا دەنووسێ. لەبەرئەوە، ئەوڕۆ سێ جۆر ڕێنووس لە نووسینی کوردییدا بەدیدەکرێ:

1. ڕێنووسێ، بنچینەکەی لە سەر چاوگ دامەزراوە. وەک ئەوەی هەر ووشەیەک، گەر چاوگ بوو، بەسەریەکەوە دەنووسرێ. گەر، وەک کرداریش بەکارهێنرا، ئەوا ڕەگەکەی بە جیا و کردارەکە بە جیا دەنووسرێن. واتە: هەموو ووشەیەک، جگە لە چاوگ، بە جیا دەنووسرێ، بێ ئەوەی، گوێ بە واتاکەی بدرێ. بۆ نموونە:

« پاککردن، چاککردن، بانگکردن، هەڵوەشاندنەوە، هەڵگێڕانەوە، خۆتێهەڵقورتاندن، تێداچوون، ... تاد ». ئەمانە هەموویان چاوگن، پێویستە، بەسەریەکەوە بنووسرێن. بەڵام، کاتێ گەردانیاندەکەین و بە شێوەی کردار بەکاریاندێنین، وایان لێدێ: « پاکم کردەوە، پاکی کردەوە، پاکیان کردەوە، پاکی دەکەمەوە، پاکی دەکاتەوە، پاکی دەکەنەوە. هەڵم وەشاندەوە، هەڵی وەشاندەوە، هەڵیان وەشاندەوە، هەڵی دەوەشێنمەوە، هەڵی دەوەشێنێتەوە، هەڵیان

دەوەشێننەوە. خۆم تێ هەڵ قورتاند، خۆی تێ هەڵ قورتاند، خۆیان تێ هەڵ قورتاند، خۆمی تێ هەڵ دەقورتێنم، خۆی تێ هەڵ دەقورتێنێ، خۆیانی تێ هەڵ دەقورتێنن ». هەروەها، بۆ ووشەکانی دیکەش، هەر بەو شێوەیە دەبێ. لێرەدا دەبینین، لە هەموو ووشەکاندا، ڕەگی چاوگەکە یەک شتە، وەک « پاک و هەڵ ». ئەویش بەگوێرەی « کات، بکەر، تاک و کۆ » پاشگری وەک « ی ، م ، یان » وەردەگرن و واتای ووشەکان دەگۆڕێن.

2. ڕێنووسێ، بنچینەکەی لە سەر واتای ووشە دامەزراوە. وەک ئەوەی هەر ووشەیەک، گەر واتایەکی تایبەتیی ببەخشێ، بێ ئەوەی گوێ بە سیستێمی چاوگ و ڕەگەکەی بدرێ، هەمووی پێکەوە دەنووسرێ. واتە: گەر چەن ووشەیەک، یەک واتایان بەخشی، لە تەنیشت یەکدییەوە دەنووسرێن. بۆ نموونە:« پاککردنەوە یا پاککردن ـ پاکمکردەوە، پاکیکردەوە، پاکیانکردەوە. پاکیدەکەمەوە، پاکیدەکاتەوە، پاکیدەکەنەوە. هەڵوەشاندنەوە ـ هەڵموەشاندەوە، هەڵیوەشاندەوە، هەڵیانوەشاندەوە، هەڵیدەوەشێنمەوە، هەڵیدەوەشێنێتەوە، هەڵیاندەوەشێننەوە. خۆتێهەڵقورتاندن ـ خۆمتێهەڵقورتان، خۆیتێهەڵقورتان، خۆیانتێهەڵقورتان، خۆمیتێهەڵدەقورتێنم، خۆیتێهەڵدەقورتێنێ، خۆیتێهەڵدەقورتێنن ». ئیدی بەو شێوەیە، ئەم سیستێمە، بۆ هەموو ووشەکانی دیکەش پێڕەودەکرێ.

بۆ ئەوەی، بەگوێرەی ئەم سیستێمە، هەموو ووشەکان بە ڕاستیی بنووسین، گەر نەمانزانی، ووشەیەک چۆن دەنووسرێ، پێویستە، بۆ چاوگەکەی بگەڕێینەوە. پاشان ورديکەینەوە. بۆ نموونە : ووشەی « هەستان ـ هەستاندن یا هەڵسان ـ هەڵساندن » چاوگە. گەر بمانەوێ، بە پێی کردارە جیاوازەکانی و کات بینووسین، بەم شێوەیە دەبێ: « هەستام ـ هەڵسام، هەستا ـ هەڵسا، هەستان ـ هەڵسان. هەڵدەستم ـ هەڵدەسم، هەڵدەستێ ـ هەڵدەسێ، هەڵدەستن ـ هەڵدەسن. هەڵمسێنە، هەڵیسێنە، هەڵیانسێنە. هەڵمسێنن، هەلیسێنن، هەڵیانسێنن ». بەلام، هێندێ کەس دەنووسن: « هەڵمبستێنە، هەڵیبستێنە، هەڵیانبستێنە. هەڵمبستێنن، هەڵیبستێنن، هەڵیانبستێنن ... تاد ». بە باوەڕی من، ئەم شێوازەی دوایییان، جگە لەوەی لە سەر زبان قورسە، بە هەڵەش دادەنرێ، چونکە چاوگەکە لە بنەڕەتدا، پیتی « ب » تێدا نییە، لەبەرئەوە نابێ، ئەو پیتە زیادکرێ.

3. هێندێ نووسەر، هەر دوو شێوەکەی پێشوو تێکەڵاودەکەن. وەک ئەوەی، ووشەی پاککردنەوە، جارێ بە شێوەی چاوگ دەنووسن، جارێکی دیکەش، لە سەر بنچینەی واتا بەڕێوەدەبەن. لەبەرئەوە، هێندێ جار دەنووسن، « پاکی دەکەمەوە »،

لە هێندێ شـوێنی دیکەشـدا دەنووسن، « پاکـیـدەکـەمـەوە ». واتە: لە نووسینەکانیاندا، دوو جۆرە ڕێنووس پێڕەودەکەن. ئەم شێوازە لە هیچ ڕوویەکەوە ڕاست نییە. چونکە، پتر سەر لە خوێنەر و نووسەرە لاوەکانمان دەشێوێنێ.) «426-424،28».

هەروەها، (هێندێ کەس هەن، دەیانەوێ، پێڕەوی ڕێبازی ڕێنووسی نوێ بکەن. بەڵام وا دیارە، زۆربەیان بە تەواویی، لە زمانی کوردییدا شارەزا نین. بۆیە، گوێ بە هیچ ڕێوشوێنێکی ڕێزمان و زمانەوانیی نادەن. ئەز پێمـوایە، نابێ، هەر لە پێناوی ئەوەی بەسەریەکەوە بنووسین، ئیدی هەرچی لە زمانەکەماندا هەیە، بە سەر یەکدیدا بیانترشێنین و گوێ بە هیچ نەدەین. بۆ نموونە:
نابێ بنووسین، کارەکەیبەئەنجامگەیاند، بەڵکوو دەبێ بنووسین، کارەکەی بە ئەنجامگەیاند. هەروەها، ئیشەکەیجێبەجێکرد ـــ ئیشەکەی جێبەجێکرد. زۆربەی نووسەران، « ئەمشەو، یەکەمجار، کەمجار ... » بەم شێوەیە دەنووسن، بەڵام وەنەبێ، گەر زۆربە کارێکیانکرد، ئیدی هەڵە نەبێ! چونکە، هەر یەکێ لەو زاراوانە، لە دوو ووشەی جیاواز پێکهاتوون. وەک: « ئەم » و « شەو »، « یەکەم » و « جار »، « کەم » و « جار »، کە هەر یەکەیان پێناسەی تایبەتیی خۆیان هەیە. « ئەم » ناوی هێمایە، « شەو » ناوە و بۆ کات بەکاردێنرێ. « یەکەم » ژمێرەیە و بە ئاوەڵناو دادەنرێ و « جار »یش هەروەها. « کەم » ئاوەڵناوێکە باسی شتێکی دیکە دەکا، « جار » بۆ ژماردن دەبێ. لەبەرئەوە دەبێ، بە جیا بیانووسین. جا گەر وا نەبێ، ئەدی بۆچی بەسەریەکەوە نانووسین: « ئەوشەو، دووەمجار، زۆرجار، هێندێجار ... »
لەوانەیە، هێندێ بڵێن: ئەدی زاراوەی « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ »، بۆ بەو شێوەیە دەنووسرێ؟ سەرەتا دەبێ، بزانین، ئەمە لە کوێوە هاتووە؟ « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ » بارێکی جیاوازی تایبەتیی خۆیان هەیە. چونکە « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ » ووشەیەکی لێکدراوە، لە « ئەم یا ئەو » و « ڕۆژ » پێکهاتووە. بەڵام، پیتی « ژ » قرتێنراوە، کورتکراوەتەوە و وەک ووشەیەکی نوێ داتاشراوە، تا « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ »ی لێ دەرچووە. ئەو چەن نموونەیەی پێشووش، بە چەن ووشەیەکی لێکدراو و داتاشراو دا نانرێن!
تەنانەت، کاتێ بە سەریەکیشەوە دەنووسین، بە هیچ شێوەیە نابێ، « ناو، ڕاناوی سەربەخۆ، کردار، ئامرازەکانی پێوەندیی و لێکدەر »، پێکەوە بلکێنین. چونکە، ئەو کاتە، جیاوازیی لە نێوان ئەو ووشە گرنگانەی زماندا نامێنێ، بەڵکوو

دەبێ، هەر یەکەیان بە جیا بنووسرێن. بۆ نموونە: « سولەیمانیخۆشە، عەلیقۆزە، لەدوورەوەهاتم، هانی جوانڕۆمـدا. « ئەم شـێوە ڕێنووسـە هەڵەیە و نابێ، بەم شـێوەیە بنووسـین. چونکە، گـەر وا بنووسـین، دیارە تەنیـا دەمـانەوێ، ئەوە بسەلمێنین، ڕێنووسێکی نوێمان بۆ زمانی کوردیی داناوە!!! ئەم پێکەوە نووسینانە، بە گوێرەی « ڕاناوەکـان، پیتـەکـان، پێشـگر و پاشگرەکـان، ناوی مرۆڤ، ئاژەڵ، باڵندە، ڕووەک، جێگە « دەگۆڕێ. دیارە، هەر چی ناوی « مـرۆڤ، ئاژەڵ، ڕووەک، شتومەک و کەلوپەل « هەیە، بەسەریەکەوە بنووسرێن، گەلێ جوانتر و باشترە. هەر چەندە، لە چەن پیت و ووشـەیەکیش پێکهاتبن، هەر یەک واتا دەگەیەنن. وەک: « دڵئارام، کرێکار، جگەرخوێن، جاڵجاڵۆکە، هەزارپێ، شەنگەسوورە، دارکونکەرە، لاولاو، شاتوو، تووترک، گۆیژەڕەشـە، حێلومـێخەک، ملوانکە، بازیبەند، پلپلە، سیاچەمانە، ئاویسەر، تەنگیسـەر، چلچرا، بەرگەسـەرین، گوڵدان ...تاد « نـەک: « دڵ ئارام، کرێ کار، جگەر خوێن، جاڵ جاڵۆکە، هەزار پێ، شەنگە سوورە، دار کون کەرە، لاو لاو، شا توو، توو ترک، گۆیژە ڕەشە، حێل و مێخەک، مل وانکە، بازی بەند، پل پلە، سیا چەمانە، ئاوی سەر، تەنگی سەر، چل چرا، بەرگە سەرین، گوڵ دان ... تاد «.)«428-427،28«

جا گەر ئێستە، سەرنجێکی ورد، لە سیبارەکەی « بەرزنجیی « بدەین، زۆر بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ، هیچ جۆرە ڕێنووسێکی پێڕەو نەکردووە. بەڵکوو، تەنیا هەر بە شێوەیەکی هەڕەمەکیی دایگرتۆتەوە، وەک بڵێی، ڕێنووسێکی تایبەتیی داناوە! بە ئارەزووی دڵی خۆی، « ئامرازەکانی پێوەندیی و لێکدەر، ناو و ڕاناوی لکاو و نەلکاو ی پێکەوە نووساندووە، بێ ئەوەی، نیشانەکانی خاڵبەندییشی بەکارهێنابێ! جگە لەوەی، شارەزای ڕێنووسی کوردیی نوێ نییە، لە زۆر جێگەی نووسینەکەشیدا ویستوویەتی، وا خۆی بنوێنێ، دەسەڵاتی بە سەر ڕێنووسی کوردیی نوێدا دەشکێ. بۆیە، لەو شوێنانەی پێویستبووە، بەسەریەکەوە بنووسێ، بە جیا نووسیوێتی. لەو شوێنانەشدا پێویست نەبووە، بەسەریەکەوە بنووسێ، بەسەریەکەوە نووسیوێتی! لەبەرئەوە، هەڵەیەکی زۆری کردووە. لێرەدا، چەن نموونەیەک لە سەر هەڵەکانی دێنمەوە و شێوە ڕاستەکانیشی لە بنەوە دەنوسم:

(لەو منەوەرو شاعیرانەی بەدەوری شێخەوەبوون.)«7،3«

لەو منەوەر و شاعیرانەی، بە دەوری « شێخ «ەوە بوون.

(کێ فەرمان و ئاگادرای و ڕێنمایی یەکانی دەسەڵاتی تازەی بەکوردی دەکردو تیابڵاودەکردەوە؟)«7،3«

کێ فەرمان و ئاگادرایی و ڕێنماییەکانی، دەسەڵاتی تازەی دەکرد بە کوردیی و بڵاویدەکردەوە؟
(کەشێخ تیاهاتەوە ناوشار)«8،3»
کە « شێخ » تیا هاتەوە ناو شار. جگە لەوەی نازانم، ئەوە چۆن کوردیی یەکە، تیا هاتەوە؟ ڕاستر وایە، بینووسیایە: کە « شێخ » هاتەوە ناو شار.
(ئەمە بۆ خۆی شیعرێکی سیاسی وەهایە کەئەوسێ دێرە هاوتایی دەیان پەڕەی وتارێکی مێژوویی و سایسی دەکات.)«15،3»
ئەمە بۆ خۆی، شیعرێکی سیاسیی وەهایە، کە ئەو سێ دێرە، هاوتای دەیان پەڕەی وتارێکی مێژوویی و سیاسیی دەکات.
(شاعیرانی کورد هەتا بیستەکانی ئەم چەرخە تێکڕا لەسەر ئەوە کۆکبوون کەدژ بەبێگانەی داگیرکەرو هەواداری قەوم و میللەتەکەیانبن)«16،3»
شاعیرانی کورد، هەتا بیستەکانی ئەم چەرخە، تێکڕا لە سەر ئەوە کۆکبوون، کە دژ بە بێگانەی داگیرکەر و هەواداری قەوم و میللەتەکەیان بن.
(لامباشەو لامباشنیە)«23،3»
لام باشە و لام باش نییە.
یا لە چەن شوێنێکدا نووسیوێتی: « یەکەمجار، هیچکام، وەیا، هەربۆ، خۆکە، هەرچاوگێڕان، لەهەر، ئەوەشبکەین، کەبەهەڵەشدا، مەریواندەکات... تاد » ئەم جۆرە پێکەوە نووسینانە، زۆر هەڵەیە و دەبێ، بنووسرێ: یەکەم جار، هیچ کام، وە یا، هەر بۆ، خۆ کە، هەر چاوگێڕان، لە هەر، ئەوەش بکەین، کە بە هەڵەشدا، مەریوان دەکات... تاد. من تێ ناگەم، چۆن ناوی شارۆچکەیەکی گەورەی وەک « مەریوان » بە کردارەوە دەلکێنرێ؟!! لە ڕێنووسی کوردییشدا وە نەبێ، زۆر شارەزابێ. نەخێر، بەڵکوو تا بڵێی، کۆڵ و هەژارە. بۆ نموونە: هێندێ ووشەی وەک: « تەرازوو، ئەلفوبێ، بریتانیا، بەڕێوەبەرێتیی یە کوردیی یەکەی، دەرگە یا دەرگا، ئاوا، ئاواتخواستنێکی ... تاد » بەم شێوەیە نووسیوە: « ترازوو، ئەلفبا، بەریتانی، بەڕێوەبردنە کوردیەکەی، درگە، ئاوها، ئاواتە خواستنێکی ... تاد »
هەروەها، هێندێ ناوی بە ڕێنووسی کوردیی و زۆربەشیانی، بە ڕێنووسی عەرەبیی نووسیوە. وەک: « حسین محمد عزیز، نوری، عبدالمحسن السعدون، عمر معروف بەرزنجی، سعید قزاز، رفیق حیلمی ... تاد » بە کوردیی بەم شێوەیە دەنووسرێن: « حوسێن مەحەمەد عەزیز، نووریی، عەبدولموحسین ئەلسەعدون، عومەر مەعروف یا مارف بەرزنجیی، سەعید قەزاز، رەفیق حیلمیی ».

ئامرازی لێکدەری « و »، هێندێ لە ئامرازەکانی پێوەندیی وەک « لە، بە ی بە وشەکانەوە نووساندووە. هێندەی من ئاگام لێ بێ، لە هیچ زمانێکی جیهاندا، ئەو ئامرازانە بە « ووشە، ناو، راناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمان و کردار »ەکانەوە نالکێنرێن، تەنیا لە زمانی عەرەبییدا نەبێ، هێندێ لە ئامرازەکانی وەک « ب » بە هێندێ ووشەوە دەلکێنرێن. بۆ نموونە: « ب + واسطه = بواسطه. ب + العربی = بالعربی ... تاد » ئەگینا، ئامرازەکانی دیکەی وەک: « لا، ما، لیس ... تاد » گشتیان بە جیا دەنووسرێن. بۆیە، نەک هەر ئەو، بەڵکوو زۆربەی نووسەرانی باشوور، ئەو ئامرازانە بە هەڵە و بە چاولێکەریی لە عەرەبەکان پێکەوەدەلکێنن. بە تایبەتیی، ئەمە لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا، زۆر بە زەقیی دەبینرێ. بۆ نموونە: ئامرازی پێوەندیی و لێکدەری، لەگەڵ هەموو پێکهاتەکانی گرامەری کوردییدا بەکارهێناوە، وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ: « لەوەلامی، لەناو، لەنەشارەزایی یەوە، لە1969، لەژێر، لەسەر، لەژمارە، لەرێی، لەدیوانەکەیدا، لەپرۆگرامی، لەمێشکیاندا، لەراستی دا، لەسەروساختی، لەسەرەتای، لەمولەحەقی، لەقەڵەمی، لە سایەی، لەئەزموونی، لەباوەش، لەژوور، لەرابردوو، لەبەر، لەمامۆستا، لەرێگای، لەدڵسۆزی، لەپەنجا، لەزوبان، لەدنیای، لەسەربەستی، لەروشدیەی عەسکەری، لەسلێمانی، لەقوتابخانە، لەدەربەدەری، لەشاردا، لەدەردیسەری، لەبارودۆخێکی، لەبەندی و ئەسارەت، لەسودی، لەلادێیەتە، لەهەموانە، لەرووی، لەپێشەکییەکەی، لە پێناوی، لەشیعر، لەمەسائیل، لەدوقای، لەلای، لەداخ، لەهەندێ، لەروو، لەسونگەی، لەکوردستان، لەمێژووی، لەمزگەوتی، لەساحەی، لەیەک، لەناوەراستی، لەسەرچنار و ... تاد »

جگە لەوەی، ئامرازی « لە » بە جیا دەنووسرێ، رێنووسی هێندێ لە ووشەکانی دیکەشی هەر هەڵەیە. بۆ نموونە: لەسەربەستی ـ لە سەربەستیی. لەروشدیەی عەسکەری ـــ لە روشدیی یەی عەسکەریی. لەسلێمانی ـــ لە سلێمانیی. لەدەربەدەری ـــ لە دەربەدەریی. لەدەردیسەری ـــ لە دەردیسەریی.

سەیر ئەوەیە، لە رێنووسی نوێدا، هێندە ناشارەزایە، ئەوەی پێویستە، پێکەوە بینووسێ، بە جیا دەینووسێ و بە پێچەوانەشەوە. بۆ نموونە: لەراستی دا. « لە » وەک ئامرازێکی پێوەندیی سەربەخۆ، بە جیا دەنووسرێ. بەڵام، پاشگری « دا » بێ ووشەی « راستی » هیچ نییە و هیچ ناگەیەنێ. هەروەها، « راستی »ش بە دوو « ی » دەنووسرێ. کەواتە دەبێ، بنووسین: لە راستییدا.

ئایا، لە زمانی کام نەتەوەی جیهاندا، ئامرازە پێوەندییەکان، بە ناوی « مرۆڤ،

وولات، شار، جێگە، کەلوپەل، ئاژەڵ، پەلەوەر ... هتد نوسینراوە؟!! کێ بیستوویەتی، کەسێ بە عەرەبیی « لەمامۆستا، لەڕوشدیەی عەسکەری، لەسلێمانی، لەقوتابخانە، لەشعر، لەکوردستان، لەسەرچنار » ئامرازەکانی پێوەندیی « فی یا من ی عەرەبیی بە ووشەکانی « معلم، روشدیە العسکریە، سلیمانیە، المدرسە، الشعر، کوردستان، سرجنار هتد بنووسێنێ؟!! یا کێ دیوێتی، لە زمانی ئینگلیزییدا، ئامرازەکانی « In, On, From, Att ... »، بەم ووشانەوە بلکێنێ؟
Teacher, Sulaimania, School, Poems, Kurdistan, Sarchnar
دەتوانم، گەلێ نموونەی دیکەش، لە زمانەکانی « ڕووسیی و سویدیی هتد بێنمەوە، بەلام، بە پێویستی نازانم. تەنیا هەر هێندە دەڵێم: مەگەر، ئەم ڕێنووسە نوێیەی ئەو بەکاریدێنێ، هەر لە دەس خۆی بێ، هەر بۆ خۆی باشبێ و پیرۆزیش بە خۆی بێ! تەنیا، هێندە هەیە، سەر لە خوێنەوارە لاوەکانمان دەشوێنێ. چونکە، کاتێ ناوی نووسەرێکی گەورەی بە توانای وەک « بەرزنجیی »، لە سەر ڕوکاری ڕۆژنامە و گۆڤارەکان یا لە سەر بەرگی سیپارەکانی دەبینن، وا دەزانن، زمانەوانێکی زۆر گەورە و شارەزایەکی گەلێ دەسڕەنگینە، نازانن، ناوی زل و دێی وێرانە!
هەروەها، ئامرازی « بە هتد » هەر بەو شێوەیە، بە هەموو ووشەکانەوە گرێداوە. وەک « بەهەمان، بەشیعر، بەقەدەر، بەسانایی، بەهێمنی، بەحەرام، بەخوێندن، بەبریناری، بەکوردی، بەدرێژایی، بەشان، بەویژدانێکی، بەڕۆژێکی، بەیەکێک، بەبێگانە، بەلای، بەحوکمی، بەتایبەت، بەئاگاداربوونێکی کەم، بەخۆیان و بەقەومەکەیان، بەمام ئینگلیز ... تاد » جگە لەوەی، لەم چەن نموونە کەمەدا، هەڵەی ڕێنووسی وەک « بە هێمنیی، بە بریناریی، بە کوردیی » تێدایە، ئەم ئامرازەش دیسانەوە، لە زمانی کوردییدا و لە هەموو بارەکاندا، هەر بە جیا دەنووسرێ.
بە هەمان شێوەش ئامرازی لێکدەری « کە »، لە هەندێ شوێندا بە ووشەکانەوە لکاندووە، لە هەمان کاتیشدا، لە سەرجەمی نووسینەکەیدا، ئەو ئامرازەی زۆر بەکارهێناوە. لە ڕاستییدا، لە هێندێ جێگەدا پێویستن و لە هێندێ جێگەی دیکەشدا پێوست نین و دەیتوانی، نەیانووسێ. چونکە ئەو ئامرازە، جگە لەوەی نووسینەکە قەبەدەکا، لە هەمان کاتیشدا، ناشیرین و ناخۆشیدەکا. بۆ نموونە: « کەزێوەر، کەباوەڕناکات، کەلەسەر، کەبڵێم، کەپیاو، کەبەرایی، کەنوشوستیش، کەئینگلیز، کەشێخ، کەببێتە، کەبەترازوویەکی، کەناوەڕۆک، کەتیا، کەلەمەرزەکاریەوە، کەدەم، کەدەڵێ، کەنێ، کەبەسودی، کەشاعیر، کەهێشتا، کەتەنیا، کەبەنەبوونی، کەکەیشتووە، ... تاد » جگە لە هێندێ هەڵەی ڕێنووسی

دیکەی وەک : « کەباوەڕناکات ــ کە باوەڕ ناکات. کـەلەسـەر ــ کـە لە سـەر. کەلەهەرزەکاریەوە ــ کە لە هەرزەکاریی یەوە. کەبەنەبوونی ــ کە بە نەبوونیی ».
کەواتە، هەموو ئەو ئامرازانە بە جیا دەنووسرێن. جا گەر وا نەبێ، کێ دیوێتی و کێ بیستوویەتی، ناوی « زێوەر، ئینگلیز، شێخ » لەگەڵ ئەو ئامرازەدا لێکدرێ و بنووسـرێ: « کـەزێوەر، کـەئینگلیـز، کـەشـێخ »؟!! لەوانەیە، « زێوەر و شـێخ » زیندووبنەوە، لە « بەرزنجـیی » زویربن و بلـێن: بابە، وازمـان لێ بێنە، نە لە سـەرمان هەڵبـەرێ و نە بانگی ناوی نوێشمـان بە گوێدا بدە! یا گەر « ئینگلیز » داگیرکەرەکان پێ بزانن، لێی تووڕەبن و بۆ « بەرزنجە »ی دووریخەنەوە!
هەروەها، زۆربەی نووسـەران، ئامرازی پێوەندیی « بێ » بە ووشەکانەوە دەلکێنن. لێرەدا یەک تێبینیی وردم هەیە. گـــــەر ناوی « مرۆڤ، زیندەوەر، شـوێن یا نازناو » بوو، ئەوا پێکەوە دەنووسرێن. وەک: « بێگەرد، بێکەس، بێخوود، بێخاڵ، بێکڵاس ... تاد » بەڵام، گـەر هاتوو، « کردار، ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمـان » بوو، ئەوا پێویستە، بە جیا بنووسرێن. بۆ نموونە: « بەرزنجیی » نووسیوێتی: « بێگەردانەی، بێگومـان ... تاد » راسـتەکـەی ئەوەیە، بنووسین: « بێ گەردانەی، بێ گومـان ». چونکە، هـەر دوو ووشـەکە جیـان و سـەربەخۆن، هەر یەکەشیان بە جیـا، واتای تایبـەتیی خـۆیان دەگـەیەنن. لە هیچ زمـانێکیـشـدا، بەو شـێوەیە نانووسـرێن و ئامرازەکانی نێگێتیف بە جیا دەنووسرێن.
هـەروەها، هێندێ لـە نووســـــەران، ئـامـــــرازی لێکدەری « و »ش، بە کـــۆتـایی ووشەکانەوە دەلکێنن. بەڵام، ئەوە بە هیچ جۆرێ ڕاست نییە و بە هیچ ووشەیەکەوە نالکێنرێ. (هەر چەندە، نووسەران زوو پێکیانەوە دەلکان. وەک: منو دارا ــ من و دارا. کۆمەڵی هونەرو وێژە ــ کۆمەڵی هونەر و وێژە. )«432،28»
« بەرزنجیی » زۆربەی زۆری واوەکانی بە کۆتایی ووشەکانەوە نووساندووە. وەک: « نەکراوەو، دەگرێتەوەو، تەڕو، سرروودو، خوێندوویانەو، بهاتایەو، ڕێزو نەوازش، منەوەرو، برغوو پارچەو، دایمەزراندو، بەرزنجەو، زێوەرو ... ». هەموو ئەو ئامرازە لێکدەرانەی « و »، دوو ووشـە یا دوو ڕسـتـەی جیاواز پێکەوە دەبەسـتن. لەبەرئەوە نابێ، بە یەکـێکیانەوە بلکێنرێ و ئەوی دیکەیانی لێ دوورخرێتـەوە، بەڵکوو دەبێ، لە ناوەڕاسـتی هەر دوو ووشـەکـە یا ڕسـتـەکـەدا بنووسرێ. ئەم پرینسیپەش، لە هەموو زمانەکانی جیهاندا پێڕەودەکرێ. بۆ نموونە: لە زمانی عەرەبییدا احمد و محـمـود، لە زمـانی ئینگلیـزییـدا Ali and Zaki، لە زمـانی ڕووسـیـیـدا Xycceun u Xaccan و لە زمانی سویدییدا Aras och Azad دەنووسن.

گەر شێوەی نێگێتیڤ، لە ناوەڕاستی ووشەدا بوو، پێکەوە نانووسرێن. بۆ نموونە: « بەرزنجیی « نووسیوێتی: « واینەکرد، لەقنەبوو ... تاد « ئەم شێوە نووسینە، نە بە ڕاست دادەنرێ و نە بە ڕێنووسی نوێش دەژمێررێ. بەڵکوو هەڵەیە و دەبێ، بەم شێوەیە « وای نەکرد، لەق نەبوو « بنووسرێ.

دەربارەی ئەو ووشانەی لە زمانـــی کوردییدا، بە دوو « و « یا بە دوو « ی « یا پتر دەنووسرێن، لێرەدا، چەن شتێ ڕووندەکەمەوە. چونکە، زۆربەی نووسەران، گوێ بەم باسە گرنگە نادەن. هەر وەک، هەمووومان دەزانین، (هەموو ووشەیەک، لە چەن پیتێ پێکهاتووە. گەر هەر ووشەیەک، بە « و « دەستپێبکا، پێویستە بە دوو « و « بنووسرێ. وەک « ووزە، ووژە، ووڕە، ووشە، وورشە، وون، ووتن، ووتار، وولات، وونجڕوونجڕ و ... تاد «. بەلام، لە ساڵەکانی حەفتادا، « کۆڕی زانیاریی کورد « بڕیارێکیاندەرکرد، گوتیان: ئەو ووشانەی سەرەتاکانیان بە دوو « و « دەستپێدەکا، تەنیا بە یەک « و « بنووسرێن. چونکە، هیچ ووشەیەکی کوردیی بە یەک « و « دەس پێ ناکا. ئەم بڕیارەی « کۆڕ « دەریکرد و ئەندامەکانی خۆشیان، ئێستە پێڕەوی ناکەن، یا بیریانچۆتەوە، بۆ نووسەرەکە خۆی دەگەڕێتەوە، بە هەر شێوەیەکیان بنووسێ، هەڵە نییە. بە باوەڕی من، بە دوو « و « بنووسرێ، گەلێ جوانتر و ڕێکوپێکترە. لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ نووسین یەک « و « ئاسانترە. بەلام، گەر پیتی « و «، لە ناوەڕاستی ووشەکەدا هاتبوو، لە نێوان دوو پیتی کۆنسونانتدا بوو، ئەوا دەنگەکە درێژ دەبێ و بە دوو « و « دەنووسرێ. وەک: « ئابووریی، بوون، پووڵ، چوون، خووڵ، ڕوون، ڕووسیا، ژوور، سوور، سووریا، قووڵ، کوورە، لووڵ، لووڕ، نووسین، نووستن و ... تاد « هەروەها، گەر هەموو ئەو « و «انەی لە نێوان دوو پیتی ڤاوڵ یا پیتێکی کۆنسۆنانت و یەکێکی دیکەی ڤاوڵدا دێن، ئەوا تەنیا بە یەک واو دەنووسرێن. وەک « خواردن، خواردنەوە، خەوتن، زوێر، زەوی، ڕەوین، ڕەوەند، ڕێوی، ڕێواس، ساوەر، گەوەڕ، لەوەڕ ... تاد «. یا کاتێ، هەر ووشەیەک، بە « و « کۆتاییدێ، لە دوای پیتی کۆنسۆنانتەوە دێ، دیسانەوە بە دوو « و « دەنووسرێ. وەک « بەڕوو، پەموو، توو، چوو، خوو، دوو، ڕابردوو، ڕوو، زوو، سنجوو، شوو، فوو، قوو، لوو، مازوو، موو، هەموو و ... تاد «. مەگەر، ووشەکە کۆتایی بە پیتێکی ڤۆکاڵ هاتبێ.)«28،434-435«

هەروەها، لە زمانی کوردییدا، زۆر ووشە و ناو هەن، بە دوو « و « دەنووسرێن و زۆربەی نووسەران پێڕەویدەکەن. بەلام، « بەرزنجیی « هەر بە یەک « و « نووسیونی. وەک: « مەحمود، هەمو، بەڵکو، دەرون، باشور، ئەزمون، ... تاد «.

دەربارەی بەکارهێنانی پیتی « ی » و جیاکردنەوەی لە « ی » ئامرازی پێوەندیی، لێرەدا زۆر بە پێویستی دەزانم، چەن خاڵێکی گرنگ باسکەم. چونکە، زۆربەی ئەو وشانەی لە زمانی کوردییدا، بەو پیتە کۆتایی یان دێ، بەپێی بەکارهێنان و واتای وشەکە لە ڕستەکەدا دەگۆڕێن. (بۆ ئەوەی، پیتی « ی » لە ڕێنووسی کوردییدا، بە شێوەیەکی ڕاست بنووسین، تا بزانین، لە کوێدا یەک، یا دوو، یا سێ « ی » بە دوای یەکدیدا دێن، لێرەدا چەن نموونەیەک پێش چاو دەخەین. هەر کاتێ پیتی« ی »، لە سەرەتای وشەوە هات، هەمیشە بە یەک « ی » دەنووسرێ. وەک:
« یار، یاد، یاوەر، یەزدان، یەدەک و ... تاد).
گەر پیتی « ی »، لە دوای ناوی « مرۆڤ، شت، جێ » یا ئاوەڵناوێکەوە هات، ئەوا هەر بە یەک « ی » دەنووسرێ. وەک: « شێخ مەحموودی نەمر. حوسێنی کورد. زایندەی سولەیمانییە. دانیشتووی کوێستانە. خەڵکی گەرمیانە. ئاسنی سارد، ئاوی گەرم ».
هەر کاتێ، باسی جێگەی لە دایکبوونی یەکێکمان کرد، یا نازناوی جێگەیەکمان دیاریکرد، ئەوا بە دوو « ی » دەنووسرێ. وەک: « کۆیی، شارەزووریی، بەغایی، کوفیی، ئینگلیزیی، ڕووسیی ... تاد ». هەروەها، ئاوەڵناوەکانیش کۆتایی یان بە دوو « ی » دێ. بۆ نموونە: « خڕیی، چوارگۆشەیی، لاکێشەیی، سەروەریی، سەربەرزیی، نزمیی، بەرزیی، گەرمیی، ساردیی، پانیی، درێژیی و ... تاد »
بەلام، کاتێ پیتی « ی »، لە ناوەڕاستی وشەیەکدا هات، دوو باری تایبەتیی وەردەگرێ و بەپێی پیتە ڤاوڵ و کۆنسۆنانتەکان دەگۆڕێ. گەر لە نێوان دوو پیتی کۆنسۆنانتدا بوو، ئەوا بە یەک « ی » دەنووسرێ، وەک: « بارین، هاڕین، ڕیچ، ژیژک، شیلان، فیکە، لیر، لیرە، میز، هەڵمین، هیزە، ویڕە و ... تاد ».
گەر لە نێوان دوو پیتی ڤاوڵ یا پیتێکی ڤاوڵ و یەکێکی دیکەی کۆنسۆنانتدا بوو، یا گەر پیتی « ی »، خۆی لە وشەکەدا هەبوو، ئەوا هەر بە دوو « ی » دەنووسرێ. وەک : « ئایین، بییر، تییر، زایین، سییر و ... تاد ». هەروەها، گەر هەر وشەیەک، خۆی بە پیتی « ی » کۆتاییهاتبێ، بە دوو « ی » دەنووسرێ، وەک: « ئابووریی، پیشەسازیی، نەتەوەیی، نیشتمانیی، وێژەیی، هونەریی .. تاد ».
جگە لەوەی، گەر بە دوای ناودا هات، ڕۆڵی ئامرازی پێوەندیی بینی و ئاوەڵناوی پێکەوە کرێدا، یا بڵێین: گەر دوو وشە یا چەن وشەیەک، بە دوای یەکدیدا هاتن و هەموویان بە پیتی « ی » ئامرازی پێوەندیی پێکەوە ببەسرێن، ئەوا یەکەم و دووەم وشە، هەر بە یەک « ی » دەنووسرێن و دوا وشەش بە دوو « ی »

دەنووسرێ. وەک: « زمانی کوردیی - زمان + ی + کورد + یی، بزووتنەوەی نەتەوەیی ـ بزووتنەوە + ی + نەتەوە + یی، ئاماری جوگرافیایی ـ ئامار + ی + جوگرافیا + یی، ڕووداوی مێژوویی - ڕووداو + ی + مێژوو + یی، بزاڤی ڕزگاری خوازی نیشمانیی - بزاڤ + ی + ڕزگاریخواز + ی + نیشتمان + یی ... هتد »
لێرەدا دەبینین، « ی » یەکەم لە نموونەی یەکەم ـ چوارەم، ئامرازی پێوەندییە. لە دوا نموونەشدا، هەر دوو « ی » زاراوەکانی « بزاڤ و ڕزگاریخواز »، هەر بە دوو «ی » ئامرازی پێوەندیی دادەنرێن. بەڵام، هەموو جووتە « ی »ەکانی کۆتایی دوا وشەکان، « ی » ئاسایین، واتای ڕستەکە تەواودەکەن. لە ڕاستییدا، ئەمەش پێوەندییەکی توندی، بە دوا پیتی کۆتایی وشەکانەوە هەیە. بۆ نموونە: زاراوەی نەتەوە ــ نەتەوەی کورد، نەتەوەکانی جیهان، تەنیا بە یەک « ی »، باوەڕی نەتەوەیی بە دوو « ی » و ئەو هەڵوێستە نەتەوەییە، بە هەستی نەتەوەییان « بە سێ « ی » دەنووسرێن. هەروەها، وشەی زانا: زانای گەورە، زانایانی زمان، بە یەک « ی »، بە زانایی، بە دوو « ی » و ئەو کارە زانایییە، بە زانایییان سەرکەوتن، بە سێ « ی » دەنووسرێن. هەموو ئەو وشانەی، بە پیتی « ی » کۆتاییان دێ، وەک: « کوێرەوەریی، جیاوازیی، کۆمەڵایەتیی، ڕۆمانسیی »، تەنیا هـــــەر بە « کوێرەوەرییانە، جیاوازییانە، کۆمەڵایەتییانە، ڕۆمانسییانە » دەنووسرێن. بەڵام، ئەو وشانەی بە کۆنسۆنانت تەواودەبن، بە دوو « ی » دەنووسرێن و دەنگەکان درێژدەبنەوە. وەک: « بابەت ــ بابەتی ـ بابەتیی. پەت ـ پەتی ــ پەتیی. زانست ـ زانستی ـ زانستیی. سەربەست ـ سەربەستی ــ سەربەستیی. کان ــ کانی ـ کانیی. ئازاد ـ ئازادی ــ ئازادیی. هێمن ـ هێمنی ــ هێمنیی. بێ لایەن ــ بێ لایەنی ــ بێ لایەنیی. مەینەت ـ مەینەتی ــ مەینەتیی و ... تاد ». لە شێوەی یەکەمدا، تەنیا یەک « ی » و لە شێوەی دووەمدا دوو « ی » وەردەگرن. چونکە هەر یەکەیان واتایەکی تایبەتیی یان هەیە. بۆ نموونە:
« ئازاد » هەم بۆ ناو و هەم بۆ ئاوەڵناو بەکاردێ.
« ئازادی » یەکێ بە یەکێ دەڵێ: تۆ ئازادی. واتە: سەربەستی.
« ئازادیی » مەبەس لە ئازادیی مرۆ یا نەتەوەیە.
« ئازادیخواز » ئاوەڵناوە. بۆ کەسێ، کۆمەڵێ یا ڕێکخراێ بەکاردێ . هەموو ئەو وشانەی پێشوو دەبێ، بەم شێوەیە بنووسرێن: « بابەتانە، زانستانە، سەربەستانە، ئازادانە، هێمنانە، بێ لایەنانە، مەینەتانە و ... » نەک بە « بابەتیی یانە، زانستییانە، سەربەستییانە، ئازادییانە، هێمنییانە، بێ لایەنییانە،

مەهنەتییانە و ... « بنووسرێن. ئەم ووشانەش، لە سەر بناغەی مۆدێلی « کورد ـ کوردانە، مەرد ـ مەردانە » دادەڕێژرێن. تاقە مەبەس ـ تاقانە مەبەس ڕاست نییە. بۆ منداڵ دەگوترێ: کوڕێکی تاقانەیە، واتە: تاقانە ئاوەڵناوە و دوای ناو یا شت دێ، نەک پێشی بکەوێ.
هەروەها، ووشەکانی دیکەی « داهێنەر: داهێنان ـ داهێنەرانە. هونەر: هونەرمەند ـ هونەرمەندانە. سەرکەوتوو: بە سەرکەوتوویی ـ سەرکەوتووانە. ژیر: بە ژیریی ـ ژیرانە. کەر: کەرێتی ـ کەرانە. شۆڕشگێڕ: شۆڕشگێڕیی ـ شۆڕشگێڕانە. پێشکەوتووخواز: پێشکەوتووخوازی ـ پێشکەوتوخوازیی ـ پێشکەوتووخوازانە. کۆنەپەرست: کۆنەپەرستی ـ کۆنەپەرستیی ـ کۆنەپەرستانە. بەهرە: بەهرەدار ـ بەهرەدارانە: کوێر: کوێری ـ بە کوێریی ـ کوێرانە. دڵنەرم: دڵنەرمی ـ دڵنەرمیی ـ دڵنەرمانە... تاد » هەروەها « باوک ـ باوکێتی نەک باوکایەتی. میر ـ میرێتی نەک میرایەتی. ئەندامێتی نەک ئەندامەتی. بەڵام پیاو ـ پیاوەتی نەک پیاوێتی. چونکە، پیاوێتی بۆ مەبەسێکی دیکەی تایبەتیی بەکاردێنرێ. کوێخا ـ کوێخایەتی نەک کوێخێتی. کەچی هێندێ ووشەی وەک کورد دەتوانین، بە گوێرەی مەبەسە جیاوازەکانمان، بە کوردێتی و کـــــوردایەتیی بیاننووسین.
بۆ « میرێتی و پیاوەتی » ـ پتر پێوەندیی بە دوا پیتی ووشەکەوە هەیە. « میر » بە پیتێکی کۆنسۆنانتی وەک « ر » کۆتاییهاتووە. بەڵام ووشەی « پیاو »، بە پیتێکی ڤاوڵ « و » تەواببووە. دوای پیتە کۆنسۆنانتەکان دەتوانین، پیتی ڤاوڵ بۆ ئاوەڵناوەکان بەکاربێنین، وەک: « باوکێتی، میرێتی، کەرێتی، بەڕێوەبەرێتی، کوردێتی، ڕیشسپێتی و ... تاد » بەڵام، دوو پیتی ڤاوڵ بە دوای یەکدا قورسە و لە سەر زبان ڕەوان نییە.
هێندێ ووشە هەن، هەر خۆیان بە دوو « ی » کۆتاییان دێ، لە هێندێ کاتیشدا، « ی میەکی ئامرازی پێوەندیی وەردەگرن، دەبن بە سێ « ی » وەک : « شایی: شاییی لادێ. کۆتایی: کۆتاییی ساڵ. لادێ: لادێی کوردستان ـ لادێیی. واتە: خەڵکی لادێ ». بەڵام، لەبەرئەوەی جوان نییە، سێ « ی » بە دوای یەکدا ڕیزکەین، تا ئێستە، هەر بە دوو « ی » نووسیومانە.)«28،435-438»
جا ئێستە، با بزانین، لە دیوەخانی سیپارەکەی « بەرزنجیی »دا، چ باسە؟!! دەربارەی بەکارهێنانی ئامرازەکانی پێوەندیێ و لێکدەر، شێوەی بەکارهێنان و نووسینیان، دیسانەوە، ڕێنوسێکی هەڵەی بەکارهێناوە. چونکە، هەموو ئەو ووشانەی لە نووسینەکەیدا هاتوون، بە یەک « ی » نووسیونی، بێ ئەوەی گوێ بە

هیچ جۆرە پرینسیپێکی تایبەتیی یا ڕێنووسی نوێ بدا.. بۆ نموونە: « زانیاری، نیشتمانی، ناپاکی، جاشایەتی، عێراقچێتی، کوردی، کوردایەتی، کوردەواری، دڵسۆزی، بڕیتی، شارستانێتی، ئاگاداری، فارسی، عەرەبی، تورکی، عوسمانی، سەربەستی، ئازادی، پەیوەندی، حەمدی، دەردیسەری، ئاینی، کۆمەڵایەتی، مێژووی، پێشەکی، هەرزەکاری، خۆشەویستی، ستایش، خواپەرستی، سەرفرازی، بەرگری، پشێوی، پاشاگەردانی، کەم ئەزموونی، پاکی، دەروونی، ڕۆمانتیکی، ڕەوانبێژی، سروشتی، دڵداری، یەکجاری، ڕاستی، نکولی ــ نەک نکوڵی، گۆڕانکاری، کاریگەری، برایەتی، هاوسانی، هەژاری، نەبوونی، سەرپەرشتی، یارمەتی و ... تاد »

لە ڕاستییدا، هەموو ئەو وشانە، بە دوو « ی » دەنووسرێن. بە تایبەتیی، وشەی « ئاینی » لە هەر دوو جێگەکەدا، بە دوو « ی » دەنووسرێ، وەک « ئایینیی ». چونکە ئاین ــ شتێکی گشتیی یە. ئایینی ـ بۆ دیاریکردنی ئایینێکی تایبەتیی بەکاردێنرێ، وەک: ئاینی ئیسلام، ئایینی جوو، ئایینی زەردەشتیی ... تاد. بەڵام، ئایینیی ــ کاتێ بە دوو « ی » کۆتاییدێ، مەبەس لەو کەسە یا ئەو کۆمەڵەیە، کە ئەو خەسڵەتە لە خۆیان دەگرن. وەک بڵێین: شێخ عوسمانی بیارە، پیاوێکی ئایینیی بوو. بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان، ڕێکخراوێکی ڕامیاریی ئایینییە.

هەموو ئەو وشانەی لە سەرەوە پیشاندران، بەپێی بەکارهێنانیان لە ڕستەدا دەتوانرێ، بە سێ « ی » بنووسرێن. لێرەدا، تەنیا هێندێ نموونە، لە نووسینەکەی خۆی وەردەگرم. وەک: « شارستانی یەتدا، ئاگاداریەکی، بەرگری یە، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، دەرونیەوە، نیشتمانیەکان، ڕاستیە، گۆڕانکاریەکان، برایەتیە.. » ڕاستتر وایە، بەم شێوەیە بنووسرێن: « شارستانیییەتدا، ئاگادارییەکی، بەرگرییە، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لە ڕووی دەروونییەوە، نیشتمانییەکان، ڕاستییە، گۆڕانکارییەکان، برایەتییە ... تاد »

## 5/2. دارشتن :

لە ڕووی دارشتنەوە، سەرجەمی نووسینەکەی زۆر « لاواز، بێ هێز و بێ پێز » بیارە. لە زۆربەی جێگەی نووسینەکەیدا، شەقڵی دارشتنی عەرەبیی لە خۆ گرتووە. نیشانەکانی خاڵبەندیی بەکار نەهێناوە. لە ڕووی گرامەرەوە، هەڵەیەکی زۆری تێدایە. بە ڕاستیی، کاتێ ئەم چەن ڕستە لاواز و بێ سەروبەرانەی خوارەوەم خوێندەوە، بیرم لەوە کردەوە، ئەم نووسەرە گەورە ناسراوە، چەندین ساڵە دەنووسێ، بۆچی وا لە کوردییدا ناشارەزایە؟ خۆ هەر دەڵێی، لە سەر تەنوور

دانیشتووه و به دەم نانکردنەوە، قسەی ئاسایی دەکا! چونکە، هیچ جۆرە پرینسیپێکی گرامەر و دەستووری زمانی کوردیی، لە نووسینەکەیدا ڕەچاو نەکردووە. با بزانین، چۆن؟!!
بێ گومان، من لێرەدا ناتوانم، ڕستەبەڕستەی سیپارەکەی بۆ شیکەمەوە. بەڵکوو، تەنیا چەن نموونەیە لە سەر لاوازیی هێندێ ڕستەی دێنمەوە. لە هەمان کاتیشدا، لە تەنیشتییەوە یا خواریشەوە، هەڵەکانی دەسنیشاندەکەم. بۆ نموونە:
(لەناو شاعیرانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەی لە ئاوابوونە،...)«3،3»
لە ناو شاعیرانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەی لە ئاوابووندایە. یا دەتوانین، بنووسین: لە ناو شاعیرانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەی ڕوو لە ئاوابوونە.
(لەم چەندانەدا، لەژمارە یەکی گۆڤاری « ئاینده »دا، هەر بەهەمان دەستوور د.حسین محمد عزیز دیسانەوە پەخەی زێوەر دەگرێتەوەو لەڕێی کۆمەڵە شیعرێکیەوە کە لەدیوانەکەیدا « سۆزی نیشتمان " ل 102-105 » بە بریتیە لەو زانیاری و بابەتانەی کە قوتابیان لەپڕۆگرامی وانەکانی خوێندندا، لەو سەردەمە، خوێندوویانەو ئەم بۆ ئاسانکردنیان بەشیعر دایڕشتۆتەوە.)«3،3»
لێرەدا ووشەی « دیسانەوە » زیادە، چونکە پێش ئەوە نووسراوە: هەر بە هەمان دەستوور، ئەوە خۆی لە خۆیدا، واتە: دیسانەوە. گەر زیادیش نەبێ، ئەوا هەڵەیە. چونکە، پێشتر من لە سەر « زێوەر »م نەنووسیوە. بەڵکوو، یەکێکی دیکە نووسیویێتی. کەواتە دەبووایە، بینووسیایە، « هەروەها... » جگە لەوەی، گەر ووشەی « دیسانەوە »ش بەکاربێنێ، دەبێ، پێش ناوەکە بکەوێ، نەک لە دوای ناوەکەوە بێ!
لە دیوانەکەیدا « سۆزی نیشتمان" ل 102-105 »یە ، ئەمە زۆر هەڵەیەکی گەورەیە. چونکە، « دیوانەکەی » بە ووشەی « دایە »وە نالکێنرێ. تەنانەت، گەر پێکیشیانەوە بنووسێنین، نابێ لە یەکدیان دابڕین. بەڵکوو دەبێ، بەم شێوەیە بنووسرێ: لە دیوانەکەی « سۆزی نیشتمان " ل 102-105 » دایە یا لە دیوانەکە دایە، پاشان، « سۆزی نیشتمان " ل 102-105 » دێ.
هەروەها، بریتیە لە: گوزارەیەکی عەرەبیی ڕووتە، واتە « عیبارە عەن » کەواتە دەبووایە، بەم شێوەیە بینووسیایە: (لەم چەندانەدا، لە ژمارە یەکی گۆڤاری « ئاینده »دا، هەر بە هەمان دەستوور، د. حوسێن محەمەد عەزیز، پەخەی زێوەری گرتەوە و لە ڕێی کۆمەڵە شیعرێکییەوە، کە لە دیوانەکەی « سۆزی نیشتمان " ل 102-105 » دایە، لەو زانیاریی و بابەتانە پێکهاتووە، کە قوتابیان لە پڕۆگرامی

وانەکانی خوێندندا، لەو سەردەمەدا خوێندوویانە و ئەم بۆ ئاسانکردنیان بە شیعر دایرشتۆتەوە.)

(گەشتەکەی لەگەڵ پیاوانی ناودارانی شێخانی سلێمانی، بۆ لای سوڵتانی عوسمانیان و مانەوەیان لەوێ بووە هۆی فراوانکردنی ئاسۆی بیروبۆچوون و شارەزایی لەدنیای ئەو سەردەمە. تێگەیشت کەبەرایی شارستانیەتی رۆژئاوا کەگەیشتبووە ئەوێ بەخوێندن و زانست ئەنجامدراوە)«7-6،3».

پیاوانی ناودارانی شێخانی سلێمانی، بۆ لای سوڵتانی عوسمانیان. لە رووی رێزمان و رێنووسەوە راست نییە. بەڵکوو، پیاوە ناودارەکانی شێخانی سلێمانیی، بۆ لای سوڵتانی عوسمانیی یا عوسمانییەکان راسترە. بووە هۆی: عەرەبییەکی رووتە. لە یەک رستەی کورتیشدا دوو « کە »ی نووسیوە. کەواتە: (گەشتەکەی لەگەڵ پیاوە ناودارەکانی شێخانی سلێمانیی، بۆ لای سوڵتانی عوسمانییەکان و مانەوەیان لەوێ، ئاسۆی بیر و بۆچوون و شارەزایی لە دنیای ئەو سەردەمە فراوانکرد. تێگەیشت، بەرایی شارستانێتیی رۆژئاوا، کە گەیشتبووە ئەوێ، بە خوێندن و زانست ئەنجامدراوە.)

(زێوەر چۆوە سەر کاری مامۆستایی یەکەی، لە« مەکتەبی نمونەی سەعادەت »، بەڵام دوای ماوەیە سۆن ناردیە بەرزنجەو لەشار دوریەوەخست، کەشێخ گەڕایەوە، هێنایەوە ناوشارو کردیە مامۆستا لە « اعدادی محمودی » کە ئەو رۆژە بەرزترین مەڵبەندی خوێندنبوو لەسلێمانی.)«8،3». راستەکەی: (« زێوەر » بۆ سەر کاری مامۆستاییەکەی خۆی گەڕایەوە، لە « مەکتەبی نموونەی سەعادەت » دامەزرایەوە. بەڵام، دوای ماوەیە، « سۆن » ناردی بۆ « بەرزنجە » و لە شار دووریخستەوە. کە « شێخ »یش گەڕایەوە، هێنایەوە ناو شار و لە « ئەعدادی مەحموودیی »یە بە مامۆستا دایمەزران، کە ئەو رۆژە لە سلێمانیی، بەرزترین مەڵبەندی خوێندنبوو.)

(شیعری نیشتمانی و بانگەشە کردن بۆ بیری نەتەوەیی و تێکۆشان لەپێناوی گەیشتن بەرۆژێکی سەرفرازی و دور لەدەسەڵاتی بێگانە لایەکی دیاری شیعرەکانێتی؛ ئەمە هەر لەسەرەتاوە کەدەستی داوەتێ.)«14،3».

(شیعری نیشتمانیی، بانگەشەکردن بۆ بیری نەتەوەیی، تێکۆشان لە پێناوی گەیشتن بە رۆژێکی سەرفرازیی و دوور لە دەسەڵاتی بێگانە، لایەکی دیاری شیعرەکانی پێکدێنێ. ئەمە هەر لەسەرەتاوە دیارە، کە دەستی داوەتێ.) چونکە، گەر وا نەبێ، دارشتنەکە زۆر لاوازدەبێ و دوا رستەشی کرداری تێدا نییە!

(ئەمە رەخنەیەکی توندە بەرامبەر لایەنگیرانی بێگانەی داگیرکەر لەدوای راماڵینی دەسەڵاتی بابانەکان ئەوان لەکەیفدابوون، ئەوانەش کەهەلپەرست و وەک کەری نارجۆکە لەهەردووبەر دەلەوەران بەلام ئەوانەی کەراست و پاک بوون، بەشیان ئاوارەیی و دەربەدەر بوونە.) «15،3»
(ئەمە، بەرامبەر لایەنگیرانی بێگانەی داگیرکەر، لە دوای راماڵینی دەسەڵاتی « بابان »کان، ئەوانەی لە کەیفدابوون، ئەوانەشی کە هەلپەرست و وەک کەری ناو جۆگەکە، لە هەر دوو بەر دەلەوەران، رەخنەیەکی توندبوو. بەلام، ئەوانەی کە راست و پاکبوون، بەشیان ئاوارەیی و دەربەدەربوونبوو.)
(ئاوارەی و دەربەدەرییەکە لەلای سالم لەداغ و سوێی داگیرکەرو پیاوەکانیانە، لەلای زێوەریش چارەی خۆ قوتارکردن لەدەست ئەوانەو ئەو وەزعە هەر رۆین و ئاوارەبوونە.) «16،3» (ئاوارەیی و دەربەدەریی یەکە لای « سالم »، لە داغ و سوێی داگیرکەر و پیاوەکانیان بوو. لای « زێوەر »یش، چارەی خۆ قوتارکردن لە دەست ئەوانە و ئەو وەزعە هەر رۆین و ئاوارەبوون بوو.)
(لەم شیعرە چیرۆک ئامێزەیدا، شێوازە بچراوی کاربەدەستانی ئەوساو بەرتیل بەرتیل کاری دەهێنێتەوە یادی پیاوانی ئیدارەی ئەمجارەی سلێمانی و دوا بیرێشی ئامۆژگارییەکی ئاشکرایە) «18،3»
(لەم شیعرە چیرۆک ئامێزەیدا، شێوازە بچراویی کاربەدەستانی ئەوسا و بەرتیل و بەرتیلکاریی، بیری پیاوانی ئیدارەی ئەم جارەی سلێمانیی دەخاتەوە و دوا بیرێشی ئامۆژگارییەکی ئاشکرای پێوە دیارە.)
(جێگا دەستی شاعیر ئینکار ناکرێ لەپەیدابوونی سەرەتایەک بۆئەدەبی منالان لەلای کورد، چونکە ئەو خاوەنی دەیان هەڵبەستی پەروەردەیی ئاسک و تەروپاراوی منالانە، کەتا ئێستاش ئەو مانا بەرزو وشە جوانانەی بە ئاوازی خۆشی تورکی و کوردی ئەوساوە لە قوتابخانەکاندا دەڵێنەوەو ئەوە دوای ئەوە فێری دەبن.) «19،3» (جێگا دەستی شاعیر، لە پەیدابوونی سەرەتایەک بۆ ئەدەبی منالان لای کورد، ئینکار ناکرێ. چونکە، ئەو، خاوەنی دەیان هەڵبەستی پەروەردەیی ئاسک و تەروپاراوی منالانە، کە تا ئێستاش، ئەو مانا بەرز و وشە جوانانەی، بە ئاوازی خۆشی تورکیی و کوردیی ئەوسا، لە قوتابخانەکاندا دەڵێنەوە و ئەوە دوای ئەوە فێری دەبن.)
(نووسینەکانی زێوەر لەچاو شیعرە کوردی و فارسی و تورکیە کانیدا کەمن بەلام کەلێنێکی گەورەی لەم بەشەی ئەدەبی کورد پڕ دەکەنەوە، بەتایبەت ئەو

لەونووسەرە کەمانەیە کە لەو سەردەمەدا 1919-1920 بۆئەوە چووە کەرێڕەوی ئاوارەیی خۆی تۆمارکاو ڕۆژەکانی ئەو سەردەمە بەئەمانەتەوە بنووسێتەوە، هەندێ لایەنی جوگرافی و کۆمەڵایەتی و سروشتی ئەو ناوچانە پێیدا تێپەڕیوە بخاتەڕوو، ئەمە کارێکە جێگای تایبەتی خۆی هەیە.)«20،3»

« نووسینەکانی » کۆیە. بەڵام، « بەرزنجیی » دواتر گرامەری بیر چۆتەوە و بە تاک دواوە. بۆیە گوتوویەتی: کەلێنێکی « گەورەی »، دەبووایە، بینووسیایە: کەلێنێکی گەورەیان. پاشان، نووسیویتی: « پڕ دەکەنەوە » ئەوە نابێ و هەڵەیە. چونکە، تازە کارەکە کراوە و تێپەڕیوە. بۆیە، « پڕکردۆتەوە » ڕاسترە. هەروەها، پێویست بە ئامرازی « کە » ش ناکا. کەواتە: ( نووسینەکانی « ڕێوەر »، لە چـــــــاو شیعرە « کوردیی، فارسیی و تورکیی »یەکانیدا کەمن. بەڵام، کەلێنێکی گەورەیان لەم بەشەی ئەدەبی کوردییدا پڕکردۆتەوە. بە تایبەتیی، ئەو لەو نووسەرە کەمانە بوو، کە لەو سەردەمەدا « 1919-1920 »، بۆ ئەوە چووە، ڕێڕەوی ئاوارەیی خۆی تۆمارکا و ڕۆژەکانی ئەو سەردەمەی بە ئەمانەتەوە بنووسێتەوە، هەندێ لایەنی جوگرافیا و کۆمەڵایەتیی و سروشتی ئەو ناوچانەی پێیدا تێپەڕیوە، بخاتەڕوو. ئەمە کارێکە، جێگای تایبەتیی خۆی هەیە.)

(ئەوا کارەکانیان تاوێر جوولاندن بوو بۆ سەرە ڕێگای بەرەو پێشەوە چوون.) «24،3»

ڕستەیەکی زۆر نارێک و لاوازە، دەڵێی یەکێکی عەرەبییزانی کوردیی نەزان، لە عەرەبیی یەوە بۆ کوردیی وەریگێڕاوە. جوانتر وایە، بنووسرێ: (ئەوا، کارەکانیان بۆ سەر ڕێگەی بەرەو پێشەوە چوون، وەک تاوێر جوولاندن وا بوو!) ئەمە، تەنیا نووسینەکەی خۆیەتی، ئەگینا دەتوانرێ، بە شێوەیەکی جوانتریش دابڕێژرێ.

(دەبێ لەو ڕاستیە بگەین کەمێژووی ئەدەبی کوردی هەمووی بریتی نیە لەبەرهەمی شۆڕشگێڕی و مولتەزیم بەمەسەلەی نەتەوەکەوە.)«26،3»

(دەبێ، لەو ڕاستییە بگەین، مێژووی ئەدەبی کوردیی، هەمووی لە بەرهەمی شۆڕشگێڕیی و مولتەزیم بە مەسەلەی نەتەوەکەوە پێک نەهاتووە.)

(یەکێ لەو دیاردە باشانەی کەداگیرکەری ئینگلیز لەگەڵ خۆیدا هێنای نێزیککردنەوەی ماوەی نێوان شارەکان بوو؛ لەوەبەر کاروان و کاروانچی بەهەزار گیروگرفتەوە ڕێگای دوور و درێژی نێوان بەغداو سلێمانی دەبڕی، بەماوەیەکی زۆر، بەکۆسپ و نارەحەتی و مەترسی، بەڵام دوایی لەسەردەمی ئەواندا بەسێ سەعات دەچوویتە کەرکوک و لەوێوە بەشەمەندەفەر بۆ بەغدا .. تا ئەم دیاردەیە

پیرەمێرد لە هۆنراوەیەکیدا بەدوورودرێژی وەک شریتێکی سینەما بۆمانی باسدەکات.)«28،3» ڕێگەیان دروسکردن، بە دیاردە دانانرێ. بەڵکوو بە کار دەژمێررێ. دەتوانین، بنووسین: کار یا پرۆژە. دیسان تاک و کۆی تێکەڵکردووە.
(یەکێ لەو پرۆژە باشانەی، داگیرکەری « ئینگلیز » لەگەڵ خۆیدا هێنای، نێزیککردنەوەی ماوەی نێوان شارەکان بوو. لەوەبەر، کاروان و کاروانچیی، بە هەزار گیروگرفت، بە ماوەیەکی زۆر، بە کۆسپ، نارەحەتیی و مەترسیی، ڕێگەی دوورودرێژی نێوان « بەغدا و سلێمانیی یان دەبڕی. بەڵام، دوایی لە سەر دەسی ئەواندا، بەسێ سەعات دەچوویتە « کەرکوک » و لەوێشەوە بە شەمەندەفەر بۆ « بەغدا » دەڕۆشتی .. تەنانەت، « پیرەمێرد »یش لە هۆنراوەیەکیدا، بە دوور و درێژیی، ئەم کارەی وەک شریتێکی سینەما بۆ باسکردووین.)
(کەلەم شیعرە وردببینەوە دەشێ ئێمە ڕەخنە لەشاعیر بگرین کە بۆ مەدح و ستایشی دیاردەیەک دەکات کەداگیرکەر لەگەڵ خۆی هاوردویەتی و بۆ ئاسانکردنی کاری خۆی کردوویە؟)«31،3»
« کە »ی یەکەم، لە جێی خۆیدا نییە. بەڵکوو دەتوانین، بڵێین: کاتێ لەم شیعرە ورددەبینەوە، یا گەر لەم شیعرە وردببینەوە. هەروەها، ڕاناوی « ئێمە » زیادە. جگە لەوەی، دوو « کە » بەکارهاتووە، یەکێکیان زیادە. « مەدح و ستایش »، یەکەم بە عەرەبیی و دووەم بە کوردیی، هەر دووکیان هەر یەک واتایان هەیە. کەواتە:
(کاتێ، لەم شیعرە ورددەبینەوە، دەشێ، ڕەخنە لە شاعیر بگرین و بڵێین: بۆ ستاییشی پرۆژەیەکی کردووە، کە داگیرکەر لەگەڵ خۆی هاوردوویەتی و بۆ ئاسانکردنی کاری خۆی جێبەجێیدەکا؟) یا (گەر، لەم شیعرە وردببینەوە، دەشێ، ڕەخنە لەشاعیر بگرین و بڵێین: بۆ ستاییشی کارێکی کردووە، کە داگیرکەر لەگەڵ خۆی هاوردوویەتی و بۆ ئاسانکردنی کاری خۆی جێبەجێیدەکا؟)
(تا ئەم کاتەش کەئەم وشانەی تیادەنوسم هیچ حیزبێ لەسەرانسەری عێراقا « بەکوردستانەوە »، ئەوانەی نوێنەرایەتی ئەم گەلە دەکەن و لەناویا خەڵکی باوەڕیان پێیە، هیچیان لەو باسە لایاننەداوەو بانگەشەی برایەتیەکە هەر بەردەوامە.)«32،3»
لە ناویا زیادە. (تا ئەم کاتەش، کە ئەم وشانەی تیا دەنووسم، هیچ حیزبێ لە سەرانسەری « عێراق »دا، « بە کوردستانیشەوە »، ئەوانەی نوێنەرایەتی ئەم گەلە دەکەن و خەڵکی باوەڕی پێیان هەیە، هیچیان لەو باسە لایان نەداوە و بانگەشەی برایەتییەکە هەر بەردەوامە.)

(لەم بۆچوونەشــەوەیە کــە هەرچی نمونەیە لەم باســەدا دێنمــەوە نابنە هۆی کــەمکردنەوە لەپلەو پایەی هونەری و ئەدەبی و خــودیی ئەدیبــەکــە، بەڵکو بۆ ســۆراخکردنیــان دەبێ بنکەنی هەمــو لایەنەکــانی بکەین و لەخــۆمــانەوە تەقــە بەتاریکیــەوە نەنێین.)«35،3» نابنە هۆی کەمکردنەوە: عەرەبییــەکی تەواوە. (لەم بۆچوونەشــەوەیە، هەرچی نموونەیە لەم باســەدا دێنمــەوە، لە پلەوپایەی هونەریی، ئەدەبیی و خودی ئەدیبەکە کــەم ناکــەنەوە. بەڵکوو، بۆ ســۆراخکردنیــان دەبێ، بنکەنی هەمو لایەنەکانی بکەین و لە خۆمانەوە تفەنگ بە تاریکییەوە نەنێین.)

(جا لە هەمولایەکەوە شاعیران کەوتنە هۆنینەوەی شیعرو چامەی درێژ درێژ بەگــەورەیی ڕووداوەکەو ســەرکردەکانیا.)«49،3» کەوتنە هۆنینەوەی شیعر و: عەرەبیی یەکی ڕووتە! کەواتە: (جا، لە هەموو لایەکەوە شاعیران، شیعر و چامەی درێژدرێژیان، بە گەورەیی ڕووداوەکە و سەرکردەکانیا هەڵدا.) یا (جا، لە هەموو لایەکەوە شاعیران، شیعر و چامەی درێژ درێژیان، بۆ گەورەیی ڕووداوەکە و سەرکردەکانی هۆنییەوە یا دانا یا گوت.)

(نابێ سوپاس و ستایشی گیانی یارمەتی برای بەڕێزم کاک « عمر معروف بەرزنجی » فەرامۆشکەم کە بۆ نووسینی ئەم بابەتە هەرچیم ویست لەسەرچاوە خستیە بەردەستم، هەروا ڕێنمیای یە بەنرخەکانیشی.)«61،3» خستیە بەر دەستم: دەربڕینێکی عەرەبییە. هەر سێ ووشەی « نرخ، بایەخ و گرنگ » سێ واتای جیاوازیان هەیە. هەر یەکەیان لە شوێنی تایبەتیی و گونجاوی خۆیاندا بەکاردێنرێن. لێرەدا، ڕێنماییە بە نرخەکانی ناگونجێ و دەبێ بڵێین: گرنگەکانی یا پڕ بایەخەکانی. کەواتە: (نابێ، سوپاس و ستایشی گیانی یارمەتیی، برای بەڕێزم کاک « عومەر مەعروف بەرزنجیی » فەرامۆشکەم، کە بۆ نووسینی ئەم بابەتە، هەر چیم لە سەرچاوە ویست، یا پێویستبوو، درێغی نەکرد. هەروا ڕێنماییە گرنگەکانیشی.)

وا بزانم، ئەم چەن نموونە کەمەی پیشانمدا، بایی هێندە بێ، هەموو هەڵە و کەموکوڕییەکانی سیپارەکە، لە ڕووی « ڕێنووس، داڕشتنی لاواز، نیشانەکانی خاڵبەندیی و زمانەوانیی یەوە لە قاودا و پیوستی بە کۆمێنتاری دیکە نەبێ!

کاتی خۆی، بۆ ئەوەی بنچینەی ڕێنووسێکی نوێی یەککرتوو، بۆ زمانی کوردیی داڕێژم، بۆ ئەوەی شێوەی بەسەریەکەوە نووسینی کوردیی پیشاندەم، ئەم خاڵانەی خوارەوەم پێشنیازکرد. بەو هیوایەی شارەزایانی زمانی کوردیی، دەمەتەقێیەکی لەسەربکەن، تا بە هەموو لایەکمان بتوانین، ڕێنووسی کوردیی، لەو گێژاوە ڕزگار

کەین. چونکە، ئەوڕۆ هەر نووسەرێ یا دەستەی نووسەرانی هەر ڕۆژنامە و گۆڤارێ، بە بیانووی ئەوەی ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردییمان نییە، بە ئارەزووی خۆیان دەنووسن، هێڵی ڕاست و چەپ، بە سەر گوتاری نووسەرانی دیکەدا دێنن. لێرەدا، بە پێویستی دەزانم، جارێکی دیکە، هەمان پێشنیاز دووبارەکەمەوە، چونکە، لە لایەکەوە، پێوەندییەکی تەواویی بە باسەکەمانەوە هەیە. لە لایەکی دیکەشەوە، بۆ ئەوەی، ئەوی پێشتر ئەم پێشنیازانەی بەر چاو نەکەوتووە و نەیخوێندوونەتەوە، لێرەدا بیانبینێ. پێشنیازەکانیش ئەمانەن:

(1. گەر ووشەیەک، بۆ شێوەی ڕەتکردنەوە بەکارهێنرا، بە دوو جۆر خۆی دەنوێنێ. یەکەمیان ـ گەر لە سەرەتای ووشەکەدا بوو، وەک: « ناخۆم، نەمخوارد یا « مەیخۆ » ئەوا پێکەوە دەنووسرێن. دووەمیان ـ گەر شێوەی نێگێتیڤ لە ناوەڕاستی ووشەکەدا هاتبوو، وەک « حەز ناکەم، حەزم نەکرد یا حەز مەکە » ئەوا پێکەوە نانووسێنرێن و بە جیا دەنووسرێن. هەروەها، گەر لە کۆتایی ووشەشدا هات، هەر بە جیا دەنووسرێ. وەک « دیار نییە، تێیدا نییە، ئاومان نییە، دیاکۆ لە ماڵ نییە و ... ».

2. هیچ جۆرە ناوێ، وەک ناوی « مرۆڤ، مەل، ئاژەل، جڕوجانەوەر، ووڵات، شار، گوند، چیا، دەشت، دارستان. ڕووبار، درەخت، ئامێری جۆراوجۆر... تاد » لەگەڵ هیچ جۆرە کردارێکدا، پێکەوە نالکێنرێن. وەک: « کوردەدەڕوا، کوردبوو، لە عێراقبوو » هەڵەیە. « کوردە دەڕوا، کورد بوو، لە عێراق بوو ... تاد » ڕاستە.

3. تەنیا ڕاناوی لکاو، لەگەڵ کردارەکاندا پێکەوە دەلکێنرێن. بەڵام، ڕاناوی نەلکاو، بە هیچ جۆرێ لەگەڵ کردارەکاندا، پێکەوە نالکێنرێن. وەک: « بە منیگوت، حەزملێکرد، ئەومبینی، منیخۆشدەوێ ... تاد » هەڵەیە. « بە منی گوت، حەزم لێ کرد، ئەوم بینی، منی خۆشدەوێ ... تاد » ڕاستە. لە کاتی ڕستەشدا، هەر هەمان دەستوور بەکاردێنرێ، وەک : « خۆزگە منیخۆشدەویست. » هەڵەیە. « خۆزگە منی خۆشدەویست. » ڕاستە. بەڵام دەتوانین، چ پیتی خستنەسەر، چ ڕاناوە لکاوەکان، پێکەوە بنووسین. بۆ نموونە: « من نانم خوارد، تۆ نانت خوارد، ئەو نانی خوارد، ئەوان نانیان خوارد ... » بەم شێوەیە دەبێ: « من نانمخوارد، تۆ نانخوارد، ئەو نانیخوارد، ئەوان نانیانخوارد ... »

4. کردارەکان پێکەوە دەنووسرێن. وەک: (یاریکردن ـ یاریدەکەم، نانخواردن ـ ناندەخۆم، ڕاکردن ـ ڕادەکەن ... تاد). بەڵام، گەر کردارەکە، بە هۆی چەن ووشە و ناوێکی دیکەوە، لە یەکدی پچڕان، ئەوا بەسەریەکەوە نانووسرێن. هەروەها، بە

دوا ووشەی ڕستەکەشەوە نانووسێنرێن. وەک :
ئێمە هەوڵ بۆ سەربەخۆیی دەدەین.
ئەوان حەز لە مەنگوین دەکەن.
تارا نانی لە چێشتخانەی لاوان خواردووە.
لەم سێ ڕستەیەدا دەبینین، چاوگی هەر سێ کردارەکان، لە « هەوڵدان، حەزکردن و نانخواردن »دا خۆیان دەنوێنن. بەڵام، بە چەن ووشە و ناوێ، لە یەکدی دابڕاون. لەبەرئەوە ناتوانین، پێکیانەوە گرێدەین، یا کـــردارەکانی « دەدەین، دەکەن و خواردووە »، لـەگـەڵ « سـەربەخـۆیی، مەنگوین و لاوان »دا، پێکەوە بلکێنین.
هەروەها، کردارە ئاوێتەکان، لە هەموو شێوەکانیدا « ڕابردوو، ئێستە و ئاینده »، پێکەوە دەنووســـرێن. وەک: « داهاتن، دەرهێنان، لێکخـــستن، بازدان، ئاوەدانکردنەوە، لێکنزیکەوتنەوە، دوورکەوتنەوە و ... »
5. جگە لەوەی، هەموو کردارەکان، بە هەر سێ شێوەکانیانەوە « ڕابردوو، ئێستە و ئاینده » هەمیشـە پێکەوە دەنووسرێن. وەک: « خەوتن ـ خەوەدێ، دەخـەوم، خەوتبووم. خواردنەوە ـ دەخۆمەوە، دەمخواردەوە، خواردبوومەوە » نەک « خەوم دێ، خەوت بووم. دەم خواردەوە، خوارد بوومەوە. »
6. هەموو ئاوەڵناوەکان، لەگەڵ ڕاناوەلکاو و کردارەکاندا پێکەوە دەنووسرێن، وەک:« سارد ـ ساردە ـ ساردبوو. گەرم ـ گەرمە ـ گەرمبوو. گەورە ـ گەورەیە ـ گەورەبوو ـ گەورەبوون. کورت ـ کورتە ـ کورتبوو ـ کورتبوون. سەرزل ـ سەرزلە ـ سەرزلبوو ـ سەرزلبوون. ورگدڕاو ـ ورگدڕاوە ـ ورگدڕاوبوو ـ ورگدڕاوبوون ».
گەر « سەرزلە » لە « سەر + زل + ە » پێکهاتبێ و پێکەوە بلکێنرێن، ئەدی بـــۆ « سەر + زل + بوو » پێکەوە نەنووسرێن؟! چ جیاوازییەکیان هەیە؟ ئەو دوو ئامراز و کردارە « ە ، بوو » تەنیا لە کاتدا جیاوازییان هەیە، ئەگینا لە هیچ ڕوویەکی دیکەوە، هیچ جۆرە جیاوازییەکیان نییە.
لەوانەیە، هێندێ کەس بڵێن: « ە » کردار نییە و ئامرازی پێوەندییە. « بوو »ش کرداری ڕابردووە. بە لای منەوە، لە هیچ زمانێکدا، هیچ ڕستەیەک نییە، کرداری تێدا نەبێ، واتا ببەخشێ. ڕاستە « ە » کرداری تەواو نییە، بەڵام، جێگەی کردار دەگرێ و ڕۆڵی کردار دەبینێ.
7. بە هیچ شێوەیە نابێ، ئامرازەکانی « لێکدەر، پەیوەندیی و ناوی هێما یا ئاماژەکردن »، لەگەڵ ناو و کردارەکاندا پێکەوە بلکێنرێن. چونکە، جگە لەوەی لە ڕووی ڕێزمانەوە هەڵەیە، هەر یەکەشیان واتایەکی تایبەتیی خۆیان هەیە. بۆ

نموونە: هێندێ نووسەر دەنووسن: « ئەمجارە، ئەمساڵ ... تاد » کەچی « ئەو جارە، ئەو ساڵە ... تاد » پێکەوە نانووسن و بە جیا دەیاننووسن. بە باوەڕی من، شێوەی یەکەم بە هەڵە و شێوەی دووەم بە ڕاست دادەنرێ. چونکە، لە هەر دوو شێوەکەدا، « ئەم و ئەو » ناوی ئاماژەکردنن. بۆچی، لە شێوەی یەکەمدا پێکەوە بنووسرێن و لە شێوەی دووەمدا بە جیا بنووسرێن؟! کەواتە، ڕاستروایە، بنووسین: « ئەم جارە، ئەم ساڵ »، لە هەموو زمانێکیشدا، هەر وا دەنووسرێ.
لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە، دەربارەی هێندێ لە ئامرازەکانی پێوەندیی وەک: « بە ، بۆ ، ە ، وەک ، لە ... تاد» و لێکدەر وەک: « و ، بەڵام ، بەڵکوو ، یا ، نەک ، چونکە ... تاد » پێویستە ڕوونیکەینەوە. دیارە، هەر دوو ئامرازەکانی پێوەندیی « بۆ ، وەک » و ئامرازەکانی لێکدەر « بەڵام، بەڵکوو ، یا ، نەک ، چونکە »، بە هیچ شێوەیەک، لەگەڵ هیچ ووشەیەکدا پێکەوە نانووسێنرێن. بەڵام، گرفتەکە خۆی لە هەر چوار ئامرازەکەی پێوەندیی « بە ، ە ، ی ، لە » و ئامرزای لێکدەری « و » دا دەبینێ. بۆ؟ گومانی تێدا نییە، هەر دوو ئامرازی پێوەندیی « ە ، ی » بە جۆرێ لە ئامرازە لکاوەکان دادەنرێن. چونکە، هەرگیز بە تەنیا نایەن و واتاش نابەخشن. بۆ نموونە: لاولاو هاتووە. لە « کرداری هات + پاشگری وو + ئامرازی ە » پێک هاتووە. چونکە، « هاتوو » بێ ئامرازەکە، هیچ ناگەیەنێ، واتاکەی ڕوون نییە. بەڵکوو ئامرازەکە، ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، لاولاو هاتووە و کارەکە تەواوبووە، ئێستە لێرەیە. بەوەش، پێوەندییەک لە نێوان « ناو، کات و شوێن »دا پیشاندەدا.
بۆ ئامرازی پێوەندیی « ی »ش، هەر بەو شێوەیە دەبێ. بۆ نموونە: کوردە لووتی گەورەیە. لێرەدا ئامرازی « ی » ناوەڵناوی « گەورە » بە ناوی مرۆڤ و ناوی ئەندامێکی جەستەی کوردەوە گرێدەدا. بەڵام، بۆ هەر دوو ئامرازی « بە ، لە »، کەم نووسەر هەیە، گوێ بە دەستووری نووسینی ئەم دوو ئامرازە پێوەندییە بدا. زۆربەی نووسەران، لەگەڵ هەموو یەکەکانی زماندا، پێکیانەوە دەبەستن. بۆ نموونە: « لە ناو، لە سەر، لە ژێر، لە بەر، لە لای، لە لایەن، لە ڕۆژی، لە شاری، لە چیا، لە پرسە و... تاد» ئەمانە، هەموویان پێویستە، بەپێی دەستووری زمان، تەنیا بەم شێوەیە بنووسرێن. کەچیی، زۆر کەس پێڕەوی ناکەن و دەنووسن: « لەناو، لەسەر، لەژێر، لەبەر، لەلای، لەلایەن، لەڕۆژی، لەشاری، لەچیا، لەپرسە و ... تاد » ئەمانە، بۆیە دەبێ، بە جیا بنووسرێن، چونکە، هەر یەکێ لەو ووشانە، بێ « لە » واتایەکی تایبەتیی خۆی هەیە، بە شێوەیەکی تایبەتییش گەردانەدەکرێن. واتە: دەتوانین، بێ « لە » بڵێین: « ناو، سەر، ژێر، بەر، لای، لایەن، ڕۆژی، شاری، چیا،

پرســـە و ... » واتە: ئەو ووشـــانە لە یەک ووشـــە پێک نەهاتوون، بەڵکوو، هەر یەکێکیان لە دوو ووشەی جیاواز پێکهاتوون، بۆیە دەبێ، پێکەوە نەلکێنرێن.
بۆ ئامــرازی « بە »ش، بە هەمـــان شـــێـوە دەتوانین، نموونەیەک بێنینـەوە: « بە تایبـەتیی، بە گشتیـی، بە ئاشتیی، بە خۆشیی، بە ئارەزوو، بە پێ، بە ئۆتۆمـۆبێل، بە ڕۆژ، بە شەو، بە شیروانم گوت و ... » بە هەڵەش، بەم شێوەیە دەنووســــــرێ :
« بەتایبەتیی، بەگشتیی، بەئاشتیی، بەخۆشیی، بەئارەزوو، بەپێ، بەئۆتۆمـۆبێل، بەڕۆژ، بەشـەو، بەشـیـروانم گـوت و ... » بەڵام، « لەبەرئەوە، بەگـوێرەی، بەپێی، جـێـبـەجـێکردن، بەڕۆژ ــ گـەر ناوی مـرۆڤ بێ ــ ، بەس و .. » هەر دەبێ، بەم شێوەیە بنووسرێ، چونکە، بە هەموویان یەک ووشە پێکدێن.
بە داخــەوە، هێندێ لە نووســەرەکـان، چاو لە دەســتـووری زمـانـی « عـەرەبیی و فارسیی » دەکەن، ئەو ئامرازە پێوەندییـیانە لەگەڵ ووشـەکانـدا، پێکەوە دەلکێنن. وەک لە عـەرەبییدا دەڵێن: « لە سـەر: عەلا، لە ژێر: تەحت، لە ناو: فی، بە ئارەزوو: برغبە، بە ڕەزامەندیی: بموافقە، بە شێوەیەکی تایبەتیی: بصورە خاصە و ... »
لە زمـانـی کـوردییـدا، ئەمـانە هەمـوو بە هەڵە دادەنرێن، چونکە، دەسـتـوورێکی تایبـەتیی خـۆی هەیە. مـەگـەر لە ئاییندەدا، دەزگـەیەکی ئەکـادیمیـای کـوردیی دامەزرێ، بەڵگەی زانستانەی بۆ داتاشێ و بچەسپێ.)«432-428،28»

## 6/2. دەقوەرگـــرتن :

هەر نووسـەرێ، کاتێ کۆپلەیە لە نووسینێکی دیاریکراوەوە وەردەگرێ، پێویستـە، ئەو کۆپلەیە چۆن نووسـراوە، هەر بەو شێوەیەش ڕایگوێزێ و بینووسێتـەوە. جگە لەوەی، گەر باسـەکـەی دووبارەکردەوە، دەبێ، بە هەمـان زمـان و شـێوەی نووسین تۆماریکاتەوە.
بەڵام، « بەرزنجـیـی » هەر لە خــۆیەوە قـســـەیکردووە و دەڵێی بـە دەم خـــەوەوە بزرکاندوویەتی! چونکە، هێندێ کۆپلەی لە سەرچاوە جیاجیاکانەوە وەرگرتووە، یا دەسکارییکردوون، یا خـۆی دروسـیکردوون و لە سـەرچـاوەکـەدا نین. بـۆ نموونە، نووسـیـویێتـی: (چەند شـیـعـرێکی بەنمونە هێناوەتەوە کەگـوایە زێوەر بـەجـارێ باشوری کوردستانی تەسلیم بەعێراق کردووەو منالان فێردەکات کەعێراق بەولاتی خۆیان بزانن!)«57،3»
جارێ، پێش هـەمـوو شـتێ دەبووایە، کوتومت من چیم گوتووە و چۆنم نـووسـیـوە، هەر بەو شـێوەیە، کۆپلەکـەی لە نووسـینەکەوە بگوێزایەتەوە، بێ ئەوەی دەسکاریی ڕێنووسـەکـەی بکا، یا یەک پیت و ووشـەی لێ بقرتێنێ. پاشـان دەبووایە، ژمارەی

لاپەڕەکەی دیارییکردایە. ئەوە جگە لەوەی، بەو ڕێنووسە پڕ لە هەڵەیە، کۆپلەکەی نووسیوەتەوە، نیشانەکانی خاڵبەندیی بەکار نەهێناوە، ویستوویەتی، سەر لە خوێنەر بشێوێنێ، ئەو قسە پڕوپوچانەی خۆی بە من بفرۆشێ!

سەیر ئەوەیە، هەر لە خۆیەوە نووسیوێتی: « زێوەر بەجارێ باشوری کوردستانی تەسلیم بەعێراق کردووە » من هەر لە « بەرزنجیی » خۆی دەپرسم، لە کوێدا من شتی وام نووسیوە. یا « زێوەر » خۆی چی بووە، تا « باشووری کوردستان تەسلیم بە عێراق بکا! » بە ڕاستیی، کارێکی تا بڵێی دزێو و ناشیرینە، یەکێ خۆی بە نووسەر بزانێ، درۆ بە دەم نووسەرێکی دیکەوە بکا، کە هێشتا زرپ و زیندوویێ! بۆ گواستنەوەی کۆپلەکانی دیکەش، لە کاتی پێویستی خۆیدا، لە هەموو مەبەستە خراپ و نادەسپاکییەکانی دەدوێم.

## 7/2. پەراوێز و سەرچاوە :

« بەرزنجیی »، لە کۆتایی سپیارەکەیدا، هەم پەراوێز و هەم سەرچاوەکانی بە جیا ڕێکخستووە. دیارە، ئەمە کارێکی باشە. بەڵام، نەزانین و ناشارەزاییەکەی لەوەدا دەردەکەوێ، زۆر جیاوازیی لە نێواندا نەکردوون. جاری وا هەیە، ژمارەی سەرچاوەیەکی نووسیوە، هەم لە پەراوێز و هەم لە سەرچاوەکانیشدا هەیە. لەبەرئەوە، خوێنەر نازانێ، کام ژمارەی سەرچاوە یا پەراوێزی مەبەستبووە!

جگە لەوەی، سەرچاوەکانی « 7،4،1 »ی لە ژێر پەراوێزدا نووسیوە، ئەو ژمارانە پەراوێز نین. بۆیە دەبێ، لە ژێر خانەی سەرچاوەکاندا تۆمار کرێن. واتە: تەنیا ژمارەکانی « 2، 3،5، 6 و بادانەوە » لە ژێر پەراوێزدا دەنووسرێن.

هەروەها، سەرچاوەکانی بە شێوەیەکی ڕاست تۆمار نەکردووە. لەگەڵ یەکدیکدا جیاوازن. بۆ نموونە: ئەو هۆنراوەیەی بە سەر « عەبدولکەریم قاسم »دا هەڵدراوە، لە دامێنیدا، بەم شێوەیە سەرچاوەکەی نووسراوە. (19 ـ ژ 2 ,3 کانونی یەک 959 ل 85)، « 50.3 » کەچیی، کاتێ تەماشای کۆدی ژمارە « 19 »ی سەرچاوەکانم کرد، نووسراوە: (هیوا ـ گۆڤار ـ ژ « 4 » ساڵی « 3 » ئازاری 1960 بەغدا.) « 64.3 »، واتە: بۆ ئەو هۆنراوەیە، سێ ژمارەی یەک گۆڤاری لە دوو ساڵی جیاوازدا بەکارهێناوە! جا، مەگەر هەر خۆی بزانێ، کامیان ڕاستە!

## 8/2. ئەخت و پوخت :

« بەرزنجیی »، دەیتوانی، نووسینەکەی خۆی بە خۆڕایی درێژ نەکاتەوە. تەنیا وەڵامی هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی « زێوەر »م بداتەوە. نەک باسی « ژیان، بەسەرهات، هۆنراوە، بەخشان، دید و بۆچوونی نووسەر و هۆنەرانی کورد »م بۆ

بکا، دەربارەی « زێوەر » چییان گوتووە و چییان نووسیوە. هێندێ نموونەی هۆنراوەی، پێیاهەڵدانی هونەرەکانی دیکەی کوردم بۆ بێنیتەوە، لەگەڵ هۆنراوەکانی « زێوەر »دا بەراوردیانکا. چونکە، کەس لاریی لەو شتانە نەبووە و نییە. من باسی بابەتێکی دیاریکراوم کردووە، نەک لە هەموو رووییەکەوە، رەخنەم لە هونەر گرتبێ، تا ئەو بەو شێوەیە، درێژەی هەواڵەکانم بۆ بخوێنێتەوە!

ئەگینا گەر وا نەبووایە، لە سەر « زێوەر » دەیتوانی، وەک کارێکی سەربەخۆ، بە جیا بینووسیایە. هەر وەک چۆن « فیردۆسیی »، پەرتووکی « شانامە »ی نووسیوە، « بەرزنجیی »ش، نەک هەر بەو شێوەیە دەیتوانی، « زێوەرنامە »یەکی درێژ بنووسێ، بەڵکوو، لەو بەرهەمەی « شانامە »ش درێژتری بنووسیایە، هەموو ئەو زانیارییە کۆنانەی، دەربارەی « زێوەر »، تا ئەورۆ نووسراون، بە کاوەخۆ کاوێژکردایەتەوە! هێندە بە شان و باڵی « زێوەر »دا هەڵیدایە، تا هێزی لێ دەبڕا و وشەی عەرەبیی پێ نەدەما! چونکە، لە مێژە کورد گوتوویەتی: پیاو کە زۆری گوت، چاکیش دەڵێ و خراپیش دەڵێ!

جا، ئێستە پێم وایە، ئەو بەشانەی، « بەرزنجیی » باسیکردوون و پێویست نین، لە خراپەکانن! بریا، « بەرزنجیی » کەمێ کۆنترۆڵی زمان و پێنووسە کولەکەی خۆی بکردایە، تا خۆشی سەری لە سیپارەکەی خۆی دەرچووایە. بەڵام، دیارە ئەو کارە بە ئەو نەکراوە و ناشکرێ، چونکە، وەک « رەسووڵ هەمزەتۆف » گوتوویەتی: (بنیادەم، دوو ساڵی پێدەچێ، تا فێربێ، قسەبکا. شەش ساڵیشی پێدەچێ، تا فێربێ، دەمی خۆی بگرێ و قسە نەکا.)«8،35»

## 9/2. شێوە و قەبارە :

هەروەها، لە رووی شێوە و قەبارەی سیپارەکەشییەوە، هەڵبەتە، ئەو تەنیا ویستوویەتی، ژمارەی لاپەڕەکانی پترکا و لە بەرگەوە بۆ بەرگ، قەبەتر و تەنگەنەستوورتر دەرکەوێ. منیش، لەو رووەوە، هیچ جۆرە گلەییەکی لێ ناکەم. چونکە، وا دەردەکەوێ، خۆی زۆر ماندوو کردووە، ماوەیەکی زۆر، لاپەڕەی سەرچاوە گەردلێنیشتووەکانی هەڵداوەتەوە و گەڕاوە.

لەوەش دەچێ، هەر لە « 1966/01/01 »ەوە، خۆی خەریککردبێ، دەنگوباسی کۆ کردبێتەوە و دەستی بە نووسین کردبێ، تا رۆژی « 1996/08/31 »، سیپارەکەی تەواوکردبێ و « 66 » لاپەڕەی رێکی لێ دەرچووبێ. تۆ بڵێی، « زێوەر »یش هەر بە رێککەوت، ئەو هۆنراوە « عێراقچێتیی »یانەی، ساڵی « 1926 » یا « 1936 » نەنووسیبێ، وا « بەرزنجیی » بەو یادەوە، هەر هەمووی لەو شەشهەڵدانانەدا

دۆراندووە؟!! تۆ بڵێی، ئێستەش وەک « هێمن »، هەر ئەزنۆکەی لە باوەشگرێ و مۆر هەڵداوێژێ و بێ هوودە، بە هیوای « دوو شەش »ێکی دیکە بێ؟!!
باوەڕ ناکەم، ئەو ژمارانە هەر وا بە خۆڕایی و بە ڕێککەوت هاتبن! ئەگینا، گەر ئەو درێژدادڕییەی نەکردایە، هەم ژمارەی لاپەڕەی سیپارەکەی « 66 » دەر نەدەچوو.
هەم نووسینی لەو جۆرەش، هیچ جۆرە پێویستیی یەکی، بە وێنەی چەن پیاوێکی گەورە و ناوداری وەک: « زێوەر، شێخ مەحموود، رەفیق حیلمیی، پیرەمێرد، قانع، هێمن ... تاد » نەدەکرد! تەنیا هەر ئەوە مابوو، وێنەیەکی گەورەی ڕەنگاوڕەنگی، سەردەمی لاوێتی خۆشی چاپکردایە. بە مەرجێ، لەو وێنانەی پێشانیداون، گەورەتر بووایە. نەک وەک ئەو وێنە پچووکەی، گوتارەکەی گۆڤاری « کاروان » وابێ، کە بۆیان بڵاوکردۆتەوە!
جگە لەوەی، دوو لاپەڕەی سیپارەکەشی « 13 و 65 »، هەر تەنیا بە کۆپیکردنی بەرگی هەر دوو سیپارەکەی « دەستە گوڵی لاوان - زێوەر » و « ئەلفەکراد و ئەلعەرەب - فەریق مین ئەلشبان » پڕکردۆتەوە، کە هیچ پێویستی نەدەکرد، ئەو دوو کۆپییییە بڵاوکاتەوە. چونکە، هەر تەنیا ناوی ئەو دوو بەرهەمەی بێنایە، خوێنەر یەکسەر تێدەگەیی، باسی چی دەکا!
لە کۆتایی ئەم بەشەدا، هەر ئەوە ماوە، بڵێم: قوڕ بە سەر ئەو خوێندکارانەی، چەندین ساڵە، مامۆستایەکی وەک « بەرزنجیی »، فێری زمانی کوردیی کردوون! یەکێ خۆی بە مامۆستا و نووسەر بزانێ، ئەوەش باری شڕی کوردییزانینەکەی بێ، ئایا، بە چ یاسا و ویژدانێ ڕەوایە، مامۆستا بێ و وانە بە منالانی کورد بڵێتەوە! بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: کـــــوردییزانێکی وەک « بەرزنجیی »، بە هەڵە لەو بوارەدا کاردەکا. بەڵکوو، باشتر وایە، خۆی بە کارێکی دیکەوە خەریکا!

# 3. بابەت و ناوەڕۆک :

لەم بەشـەدا، هەوڵدەدەم، لە هـەموو ڕوویەکـەوە، زۆر بە وردیی و درێژیی، لە دید و بۆچوونەکـانی « بەرزنجـی » بدوێم. ئەوەی پێـویسـتـی بە وەڵام بێ، دێربەدێری نووسـینەکەی، بێ ئەوەی دەسکاریی شـێوەی نووسـین، هەڵەی چاپ و زمـانەوانیی بکەم، وەک خۆی چۆن هەیە، ڕایدەگوێزم. بە بەڵگەی لەچاوچەقیو وەلامیدەدەمەوە، تا ئەوەی، دەربارەی « زێوەر » نووسیومە، پتر ڕوونیکەمەوە و بیچەسپێنم.

## 1/3. دەربارەی پێشەکییەکەی :

« بەرزنجـیی » نووسـیـویـەتی: (لەناو شـاعیـرانی نیوەی یەکـەمی ئەم سـەدەیەی لە ناوابوونە، هیچ کام وەک زێوەر 1875-1948 زوڵمی لێ نەکراوەو شالاوی ناهەقی بۆ نەبراوە، هەر ساتە ناسـاتێ بەخۆڕایی و بەبێ هۆ وەیا لەنەشـارەزایی یەوە بەر درگەی پێ دەگیرێ.) «3،3»

ئەم قسە زل و بۆشانە، هەموو کەسێ دەتوانێ، بیانکا. چونکە، گەر یەکێ بڕیاریدا بێ، داکۆکیی لە « شتێ، بیرێ، هەڵوێستێ یا کـار ێکی نارەوا بکا، دەبێ، هەر لە خۆیەوە، ووشە ڕیزکا و بەو جۆرە ووشە هەرزانانە، پێشەکییەکەی برازێنێتەوە.

نازانم، بۆ تا ئێستە، نووسەرێکی دیکە، لە سەر ئەو جۆرە کێشە و باسانە، یەخەی چەن هۆنەرێکی دیکەی وەک: « بێکەس، بێخود، ئەسیریی ... تاد » نەگرتووە و لە دەرگـەی نەداون، دەردی « بەرزنجـیی » خـۆی نـووسـیـویـەتـی: هـەر سـاتـەنـاسـاتـێ، یەخەی « زێوەر » دەگرن و زوڵمی لێ دەکەن؟!! هـەڵبەتە، شتێ لە ئارادا هـەیە، هیچ کـەسێ بە خـۆڕایی، یەخـەی کەس ناگرێ. ئەمـە مـێژووە و دەبێ، چۆن هـەیە، وا باسکرێ و شـیکرێتـەوە، هەڵسـەنگێنرێ و ڕەخنـەی لێ بگیـرێ، لایەنە چاک و خراپەکانی دەستنیشانکرێ،. بەڵێ مێژووە، مێژووی وێژەی کوردییە، کە بە شێ لە مـێژووی نەتەوەکـەمـان پێکدێنـێ. لەبەرئەوە، گـەری بارە ترێ نیـیـە، وەک ئەو تێـگەیشـتـووە! ئیـدی، بۆ بە خـۆڕایی و بەبێ هۆ، یا لە نەشـارەزاییـیەوە، تەنیـا یەخەی هۆنەرێکی وەک « زێوەر » دەگرین؟!! ئایا گەر یەکێ بیەوێ، لێکۆڵینەوەیەک لە سـەر لایەنی یا بەشـێکی هۆنراوەکـانی « زێوەر » بکا، بە باشـیی هەڵیـان سـەنگێنێ، ڕوونیـانکاتەوە، ڕەخنەیان لێ بگرێ، بە کـام یاسـا، بە خـۆڕایی بەر دەرگەی پێ دەگرێ؟!!

ئینجـا، سـەیرەکـە لەوەدایە، هەر کـەسێ شـتـێکی بە دڵ نەبوو، یا لەگـەڵ باری سەرنجی تایبەتیی خۆیدا نەگونجا، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی زانستانەی پێ بێ،

یەکسەر ڕەخنەگرەکە بەوە تاوانباردەکا، گوایە: (تاوتۆیەکی نەشارەزایانەی شیعرێکی کرد)«3،3» وەک « بەرزنجیی » بە « کاکە مەم بۆتانیی » گوتووە! باشە، با بڵێین، « کاکە مەم » ساڵی « 1969 »، گوتاری « ئاسایشەکەی زێوەر لەتای ترازودا »ی نووسیوە، زۆر نەشارەزایانە شیکردۆتەوە، (حوکمەکەی زاڵمانە بوو.)«3،3»، ئەدی، چی وای لێ کرد، ماوەی « سییەک ساڵ » فزە لە خۆی ببڕێ، ئەوڕۆ، کای کۆن بەباکا، هەڕەشەی لێ بکاو بڵێ: (لەسەر نووسینێکی تێرو تەسەل هەڵدەگرێ.. بۆ ئایندە.)«3،3» ئەدی، بۆ لەو ماوە دووروودرێژەدا، نەک هەر ئەو، بەڵکوو یەکێ لە نووسەران یا ڕێژەدۆستان، وەڵامێکی ئەو نەشارەزایی و « حوکمە زاڵمانە »یەیان نەدایەوە؟!! بۆچی، جگە لە « بەرزنجیی »، کەس وەک پۆلیسی دەروازەی ڕێژەی کوردیی، قوڕقوڕاکەی نەگرت؟ هەڵبەتە، ئەم کاسەیە بێ ژێرکاسە نییە و دەبێ، بزانین چییە؟!!
پاشان، « بەرزنجیی » دوو کۆپلەی لە نووسینەکەی من وەرگرتووە، بە ئارەزووی خۆی دایڕشتۆتەوە، بێ ئەوەی گوێی دابێتێ، من چۆنم نووسیوە، یا بە چ شێوەیە دامڕشتووە. شەلم کوێرم ناپارێزم، نوقورچی گرتووە. هەر وا بە شێوەیەکی هەڕەمەکیی، بۆچوونەکانی منی، بە هۆنراوەیەکی « مەحویی »یەوە گرێداوە و نووسیوێتی: (لەڕاستی دا بەرامبەر ئەمە کە لەقەڵەمی کەسێکەوە دەردەچێ خۆی بەخاوەنی رادەیە لەسەروساختی کردن لەگەڵ ئەدەب و ڕۆشنبیریدا دادەنێ.. هیچ ناوترێ لەوە زیاتر کەبڵێم: سەد شوکور بۆ خوا کەزێوەر ئەم ڕۆژانەی نەدی و بەحورمەتەوە بەر لەپەنجاویەک ساڵ سەری نایەوە، نەکەیی کە بەو « لەبزە شیرینە » ئاخافتنی « ئەدەب »ی لەگەڵدا بکەن و لەوانەیە خراپتریش.)«4،3» ئەم چەن دێڕە، گەر شتێ بگەیەنێ، تەنیا نیشانەی نزمیی ئاستی ڕووناکبیریی و نەزانینی خاوەنەکەی، بەرانبەر بە لێکۆڵینەوەی ڕێژەیی و مێژوویی پیشاندەدا. چونکە، ئەو پێی وایە، هەرچی لە کاتی خۆیدا، هەڵەیەکی کرد و بۆی دیزەبەدەرخۆنەکرا یا کەسێ نەبوو، لەو سەردەمەدا ڕەخنەی لێ بگرێ، پاشان مالاویی لە ژیان کرد، ئیدی بە هیچ شێوەیە نابێ، لە گۆڕی پڕ لە هێمنیی و ئارامیدا، خەبەرکرێتەوە، لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدرێتەوە، باسی لایەنە هەڵە و خراپەکانی بکرێ. چونکە، یەکێکی وەک « زێوەر »، کاتی خۆی، « بەحورمەتەوە بەر لەپەنجاویەک ساڵ سەری ناوەتەوە! » و بەڕێکراوە، ئیدی ئەوڕۆ، هەر نووسەرێ، هەر لێکۆڵینەوەیە لە سەر هێندێ لە هۆنراوەکانی بکا، دەبێ، یەکێکی وەک « بەرزنجیی »، سوپاسی خوا بکا، « کەزێوەر ئەم ڕۆژانەی نەدی! »

هەڵبەتە، ڕەخنەگرتن لای ئەو، بە « لەبزی شیرن » دادەنرێ! چونکە، نەک هەر ئەو، بەڵکوو زۆربەی زۆری نووسەران و هونەرانی کورد، فێری ئەوە بوون و گوێیان بەوە ڕاهاتووە، تەنیا بە چاکە باسکرێن، بە شان و بازوویاندا هەڵدرێ، لە گوڵ کاڵتر بە خۆیان و بەرهەمەکانیان نەگوترێ، گەر هەرچی بڵێن و هەرچیش بکەن، هەر ئافەرین کرێن و چەپڵەیان بۆ لێدرێ!

بە ڕاستیی، ئەمەیە ماڵوێرانیی و پاشاگەردانیی، ئەمەیە نەتەوەیەکی دواکەوتوو لە یەکێکی دیکەی پێشکەوتوو جیادەکاتەوە! ئەدی گەر ئەو، ئاگای لە ڕووداوەکانی مێژوو بووایە، چۆن بڕیاری وای دەدا؟ ئەدی ئەوە نییە، لە نێو نەتەوەکانی جیهاندا، ڕۆژانە دەس بۆ بەرهەمی چەندین « نووسەر، هونەر، ڕامیار و پیاوی ئایینیی » ڕادەکێشن، بەرهەم و کردارەکانیان هەڵدەسەنگێنن، لایەنە باش و خراپەکانیان دیاریدەکەن، ڕەخنەی توندیان لێ دەگرن، هەر کەسە مافی سروشتیی و ڕەوای خۆی دەدەنێ، بێ ئەوەی کەسێ هەبێ، بۆڵەیە یا سرتەیەکی لێ بێ. چونکە، تەنیا هەر بەو شێوەیە دەتوانن، مێژووی نەتەوەکەیان هەڵسەنگێنن، لایەنە خراپەکانی پیشاندەن، تا جارێکی دیکە، ئەو هەڵە و خراپانە دووپات نەبنەوە، خۆشیان و نەوەکانی داهاتووشیان، کەڵکی لێ وەرگرن. ئەمەش، پتر لەو کۆمەڵە دواکەتووە بندەستانەدا ڕوودەدا، لە نێو ئەو گەلانەدا بەدیدەکرێ، کە خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆیان نین. یا قەوارەیەکی نەتەوەیی سەربەخۆشیان هەیە، بەڵام، چونکە ئازادیی ڕادەربڕین نییە، دیمۆکراسیی وەک سیستێمێکی مۆدێرن و شارستانییانە پیادە ناکرێ، زۆر جار، ئەو پرۆسەی هەڵسەنگاندن و ڕەخنەگرتنە، بۆ ماوەیەکی دیکەی مێژوویی دوادەکەوێ! ئایا، کێ دەیتوانی، لە سەردەمی دیکتاتۆرێکی خوێنڕێژی وەک « ستالین »، یا هەر دیکتاتۆرێکی دیکەی ئەو سەردەمەی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکاندا، نەک هەر ڕەخنە لە کردەوە دڕندە و نامرۆڤانەکانیان بگرێ، بەڵکوو، ڕەخنەش لە هونراوەی هونەرێ یا نووسینی نووسەرێکی سەر بەو ئایدۆلۆژیا و ڕێبازە بگرێ؟ کەچیی، کاتێ هاورێ « ستالین » مرد، « خرۆتشیۆف » هات، نەک هەر زۆر ڕێزیان لێ نەگرت، بەڵکوو مافی ئەندامێتی پارتی کۆمۆنیستیشیان لێ سەندەوە، ئەو پەیکەرە گەورەیەی، لە نێو پەیکەری پیاوە گەورەکانی « سۆڤیێت »دا بۆیان داچەقاندبوو، ئەویشیان تووڕدا. دواتریش، کاتێ « خرۆتشیۆف » لابرا، « برێژنێف » و دەستەیەکی دیکە هاتن، جارێکی دیکە، بە بیر و کردەوەکانی « ستالین »دا چوونەوە. ئەوان دەیانزانی، ئەو پیاوە هەڵەی زۆر بووە. بەڵام، ئەو، ئەوە نەبوو، بەو

شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەن. لەبەرئەوە، هەموو مافێکی خۆیان بۆ گێڕایەوە. پەیکەرێکی نیوەیان بۆ داتاشییەوە.
دوای ئەوەی « گەربەچێۆف »یش هات، هەموو دید و بۆچوونەکان، هەموو پێوانە و هەڵسەنگاندنەکان، بە تەواویی گۆڕان. ئینجا، نەک هەر « ستالین »یان بەسەر کردەوە، بەڵکوو، هەموو ئەوانەی، لە بواری ڕامیاریی و نووسیندا کاریانکردبوو، بە چاک و بە خراپ، هەواڵەکانیان سەر ئاو کەوتن و لە بنی دەمۆڵەکەیان بۆ دان.
دوای ئەوەی « یەکێتی سۆڤێت »یش هەڵوەشایەوە، ئیدی بەزمەکە بە تەواویی گەرم بوو، هەموو نهێنییەکان پتر ئاشکرابوون، پرۆسێسی هەڵسەنگاندن و ڕەخنە گرتنەکەش، لە لووتکەی تێپەڕان. کەچیی، ئێستەش لە « ڕووسیای فیدراڵ »، هێندێ هەن، وەک « بەرزنجیی »، ئاوات بە « کەڕیی، لاڵیی و کوێریی » سەردەمی کۆمۆنیستەکان دەخوازن. تا ئەندازەی پەرستن، « ستالین » و بیروباوەڕەکانی دەپەرستن. شانازیی بە هەموو کردەوەکانییەوە دەکەن! ئەمە چیرۆکی مێژووە و مێژووش، هەرگیز نامرێ و زیندووە. هەمیشە، چەن کەسێ هەر هەن و دەبن، چیلکە لە پۆخڵەواتی ڕووداوە مێژووییەکان وەردەن، ڕاستییەکان بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیان ڕوونکەنەوە! جا هەزارانی وەک « بەرزنجیی » پێیان خۆشبێ یا ناخۆشبێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ. چونکە، هەمیشە هەر چەن کەسانێکی دڵسۆزی نەتەوە و نیشتمانپەروەر دەبن، گۆڕی مێژوو شەقکەن، سەر بە ئەرشیفی ڕووداوە مێژوو ییەکاندا بکەن، لاپەڕە سوور و گەش، زەرد و سیسەکانی پەرپەرکەن. ئەو جۆرە کەسانەش، هەرگیز نە شەرم لە هەڤاڵ « بەرزنجیی » و نە شەرم لە هیچ کەسێکی دیکەی دەسەڵاتدار دەکەن.
هەر زۆر دوور نەڕۆین، ئەو هەموو ناهەمواریی و کارە خراپانەی، ئەورۆ لە باشووری کوردستاندا ڕوودەدەن، ئەو هەموو درۆ و دەلەسانەی بە دەم سەرکردە مردووەکانەوە دەکرێن، ئایا، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئاوڕیان لێ نادرێتەوە؟!! ئایا هەر وا بە ئاسانیی، بە پەیژەی ئەمریی و لووتکەی سەرکەوتندا هەڵدەگەڕێن؟!! یا ڕۆژێ دادێ، (مثقال ذرە خیر یری، مثقال ذرە شر یری) ئەمە ئەورۆ بۆ وایە؟!!
لەبەرئەوەی، لایەنە دەسەڵاتدارەکان، دەسەڵاتیان هەیە، توانای لێدان و گرتنیان هەیە، پارەیەکی زۆر دەڕێژن، تا چەندین نووسەری خۆفرۆش و چڵکاوخۆری کورد، ملوانکەی درۆ بهۆننەوە، لە ملی سەرکردە و وابەستەکانیانی کەن. هەڵە و تاوانەکانیان بۆ لێفەپۆشکەن، هەموو نەنگییەکانیان بۆ داپۆشن، هەر تەنیا بە شان و باڵاییاندا هەڵدەن، تا وەک فریشتەیەکی پاک و بێ هەڵە، لێیان بڕوانرێ!

بەلام، ڕۆژێ دادێ، تەلیسمی ئەو هەموو درۆیانە بشکێنرێ، کارتێکرنیان لە سەر کۆمەلانی خەڵک بەتاڵکرێتەوە، تیشکی خۆری ڕاستیی، بۆ هەمووان دەرکەوێ، هەر کەسە لە مێژووی تێکۆشانی خۆیدا، مافی ڕەوای خۆی پێ بدرێ!

پاشان، هۆنراوەیەکی « مەحویی »، بە هەڵە نووسیوە، کە گوتوویەتی:

ڕۆڵە! گەر حەزدەکەی ببیە شاکور

پەندی « مەحویی » لەگوێگرە وەک دور

مەردی ئازادە قەت مەڕەنجێنە

( کل شیٔ و لا شتیمە حر ) «337،57»

نازانم، ئەو هۆنراوەیەی، لێرەدا بۆ هێناوەتەوە؟ چ پێوەندییەکی بە سەر گوتارەکەی منەوە هەیە؟ بۆ دەبێ، ڕەخنە لە « فەردی ئازاد » نەگیرێ؟ بۆ « فەردی ئازاد » چییە؟ لە چی دروسکراوە؟ ئایا، هەڵە ناکا؟ ئەمە مەگەر هەر لای چەن کەسێکی وەک « مەحویی » و « بەرزنجیی » ڕەوابێ! ئەگینا، هۆنەر خۆشی، هەر یەکێ بووە، وەک هەموو ئەو کوردانەی ژیاون و دەژین، هەموو کەس بۆی هەیە، پەنجەی ڕەخنە بۆ کار و بۆچوونەکانی درێژکا!

دوای ئەوە، گەر یەکێ ڕەخنە لە « فەردێکی ئازاد » بگرێ، ڕەخنەکەی ڕاسبێ و لە دڵسۆزییەوەبێ، بۆ دەبێ، ئەو هۆنەرە برەنجێ؟ بەڵکوو پێویستە، گەر لە ژیاندا بێ، سوپاسی ڕەخنەگرەکە بکا، گەر لە ژیانیشدا نەبێ، ئەوا ڕاستیی بۆ خەڵکی ڕووندەبێتەوە! جگە لەوە، ئایا ڕەخنەگرتن بە " شتیمەی حر " دادەنرێ؟ جا گەر وایە، من هیچ تێبینییەکم، لە سەر ئاستی کەلتووریی « بەرزنجیی » نییە!

پاشان وەنەبێ، نووسەر، هۆنەر و ڕووناکبیرانی کورد، هەر هەموویان و لە هەموو سەردەمێکدا، ڕاژەی نەتەوەکەی خۆیان کردبێ، یا ئەوەی نووسیبێتیان، لە بەرژەوەندیی کورددا بووبێ. نەخێر، بەڵکوو لە هەموو سەردەمێکدا، کۆمەڵێ کوردی « نووسەر، هۆنەر و ڕووناکبیر »، وەک مۆم بۆ نەتەوەکەیان سووتاون، ڕێگەی تاریکونوتەکیان بۆ ڕۆشنکردوونەتەوە، شەویان بە دەم ڕۆژەوە گرێداوە، خەباتێکی بێ وچانیان، بۆ « ئازادیی، سەربەخۆیی و بەختەوەریی » نەتەوەکەیان کردووە. بە پێچەوانەشەوە، هێندێکی دیکەش هەبوون، ئەوەی بیریان لێ نەکردبێتەوە، کێشەی ڕەوا و گرفتە سەرەکییەکانی کورد بووە. بەلام، ناپاکییان لە خاک و نەتەوەکەیان نەکردووە. هێندێکی دیکەش هەبوون، نەک هەر بە تەنگ کوردەوە نەهاتوون، نەک هەر سەری خۆیان کزکردووە و دانیشتوون، بەڵکوو دژی ئاوات و ئامانجی نەتەوەکەشیان بوون، وەک پوازی کوردیی، ناپاکییان لە کورد و

کوردستانیش کردووە. کەواتە، بۆچوونەکەی « مەحویی » هەڵەیە، یا، لێرەدا بۆ ئەو مەبەسەی « بەرزنجیی » ناگونجێ!

هۆنەورێکی نیشتمانپەروەری وەک « بێکەس »، لە « 1939/11/16 »دا بە دە پێنجینە، هۆنراوەی « خوا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا »ی گوتووە. لەم هۆنراوەیەدا، هۆنەر لە دەردەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی دواوە. هەر چەندە، ئەو باری سەرنجانەی، تا ئەورۆش هەموویان هەر راستن. بەڵام، هۆنەر لێرەدا، زۆر رەشبینانە بیریکردۆتەوە، هیچ تروسکەیەک، هیوایەک بە تەوژمی هۆنراوەکانییەوە بەدی ناکرێ. لە پێنجینەی شەشەمدا، پەنجەی تاوانی، ئاراستەی رووناکبیرانی کورد کردووە، رەخنەی لێ گرتوون. گوایە، هەر کەسە خەمی گیرفانی و ورگ پرکردنی خۆیەتی، نیشتمانەکەی پشگوێخستووە، تەنانەت بۆ پارە، بیروباوەری خۆشی فرۆشتووە. بۆیە گوتوویەتی:

مونەووەر، هەر زۆری لەبەر نانی
وەتەن ئەفرۆشێ، بە یەک تارانی
ئەخاتە ژێر پێ، دین و ئیمانی
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا «100،6»

جا، ئیدی دەبێ، لێرەدا « بێکەس » تاوانبارکەین، چونکە، « منەوەر »ی بە نیشتمانفرۆش « داناوە؟ کێ دەڵێ، لە نێو ئەو « منەوەرانە »دا، بە دەیان و سەدان « فەردی ئازاد »یشی تێدا نەبووە؟!!

« بەرزنجیی »، هەر لە خۆیەوە قسەی فڕێداوە. خۆشی نازانێ، چی گوتووە و چی کردووە. چونکە، گەر بیزانیایە، هەڵبەتە نەیدەفەرموو: (منیش دەڵێم: لەسایەی نەبرێ، هەر چاکە، پاش ئەوەندە ساڵ لەئەزموونی خوێندن و ژیان لەباوەشی شارستانیەتدا، هێشتا باشە ئەم دوو وشە سەنگینەی کردە دەسکە گوڵی دیاری و لەژوور سەری قەبرەکەی داینا.)«4،3» ئایا دەبێ، « خوێندن و ژیان لە باوەشی شارستانییەتدا »، پێوەندیی بە ووشەی « سەنگین »ەوە چی بێ؟!!

دیارە، ئەو ئاگای لە جیهانی ئازاد و شارستانییەت نییە و نازانێ، خەڵکی چی دەنووسن؟ چۆن رەخنە لە یەکدی دەگرن؟ جگە لەوەی، ئەو « دوو وشە سەنگینە »، دەسکەگوڵی دیاریی نەبووە و نییە، لە ژوور سەری گۆڕەکەیم دانابێ. بەڵکوو، تاجەگوڵینەی رەخنەیە و لە ملی هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی هۆنەرم ئالاندووە. رەخنەکەش، زۆر لە جێی خۆی دایە، هەرگیز لێشی پەشیمان نیم.

چونکه، ئەوەتەی بیرمکردۆتەوە، بە هەموو بیر و هۆش و بوونمەوە، دژی بیری گەندەڵی « عێراقچێتیی » بووم. جا، ڕەشەبای بۆگەنی ئەو بیرە، لە هەر کوێوە هەڵیکردبێ، من نەک هەر دەرگە و پەنجەرەکانم داخستووە، بۆ ئەوەی مێشکم پڕ نەبێ و بۆنەکەی کاسم نەکا، بەڵکوو، بە چەکی زانین و زانست، بە بیری نەتەوەیی و کوردستانیی، بەو پەڕی توانامەوە، بەرەنگاریبوومەتەوە، لە مێشکی گەلێ لاوی کوردم دوورخستۆتەوە و لە بەر چاوم خستوون!

هەڵبەتە، هەموو کەسێ ئازادە، چۆن بیردەکاتەوە. بەڵام، هەر کاتێ زانیبێتم و بزانم، ئەو بیرە دروسکراوە، دژی بیرە ڕەسەنەکەی من وەستاوە و دەوەستێ. سەری لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم شێواندووە و دەشێوێنێ. ڕێگەی ڕاستی لێ گۆڕیوێ و دەگۆڕێ. کوێریکردوون و کوێریاندەکا. زیانی بە پاشەڕۆژی نەتەوە و نیشتمانەکەم گەیاندووە و دەگەیەنێ. ئەوا بە هەموو توانامەوە، دژی وەستاوم و دەشوەستم، لە قاوەمداوە و لە قاویشیدەدەم. هێندێ جاریش، باجەکەیم زۆر بە چاکیی داوە!

پاشان، نووسیوێتی:(لەوانەیە نووسینەکە هەندێ هەرزەو گەنجی « بێ ئاگا لەرابوردوو » بەلای خۆیدا ببا، بەڵام زۆریش پێی پەست و نیگەرانن. بەتایبەت ئەوانەی شتێ لە مێژووی نێزیکی نەتەوەو ئەدەبی نەتەوەکەیان دەزانن..)«5،3»

سەرەتا دەڵێم: هەر باشە، ئەو نووسینە، یەکێکی وەک « بەرزنجیی » بێ ئاگا لە مێژووی نەتەوەکەی، بە لای خۆیدا نەبردووە. چونکە، ئەوەی باوەڕ بەو نووسینە بکا، ئەوا ئەو بە « هەرزە و گەنجی » دادەنێ، ئەوەشی باوەڕی پێ نەکا، بە ڕووناکبیر و بە سالاچووی دەژمێرێ. دیارە، خۆشی لە ڕیزی ئەو ڕووناکبیر و بەساڵاچووانەدا داناوە! بەڵام، من « بەرزنجیی » و هەموو ئەوانەی دیکەی، لنگەوقوچ لە ڕەخنە و مێژوو گەیشتوون، دڵنیادەکەم، ئەوانەی باوەڕیان بەو ڕێباز و باوەڕە هەیە، « هەرزە و بێ ئاگا لە ڕابوردوو» نین، وەک ئەو تێیگەیشتووە و تاوانباریاندەکا. بەڵکوو، ئەوانە دژی ئەو بیرە پووچە ڕادەوەستن و چاکیش لێی تێگەیشتوون. دەزانن، کوریسی نارەسنی ئەو بیرە پوچەڵە، لە کوێوە درێژکراوە و بۆ چ مەبەسێ شلکراوە! ئەوانەی پێشی پەستن، جگە لە کەسوکاری هۆنەر و چەن « عێراقچیی » یەکی نەکبەتی سەرلێشێواوی بێ هۆش و گۆش پتر، کەسی دیکە نین. لەبەرئەوە، شتێکی سەیر نییە، گەر هەموو بێگانەپەرستێ، دژی بیری خۆرسکیی و ڕەسەنی کوردایەتیی و کوردستانیی بن و بەرانبەری بوەستنەوە. چونکە، کەسێ پشت لە خاک و نیشتمانەکەی خۆی بکا، لەوە پتر دەبێ،

چاوەڕوانی چی دیکەی لێ بکرێ! کەسێ بانگاشەی بیری « عێراقچێتیی » بکا، کەسێ بیەوێ، تاهەتایە، کوردستانەکەی بەو دەوڵەتە داگیرکەرەوە ببەسرێتەوە، ئیدی چۆن، دژی ئەو بیرە پیرۆزە ناوەستێتەوە؟ هیچ گومانی تێدا نییە، شەمشەمە کوێرەی بیری « عێراقچێتیی »، هەمیشە لە تیشکی زێڕینی خۆری بیری «کوردستانیزم » دەترسێ! چونکە، ئەو بیرە، تەنیا هەر لە شەوەزەنگدا هەڵدێ. بە پێچەوانەی بیری کوردایەتییەوە، لە خۆرەتاوا گزنگدەدا و دەدرەوشێتەوە.
هەروەها، ئەو جۆرە کەسانەی بەو شێوەیە ناوینادەبا، « ئەوانەی شتێ لە مێژووی نێزیکی نەتەوەو ئەدەبی نەتەوەکەیان دەزانن.. » ئەوەتەی هەن، وەک شەمەندەفەر، هەر لە سەر یەک هێڵی ئاسنین ڕۆیشتوون و دەڕۆن.، نە بە هیچ لایەکدا لادەکەنەوە، نە ئاوڕیش بۆ دواوە دەدەنەوە، تا ڕابوردووی خۆیان و نەتەوەکەیان بە باشیی بزانن. چونکە، گوێ بۆ قسەی کەس شل ناکەن، ڕەخنە لە کەس وەر ناگرن، بە زۆریی هەر فێری « پیاهەڵدان، ماستاوساردکردنەوە، مامەیی، دڵدانەوەی کەسوکاری مردووەکان » بوون. ئەوەش، نە هەرگیز بە من کراوە، نە هەرگیزاوهەرگیزیش بە من دەکرێ!
گەر یەکێ، گوتارەکەی منی نەخوێندبێتەوە، بەپێی قسە پفهەڵدراوەکانی ئەو بێ، وا دەزانێ، من لە هەموو ڕوویەکەوە و بە شێوەیەکی کوێرانە، ڕەخنەم لە « زێوەر » گرتووە، دژایەتیمکردووە. یا خوانەخواستە وەک ئەو دەیەوێ، لە خوێنەرانی بگەیەنێ، من گوتوومە: « زێوەر » ماموستای هۆنراوە نەبووە، ئاستی پەخشانەکانی نزم و ناوەڕۆک خراپبوون، دڵسۆزی خاک و نەتەوەکەی خۆی نەبووە، سروودی بۆ خوێندکاران نەهۆنیوەتەوە! ئەمە گەر وا لێکدرێتەوە، وەک ئەو دەیەوێ، لە مێشکی خوێنەری تێکترنجێنێ، ئەوا بێ ویژدانییەکی زۆر گەورە، نەک هەر بەرانبەر بە « زێوەر »، بەڵکوو بەرانبەر بە من و نووسینەکەشم دەکرێ. چونکە، هەر یەکێ نووسینەکەی منی خوێندبێتەوە، یا گەر جارێکی دیکە پێیدا بچێتەوە، یەکسەر تێدەگا، من بە چ شێوەیە، تەماشای « زێوەر »م کردووە. چۆن سەرەتا، بە شان و بازوویدا هەڵمداوە، بە شانازییەوە، لایەنە باشەکانیم باسکردووە. پاشان، ڕەخنەم لەو هۆنراوانەی گرتووە، نەک پەلاماری کەسێتی خۆیم دابێ! ئیدی دەبێ، ئەو قسە زەردباوانەی « بەرزنجیی »، چ ڕەواجێکی لە نووسیندا هەبێ، وا هێندە بە دەس و دڵ فراوانییەوە، بەبایکردوون و دەسی پێوە نەگرتوون، بە تایبەتیی، کاتێ ڕێگەی بە خۆی داوە، بە ناوی هەموو دڵسۆزێکەوە، داکۆکیی لە « زێوەر » کردووە و گوتوویەتی: (هەربۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەو

بیرۆکە چەوتانەی کە لەو نووسینەدا هاتوون، بەهێمنی تاوتوێیەکی دەکەم، بۆ هیچ نا لەبەر دیفاع لە مامۆستای شیعرو نووسینی پەخشانی کوردی، دڵسۆز بەخاک و نەتەوەکەی..) «5،3». جا، گەر ڕا نەسپێرراوە، ئەو ژارە ڕەشە هەڵڕێژێ، با، تەنیا دەس بۆ یەک جێگەی نووسینەکەم ڕاکێشێ، تا هەموومان بزانین، « ئەو هەڵە و بیرۆکە چەوتانە » لە چ دێڕێکی گوتارەکەمدا هاتوون!

لە کۆتایی پێشەکیی سیپارەکەشیدا، هەر دەڵێی، گوتارێکی ڕامیاریی لە بۆنەیەکی تایبەتییدا دەخوێنێتەوە، یا وەک مەلایەکی ئایینیی، لە سەر گۆڕی شەهیدێکی زۆرلێکراو وەستاوە و سڵاو بۆ گیانی پاکی دەنێرێ، وا نووسیوێتی: (سڵاو لەو دڵسۆزە پاکە بێگەردانەی بەبێ هیچ مەبەستێ « جگە لەدڵسۆزی نەبێ » ئاوا خۆیان بەختکردو ڕێزو نەوازش بۆ گیانی ئەو مامۆستاو ڕابەرەی کە ئێمە لەڕێگای مانای قووڵی سرودەکانی ئەوەوە لەسەرەتاییدا ئەلفبای کوردایەتی بەمێشکماندا چوو، نابێ هێند نمەک بە حەرام بین لە ئاستیدا و سپڵەبین، نەریتی کوردەوارییە کەپیاو دەبێ بەرامبەر وەفاداران بەوەفابێ.) «5،3».

جا، گەر ئەمە درێژدادریی و سەر لە خوێنەر شێواندن نەبێ، چییە؟ تۆ بڵێی، کەسێ ئەو ووشە قەبەقەبانە نەنووسێ، وەک مامۆستایەکی ئایینیی گوتار نەخوێنێتەوە، نەفرەت لە گۆڕی ئەو کەڵەپیاوانە بکا، هەست بە شەونخونیی و ماندووییان نەکا! بەڵام، ئەمەیان بۆ باسەکانی دوایی هەڵدەگرین، تا بزانین، چ بەرانبەر « زێوەر » و چ بەرانبەر نەتەوە و نیشتمانەکەی، کێ « نمەک بە حەرام » و « سپڵە » یە؟ دیارە، هەموو کەسێ دەتوانێ، قسەبکا. چونکە، قسە هەژارە و هەموو کەسێ پێی دەوێرێ! بەڵام، گرنگ ئەوەیە، ئەو کەسە بزانێ، چی دەڵێ و چی دەنووسێ. دەردی « هەمزەتۆف » یش گوتوویەتی: (هەر ئەوەندە بەس نییە، ژنی کەمان شەتەکدەی، دەبێ، بزانی، چۆنی لێ دەدەی. ئەوەندە بەس نییە، زەویت هەبێ، دەبێ، بزانی، چۆن دەیکێڵی و دایدەچێنی.) «277،36».

## 2/3. ژیننامـــــــە :

سەیر ئەوەیە، پەنجاودوو ساڵ دەبێ، « زێوەر » مردووە، کەچیی، تازە یەکێکی وەک « بەرزنجیی » دەیەوێ، ژیان و بەسەرهاتەکانیمان بۆ باسکا، وەک نهێنییەکی هێندە شاراوە، کارێکی هێندە گران و مەتەڵێکی هێندە قورسبێ، هەر تەنیا خۆی بیزانێ! ئەوە لە کاتێکدا، لە چەن سەرچاوەیەکی مێژوویی و وێژەیی کوردییدا، ئەو زانیارییانە، زۆر بە ئاسانیی چنگدەکەون. خەڵکی کورد بە گشتیی و ڕووناکبیران بە تایبەتیی، هۆنەرێکی گەورەی وەک « زێوەر »، بە هەموو چاکە و

خراپەکانییەوە، زۆر باش دەناسن. گەر هەر کەسێ، ئارەزوویکا، تەنیا لاپەرەکانی « مێژووی ئەدەبی کوردی ـ عەلائەدین سەجادیی » هەڵداتەوە، کە چلوهەشت ساڵ لەمەوبەر نووسراوە، گەلێ زانیایی پتری دەربارەی هونەر تێدایە، لە چاو ئەو زانیارییانەی ئەو باسیکردوون. جا ئیدی، چ پێویستیدەکرد، مێژوونووسێکی ناودار و نووسەرێکی گەورەی وەک « بەرزنجیی »، ئەو گرێکوێرەیەیان بۆ بکاتەوە، باسی ژیانی « زێوەر »یان بۆ بکا، هێندێ لە کاتی زێرینی خۆی، بەو جۆرە لێکۆڵینەوە پڕ لە بایەخانەوە بکوژێ، سەری خەڵکی کوردیش بە خۆڕایی بیەشێنێ؟!! چونکە، لە ڕاستییدا، گەر لەو بوارەدا، لە کەروێشک دەسی کورتر نەبێ، هەرگیز درێژتر نەبووە و نییە!

دوور نییە، کاتێ، باسی ژیانی هونەرێکی ناسراوی وەک « زێوەر »ی کردووە، تەنیا هەر لە بەر یەکێ لەم هۆیانەی خوارەوە بووبێ:

1. نووسینەکە بە خۆڕایی درێژکاتەوە.

2. سەر لە خوێنەران بشوێنێ، لە مەبەسە سەرەکییەکە دووریان خاتەوە. تا وا بزانن، ئەز لە هەموو ڕوویەکەوە، دژایەتیی « زێوەر »م کردووە!

3. لە خەڵکی بگەیەنێ، من شارەزای مێژووی ژیان و بەسەرهاتەکانی ڕۆژانەی ئەو سەردەمانەی کوردستان نەبووم و نیم. زۆر ئاگاداری ژیانی « زێوەر »یش نیم.

ئەو لێکۆڵینەوەیەی ماوەی پتر لە دوو ساڵە بە دەسمەوەیە، لەگەڵ ئەو جۆرە لێکۆڵینەوە کلاسیکییانەی تا ئێستە کراون، زۆر جیاوازییان هەیە. چونکە، ئەوان بە درێژیی لە « ژیان، هەڵسوکەوت و بەرهەم »ی هونەرانی کورد دواون. بەلام، من تەنیا هەر ناوی تەواو، ساڵی لەدایکبوون و مردنیانم تۆمارکردووە. ئەگینا، هەر کەسێ بیەوێ، زانیاریی پتر دەربارەی ئەو جۆرە شتانە و لە سەر هەر هونەرێکی کورد بزانێ، ئەوا دەتوانێ، پەنا بۆ سەرچاوەیەکی وێژەیی یا دیوانە چاپکراوەکانیان بەرێ و بە تەواویی، شارەزای مێژووی ژیانیان بێ!

جا هەر لە ئێستەوە با بزانین، لە داهاتوودا چۆن باسی ژیانی « وێژەیی، نەتەوەیی و ڕامیاریی » هونەران دەکرێ. ئایا، هەر وەک ئەو نووسیوێتی، باسکرێ، یا پێویستە، چۆن ژیاوە، چی نووسیوە، هەڵوێستی نەتەوەیی و ڕامیاریی چۆن بووە، هەر وا باسکرێ، بێ ئەوەی سەراپای ژیانی بە پیاهەڵدان و زانیاریی ناڕاست ئارایشتکرێ؟ چونکە، ئەو جۆرە نووسینە کاڵوکرچ و ناڕاستانە، تەنیا هەر یەک هالاوی گەرمی تیشکی خۆری ڕاستییان لێ بدا، هەر زۆر زوو ئارایشتەکەی چروچاویان ئارەقدەردەدا و هێندەی دیکە ژیانیان دزێوتر دەبێ!

دەربارەی ژیانی هۆنەر، هەر لە سەرەتاوە تا ئەو جێیەی نووسیوێتی: (ئەم یەکێک بوو لەو « هەند » کەسانەی کە لەگەڵ خاووخێزانی شێخ شاریان بەجێ هێشت، ئاوارەو دەربەدەری مەریوان و هەورامان و موکریان بوون و بۆ ماوەیە ژیانێکی تاڵ و سەختیان بردەسەر.)«7،3» باش هاتووە. بەڵێ ڕاستە، ئەوانە هەموویان هەڵاتوون. هەر چەندە، باوەڕ ناکەم، بەو شێوەیە بووبێ، « ژیانێکی تاڵ و سەختیان بربێتەسەر. » وەک ئەو نووسیوێتی! لە جێگەیەکی دیکەشدا نووسیوێتی: (ژیانی پڕ لەدەربەدەری زێوەرو هاوەڵەکانیشی ئەوە لەبەرچاوە، کەسێک مەبەستی بێ با « گەنجینەی مەردان ـ یاداشتی ڕۆژانی دەربەدەری » بخوێنێتەوە.)«7،3» چونکە، ئەمە زۆر بە ڕوونیی، لە « گەنجینەی مەردان »دا دەردەکەوێ، نەک وەک ئەو ویستوویەتی، ئەو بەرهەمە بە گەواهیی درۆ ڕابگرێ! جا، ئیدی چەن لە دەرەوە بووە؟ چۆن ڕایبواردووە؟ پێویست ناکا، مێژووی ژیان و تێکۆشانی « زێوەر » و هاوەڵەکانی، بەو شێوەیە بنووسیتەوە، کە خۆی ئارەزووی لێی هەیە، وێنەیەکی ژیانی پڕ لە چەرمەسەریی و دەربەسەریی، هۆنەرمان بۆ بکێشی، چونکە، ئەوانە هەمووی ڕوون و ئاشکران، سەردەمەکەش هێندە دوور نییە، تا خەڵک وەک مێژووی « مادە »کان، لێی بە گومان بێ!

## 3/3. گەنجینەی مەردان :

لەبەرئەوەی « بەرزنجیی »، لە لایەکەوە، لە چەن شوێنێکی نووسینەکەیدا، باسی ئەو بەرهەمەی کردووە، بە ناو وەک سەرچاوەیەک بەکاریهێناوە! لە لایەکی دیکەشەوە، بۆ ئەوەی ڕاستیی قسەکانمان بسەلمێنین، کە « زێوەر » و هاوەڵەکانی تووشی سەغڵەتیی نەبوون، پەنا بۆ بەر قسەکانی خۆی دەبەین. تا بزانین، ئەو بەرهەمەی چییە و لە چیی دەدوێ؟ هێندەی پێوەندییشی بە باسەکەی من و سیبارەکەی « بەرزنجیی »یەوە هەبێ، چەن نموونەیەکی لێ دێنمەوە.
لە پێشدا، با بزانین، « گەنجینەی مەردان » چییە و لە چی پێکهاتووە؟ ئەو پەرتووکە، لە « 195 » لاپەڕە پێکهاتووە. نووسەر بە « 150 » لاپەڕە، باسی پیاوە ناودارەکانی کورد و عەرەبی کردووە. تەنیا هەر بە « 42 » لاپەڕە، لە «یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری » دواوە. لەو چلودوو لاپەڕەیەش، لە لاپەڕەکانی « 183-187 »دا، شتێکی گێڕاوەتەوە، هیچ پێوەندییەکی بە یادداشتەکانی خۆیەوە نییە! واتە: تەنیا سیوحەوت لاپەڕەیە.
« زێوەر »، لەو ڕۆژەوە هەڵاتووە، تا گەڕاوەتەوە، بە چەن گوند و ناوچەیەکی وەک : « بناویلە، نۆدێ، چنگیان، کانیشیلان، هەولوو، دۆڵبەموو، سەرکان، باشماخ،

مەریوان، کانیسانان، باڵک، نژمار، دەرزییان، چۆڕ، بانە، شوێ، ساوان، نواوێ و زەنبیل دا تێپەڕیوە و لە هێندێکیشیان ماوەتەوە.
ڕاستە، « زێوەر » وەک کوردپەروەر و شۆڕشگێڕێ، کوردایەتیی کردووە و لە شۆڕشەکەی « شێخ » دا، ساڵی « 1919 » بەشداریکردووە. کاتێ شۆڕشەکەش تێکشکاوە، « شێخ » بە برینداریی گیراوە و ڕەوانەی « هیندستان » کراوە، ئەو لەگەڵ هێندێ لە نیشتمانپەروەرانی دیکەی کورددا هەڵاتوون، پەنایان بۆ بەر گوندەکانی کوردستان بردووە. هەر چەندە، لە ماڵ و منداڵ و شارەکەی خۆیان دوورکەوتوونەتەوە، کەمێ ماندووبوون. بەڵام، وەک « بەرزنجیی » باسیکردووە و شتەکەی زلکردووە، تا سۆزی خوێنەر ڕاوکا، بەو شێوەیە نەبووە. چونکە، نە هێزەکانی ئینگلیز دوایانکەوتوون، نە لەگەڵ دوژمندا تووشی شەڕ بوون. نە هیچیان کردووە، نە زۆر ماندوو و سەغڵەتیشبوون. بەڵکوو، ئەو جۆرە هەڵاتن و خۆشاردنەوانە، وەک گەشت و سەیران وابوون. چونکە، ئەو لەگەڵ خێزان و کوڕەکانی « شێخ » دا بووە. ئەو بنەماڵەیەش، لە هەموو کوردستاندا ناسراون، ڕوویان لە هەر کوێیە کردبێ، ماڵی خۆیان بووە و ڕێزێکی بێ پایانیان لێ گیراوە. نە پەنجەیەکیان گەرمبووە، نە لە خواردن و خواردنەوەش، پەکیانکەوتووە. لەبەرئەوە، یەکێکی وەک « بەرزنجیی »، زۆری پێوە ناوە، کاتێ باسی ئەو هەڵاتنەی کردووە. ئینجا با بزانین چۆن؟
« زێوەر » خۆی، لە چەن جێگەیەکی نووسینەکەیدا، زۆر ڕاسگۆیانە، باسی ئەو ڕێزلێگرتن و میوانداریییەی کردووە و نووسیوێتی: (چووینە « هەولوو »، ئاوایی تیا نەبوو،* یەک پیاو نەبێ، بە دیار تووتنەوە دانیشتبوو. ئێمەش بە هەموومان کە مەوجوود گەیشتبووە سەدوپەنجا کەسێ، یەک قۆریە، دوو پیاڵە، یەک دوو پارچە مسمان هەبوو. هی وا هەبوو هەتا نۆبەی چای بەیانیی بهاتایە سەر# وەقتی چای عەسری دەهات. ئەمما لە جیهەتی خواردنەوە کەس موعەتتەل نەدەبوو. ماڵی شێخ دووسەد سەر مەڕ و بزن و کار و بەرخیان دەرکردبوو، هەر ڕۆژێ دوو سێ سەر حەیوانمان سەرئەبڕی.)«154،40» ئەوە ئەو کاتە، ئاوایی کەسی تێدا نەبووە و لە سەر خۆیان ژیاون، بۆیە، کەمێ لە چاخواردنەوەدا سەغڵەتبوون! ئەگینا، کاتێ لە گوندەکان دامەزراون، لە هیچیان کەم نەبووە. ئەوەتە، لە جێیەکی دیکەی نووسینەکەیدا، نووسیوێتی: (بۆ قاوەڵتی چووینە « دۆڵبەموو ». مەردانە، دۆستانە، خزمانە، خزمەتیانکردین.)«156،40»

* دەبووایە بینووسیایە: ئاوایی کەسی تیا نەبوو یا کەسی تیا نەبوو. # دەهاتەسەر.

پاشان نووسیویەتی: (لە باشماخ هەستاین. سوارەی مەحموودخان پێشمانکەوت. لە ڕێگای شاخەوە کە بۆ ئێمە مەحفووزتربوو، کەوتینەڕێ. بە بەر هەر دێیەکدا کە دەرۆیشتین ئیستیقبال، حورمەت، مەمنوونی، مەحەببەتیان دەنواند تا گەیشتینە کانیسانان.) «160،40» دوایی، «زێوەر» لەگەڵ کوڕانی «شێخ »دا، بەرەو گوندی «کانیسانان» بەڕێکەوتوون. لەوێ، «مەحموود خان» پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێ کردوون و ڕازەیکردوون. (قەیسی و سێو میوەی ئەو وەختەیان بوو، هێنایان. سەماوەر هاتەپێشەوە.) «161،40» (چامان خواردەوە، نیو سەعاتی مابوو بۆ غرووب هەموو ڕەفیقانم گەیشتنەجێ. مەجموویعی ژن و منداڵ و پیاو سەدویەنجا کەس دەبوو. هەشتا ئولاغ: ئێستر و ئەسپ و ماینیشمان دەبوو. ئەم هەموو خەڵقە مونتەزەم چادرا. نانێکی جوان دروستکرابوو.) «161،40»

کاتێ لە گوندی «بالک »یش بوون، («زەهیر» ناوی کەیخوسرەوبەگە لەگەڵ ئەحمەدبەگی برازای ڕەسمی میوانداریان بە جوانی بەجێهێنا. چای ئێوارێ خورایەوە. بۆ «نژمار» کە دێی مەحموودخانی هەورامی بوو، حەرەکەتمان کرد. سەعاتێ لە بالکەوە دوورە. زوو گەیشتینە ئەوێ. مەحموود خان خەبەری زانیبوو، لە «نزلی »یەوە بە ئیستیقبال حەرەکەتی کردبوو.) «163،40»

لە «بانە »ش ڕێزیان کەمتر لێ نەگیراوە، بۆیە نووسیویەتی: (وەقتی مەغریب داخلی بانە بووین، حەمەتاڵ پیاوی ڕۆستەم خان لە پێش ئێمەدا میوانیی شێخ قادر و منداڵانی تەقیبی کردبوو، تەعریفمان بیستبوو، ڕوومانکردە ماڵی ئەوان. ئەگەرچی خۆی لە ماڵ نەبوو. ئەمما لە تەرەفی برا و کەسوکاری بە نەوعێ خزمەتیانکردین، مەفتوونیان بوین.) «177،40»

ئێنجا با بزانین، لە گوندی «ساونا» چۆن ڕایانبواردووە؟ (لە ساونا بۆ ئەمینیی و خواردن و خواردنەوە و ئیستیراحەت لە بەهەشتا بووین.) «181،39» دەربارەی میوانداریی گوندێکی دیکەش نووسیویەتی: (شەو لە «نواوێ »دا زۆر خدمەتیان کردین. ڕەعیەتەکەی هەموو سمایلعوزێریی بوون لەوێدا ئیسکانن بووبوون. بە چوونی ئێمە گەلێ خۆشحاڵبوون.) «189،40»

لە دوا قۆناغیشدا، پێش ئەوەی بە یەکجاریی بگەڕێتەوە، سەردانی «زەنبیل »ی کردووە و نووسیویەتی:(سەیید موحەممەد هات، دەست بەجێ سوارەکانی دابەزاند، باریان بۆ بارکردین، منداڵانی شێخی سوارکرد، چووینە خانەقاە، ئەوی لازیمەی میوانداریی بوو بە ئەمری سەیید ئیجراکرا و بە خۆشی دامەزراین. لە پاش دوو سێ ڕۆژ ئیستراحەت ئاغایانی «ئەسکی بەغدا »جەنابی حاجی موئمین

خان و قۆچ بەگ بۆ زیارەت هاتنە زەنبیل. کە چاویان بە من کەوت بە واسیتەی موعارەفەی پێشوو تەکلیفیان کرد من بچمە خدمەتی ئەوان. منیش ئیجابەتم کرد. کە تەشریفیان ڕۆیەوە ئولاغیان بۆ ناردم، چوومە ناو ئەو بەگزادانە، ئەو عالی هیممەتانە.)«191،40»، دوای ئەوەش، بە چەن ڕۆژێ گەڕاوەتەوە بە ماڵ و منداڵی خۆی شادبۆتەوە. ئیدی دەبێ، گەشت و سەیران لەوەخۆشتر چی بووبێ!

« زێوەر » یادداشتەکەی خۆی تەواو نەکردووە، تا گوندی « زەنبیل » و ناوچەی « موکریان »ی تۆمارکردووە. ئیدی، لەوە بە دوا نازانین، بەرەو کوێ ملی ڕێگەی گرتووە! هەروەها بە هیچ جۆرێ، باسی گەڕانەوەی خۆی بۆ « سولەیمانیی » نەکردووە! لەبەرئەوە، کەی گەڕاوەتەوە؟ لەگەڵ کێ گەڕاوەتەوە؟ ئاشکرا نییە. جگە لەوەی، لە یەکەم ڕۆژەوە دەرچوون، تا لە ناوچەی « موکریان » جێگیربوون، مێژووەکانی نەنووسیوە، تا بزانین، ئەو سەردەمانە چۆن بوون و بە سەرچاوە مێژووییەکانی دیکە، بەراوردیانکەین! لە ڕاستییدا، یادداشتەکەی شتێکی ئەوتۆ نییە، بۆ ئەم ڕۆژە کەڵکی لێ وەرگیرێ. چونکە، زانیاریی گرنگی تێدا نییە. وەک خۆشی نووسیویتی: (مەقسەدم لە نووسینی ئەم تەئریخە بچکۆلەیە بەیانی ئەحواڵی عەشیرەت و میللەتی کوردە. بەو موناسەبەوە واقیعاتی خۆم نووسیوە.)
«191،40».

## 4/3. هەڵوێست:

بەڵام، پرسیارەکە لێرە دایە، ئایا، کاتێ « شێخ » گیرا، ئینگلیزەکان بڕیاری خنکاندنیان دەرکرد، پاشان، ئەو بڕیارەیان بە گرتن و دوورخستنەوەی گۆڕی، « زێوەر » چی کرد؟ چی بۆ « شێخ » کوت؟ بۆچی بە ڕاشکاویی نەڵێین: لەو ڕۆژە بەدواوە، بەرە و شار پاشەوپاش گەڕاوەتەوە، گێڕی بەرژەوەندییەکانی خۆی گۆڕیوە، زۆر بە ئاسانیی، بە سەرەولێژکەی ژیانی تایبەتیی خۆیدا شۆڕبۆتەوە، ئیدی بۆ خۆی ژیاوە، تا بۆ دوا جار، چاوی لێکناوە! ئەگینا، گەر وا نییە، لەو ڕۆژەوە گەڕاوەتەوە، جگە لەوەی بە « ژیانی ئاسایی ڕۆژانە، کارکردن، هۆنراوەگوتن و خواناسیی » خۆیەو خەریکبووە، با « بەرزنجیی »، تەنیا یەک هەڵوێستی نەتەوەیی و ڕامیاریی هۆنەرمان بۆ باسکا و بڵێ قیر!

وەک ئەوەی، تەنیا هەر، هەڵوێستی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەریی، بەوە بپێورێ، کاتێ شۆڕشێکی چەکداریی لە کوردستاندا بەرپابێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، تا چەن دوای ئەو شۆڕشە دەکەون، هەڵدێن و پەنا بۆ شاخ دەبەن، چەکی بۆ هەڵدەگرن و داکۆکیی لێ دەکەن! بۆیە، « بەرزنجیی » نووسیویتی: (لەو منەوەرو

شاعیرانەی بەدەوری شێخەوەبوون، تەنیا ئەم و حەمدی ساحێبقران 1936-1878 و حسێن نازم بوون کە لەشاردا نەمانەوە، ئەوانی دی ملیان بۆ حوکمی تازەداو بەڵکو هەندێکیشیان بوونە برغوو پارچەو کەرەسەی ئەو دەسەلاتەی کەئینگلیز لەشاردا دایمەزراندو هێدی هێدی پەل و پۆی بۆ دەورویەریش هاویشت.)«7،3»

بە ڕاستیی نازانم، دەیەوێ، چی بڵێ؟!! ئایا، هەر لەبەرئەوەی، ئەو سێ هۆنەر و ڕووناکبیرە ڕایانکردووە، ئیدی دەبێ، بە نیشتمانپەروەر و ئەوانی دیکەی ڕایان نەکردووە، بە خۆفرۆش دانرێن؟ من ئێستە دەڵێم: هەر چەندە، لە بریا هیچ شێن نابێ! بەلام بریا، نەک هەر کەس ڕای نەکردایە و شاریان چۆڵ نەکردایە، بەڵکوو، وەک ئەوانی دیکە بمانایەتەوە. بە زمانێکی هێمن، لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بدوانایە، ڕەشەخەڵکەکەیان تووشی « ئازار، ڕاکردن، سزادان و گرتن » نەکردایە! بەجێیان نەهێشتنایە، ڕێگەی ڕاستیان پیشاندانایە، ئەوە گەلێ لەوە باشتربوو، ماوەیە خۆیان گورگەکەن، پاشان، بۆ لای هەمان سوورەی چاوشینی ئینگلیز بگەڕێنەوە! ئیدی، پاڵی لێ بدەنەوە و بڵێن: ئاگرەسوورە لە خۆمان بە دوورە!

ئەدی، کاتێ شاریان جێهێشت، چییان کرد؟ خۆ لەو سەردەمەدا، دوای ئەوەی « شێخ » گیرا و دوورخرایەوە، ئیدی، هەموو شت تەوابووبوو. چونکە، نە پارتێکی رامیاریی هەبوو، تا لە دوورەوە سەرپەرشتییبکەن، نە شۆڕشێکی چەکدارییش هەبوو، تا بەشداریی تێدا بکەن و درێژەی پێ بدەن. ئینجا، سەدان هەزار خۆزگەش بەوە دەخوازم، « شێخ میش هەر لە سەرەتاوە، تەقەی نەکردایە و شاخی لە کەس نەگرتایە. چونکە، مێژوو و ڕۆژگار بۆی سەلماندین، ئەو هەموو هەوڵدانە چەکدارییانەی کورد، لە مێژووی خوێناویی خۆیدا داوێتی، لە مالوێرانیی پتر، هیچی دیکەی بۆ کورد تێدا نەبووە و ناشبێ. ئەو کەلانەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی « بریتانیا » ش بوون، هەموویان پێگەیشتن و دەوڵەتی نەتەوەیی خۆشیان بۆ دامەزراندن. جگە لەوەی، ئەوانەی ڕاشیانکرد، هەر زوو گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوە! ئیدی باشتر نەبوو، ئەو ئەرکە خۆڕاییییەیان نەکێشایە و لە شار بمانایەتەوە، وەک هاوەڵە هۆنەر و ڕووناکبیرەکانی دیکەیان مانەوە؟!!

جا گەر وابێ و بەپێی ئەو بۆچوونەی « بەرزنجیی » بێ، ئەوا سالی « 1974 » یش، کاتێ جەنگی کوردستان، لە نێوان سەرانی شۆڕش و دەوڵەتی داگیرکەری عێراقدا هەڵگیرسایەوە، دەزگەی « پاراستن »ی سەر بە بنەماڵەی « بارزانیی »، خەڵکێکی زۆریان بە هەڵە فریودا، بۆ ئەوەی هەڵێن. هێندێکی دیکەش، هەر لە ڕوانگەی

دڵسۆزیی و نیشتمانپەروەریی خۆیانەوە، لە هەموو باشووری کوردستانەوە ڕایانکرد و پەنایان بۆ شاخ برد. بەڵام، لەگەڵ جەنگەکە بە تەواویی گەرمبوو، فڕۆکەکانی « بەعس »، کوردستانیان بۆمبارانکرد، هەر بە لێشاو خەڵک گەڕانەوە. ئایا، ئەمانیش وەک ئەوانەی سەردەمی ئینگلیزەکان گەڕانەوە، وەک ئەوانەی لە هەر دوو سەردەمەکەدا نەڕۆشتبوون، هەر « برغو و پارچە و کەرەسەی « ئینگلیز و « بەعس « بوون؟ خۆ ناشێ، گەڕابنەوە، هەر دوو داگیرکەریان، لە کوردستان بە قۆچەقانیی دەرکردبێ!!! یا با بڵێین، « جگە لەو ڕێکخراوانەی دژی شۆڕشەکە بوون، جگە لەو کوردە ناپاکانەی خۆیان فرۆشتبوو، چەکیان بۆ داگیرکەر هەڵگرتبوو « ئایا، هەموو ئەوانەی هەر لە بنەڕەتدا ڕایان نەکرد، لە نێو شارەکاندا مانەوە، وەک ئەو نووسیوێتی: « ملیان بۆ حوکمی تازەدا و بەڵکوو هەندێکیشیان بوونە برغو و پارچە و کەرەسەی ئەو دەسەڵاتەی کە ئینگلیز لە شاردا دایمەزراند و هێدی هێدی پەل و پۆی بۆ دەوروبەریش هاویشت. « یا، لە نێو شارەکاندا بە هەزارانیان، لە ریزەکانی « شۆڕش و پارتیی »دا، بە نهێنیی کاریاندەکرد؟!! هێندێکیشیان، لە قوژینی گرتووخانە تاریکە پڕ ترسناکەکانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق توند کرابوون، بە درندانەترین شێوە، ئازاردەدران. هێندێکی دیکەشیان، لە سێدارە دران و گیانی پاکیان بە نەتەوە و نیشتمانەکەیان بەخشی!
ئەدی « بەرزنجیی »، چۆن باسی ئەو کەڵەپیاوانە دەکا، کە شاریان چۆڵ نەکرد؟!! خۆ خۆشی یەکێ لەوانە بوو، نەک هەر لەو کاتەدا، بەڵکوو، تەنانەت لە هەموو ژیانیشیدا، ئەوەتەی هەیە، لە جادەی قیری شاری « سولەیمانیی « دوور نەکەوتۆتەوە! چونکە، هەر ڕێخکراو و پارتێکی کوردستان، لە هەر سەردەمێکدا، لەگەڵ دەسەڵاتی « بەغدا « کۆک و ڕێکبووبێ، ئەم، گەر لەگەڵیشیان نەبووبێ، ئەوا دڵ و باوەڕی لایان بووە! وەک دەڵێن: هەر کەسێ کار بووبێ، ئەم کورتان بووە!
ئەدی بێمان نالێ، ئەو هەزاران کوردەی ئەوڕۆ، لە کوردستانی بندەستی دەوڵەتی عێراق و لە ناوچە عەرەبییەکاندا دەژین، یا ئەو چەن ڕووناکبیر و نووسەرانەی لە « بەغدا « دەژین، چۆن ناویاندەبا و بە چ چاوێ لێیان دەڕوانێ؟!! بە لای منەوە، ئەوڕۆ پیاوی « ڕووناکبیر، نووسەر و کوردپەروەر »ی وامان هەن، لە ناوچەکانی بندەستی ڕژێم و « بەغدا « دەژین، بە دەیان جار، لە زۆربەی زۆری خەڵکە دەسڕۆشتووەکەی ناوچە ئازادکراوەکانی باشووری کوردستان، نیشتمانپەروەرتر و دڵسۆزترن. چونکە، هەر هیچ نەبێ، بە هیچ شێوەیە، دەستیان لە « دزیی، ئاودیوکردن، سزادان و ئازاردانی خەڵک، دەستدرێژکردنە سەر ئابڕووی کیژ و

ژنانی کورد، ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناپاکیی، جەنگی نێوخۆ و وێرانکردنی کوردستان دا نەبووە و نییە!
بە داخەوە، ڕووداوەکان زۆر بە هەڵە لێکدەدرێنەوە. ڕاستە، هێزەکانی « بریتانیا » لە کوردستان بوون، بەڵام، هەموو بەڕێوەبەرێتییەکان کوردیی بوون و بە دەس کورد خۆیەوە بوون. ئایا، باشتر نەبوو، کورد هاوکاریی لەگەڵ ئینگلیزدا بکردایە، کاروباری کوردستانیان ڕاپەڕاندایە، لە بری ئەوەی، دژی ئینگلیزەکان بووەستن و جەنگی دژ بکەن؟!! بەڵێ، کورد جەنگی دژی ئینگلیزەکان ڕاگەیان، ئەو ئینگلیزانەی، لە سەر داوای « شێخ مەحموود » خۆی، بەرەو « سولەیمانیی » کشان و دەزگەکانی یەکەم دەوڵەتی کوردییان دامەزران. لێرەدا، چەن پرسیارێ سەردەردێنێ: کێ یەکەم چاپخانەی لە شاری « سولەیمانیی » دامەزران؟ کێ ڕۆژنامە و گۆڤاری بە کوردیی دەرکرد؟ کێ هانی نووسەر و هۆنەرەکانی کوردی دەدا، بە کوردییەکی ڕەسەن و پەتیی بنووسن؟ کێ هەوڵیدەدا، گرامەری زمانی کوردیی بۆ کورد دانێ؟ ئەدی ئەمانە، هەمووی هەر پیاوەکانی ئینگلیز نەبوون؟ ئیدی ئەوان. لە چاو وەچەکانی پەیامبەردا، خراپی چی بوون، کە تا ئەڕۆش، لە دوو پارچەی نیشتمانەکەماندا « باشوور و خۆراوا »، زمانی کوردییان قەدەغە کردووە و بە هەموو شێوەیە هەوڵی قڕکردنمان دەدەن؟ ئایا، هەر، زێوەر، خۆی نەبوو، کاتێ گەڕاوەتەوە، بەرهەمەکانی لە ڕۆژنامەی « پێشکەوتن دا بڵاو کردۆتەوە؟ ئیدی چ پێویستدەکا، ئەوانەی شاریان جێ نەهێشتبوو و کاریان لەگەڵ ئینگلیزدا کردووە، لەوانەی پەشیمانبوویوونەوە و گەڕابوونەوە، جیاکرێنەوە؟ ئەوان، گەر سەرەتا کەمێ لەکبوون، لە کۆتاییدا هەموویان چوونیەکبوون!
کەواتە، بۆ دەبێ، ئەوانەی ڕایان نەکردووە، ملیان بۆ دەسەڵاتی نوێ شۆڕ کردبێ، هەندێکیشیان « برغو و پارچە و کەرەسەی » ئەو دەسەڵاتەی ئینگلیز بووبن؟ ئەدی، ئەوانەی هاوکارییان لەگەڵ ئینگلیزدا نەکردووە، چییان کردووە؟ سەیر ئەوەیە، ئەو هاوکاریی و پشگیرییکردنەی ئینگلیزەکان، بۆ عەرەبەکانی عێراق ڕەوابووە و کەس گللەییان لێ ناکا. کەچیی، بۆ ئەو چەن ڕووناکبیرەی، بە باشیی لە باری سەردەمەکەی خۆیان گەیشتبوون، جێگەی ئەنگییە و ئەوڕۆ ڕەخنەیان لێ دەگیرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕووداوەکان بە ئاشکرا سەلماندی، ئەو کارەی ئەوان کردیان، لە کاری هاوەڵەکانی دیکەیان ڕاستتربووە! ئایا، ئەو کوردانەی، لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هاوکارییانکردووە، هەر لەگەڵ هەمان عەرەبی عێراقدا، لە یەک دەوڵەتی بندەسی « بریتانیا دا نەبوون؟ پێکەوە کاریان نەکردووە؟

## 5/3. گەڕانەوە :

پاشان هەر لە خۆیەوە، پاکانەی بۆ ئەوانە کردووە، کە گەڕاونەتەوە، وەک ئەوەی یەکێ ڕەخنەی لە گەڕانەوەیان گرتبێ! بۆیە نووسیوێتی: (کە شەویش ئەموستەچاو بوو چوار لات لێ تەنراو «ئەمەل» نەما، ئاخۆ گێلی و خۆ کوشتن نیە مل بنێت و بەرەو نادیار هەنگاوبنێت؟ ... گەڕانەوەی زێوەرو هاوەڵەکانی لەبارودۆخێکی ئاوەهادا بوو، تروسکایی هیوایەک لەخوار را بریسکەی دایەوە: گەڕانەوەی شێخ بوو لەبەندی و ئەسارەت.)«8.3»

ئەوانەی ڕایانکردبوو، هەر لە سەرەتاوە، بەرەو نادیار هەنگاویان نابوو، ئیدی بۆ دەبێ، کاتێ گەڕاونەتەوە، پاساوی ئەوەیان بۆ بدرێ، تا بەرەو نادیار هەنگاو نەنێن؟!! چونکە، ئەو کاتەی ئەوانە ڕایانکردووە، نە پارتێکی ڕامیاریی و نە شۆڕشێکی چەکداریی، لە کوردستاندا نەبووە. کاتێ «شێخ» یش گیرا، جولانەوەکە بە تەواویی وەستا، جا گەر، لە ترسی ژیان و گیانی خۆیان نەبووبێ، بۆ ڕایانکردووە؟ پێم وایە، ئەو چەن کەسە، هەر لە بنەڕەتدا، ڕایان نەکردایە و نەڕۆشتنایە، گەلێ باشتربوو. بەڵام، کە ڕۆیشتن و گەڕانەوە، بە کارێکی زۆر ئاسایی دادەنێم. چونکە، دەبێ، لە خۆمان بپرسین: بۆ ڕۆیشتن؟ بۆ کوێ چوون؟ لە پێناوی چیدا هەڵاتن؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بۆ هیچ و لە بەر هیچ ڕۆیشتن. بەڵام، لە پێناوی ژیاندا گەڕانەوە!

«بەرزنجیی» نیازی وایە، مێژووی ڕووداوەکانمان لێ تێکدا، وەک چۆن سەراپای سیپارەکەی، لە زانیاریی ناڕاست و چەواشەکەرانەدا نقوومبووە! چونکە، بەپێی لاپەڕەکانی «چیم دی» بێ، جەنگی «دەربەندی بازیان» لە «1919/06/22»دا ڕوویداوە، هەمووی ڕۆژێکی خایاندووە و تەواوبووە. پاشان، «شێخ» گیراوە، (لە دوای سێ ساڵێک دیلی و مەینەتیی ڕابواردن لە بەندیخانەی بێگانە، بە دەبدەبە و شکۆیەکی شاهانە گەیشتەوە سلیمانی «1922/09/30»)«517.37»

هەروەها، بەپێی یادداشتەکەی «زێوەر» خۆشی بێ، کەس نازانێ، کەی ڕایکردووە و کەی گەڕاوەتەوە! بەڵام، چونکە ماوەیەکی زۆر، لە هەموو گوند و ناوچەکان نەماوەتەوە، بەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، هەمووی چەن هەفتەیە لە دەرەوە بووە و گەڕاوەتەوە. واتە: کاتێ «شێخ» گیراوە، «زێوەر» هەڵاتووە. پێش ئەوەی بەریشبێ و بگەڕێتەوە، ئەو گەڕاوەتەوە. خۆ ناشێ، «زێوەر» سێ ساڵ لە دەرەوە مابێتەوە و چاوەڕوانیکردبێ، تا هەواڵی گەڕانەوەی «شێخ» ی بەرگوێ کەوتبێ! لەبەرئەوە، پێش ئەوەی، لە هیچ لایەکەوە، هیچ جۆرە تروسکاییەک دەرکەوتبێ،

پێش ئەوەی، هیچ جۆرە نیشانەیە، بۆ گەڕانەوەی « شێخ » هەبووبێ، « زێوەر » و هاوەڵەکانی گەڕاونەتەوە. بەلام، « بەرزنجیی » وەک خۆی دەخەڵەتێنێ، دەیەوێ، خوێنەریش لەگەڵ خۆیدا بخەڵەتێنێ! گریمان، خەڵکی بۆ خۆی دەخەڵەتێنێ، ئەدی خۆی بۆ کێ دەخەڵەتێنێ؟!!
ئینجا، هەروا بە دەم وڕێنە و ئەندێشەوە، قسەی بزرکاندووە و نووسیویتی: (خۆ کە هاتیشەوە، کابرا نەچوو « فەوجێک خەفیفە یا مەفرەزەیە تەواری » بکاتەوەو گەنجەکانی ولات راپێچ کات، لەم کێو بۆ ئەو شاخ و لەم دۆڵ بۆ ئەو نشێو.)«8،3»
بریا، کەمێ لۆژیکی دەبوو، کەمێ ژیرانە ڕووداوەکانی هەڵدەسەنگان. چونکە، ئەو سەردەمە، نە شۆڕشێکی چەکداریی هەبووە، نە « فەوجی خەفیفە یا مەفرەزەی تەواری » هەبووە، تا یەکێکی وەک ئەو، ئەو کارەبکا. جگە لەوەی، « زێوەر » پیاوی ئەو کارە نەبووە، هەرگیز ئەو جۆرە کارە ناپاکانەیەش، لە شان و شەوکەتی هۆنەرێکی ڕووناکبیری وەک ئەو نەوەشاوەتەوە. بەلام، لە هەمان کاتیشدا، گەڕانەوەی یەکێکی وەک ئەو، کە نزیکی « شێخ » بووە، هەروا بە خۆڕایی نەبووە. دیارە، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە، پێوەندیی بە ئینگلیزەکانەوە کردووە، بەرانبەر بە گەڕانەوەی، قایلبوونی ئەوانی وەرگرتووە. ئینجا گەڕاوەتەوە. ئەگینا، لادێییەکی نەناسراو نەبووە، تا بە دزییەوە یا بە ئاشکرا، بەرەو شار، ملی ڕێگەی گرتبێ، بێ ئەوەی کەس بیناسێ یا پێ بزانێ! ئەوە قسەیەکە، مەگەر هەر تەنیا، لە هەگبەکەی « بەرزنجیی »دا دەستەکەوێ.
پاشان نووسیویتی: (بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە گەڕایەوە تا سەعات 6،5 ڕۆژی 30 ئەیلولی1922 کەشێخ تیاهاتەوە ناوشار، تەنیا یەک دێرە شیعری بە شان و باهوی کاربەدەستانی ئەو ڕۆژەدا هەڵنەداو نووسینێکی لەسودی ئەوان بلاونەکردەوە.)«8،3» لێرەدا، من ناتوانم، بڵێم: ئەم گەواهییدانەی لە سەداسەد ڕاستە. لە هەمان کاتیشدا ناتوانم، بڵێم: نەخێر، وا نییە. چونکە، لە لایەکەوە، گەلێ جار هێندێ کەس، هێندێ کاری خراپە دەکەن، کەس پێی نازانێ. یا بە ناوێکی خوازراوەوە شت دەنووسن.
لە لایەکی دیکەشەوە، گەر مێژووی گوتنی هۆنراوەکانیمان بزانیایە، هەڵبەتە، ئەو کاتە بڕیارێکی بنەبڕیمان دەدا. چونکە، مێژووی دانانی ئەو هۆنراوانە، گەلێ شتی گرنگمان بۆ ڕووندەکاتەوە. بۆیە، لێرەدا من دەپرسم: ئایا، « زێوەر » ئەو هۆنراوانەی کەی هۆنیوەتەوە؟ چونکە، تەنیا ئەو دوو هۆنراوەیەی بۆ باری ناسایشی داناوە، خۆی لە خۆیدا، شتێکی ئاسایی نییە. دانی بەوەدا ناوە،

ئینگلیزەکان بە شێوەیەکی باش و ڕێکوپێک، ناوچەکە بەڕێوەدەبەن. ئەوەش لەو ڕۆژ و سەردەمەدا، بۆ ئەوان شتێکی کەم نەبووە. لەوانەیە، هەر هێندەشیان لە خوێندەوار و هونەرێکی ناسراوی وەک ئەو ویستبێ، کە یەکێ لە نزیکەکانی « شێخ » بووە! خۆ نەدەکرا، هەر وەک « بەرزنجیی » خۆشی نووسیوێتی: « فەوجی خەفیفە و مەفرەزەی تەواری » بۆ بکەنەوە. چونکە، ئەوە کاری ئەو نەبووە. تەنانەت لەم سەردەمانەشدا، دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، ئەو کارانەی بە ڕووناکبیر، نووسەر و هونەرە کوردەکان نەسپاردووە. بەڵکوو، ئەوانەی لەگەڵ ئەو ڕژێمەدا دەستیان تێکەڵکردووە و هاوکارییانکردووە، هەر لە ڕێی نووسین و پێنووسەکانیانەوە بووە. ئەوانەی چەکیشیان هەڵگرتووە، زۆر ئاشکران، کێ بوون! « سەددام حوسێن »، لەگەڵ ئەو هەموو گرفتە نێوخۆیی و دەرەکییەی هەیبوو، هێشتا، هونەری کوردی چەکدار نەکردبوو، تا ئینگلیزەکان دژی « هیچ ! »، یەکێکی وەک « زێوەر » چەکدارکەن و « فەوجی خەفیفە و مەفرەزەی تەواری » بۆ بکەنەوە. بەڵکوو، بۆ کاربەدەستانی ئینگلیزی ئەو سەردەمەی « سولەیمانیی »، هەر هێندە بەسبووە، گەر یەکێکی وەک « زێوەر » دامرکێننەوە، لە هەموو شتێ دووری خەنەوە، تا مردن، بەشداریی هیچ جۆرە چالاکییەکی « نەتەوەیی، ڕامیاریی و چەکداریی » نەکا، دژی ئینگلیزەکان نەوەستێ، هاوکاریی لەگەڵ « شێخ »دا نەکا. تەنانەت، هۆنراوەیەکیشی پێشکەش نەکا! هەر وەک « بەرزنجیی » خۆشی نووسیوێتی: (بەڵکو ناوبەناو شیعرێک یان نووسینێکی ئاینی یاکۆمەڵایەتی بڵاودەکردەوە، وەیا تیل و توانج گرتنێ کەبێتە پەندو عیبرەت.. نامیلکەیەکیش « چیرۆکی پێغەمبەران » ...)«8،3» ئیدی، لەوە پتر دەبێ، من چیدیکە باسکەم، گەر ئەو خۆی ئەو گەوهەیەمان بۆ بدا، کاتێ « زێوەر » گەڕاوەتەوە، خۆی بە چییەوە خەریککردووە! یا لەوە پتر دەبێ، ئینگلیزەکان چییان لێ ویستبێ!

من بە هیچ جۆرێ، گومانم لە پاکیی و دڵسۆزیی « زێوەر » نییە. لەو باوەڕەدام، بە هیچ شێوەیە، سەری بۆ ئینگلیز شۆڕ نەکردووە، وەک ئەو دەیەوێ، بە زۆر و بە دەرزیی، لە مێشکی خوێنەری بناخنێ! گوایە، من گوتوومە: « زێوەر » پیاوی ئینگلیز بووە. بەڵام، ئەوەی گوتوومە و هەمیشەش دەیڵێمەوە، ئەوەیە، دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە، ئیدی دانیشتووە، وەک فەرمانبەرێکی دەوڵەت کاریکردووە، وازی لە هەموو شتێ هێناوە. جا گەر وا نییە و کارێکی گەورەی « نەتەوەیی، ڕامیاریی یا شۆڕشێکی چەکداریی » کردووە و من پێم نەزانیوە، ئەوا داوا لە « بەرزنجیی » دەکەم، بۆمان ڕوونکاتەوە، تا منیش ئاگاداربم! خۆ گەر واش نییە، ئیدی ئەو

بۆچوونەی من، ئەوە ناگەیەنێ، کە ئەو هەر لە خۆیەوە بیری لێ دەکاتەوە!
لەوە دەچێ، جگە لەوەی « زێوەر » ڕەوشەکەی بە دڵ نەبووە، هیچ شتێکیش نەبووە، تا خۆیانی پێوە خەریککەن، شۆڕشێ نەبووە، تا بمێننەوە و خەباتبکەن، لەوەش ترساوە، خان و بەگزادەکانی ئەو ناوە بیانگرن و لە پێناوی پوڵدا، ڕەوانەی لای ئینگلیزیان کەنەوە. هەر وەک خۆشی نووسیویتی: (لەحەزە لەحەزە خەوفی بەگزادەمان بوو کە بمانگرن لە پێناوی خانەکانا.)«173،39» بۆیە، تووشی نائومێدیی بووە و گەڕاوەتەوە. بە هەڵەشدا ناچم، گەر بڵێم: بە هیچ شێوەیە، باوەڕی بە هیچ شتێ نەمابوو، سەری خۆی کپزکردووە و بۆ خۆی ژیاوە. هەروەها، دڵنەوایی ئینگلیزەکانیشی کردووە، بۆ ئەوەی ژیانی لێ تێک نەچێتەوە. چونکە، تا لە ژیاندا بووە، بە تەواویی، دەستبەرداری ئەو ژیانەی پێشووی خەباتی « نەتەوەیی، ڕامیاریی و چەکداریی » گەلەکەی بووە، ئیدی بۆ لاقی خۆی بە تەڵەوە بکاتەوە؟!!
خۆ گەر وا نییە، ناشێ، « بەرزنجیی » پێمان بڵێ: نەخێر، « زێوەر » هەر لە سەر کاری خۆی بەردەوامبووە، وەک « بێکەس »ی کۆڵنەدەر، هۆنراوەی « بیستوحەوت ساڵە »کەی بە ئاشکرا، لە بەر دەمی نوێنەری ئینگلیزەکاندا خوێندۆتەوە و زۆر بە ڕاشکاویی، نووکی پەنجەی تیژی، لە چاڵی چاوی چەقاندووە!

## 6/3. لێکدانەوەی ناڕاست :

پاشان نووسیویتی: (ئەو بەگەڕانەوەی شێخ چاوی ڕووندەبێتەوە، شارو وڵاتی لەلادەبێتە بەهەشت، قەریحەی شیعریی دەکرێتەوەو دەڵێ:

ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی
مەزرەعەی توخمی نەشاتو باعیسی ژینی منی
« 1922 کانوونی دوو 17،6 ل 9 - ژ - 4»

تکایە سەرنجی وتنی مێژووی شیعرەکە بدە.)«9-8،3»
کێ دەڵێ، « زێوەر » ئەو هۆنراوەیەی بە بۆنەی گەڕانەوەی « شێخ »ەوە گوتووە؟ ئایا، چۆنی دەسەلمێنێ، ئەو هۆنراوەیەی بۆ ئەو داناوە؟ بەڵگەی چییە؟ ئایا، تەنیا بەڵگەی مێژووی گوتنی هۆنراوەکەیە؟ جا، مێژووی دانانی هۆنراوەکە، چ پێوەندییەکی بە گەڕانەوەی « شێخ »ەوە هەیە؟ یا کەمێ پێش ئەو مێژووەش، یا لە هەمان مانگ و ساڵیشدا گەڕابێتەوە. چونکە، ئەو نە هۆنراوەکەی پێشکەش بەو کردووە، نە بە هیچ شێوەیەکیش، باسیکردووە! ئیدی، بۆ دەبێ، ئەو بڕیارەبدا؟
جگە لەوەی، لە هیچ سەرچاوەیەکی ووێژەییشدا، بەو شێوەیە باس نەکراوە، کە ئەو، بۆ مەبەستی تایبەتیی خۆی باسیکردووە. نووسەرێکی وەک « عەلادین

سەجادیی »، پێش ئەوەی هۆنراوەکە تۆمارکا، پێشەکیی بە یەک دێڕ نووسیوێتی:
(زێوەر بەرامبەر بە خاکی نیشتمانی پیرۆزی کە خۆشەویستی خۆی دەرئەبڕێ ئەڵێ.)«496،46» ئیدی، بۆچی وای دانەنێن، « زێوەر » نیشتمانەکەی خۆی زۆر خۆشویستووە، وەک هەموو ئەو هۆنەرانەی دیکەی کورد، بێ هۆ و بێ بۆنە، تەنیا لە دڕزی خۆشەویستیی نیشتمان و دڵسۆزیی بۆ کوردەوە، چەندین هۆنراوەیان بە سەر کوردستاندا هەڵداوە، نەک بۆ سەرکردەیەکی وەک « شێخ »یان گوتبێ!
گریمان، بۆچوونەکەی ڕاستە، ئایا، ئەمە چی دەگەیەنێ، کاتێ « شێخ »، ماوەی سێ ساڵ دوورخراوەتەوە، بۆچی تاکە یەک دێڕ هۆنراوە چییە، بۆی نەگوتووە؟ ئەدی چەندین هۆنەری دیکەی وەک « حەمدیی، بێخود، کەمالیی ... تاد » بۆچی هۆنراوەیان بۆ هۆنیوەتەوە و پێشکەشیانکردووە، لە کاتێکدا، « حەمدیی » لەگەڵیشی ناکۆکبووە؟!! ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، یا بەڵێنی بە ئینگلیزەکان داوە، بە هیچ شێوەیە خۆی لە هیچ جۆرە کارێکی ڕامیاریی هەڵ نەقورتێنێ، پێوەندیی لەگەڵ « شێخ »دا بیسێنێ، یا هەر خۆی ترساوە، کاتێ « شێخ »یان دوور خستۆتەوە نقەی لێ نەهاتووە. کاتێکیش « شێخ » گەڕاوەتەوە، گەر ڕاستبێ، ئەو هۆنراوەیەی بۆ ئەو گوتبێ، ئەوە نیشانەی ئەو پەڕی هەلپەرستییە! دیـــــارە، « بەرزنجیی » دەیەوێ، دوای مردنیشی درۆی بۆ هەڵبەسێ، لە گۆڕەکەشیدا نەیەڵێ، تاوێ گیانی ڕەوانی ئارامگرێ!

## 7/3. هۆنەر و سەرانی کورد :

ئەز بە خراپە باسی « زێوەر »م نەکردووە، بەڵکوو، ڕەخنەم لێ گرتووە. تا ئەو نموونەی چەن هۆنەر و ڕووناکبیرێکی گەورەی وەک « ئەحمەد موختار و جەمال عیرفان »م بۆ بێنێتەوە. بریا، « شێخ » هێندە دڵ و مێشکی لە ئاستی ئینگلیزەکاندا فراوانبووایە، هەر زۆر زوو لەگەڵیاندا ڕێککەوتایە. جا ئێستە، ڕۆژمان بەم ڕۆژە ڕەشە نەدەگەیی، چەن هۆنەرێکی وەک « زێوەر »یش، ئەو جۆرە هۆنراوانەیان نەدەگوت، دوو کەسی وەک « بەرزنجیی »ش، ئەو هەڵەوپەڵانەی، بە هەڵپەڵەی هۆنەرانی دیکەی کورد دا نەدەپۆشی. چونکە، یەکێ هیچی پێ نەبێ، وەک کەندووی بۆش وابێ، هەر دەبێ، ئەو جۆرە بەراوردە بێ بنچینانە بکا!
پاشان، « بەرزنجیی » وا دەزانێ، « شێخ » کارێکی باشیکردووە، چەن هۆنەرێکی وەک « ئەحمەد موختار جاف » و « سەلام »ی گرتووە، دڵی چەن هۆنەرێکی دیکەی وەک: « ئەورەحمان بەگی بابان، حەمدیی، پیرەمێرد »ی زویرکردووە. ئایا، چارەنووسی یەکێکی وەک « جەمال عیرفان »، بە چی گەیی؟!! ئایا، « شێخ » مافی

ئەوەی هەبوو، لە چەن نیشتمانپەروەر و هۆنەرێکی گەورەی وەک ئەوان بپرسێتەوە؟ من پێم وایە، ئەوە یەکێ لە هەڵەکانی « شێخ » بووە. چونکە، نەک هەر گوێی لەو ڕووناکبیر و هۆنەرە نیشتمانپەروەرانە نەگرتووە. بەڵکوو، سزای هێندێکیشیانی داوە. ئێمە، گەر بە چاک نەڵێین چاک، بە خراپ نەڵێین خراپ، جیاوازیی لە نێوانیاندا نەکەین، تەنیا هەر بە چاک و بە خراپ، داکۆکیی لە گوتە و کردەوەکانی هۆنەر، نووسەر و پیاوە گەورەکانی کورد بکەین، باوەڕ ناکەم، تا ماوین، هیچ بە هیچ بکەین، تا ئەو بایەش لەو کونەوە بێ، ڕەوشی کورد هەر ئەو ڕەوشە دەبێ! چونکە، گەر وامان نەکرد، بە چ شێوەیە دەتوانین، ڕابووردوومان هەڵسەنگێنین، کەڵک لە پەندەکانی مێژوو وەرگرین، هەڵە و کەموکوڕییەکان دەستنیشانکەین، گەر هەر لە پشتی ملماندا و خراپەکانمان شاردەوە، تەنیا لە چاکەکانیان بدوێین، یا خراپەکانیشیان بە چاکە بۆ بژمێرین؟ ئەو دەسبڵاویی و دڵ و دەروون فراوانییە، مەگەر هەر لە دەس دوو خانەدانی خاوەن دیوەخانی وەک ئاغای « بەرزنجیی » بێ، چونکە، هێشتا ئێمە بەو پلەوپایە کۆمەڵایەتیی و کەلتوورییەی ئەو نەگەیشتووین!

ئینجا دەبێ، لە « بەرزنجیی » بپرسین، بۆ « شێخ » لە « زێوەر » زویر نەدەبوو؟ خۆ ئەویش، جگە لەوەی ئەو دوو هۆنراوەیەی داناوە، وەک ئەوانی دیکەش، پێوەندیی بە « سۆن »ەوە هەبووە، « سۆن »یش یارمەتیداوە و وەک مامۆستایەک دایمەزراندۆتەوە، لە ڕۆژنامەکەشیدا، جاروبار گوتاری نووسیوە؟!! هەڵبەتە، نەک وەک ئەو نووسیوێتی: (زێوەر واینەکرد، بەپاکی خۆی مایەوە، هەر ئەو پیاوە زاناو شاعیرە بەویقارو ئاغرو لەسەرخۆیە بوو کە بۆی هەبوو بەبێ پرس بچێتە خزمەتی شێخ و حەرەمسەرای شێخان.)« 10،3 » بەڵێ، کەس نەیگوتووە، ناپاکبووە، تا دوو نیشتمانپەروەری وەک: « ئەحمەد موختار جاف » و « جەمال عیرفان » بە ناپاک دانێ! بگرە، ئەو دوو پیاوە ڕووناکبیرە زرنگە، لە ئاوی باران، لە پەڕەی ئاسکی کوڵ و تەنانەت لە یەکێکی وەک « بەرزنجیی »یش کوردتر و پاکتربوون! بەڵام، هێندە هەیە، ئەوان وەک « زێوەر »، لە دەسوپێوەندی « شێخ » نەبوون، هەڵپەرست نەبوون، مەراییان نەکردووە، ڕەخنەیان لە هەڵە و کەموکوڕییەکانی « شێخ » و داروودەسەکەی گرتووە. بۆیە، « شێخ » لەگەڵیان ناکۆکبووە، سزای ئەوانی داوە، زۆر ڕێزی لێ نەگرتوون. بەڵام، ڕێزی « زێوەر »ی گرتووە!

گومانی تێدا نییە، ئەوانەی لە سەردەمێکی دیاریکراوی ژیاندا، پێکەوە دەژین، یەکدی باشتر دەناسن، وەک لەوانەی لە ڕێگەی گێڕانەوە و نووسینەوە، کەسێکی

دیاریکراو دەناسن. چونکە، ئاگایان لە هێندێ بۆچوون، هەڵوێست و کرداری یەکدی هەیە. لەوە دەچێ، « زێوەر » لەگەڵ « بێکەس »دا، زۆر ڕێک نەبووبێ. بۆیە، لە هۆنراوەی « ئارەق ناخۆم »دا، پلاری تێگرتووە، هەڵبەتە، « بێکەس »یش، وەک دەڵێن: لە فیکەی خۆی تێگەیشتووە! بۆیە ئەویش بە پلارهاویشتنەوە، وەڵامیداوەتەوە، بە هەڵپەرست و ڕیاکار نێوزەدیکردووە و بە شازدە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

من عارەق ئەخۆم، کە بێ کەدەربم
کەمێ لە دنیای دوون، بێ خەبەربم
گەلێ سزام دی، لە ڕووی عەقڵەوە
بادەی مەی بخۆم، بێ هۆش و کەربم
عافیتی تۆ بێ بامێ و قوبوولی
یا من بە عارەق، تووشی زەرەربم
بەهەشت کە پڕبێ، لە وشکەسۆفی
ئاواتەخوازم، کە لە سەقەر بم
نامەوێ، بەرگی ڕیا و زاهیدی
ئەگەر بەو بەرگەش، زۆر موعتەبەربم
کورسیی مەیخانەم، لە لا خۆشترە
لەوەی کە لە سەر تەختی قەیسەر بم «138،6»

هەڵبەتە، ئەوانەی لەو سەردەمەدا ژیاون، هاوتەمەنی « زێوەر » بوون، وەک مامۆستا « نەجمەدین مەلا » و « بێکەس »، زۆر لە نزیکەوە، شارەزای بوون و ناسیویانە، ئاگاداریبوون و زانیویانە، چی گوتووە و چی کردووە. بۆیە، بەو شێوەیە باسیانکردووە. نەک وەک نووسەرێکی گەورەی کۆتایی سەدەی بیستەمی وەک « بەرزنجیی »، بە چاوی خۆی « زێوەر »ی نەدیوە، تەنیا یەک لایەنە، سەیری هۆنراوەکانی کردووە و بڕیاری لە سەر داوە. چاویشی لە لایەنە لاواز و سیسەکانی نووقاندووە. ئەز وەک نووسەرێ، پێش هەموو شتێ، ویژدانم بە دادوەر داناوە. هەر دوو لایەنە چاک و خراپەکانی هۆنراوەکانیم بینیون و قسەم لە سەر کردوون. ئەمەش، بە هیچ شێوەیە، لای من لە پلەوپایەی « زێوەر » کەم ناکاتەوە. چونکە، ئەو لەو سەردەمەدا، هێندەی لێ تێگەیشتووە. باوەڕی بەوە هەبووە و ئازاد بووە. بەڵام، من ڕەخنەی لێ دەگرم. چونکە دەزانم، ئەو باوەڕ و تێگەیشتنە، لە هەموو سەردەمێکدا، زیان بە ڕۆڵەکانی گەلەکەم دەگەیەنێ!

سەیر ئەوەیە، نووسیویتی: زێوەر(بۆی هەبوو بەبێ پرس بچێتە خزمەتی شێخ و هەرەمسەرای شێخان.)«10،3»، بۆ هەرچی بۆی هەبوو، بێ پرس، خۆی بە دیوەخانی سەرکردەکانی کورددا بکا، یا سەر بە حەرەمسەراکانیادا شۆڕکاتەوە، ئیدی دەبێ، پیاوێکی باشبێ؟ لە ژیانی خۆیدا، هیچ هەڵەیەکی نەکردبێ؟ ئەوە چ پێوەندییەکی بە سەر باسەکەی ئێمەوە هەیە؟ جگە لەوەی، ئەو سەرکردانەی کورد، لە هەموو کات و سەردەمێکی مێژووییدا، بە دەیان « نۆکەر، پاروگلێن، مەسینەهەڵگر، مەراییکار، پیاوی خراپ، جەردە و پیاوکوژ »یان هەبووە و هەیە. هەروەها، چەندین سیخوڕ و پیاوی تورک و ئینگلیز، لە دەوری « شێخ » خڕ بووبوونەوە، ئایا، « بەرزنجیی » ئەوانیش، (هەر بە پیاوی زانا و شاعیر و بە ویقار و ئاغر و لەسەرخۆ) دادەنێ؟!!

دوای ئەوە، بۆ دەبێ، هەمیشە قسە و بڕیاری سەرکردەکانی کورد، بە پێوەرێکی رەها و بێ وێنە دابنرێ؟!! بۆچی ئەوان خۆیان، هەڵەیان نەکردووە؟ کێ هەیە، لە ژیانی تایبەتیی و گشتیی خۆیدا، هەڵە نەکا، بە تایبەتیی، گەر ئەو کەسە، بە کاری رامیارییەوە خەریکبێ؟ تەنیا هەر خوا و مردووی گۆڕستانەکان هەڵە ناکەن! با لێرەدا، دوو نموونەی زیندوو بێنمەوە، تا باشتر، لە چۆنێتی رووداوە مێژووییەکان بگا. چونکە، وەک منی تاوانبار کردووە و نووسیویتی: (نووسەر زۆر بێ ئاگایە لەمێژووی نێزیکی گەلەکەی.)«55،3» ئەوە تەنیا هەر یەکێ، ئەو بڕیارەدەدا، پەنا بە خوا، خۆی هێندە دانا و زانابێ، لە پەنجەی ساغ کرم دەربێنێ! جۆ بە دیواردا هەڵگێڕێ! هێندە بە ناخی مێژووی کۆن و نوێی نەتەوەکەیدا شۆڕبۆبێتەوە، تا سەر « کۆڵوانە سوور! »ەکەی تێنابێ!

« شێرکۆ بێکەس »، ساڵی «1967-1968»، دژی جەنگی کوردکوژیی و ناپاکیی، هۆنراوەی « شارەکەم »ی دانا. لە رۆژنامەی « برایەتیی »دا بڵاویکردەوە. ئەو کاتە، « جەلالیی »یەکان سزایاندا و دە رۆژیان لە گرتووخانەکانی « بەکرەجۆ »ی پێتەختی دەسەڵاتەکەیان توندکرد. پاشان، بە هۆی ناسیاویی و تێکەڵاویی لەگەڵ « برایم ئەحمەد »دا، بە « رەفتی کەفالەت » بەربوو.

هەروەها، « رەووف بێگەرد »، ساڵی « 1975 »، لە ناوچەی ئازادکراو و لە نێو جەرگەی شۆڕشەکەدا، لە سەر بەرەڵایی و ناڕێکوپێکیی شۆڕشی «11/سێپتێمبەر»، دژی دز و درۆزنەکانی نێو شۆڕش، چیرۆکی « هەنگاوێک لە رێگای دووردا »ی نووسی و لە ژمارە یەکی گۆڤاری « نووسەری کورد »ی چیادا بڵاوکرایەوە. سەرانی پارت و شۆڕشەکەش سزایاندا و « 21 » رۆژ لە

گرتووخانەی « چەمان » گرتیان. پاشان، بەربوو. بەڵام، وەک خۆی بۆی نووسیوم:
(ئەگەر هەندێک ناوی گەورەی وەک « ساڵح یوسفیی و دارا تۆفیق » نەبوونایە،
لەوانە بوو، لەناوەبەرن.) ئەوە لە کاتێکدا، بە دەیان نووسەر و هونەری دیکەش
هەبوون، رۆژانە لە چاپخانەکانی کوردستان و ئێران، وەک گای عەلی خۆیان
دەلستەوە، « شەوانەش هاونشینی جامی بادە بوون! »
بێ گومان، ئەوەش تەنیا هەر لەبەرئەوە بووە، دوو باڵی دەسڕۆشتووی پارت و
شۆڕشەکە، ئەو بریارەیانداوە. نەک لە ڕاستییدا، ئەوان تاوانبارین یا ناپاکییان
کردبێ، بۆیە، سزادرابن! ئایا، « بەرزنجیی » هەڵوێستی هەر دوو هونەر و
چیرۆکنووس « بێکەس » و « بێگەرد »، بە هەڵە و ناپاکیی دادەنێ، چونکە،
ڕەخنەیان لە هەڵە و کەموکوڕییەکان گرتووە و ئەو دەسەڵاتدارانەی ئەوسای
کوردستانیش، سزایان داون، وەک بە ناپاک باسی « موختار » و « عیرفان »ی
کردووە، چونکە، ڕەخنەیان گرتووە و خۆیان لە « سۆن » نزیککردۆتەوە؟!! وا
نووسیوێتی: (زێوەر واینەکرد، بەپاکی خۆی مایەوە،) «10.3»
ئەوڕۆش، بە سەدان سەرۆک جاش و ناپاک، لە ڕیزەکانی « پارتیی و یەکێتیی »دا،
دەبینین، بە چەپڵە و بە گۆرانیی، جەنگی نێوخۆی کوردەقڕان گەرمدەکەن. کەچیی،
لای سەرانی ئەو دوو ڕێکخراوە، گەلێ لە چەن « خوێنەوار، ڕووناکبیر، نووسەر،
هونەر و زانا »ی کورد لە پێشترن و پتر ڕێزیان لێ دەگیرێ. تەنانەت، لە یەکێکی
وەک « بەرزنجیی » خۆشی لە پێشترن! چونکە، شەڕیان بۆ دەکەن. هەر دوور
نەڕۆین، « تەحسین شاوەیس »ێکی ناپاک، کە چنگی بە خوێنی دەیان کوڕی کورد
سووربوو، کاتێ هێزەکانی « یەکێتیی »، لە « چەمچەماڵ » ویستیان، تۆڵەی لێ
بکەنەوە و پەلاماریاندا، « مەسعوود بارزانیی » زۆر بە ڕاشکاویی گوتی: گەر
دەستی بۆ بەرن، شەڕی سەرانسەریی لە سەر دەکەم! کاتێ، لە جەنگی نێوخۆشدا
کوژرا، هەر ئەوە نەبوو، قوڕی، بۆ نەپێوین! جا، ئیدی یەکێکی وەک « بەرزنجیی »،
بەو بیرە هەرزە و بەو پێنووسە کولەوە، چۆن دەتوانێ، بە دەستی ڕووتەوە، جێگەی
یەکێکی وەک « شاوەیس » بگرێتەوە؟ چۆن دەتوانێ، بە بەڵگەی ئیفلج و مردارەوە
بوو، جەرگی مێژوومان بۆ شەقکا و بە خۆڕایی پیاوە ناودارەکانی کوردمان بۆ
لەکەدارکا؟ سەرەڕای ئەو غەدرە گەورەیەی، لە « جەمال عیرفان » کراوە، تازە
یەکێ لە شێخەکانی « بەرزنجە »، بە پیاوی ئینگلیز و ناپاک تاوانباری دەکا!
« بەرزنجیی »، خۆشی نازانێ، چی دەڵێ و چی دەنووسێ. لە کاتێکدا، من باسی
ناپاکیی « زێوەر »م نەکردووە، جگە لەوەی قسەکە هەڵدەگێڕێتەوە، هەڵەکانی

ئەویشی پێ لێفەبۆشەدەکا، خەڵکی نیشتمانپەروەری دیکەی وەک « موختار و عیرفان »یش بە ناپاک دادەنێ. هەر لەبەرئەوەی، لەگەڵ « شێخ »دا ناکۆکبوون، یا کاریان لە ئینگلیز وەرگرتووە، تا بەڵگە لاواز و بێ بنچینەکانی خۆی پێ بسەلمێنێ!
بریا، هەموو کورد، بە « شێخ مەحموود »یشەوە، هێندە بیریان تیژبووایە، کاریان لەگەڵ ئینگلیز بکردایە. کوردستانیش ئێستە، کۆلۆنیایەکی « بریتانیا » بووایە، نەک لە ژێر دەستی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقدا بووایە، لە ژێر دروشمی برایەتیی درۆزنانەی کورد و عەرەبدا، وولاتەکەمان داگیرکەن، سەروەت و سامانمان تالانکەن، کوردستان وێرانکەن، ئەنفالمانکەن، ژاربارانمانکەن، دەس بۆ ئابڕووی کیژ و ژنانی کورد بەرن. جا ئێستە، « بەرزنجیی » نەک هەر یەک ووشەی عەرەبیی، لە نووسینەکانیدا بەکار نەدەهێنا، بەڵکوو، بە ئینگلیزیی دەدوا، باسی برایەتیی کورد و ئینگلیزیشی بۆ دەکردین!

## 8/3. سایکس . پیکۆ :

نازانم، « بەرزنجیی » وەک « مێژوونووسێکی دەسڕەنگین! » ئەم زانیارییە لنگە و قووچانەی، لە چ کون و قوژبنێکی مێژوودا دۆزیوەتەوە؟ هەر لە خۆیەوە، ناوی ڕێککەوتنی « سایکس ـ پیکۆ » و شکستهێنانی شۆڕشەکەی « شێخ »ی هێناوە، هەموو کارتەکانی تێکەڵاو کردووە، بە کوردییەکی شەقوشڕی نیوەگیان دایڕشتووە و نووسیوێتی: (بەلام کەنەخشەو پیلانی دەرەکی بارودۆخەکە بەلایەکی تردا دەباو دواخالی پیلانی سایکس بیکۆ سەبارەت بەکوردی باشور دێتە جێبەجێکردن و بەزۆر مولحەق بەحوکمی عێراقەوە دەکرێ و شێخ لەدوا وتاریدا تف و لەعنەت لەهەمو ئەوانە دەکات کەبەقسەو بەڵێنی درۆ میللەتان دەخەڵەتێنن و دوژمنانی کوردیش لەهەمو لایەکەوە دەست لەناو دەست دەنێن و کەلەکۆمەکی ناحەزانی ناوخۆو پیاوانی ئینگلیزیش هەموو دەبنە فاکتەری مۆرکردنی ئەو ڕێکەوتنەی پێنجوێن لە1927/6/15 کە « بەزۆر » کۆتایی یان بەشۆڕشەکە پێ هێنا.)«10،3»
کاتێ ئەم چەن دێڕەم خوێندەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم: ئاخۆ لە چ سەرچاوەیەکی گرنگەوە، ئەم زانیارییانەی وەرگرتووە. بەلام، تەماشامکرد، خۆی نووسیوێتی، ئیدی یەکسەر تێگەیشتم، چ ئەم زانیاریی و چ ئەو سەرچاوەیش، کە دووجار چاپیکردووە، هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ قسە ئاساییەکانی خۆیدا نییە!
با بزانین، ڕاستیی ڕووداوە مێژووییەکان، چۆن بوون؟ ئەو پەیمانە لە ساڵی چەندا مۆرکرا؟ ئەو کاتە « شێخ مەحموود »، ئاگای لەو بەندوباوە هەبووە، یا نا؟

ئایا، تا ڕووسەکان خۆیان، دوای شۆڕشی بەلشەفیک، لە « 1918/11/8 »دا، دەقی ئەو پەیمانەیان ئاشکرا نەکرد، کێ ئاگای لەو پەیمانە نهێنییە بوو؟ ئایا، هەر « شێخ » خۆی نەبوو، دوای ئەوەی، پتر لە دوو ساڵ بە سەر ئەو پەیمانەدا تێپەڕبوو، نوێنەری بۆ « کەرکووک » نارد، داوای لە ئینگلیزەکان کرد، بەرەو شاری « سولەیمانیی » بجمێن؟ هەر خۆی نەیهێنان؟! ئەدی، بۆ ڕاست نەڕۆین و نەڵێین: بەرنامەی « سایکس ـ پیکۆ »، وەک تیشکی خۆر، دیار و ڕوون بوو، بەڵام، پیاوە ناودارەکانی کورد، لێی تێ نەگەیشتبوون، یا با هەر بڵێین: لێی تێگەیشتبوون، بەڵام، نەیاندەزانی، چی بکەن، چۆن هەنگاوبنێن. خۆ ئەو کاتەش، « مێژوونووس، جوگرافیازان، ڕامیار، نووسەر، زانا ... »یەکی وەک « بەرزنجیی » لە دەوروبەری « شێخ » نەبوو، تا لە تەواوی ناوەڕۆک و مەبەستی ئەو پەیمانە ئاگاداریکاتەوە. وەک هەلاج، چۆن لۆکە شیدەکاتەوە، بەندەکانی پەیمانەکەی بۆ شیکردایەتەوە و لە مەترسیێکانی بۆ سەر کورد، ئاگاداریکردایەتەوە!

من پێم وایە، دەرد و گرفتەکە، هەر تەنیا لە بەندەکانی « سایکس پیکۆ »دا نەبوو، هەر تەنیا ئەوە نەبوو، لێی تێگەیشتبوون یا لێی تێ نەگەیشتبوون. بەڵکوو، گرنگترین خاڵی لاوازیی ئەوە بووە، لەو سەردەمە و تەنانەت ئەوڕۆش، کەس نەبووە و کەسیش نییە، قسە لە قسەی سەرکردەکانی کورددا بکا، ڕاوێژکردن بە پسپۆڕ و شارەزایانی کورد و بیانیی، کارێکە لای سەرانی کورد، بە نەنگیی دادەنرێ! جا لەبەرئەوەی، لەو ڕۆژەدا، کەس نەبووە، قسە لە قسەی « شێخ »دا بکا، جگە لە چەن کەسێکی ڕووناکبیر، کە تەنیا ڕەخنەیان گرتووە و کەس گوێی لێ نەگرتوون، زۆربەی ئەوانەی دیکەی، لە دەوری « شێخ » بوون، پیاوی نەزان و نەشارەزابوون. هێندێکیان هەلپەرست و هێندێکی دیکەیان، سەر بەم داگیرکەر و هێندێکی دیکەشیان سەر بەو داگیرکەر بوون. هەر ڕۆژەی شتێکیان بۆ باسکردووە، هەواڵێکیان بۆ بردووە. ئەویش بەپێی ئەو زانیاریی و هەواڵانە، بڕیاریداوە. هەر وەک چۆن ئەوڕۆ، دەوری « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » بە هێندێ کەسی « نەزان، هەلپەرست، سیخوڕی دەزگەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، دەم و دەس و داوێن پیس و کۆنەدۆستەکانی خۆیان » گیراوە، بەپێی بەرژەوەندیی و بە ئارەزووی دڵی خۆیان، درۆیان بۆ هەڵدەڕێژن، هەرچی خراپە بۆ کورد، ئەومیان پێ دەکەن، لە ژێر ناوی ململانێی پارتایەتیی و دەسەڵاتی ڕامیاریی لە کوردستاندا، جەنگێکی نێوخۆیی ماڵوێرانکەرانەیان هەڵگیرساندووە، تا وایان لێهاتووە، سەربەخۆیی بڕیاری ڕامیاریی، لە دەس خۆیاندا نەماوە، بۆ هەر کارێکی گرنگ، پێوەندیی بە

چارەنووسی کوردەوە هەبێ، تەنانەت سەردانی وولاتانی دەرەوەش بکەن، بەپێی پێوەندیی کێشە و گرفتەکە دەبێ، هەر دوو لایان، پرس بە یەکێ یا پتر، لەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرەی کوردستان بکەن!
ئەوە جگە لەوەی، کوردیش، خۆی هیچ نەبووە، لە نێوخۆدا زۆر ناڕێکبووە، هەموو کورد « شێخ »یان نەویستووە، شۆڕش و دەسەڵاتەکەشی، تەنیا لە سنووری تەسکی پارێزگەی « سولەیمانیی » تێپەڕی نەکردووە. ئیدی، ئەم ڕاووڕتوییبیە چییە، « بەرزنجیی » بۆمان دێنێتەوە؟ بە هەر شێوەیە بێ، هەر دەیەوێ، لە هەموو تێشکان و نوشوستییبیەکانی کورددا، تەنیا داگیرکەران و دەوڵەتە زلهێزەکان تاوانبارکا؟!! ئەدی کورد بۆ خۆی هەڵە و گوناهی نەبووە؟ تاوانی نەکردووە؟ ناپاکیی لە خۆی و کێشەکەی نەکردووە؟ لە ئاستی ڕووداوە مێژووییبیەکاندا بووە؟ هەلی مێژوویی لە کیس نەداوە؟ جا گەر وا نەبێ، بۆ تا ئێستە، بە هیچ نەبووە؟
ڕەنگە، « بەرزنجیی » وا بزانێ، خەڵکی کورد لە گوێی گادا نووستوون. چونکە، پەیمانی « سایکس ـ پیکۆ » لە « 1916/05/16-9 »، لە نێوان هەر سێ دەوڵەتی « فەرەنسا، بریتانیا و ڕووسیای تزاریی »دا مۆرکرا.
ژەنەڕاڵ « شەریف پاشا »، ڕۆژی « 1919/03/22 » لە « پاریس » یادداشتەکەی پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتیی کرد. بەرهەمەکەشی، پەیمانی « سیڤەر » بوو، لە « 1920/08/10 »دا مۆرکرا. پاشان، لە « 1923/06/24 » بە پەیمانی « لۆزان » گۆڕا. بەڵام، خۆ کۆنفرانسی « قاهیرە »، لە مانگی « مارسی/1921 »دا بەستراوە. ئەو کاتە هێشتا، بە تەواویی بڕیار لە سەر چارەنووسی باشووری کوردستان نەدرابوو. با بزانین، مێژوو چیمان بۆ دەگێڕێتەوە؟
لە خوارووی کوردستان، کاتێ جەنگی یەکەمی جیهان تەواوبوو، عوسمانییبیەکان کوردستانیان چۆڵکرد. واتە: کوردستان بە دەس کورد خۆیەوە بوو. بەڵام لە (« 1918/11/08 »، ئینگلیز هاتە « سولەیمانیی » کە نوێنەریان مێجەر « نۆئیل » بوو.)« 20،2 » (دەوڵەتی خوارووی کوردستان بە سەرۆکایەتی « شێخ مەحموود » لە « 1918/11/02 »دا دامەزرا و بریتانیای گەورە، لە « 1918/12/01 »دا، بە ڕەسمیی ناسی.)« 143،11 » لە هەمان ڕۆژیشدا، (کۆلۆنێل ـ ئارنۆڵد ویلسن ـ ی سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی ئینگلیز لە عێراق، بۆ پیرۆزبایی شێخ مەحموود، بە فڕۆکە هاتە سولەیمانیی.)« 142،11 »
هەروەها، (لە « 1922/10/10 »دا، شێخ مەحموود کابینەیەکی هەشت نەفەریی دیاریکرد.)« 148،11 » ئیدی دوای ئەوە، جارێکی دیکەش، جەنگ لە نێوان

هێزەکانی ئینگلیز و « شێخ »دا دەستیپێکردەوە، تا، لە « 1924/07/19 »دا، هێزەکانی دەوڵەتی عێراق و بریتانیا، شاری « سولەیمانیی »یان داگیرکرد و هەموو شت کۆتاییپێهات!

لە بارەی خەباتی « شێخ مەحموود »ەوە، « کریس کۆچێرا » نووسیویەتی: (ئەو کوردە ناسیۆنالیستە مەزهەبییە، کارێکی زۆری بۆ کوردان کرد. هەر چەندە، سەر نەکەوت. بەڵام، لە ڕوانگەی ڕامیارییەوە، بۆ کوردان گەلێ قازانجی لێ وەرگیرا. ئەو مرۆڤە نەبەزە دەیویست، کوردستانێکی سەربەخۆ پێکبێنێ. ئینگلیزەکانیش لە ساڵی « 1921 »دا لەگەڵ ڕا و تەگبیری ئەو بوون. بەڵام، بە دانانی « فەیسەڵ » ئینگلیزەکان باوەڕیان گۆڕا.)«182،52»

هەروەها، کاتێ کێشەی کورد، ساڵی «1931» لە پەرلەمانی عێراقدا باسکراوە، دید و بۆچوونی جیاواز هەبووە. بەڵام، یەکێ لە ئەندامەکان گوتوویەتی: (ناتوانم، لە کێشەی « شێخ مەحموود » تێبگەم. لە هەموو هەلێکدا، بەرگریینەکا و هێمننەبێتەوە. پەیمانێ یا ڕێککەوتنی ئەوت دێتەکایەوە، « شێخ مەحموود » ڕانەپەڕێ. بۆیە دەبێ، لە پێش هەموو شتێکدا، « شێخ مەحموود » لە کۆڵبکەینەوە، یا سەربەخۆیی بدەینێ یان ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لەگەڵی تێک بگەین:) «148،59» منیش لەگەڵ « ئەوشیروان مستەفا »دا دەڵێم: (ئەگەر « شێخ مەحموود » بیتوانیایە، درێژە بە جووڵانەوەکەی بدا، لەوانە بوو، حوکوومەتی عێراق ناچاربێ، ئەرمیی لەگەڵ بنوێنێ و گفتوگۆی لەگەڵ دابمەزرێنێ.) «148،59»

لە ڕاستییدا، کورد خۆی، شارەزایی لە کاری ڕامیاریی و دیپلۆماسییدا نەبووە. لە نێو خۆیدا ناکۆکبووە، ئیدی نەتەوەیەکی وا لێکداپچڕاو، چۆن دەتوانێ، مافە نەتەوەییە ڕەواکانی خۆی بەدەستبێنێ؟

لە بەر تیشکی ئەزموونە مێژووییەکاندا، لە مێژە نووسیومە: (لە ڕووی ڕامیاریی و دیپلۆماسییەوە، « شێخ »ی نەمر نەیتوانی، ئەو کارەی بە « شەریفی مەککە » و وەچەکانی کرا، ئەم جێبەجێیکا. گەر « شێخ مەحموود، سمکۆ، سەیید تەهای شەمزینیی » و کوردەکانی بندەستی عوسمانیی، هەموو تیرە و هۆزەکانی دیکەی کورد، دەنگی خۆیان لەگەڵ دەنگی ژنەراڵ « شەریف پاشا »دا یەکخستایە، دەستی یەکدییان بگرتایە، دژی تورکەکان بجەنگانایە، دڵی بریتانیایان ڕاگرتایە، بارەکە بە شێوەیەکی دیکە دەگۆڕا. دوور نەبوو، ئێستە ئاڵای کوردستان، لە سەر تەلارە بەرزەکانی هەموو شارەکانی کوردستان بشەکایەتەوە!)«185،29» هەر

وەک نووسەر و ژۆرنالیستی فەرەنسایی « کریس کۆچێرا »ش گوتوویەتی: (ئینگلیز مەبەستی ئەوە بوو، شێخ مەحموود دەوڵەتێکی ناوچەیی دابنێ. لە زاڵبوونی تورکەکان بە سەر شاری سولەیمانیی، بەو جۆرە پشگیرییبکا. ئینجا گەر وەک زانایەک، ئاکاری خۆی لەبەرچاوی ئینگلیز پیشاندایە، زۆر زوو لە بیر نەدەچوو. پێویستبوو، گەر لە دەرکەیەکی وەدەریان نایە، دەبوو، لە دەرکەیەکی ئاواڵەی دیکەی بدایە و لە گێژاوان بە قازانجی کورد، خۆ ڕزگارکا.)«120،52»

کەواتە: گەر هەر لە سەرەتاوە، شتەکان ڕوون نەبووبێ، ئەوا لە دوای کۆنفرانسی « قاهیرە »، هەموو شتەکان بە جوانیی و ڕوونیی دیاربووە. ئیدی « شێخ » تف و نەفرەتی لە چی کردووە، دوای ئەوەی فیلمەکەی چارەنووسی کورد، هەر لە سەرەتاوە، بە تراژیدیایەکی نەتەوەیی کۆتاییهاتووە و مەلی هیوای کوردیان، هەر بە زەرنەقووتەیی سەربڕیوە؟!!

## 9/3. « زێوەر » و نووسەران :

دوای ئەوە، « بەرزنجیی » تا « زێوەر »ی بۆ ئاشتووین، گەلێکی پێدا هەڵداوە. وەک من بە پێچەوانەوە لە سەرم نووسیبێ! هیچ گومانی تێدا نییە، « زێوەر » نیشتمانەکەی خۆی زۆر خۆشویستووە. بۆیە، سوێندی بە سێبەری شاخ و شنەی نەسیمی بەهارەکەی خواردووە. بەڵام، ئەم بروانامەیە، ڕێگەی ئەوەمان لێ ناگرێ، بڵێین: بە باوەڕی ئەو، کێشەی کورد لە عێراقدا چارەسەردەکرا. کوردایەتیی لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتی عێراقدا کردووە، وەک چۆن سەرانی کوردیش، ئەوڕۆ هەر بەو شێوەیە بیردەکەنەوە.

بەڵام، خۆ بەو جۆرە بیرکردنەوە و تێکۆشانە ناتوانین، مۆری تاوانی ناپاکیی، لە نێوچەوانی کەس بدەین، کەس بە ناپاک دانانرێ. بەڵکوو، ناپاکیی ئەوەیە، کەسێ یا لایەنێکی کوردیی، ڕێگە پێشانی هێزەکانی داگیرکەر بدا، دژی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی، سیخوڕیی بکا، ئازاریانبدا، دەس لەگەڵ دەزگەکانی داگیرکەردا تێکەڵکا، بە هەر دە پەنجە، بۆ دەوڵەتە داگیرکەرەکەی مۆرکا، شار و ناوچەکانی « کەرکووک، خانەقین و ... تاد » کوردستان نین، بێ ئەوەی پرس بە ڕۆڵەکانی گەل بکا و ڕیفراندۆمێکی بۆ سازکا. ناپاکیی ئەوەیە، جەنگێکی چەپەڵی نێوخۆی ماڵوێرانکەرانە هەڵگیرسێنێ، لە کوردستانێکی ئازاددا، کوڕی کورد بە خۆڕایی بە کوشتبدا، نیشتمانەکەمان وێرانکا.

چونکە، « بەرزنجیی » خۆی مامۆستای « سەرەتایی »یە، وا دەزانێ، لە سەرەتای ساڵێکی نوێی خوێندن دایە، پۆلێ خوێندکاری نوێی بۆ هاتووە، وانەیان پێ دەڵێ!

بۆیە، بەو شێوەیە لە خوێنەری کورد دەڕوانێ، وا دەزانێ، گەر ئەم باسە کۆچوکالانەیان بۆ نەکا، ئیدی کەس « زێوەر » ناناسێ!
پاشان، باسی ئەو نووسەرانەی کردووە، چییان لە سەر « زێوەر » نووسیوە، قسەی چەن نووسەر و هۆنەرێکی وەک: « رەفیق حیلمیی، حەمەی مەلا کەریم، عەلی کەمال باپیر ئاغا »ی هێناوەتەوە. لە ئەنجامیشدا، چەن قسەیەکی پڕوپوچ نەبێ، هیچی دیکەی نەگوتووە! چونکە ویستوێتی، وا لە خوێنەر بگەیەنێ، خوانەخواستە من نووسیوومە، « زێوەر » لای خەڵکی خۆشەویست نەبووە، ڕێزیان لێ نەگرتووە. ئایا، ئەوە چ پێوەندییەکی بە سەر هۆنراوە « عێراقچێتیی » یەکانییەوە هەیە؟!! خەسڵەت و ڕەوشتی بەرزی « زێوەر » لە شوێنێک و هۆنراوەکانیشی لە جێگەیەکی دیکە دادەنرێ و لێکدەدرێنەوە. پێویست ناکا، دۆ و دۆشاو تێکەڵکەین، خۆڵ لە چاوی خەڵکی کەین و چەواشەیانکەین. خۆ ئێستەش، گوتارەکەی من زیندووە و ماوە، هەموو کەسێ بۆی هەیە، سەرنجێکی سەرپێیی لێ بدا، تا لە مەبەسی ڕەش و گومانلێکراوی ئەویش بگا!
بە ڕاستیی، من وام لێهاتووە، بە هیچ شتێکی « بەرزنجیی » باوەڕ نەکەم، چونکە. تەنانەت ئەوانەی دەربارەی « زێوەر »یش قسەیانکردووە و بە چاکە ناویانهێناوە ئەو، نووسینەکانی بە دەسکارییەوە گواستۆتەوە. یا لێی کەمکردۆتەوە، بێ ئەوەی ئاماژەی بۆ بکا، یا لێی زیادکردووە. با بۆ نموونە، ئەم دەقەی « رەفیق حیلمیی » بنووسینەوە و لەگەڵ ئەوەی « بەرزنجیی »دا بەراوردیانکەین، تا بزانین، جیاوازییان چییە، بێ ئەوەی دەسکاریی ڕێنووسی هیچیان بکەم؟
« بەرزنجیی » نووسیوێتی: (لەڕوشدیەی عەسکەری و لەئەعدادی مولکی قوتابی ئەم مامۆستا بەنرخە بووم، زۆرم خۆش دەویست، بەچاوێکی ئێجگار بەرزەوە تەماشام ئەکرد، سالی 1942 موفەتیشی مەعاریف بووم، چوومە بەرزنجە، نەمدەزانی کەمامستا زێوەر لەوێ موعەللیمە، مامۆستاو مودیر، بەپێی عادەت، تا قەراغ دێ هاتن بە پیرمەوە، لەدوورەوە کە چاوم بەمامۆستا زێوەر کەوت، لەسەیارەکە هاتمە خوارەوەو ڕووم نەکردە کەس تا خۆم گەیاندە مامۆستا خۆشەویستەکەم، بەگەرمیەوە دەستەکانیم ماچ کردو بەزۆر پێش خۆم و ئەوانی ترم دا .. وا ئەزانم ئەم بزووتنەوەیەم هەروەکو واجبێکی وەفاو قەدرزانی بوو.)
«12،3»
ئینجا، با بزانین، « رەفیق حیلمیی » چی نووسیوە: (لە ڕوشدیەی عەسکەری و لە ئەعدادی مولکی قوتابی ئەم مامۆستا بەنرخەبووم، زۆرم خۆش ئەویست و بە

چاوێکی ئیجگار بەرزەوە تەماشام ئەکرد، لە ساڵی 1942دا مفتش مەعاریف بووم، بۆ پشکنینی قوتابخانەکانی لوای سولەیمانی لەو ناوە بووم. چوومە «بەرزنجە»یش. ئەمدەزانی کە مامۆستا «زێوەر» لەوێ موعەللیمە مامۆستاکان و مودیری مەکتەب، بەپێی عادەتی دەرەوە، تا قەراغ «دێ»ی بەرزنجە هاتبوون بە پیرمەوە. لە دوورەوە کە چاوم بە مامۆستا زێوەر کەوت، لە «سەیارە»کە هاتمە خوارەوە ورووم نەکردە مودیر و ماموستاکانی تر تا وەکوو خۆم گەیاندە ماموستا خۆشەویستەکەم. بەگەرمیکەوە دەستەکانم ماچ کرد و بە زۆر، پێش خۆم و ئەوانیترم دا. ئینجا لەگەڵ خەڵقەکەی تر دەستم کرد بە خۆشوو چلونی. وا ئەزانم ئەم بزوتنەوەیەم هەر وەکوو «واجب»یکی وەفاو قەدر دانی بوو کارێکی گەورەیشی کردە سەر ئەوانەی لەوی بوون.)«44،37»

لێرەدا دەبینین: دێڕ نییە، «بەرزنجیی» دەسکاریی نەکردبێ. ووشە نییە، رێنووسەکەی نەگۆڕیبێ و قەڵبی نەکردبێ. لەو سەردەمەدا، «رەفیق حیلمیی» نیشانەکانی خاڵبەندیی داناوە، کەچیی «بەرزنجیی» ئەویشی بۆ هولداوە! گەر یەکێ تاقەتی ئەوەی نەبێ، هەر دوو دەقەکە بە وردیی بخوێنێتەوە و بەراوردکا، ئەوا هەر بە تەماشاکردنێکی خێرایی دەبینێ: نووسینەکەی «بەرزنجیی» لە سێ دێڕ و نیو، نووسینەکەی «حیلمیی»ش لە پێنج دێڕ و نیو پێکهاتوون! جا، ئیدی چۆن باوەڕ بە دەسپاکیی یەکێکی وەک ئەو بکەم!

## 10/3. «زێوەر» و بەرهەمەکانی :

«بەرزنجیی» لە ژێر ناونیشانی «زێوەر ... شیعر و نووسین»دا، باسی هۆنراوە و پەخشانەکانی هۆنەری کردووە. بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، وەک گەنجێکی زێڕ و زیوی دۆزیبێتەوە، وەک کەس تا ئەو کاتە، هیچی لەو بارەیەوە نەزانیبێ، بەرچاوی کەس نەکەوتبێ و نەبیستبێ! لە درێژدادڕییەکی وادا، خوێنەری کورد ئاگاداردەکاتەوە، کە «زێوەر» هۆنراوەی هۆنیوەتەوە و پەخشانیشی نووسیوە. ئەز لەو باوەڕەدام، گەر هەوڵ و ماندوویی ئەو نەبووایە، لەوانەیە، بە بیستویەک سەدەی دیکە، کەس ئەو گەنجەی بۆ نەدۆزرایەتەوە! بۆیە، تا خوێنەری کورد مابێ، دەبێ، سوپاسیبکا، بۆ ئەو هەموو زانیارییە نوێیەی پێی بەخشین!

لە نێوان قسەکانیدا، دەربارەی هۆنراوەکانی «زێوەر» نووسیوێتی: (شیعری نیشتمانی و بانگەشە کردن بۆ بیری نەتەوەیی و تێکۆشان لەپێناوی گەیشتن بەڕۆژێکی سەرفرازی و دور لە دەسەلاتی بێگانە لایەکی دیاری شیعرەکانێتی، ئەمە هەر لە سەرەتاوە کە دەستی داوەتێ.)«14،3» حەزدەکەم، تەنیا یەک تاکە

نموونەی لە هۆنراوەکانی « زێوەر » بۆ بهێنامایەتەوە، کە « بانگاشەی بۆ بیری نەتەوەیی » کردووە. بە پێچەوانەوە، جگە لەوەی لەو سەردەمانەدا، ئەو جۆرە شتانە زۆر کزولاوازبووە، باوەڕیش ناکەم، پیاوێکی خواپەرستی وەک « زێوەر »، باوەڕی بە بیری نەتەوەیی هەبووبێ. چونکە، گەر هەستی نەتەوەیی لەو سەردەمەدا بەهێز بووایە، وەک هێندێ نووسەر، بە خۆڕایی لە پشتی ملی بۆ دەدەن، گەر هەستە ئاینییەکەی، لە هەستە نەتەوەییەکەی بەهێزتر نەبووایە، هەڵبەتە، بە چواردە نیوەدێڕ هۆنراوە، لە هۆنراوەی « ئامۆژگاریی »دا نەیدەگوت:

قەت مەڵێ، من کورد و « مەدحەت » تورک و « سەعدوون » عارەبە

« جوملە ئیسلامین »، براییمان لە « شـــــــەرعا » جارییە «108،39»

ئەگینا، « زێوەر » هۆنراوە و سروودی نیشتمانیی زۆر هۆنیوەتەوە. بەڵام، پیاهەڵدان بە سەر نیشتماندا، نیشانەی ئەوە نییە، « زێوەر » یا هەر هۆنەرێکی دیکەش بێ، « نەتەوەیی » بووە یا « بانگاشەی بۆ بیری نەتەوەیی » کردووە. خۆشەویستیی نیشتمان بە شتێک و بیری نەتەوەیی و بانگاشەکردنیش بۆی، بە شتێکی دیکە دادەنرێ. لەو بوارەدا، گەلێ هۆنەری گەورەی کلاسیکیمان هەبووە، تا بڵێی خواپەرست و پیاوی ئاین بوون. گەلێ هۆنراوەی جوانیان، بۆ نیشتمانەکەیان گوتووە. بەڵام، باوەڕ ناکەم، هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان، بیریان لەوە کردبێتەوە، « نەتەوەیی » بن، یا بانگاشە بۆ بیری نەتەوەیی بکەن. هەروەها، بە دەیان هۆنەری مارکسیی و کۆمۆنیستمان هەبووە و هەیە، چەندین گۆرانییان بۆ کوردستان چڕیوە، نیشتمانەکەی خۆیان خۆشویستووە. بەڵام، نەک هەر نەتەوەیی نەبوون، بەڵکوو، زۆر دژایەتیی ئەو بیرەشیان کردووە.

تا ئێستە، نە لە کەسم بیستووە، نە لە هیچ جێگەیەکدا خوێندۆتەوە، « زێوەر » هۆنەری بەرگریی بووبێ. باوەڕ ناکەم، بە هۆنەری بەرگریی دابنرێ. ئەمە یەکەم جارە، لە زمانی « بەرزنجیی »یەوە، ئەم هەواڵە بڵاودەبێتەوە. هەڵبەتە، ئەویش وەک بۆچوونەکانی دیکەی ڕاست نییە. هەروەها، لەو ڕووەوە، « زێوەر »ی لە ڕیزی هۆنەرەکانی وەک « سالم، حاجی قادری کۆیی، مەلا حەمدون، عارف سایب، حەمدیی ساحێبقران، شێخ نووریی شێخ ساڵح و عەلی کەمال باپیر ئاغا » داناوە. ئەوانیشی بە چەن هۆنەرێکی بەرگریی ناساندووە. هەر چەندە، لێرەدا نامەوێ، لە هۆنراوەی بەرگریی بدوێم، چونکە، باسەکە زۆر درێژتر دەبێتەوە. بەڵام، هێندێ لەو هۆنەرانەی ناویبردوون، بە هیچ شێوەیە، فریان بە سەر هۆنەری بەرگرییەوە نەبووە و نییە. بۆ نموونە: حەزدەکەم، بزانم، هۆنەرێکی وەک « کەمالیی »، چەن

هۆنراوەی ڕامیاریی بە گشتیی و هۆنراوەی بەرگریی بە تایبەتیی هەیە، وا هەر لە خۆیەوە کوێرانە، تفەنگی بە حەشارگەی بەرهەمەکانی « کەمالیی » یەوە ناوە؟ دیارە، هێندە شارەزایە و بە نێو هۆنراوەکانی « کەمالیی »دا گەڕاوە، چاوەکانی کزبوون و ئاویان داهاتووە. بۆیە، ئەوی بە هۆنەری بەرگریی داناوە!

جگە لەوەی، نەزانینەکەی لەوەدایە، دوو هۆنراوەی « سالم و زێوەر »ی بە نموونە هێناوەتەوە و بە هۆنراوەی ڕامیاریی داناون. ئەو دوو جۆرە هۆنراوەیەش، پتر لە ژێر خانەی هۆنراوەی ڕەخنەی مێژووییدا جێگەیان دەبێتەوە. چونکە « سالم »، باسی ڕەوشی سەردەمێکی دیاریکراوی ناوچە و میرنشینی « بابان »ی کردووە، پتر لە سەدویەنجا ساڵ لەمەوبەر، ئەو هۆنراوەیەی گوتووە! بەڵام، « زێوەر »، هەر باسی زۆرداریی و کارە خراپەکانی سەردەمی تورکە عوسمانییەکانی کردووە، وەک بابەتێکی مێژوویی، ڕووداوەکانی سەردەمێکی دیاریکراوی گێڕاوەتەوە و باری کۆمەڵایەتیی و ڕەوشی ئاسایشی شارەکەی پیشانداوە.

ئێنجا با بزانین، « بەرزنجیی » هۆنراوەکەی « زێوەر »ی چۆن نووسیوە؟ ئایا، وەک زۆربەی ئەو کۆڕیلە و هۆنراوانەی، نووسەران و هۆنەرانی دیکەی، بە هەڵە و بە شێوەیەکی نادەسپاکانە ڕاگوێستووە، ئەم هـــۆنراوەیەی « زێوەر »یش، لە دەس سانسۆری ساختەکارییەکانی ڕزگاریبووە، یانا؟ « بەرزنجیی »، سێ دێڕی لە هۆنراوەکەی « زێوەر »، بەم شێوەیەی لای خوارەوە نووسیوە:

لەم وەختە کەپڕ فیتنەو ڕێ بەستنە ئێستا
خۆشی کەبێ مردنە یا نوستنە ئێستا
ئاشوب و بەلاو فیتنە وەکو تەرزە ئەبارێ
هەر جەردەیی و هەر دزی و کوشتنە ئێستا
لەم شارە کەوا مەنبەعی ئاشووب و فەسادە
دەرمانی شیفای خەستە دلان، ڕۆینە ئێستا «16-15.3»

بەڵام، هۆنراوەکە لە دیوانەکەی « زێوەر » خۆیدا، بەم شێوەیە نووسراوە، دوای ئەوەی، دەسکاریی ڕێنووسەکەیم کردووە و بە ڕێنووسێکی نوێ تۆمارمکردۆتەوە:

ئەم وەختە، کە پڕ فتنە و ڕێ بەستنە ئێستا
خۆشی کە ببێ، مردنە یا نوستنە ئێستا
دو یاری « وەفادار» و بەبێ غەش نییە هەرگیز
هەرچی کە تەماشای ئەکەم، دوژمنە ئێستا
ئاشوب و « بەلا و فتنە »، وەکوو تەرزە ئەبارێ

هەر جەردەیی و هەر دزیی و کوشتنە ئیستا
فەرقێکی لەگەڵ « شیعە » ئەما، مەزهەبی سووننی
هەر گرتن و لێبرین و تێخستنە ئیستا
لەم شارە کەوا، « مەنبەعی » ئاشووب و فەسادە
دەرمانی شیفای خەستەدلان، ڕژینە ئیستا «53-52،39»

لە « مێژووی ئەدەبی کوردی ـ عەلادین سەجادیی مشدا، هەر سێ دێری یەکەمی هۆنراوەکەی وەرگرتووە، جگە لە جیاوازیی ڕێنووسی هەر دوو سەردەمەکە، چۆن لە دیوانەکەیدا هاتووە، هەر بەو شێوەیە نووسراوە.«488-487،47»

بەلام، « بەرزنجیی » بە ئارەزووی دڵی خۆی، سێ دێرە هۆنراوەی لە هۆنراوەکە هەڵبژاردووە، بێ ئەوەی ئامـاژەی پێ کردبێ، نووسیوێتییەوە. جگە لەوەی، بەو ڕێنووسە تۆماریکردوون، کە خۆی داینـاوە، بۆیە، هێندێ هەڵەی تێکەوتووە!

## 11/3. گرۆکی باسەکە :

گوتمان: « زێوەر » پیاوێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆز بووە. بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، لە ڕووی بۆچوونەوە، لە نێوان بەرداشی « کوردایەتیی » و « عێراقچێتیی »دا، بە شێوەیەکی سەیر خولیخواردووە. لەوە دەچێ، دوای ئەوەی « شێخ » گیراوە و دوورخراوەتەوە، « زێوەر » یش لەگەڵ خێزانەکەی « شێخ » شاری جێهێشتووە و دەربەدەربووە، بێ هیـوایییـەکی زۆر تەنگی پێ هەڵچنیبێ. ئەگـینا، هەروا بە خۆڕایی، سالی « 1920 »، بە هەژدە نیوەدێر، هۆنراوەی « ستایشی ئاسایش »ی نەگوتووە! دیارە، تاقەتی لە هەموو شتێ چووە، بۆیە، بە یەکجاریی دانیشتووە، خەریکی کاری مامۆستایی خۆی بووە. جگە لەوە، من پێموایە، ئەو سەردەمە، لەو باوەڕەدا بووە، تازە کارلەکار ترازاوە، هیچ لەگەڵ « بریتانیا » ناکرێ. وایزانیوە، گەر کورد شتێکی دەسکەوێ، هەر بە هۆی ئینگلیز و لە چوارچێوەی عێراقدا دەسیدەکەوێ. بۆیە، ئەو هۆنراوەیەی گوتووە و وەک دیارییەک پێشکەشیکردوون. گرۆکی باسەکەمان، لە گوتارەکەی « ئاینده »دا، لەم هۆنراوەیەوە دەسپێکردووە. ڕاستە، وەک سەرچاوە مێژوویییەکانیش باسیانکردووە، ئەو سەردەمە، بارێکی زۆر خراپ، لەو ناوچەیەدا هەبووە، « زێوەر » وێنەیەکی ڕاستەقینەی ڕەوشی کۆمەلایەتیی ئەو سەردەمەی گرتووە. بەلام ئەو، ئەو هۆنراوەیەی بۆ ئەو مەبەسە نەگوتووە، کە « بەرزنجیی » بە هەڵە نووسیویێتی: (ئەو دیاردە قێزەونانەی کەشاعیر لەو شیعرە شەش دێڕەیدا باسیان لێوە دەکات، هەمووی بوون و خەڵکی لێی بێزارو وەڕسبوون، ئەمیش وەک شاعیرێکی بەرپرس بەرامبەر ویژدان

و پەیامەکەی خۆی و ئەو ئاینەی کەپێی دەڵێ « الساکت عن الحق شیطان اخرس، قل الحق ولو کان مرا » نەیتوانیوە، بەبێدەنگی بەرامبەریان بووەستێ، ومیا خۆی لەگەڵ ڕۆژدا بگونجێنێ.. چونکە ئەوە کاری « منافق »انە.)«17،3»
1. ئەو دوو ڕستە عەرەبییەی بۆ بەڵگەی بەهێزیی قسەکانی هێناوێتییەوە، ئایین نین، بەڵکوو پەندیپێشینانی عەرەبین!
2. ئەو هۆنراوەیەی بۆ مەبەستێکی تایبەتیی خۆی گوتووە، تا نێوانی خۆی و ئینگلیزەکان چاککاتەوە. چونکە، جگە لەوەی هۆنراوەکەی، دوای تێکشانەکەی « دەربەندی بازیان » هۆنیوەتەوە، لە هەمان کاتیشدا، « شێخ » لە وولات دوور خراوەتەوە، هیچ جۆرە تروسکاییەک بەدی نەکراوە، تا لەگەڵ ئینگلیز ڕێککەون و بگەڕێنەوە. هەروەها، لە سەراپای هۆنراوەکەدا، هۆنەر باسی ڕەوشی ئەو سەردەمەی کردووە، بە ڕەوشی پێشووتری بەراوردکردووە. بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، بە ئینگلیزەکانی گوتووە: ئێوە ئەو ڕەوشەتان چاککرد، دەسەڵاتێکی باشتان هەیە، دژایەتیی دز و جەردە دەکەن، ئاسایش و هێمنیی، باڵی بە سەر ناوچەکەدا کێشاوە. ئیدی دەبێ، ئینگلیزەکان، لەوە پتر چی دیکەیان لێ ویستبێ؟ لەبەرئەوە، هۆنراوەکە وەک ئەو هۆنراوەیە نییە، بۆ مەبەستی گشتیی و پاکیی دانرا بێ. جگە لەوەی، ئەو هۆنراوەیە، مەگەر باری کۆمەڵایەتیی سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراومان بۆ بگێڕێتەوە، ئەگینا چ پێویست بەوە دەکا، تەقەیەک یا دزییەک لە هەر شوێنێ بکرێ، خێرا هۆنەر لە قاویدا و هۆنراوەیەکی دژی بۆ بهۆنێتەوە، سەری خۆشی و خەڵکەکەشی پێوە بیەشێنێ! با بزانین، چی گوتووە؟

« حەمد لیللا »، وا لە دەورەی بانی دێ، سەنگەر نەما
« ئەشقیا » شەق بوو، « شەقەی » پێنجتیر و ماووزەڕ نەما
« دائیما شوکری حوکوومەت » کەن، « ئەهالی سەرچنار »
تەشقەڵەی کوردی گەڕی « جاف »ی، زیانی مەڕ نەما
چاکی کرد، بۆ خۆی « مچیل » مرد و دوکانی شاردەوە
چونکە خۆیادان و دەستدانانی سەر « خەنجەر » نەما
ڕوو لە هەر جێیەک ئەکەی، بۆ خۆت بچۆ باکت نەبێ
لووتی لۆتی شۆڕە، سەرسمت و کەفەڵ وەرەوەر نەما
با، نەبێ، کەس لێفە نافرێنێ، بنوو، بێ غەم بە شەو
گەندەدز، لێفەفڕێنی ساڵی پێشووتر نەما
نانتان بێ غەم بخۆن، ئەی « ئەهلی ڕەحم و مەرحەمەت »

تو خوا و توبی « رەسووڵ »، پاڕانەوەی سواڵکەر ئەما
سەیری کۆڵانان بکە، ئێستا کە چەند پاکە و « تەمیز »
پیسی و تۆزی سەرمنوێلک، لە ڕێی مەعبەر ئەما
« خواجە فەندی »، گەر دڵی عاجز نەبێ، عەرزی ئەکەم
ڕۆژی دەرسی کوردییە، تەشریفەکەی « نادر » ئەما
« صاحبا امیدگاها دست بوسم » تێپەڕی
دەرسی کوردیی خۆم ئەخوێنم، باوی « ئەسکەندەر » ئەما «31-30،39»
ئایا، « بەرزنجیی » لە خۆی ناپرسێ، لەم دێرە هۆنراوەیەدا، « زێوەر » ستایشی کێی کردووە، کاتێ، باسی خاوێنی کۆڵانەکانی کردووە؟ ئایا، ئەو کاتە، کێ فەرمانڕەوایی شاری « سولەیمانیی » کردووە؟ کێ دەسەڵاتی هەبووە، پیسی و تۆزی سەرمنوێلکی لە ڕێی هاتوچۆکەراندا نەهێشتووە؟ سەیر ئەوەیە، مێژوو خۆی دووبارەدەکاتەوە. هەر چەندە، ئینگلیزەکان داگیرکەربوون، وا بەو شێوەیە، هۆنەر ستایشی کارە چاکەکانی کردوون. بەڵام، خۆ « پارتیی و یەکێتیی »، دوو ڕێکخراوی کوردستانین. ئەوڕۆ، منەت بە سەر ڕۆڵەکانی گەلدا دەکەن، چونکە، جادەیان بۆ قیرتاودەکەن. کەچیی، لە هەمان کاتیشدا، بە دەیان کاری خراپەی دیکەش دەکەن، کوڕی کورد بە خۆڕایی دەکوژن و بۆ داگیرکەرانی کوردستانیان بەکوشتدەدەن!
یا کاتێ گوتوویەتی:(دەرسی کوردیی خۆم ئەخوێنم، ...) مەبەسی چی بووە؟ هەڵبەتە، پێش ئەوەی ئینگلیزەکان شار گرتن، هەموو وانەکان هەر بە « تورکیی و فارسیی » خوێندراوە. بەڵام، کاتێ ئەوان هاتوون، ئیدی بە زمانی کوردیی خوێندراوە. بۆیە، « زێوەر » ستایشی کردوون، چونکە، هەر ئەوان ئەو مافەیان بە کورد ڕەوابینیوە!
کێشەی دووەمی کرۆکی باسەکەمان ئەوەیە، هێندێ هۆنراوەی « عێراقچێتیی » گوتووە، بە باوەڕی من، خوێندکارانی کوردی فێری « عێراقچێتیی » کردووە. بەڵام، « بەرزنجیی » لەو بارەیەوە نووسیوێتی: (هەروا لەو سەردەمەدا بیری لەوە کردۆتەوە کەهەندێ بابەتی خوێندنی منداڵانی کورد بەگران وەری دەگرن و زۆربەی وەک زانیارییەکی ڕووت « مجرد » لەلایان دەمێنێ، ئەم وەک شارەزایەکی پەروەردەیی هاتووە ئەو بابەتانە « بەتایبەت جوگرافیا » بەشیعر سەرلەنوێ داڕشتوونەتەوەو لەنامیلکەیەکدا بۆ منداڵانی چاپکردووە.. ئەمەش دەچێتە خانەی « شیعری فێرکردن ـ تعلیمی ـەوە.)«19،3»

منیش دەڵێم: بریا خوێنەوار و هۆنەرێکی ناسراوی وەک « زێوەر »، ئەو کارەی نەکردایە. ئەو زانیارییە بێ کەڵکانە، تەنیا هەر وەک زانیارییەکی رووت بمانایەتەوە، تا منالآنی کورد، بە هیچ جۆرێ کەڵکیان لێ وەر نەگرتایە، کاتێکیش لە پۆل دەچوونەدەرەوە، هیچیان لە بیر نەمایە! چونکە، ئەو باسی نیشتمان و دەوڵەتێکی بۆ کردوون، نیشتمانی منالآنی کورد نەبووە و نییە. بەڵکوو، ئەو دەوڵەتە، نیشتمانە خۆشەویستەکەی منالآنی کوردی داگیرکردووە!

لەگەڵ ئەوەشدا، با بڵێین: هۆنەر هۆنراوەی فێرکردنی بۆ منالآنی کورد هۆنیوەتەوە. ئایا، جگە لەو بابەتانە، هیچی دیکە نەبووە، بە هۆنراوە بۆیان بهۆنێتەوە و فێریانکا، تا لە بیریان نەچێتەوە؟!!

هەر چەندە، من باسی « پەخشان ەکانی « زێوەر »م نەکردووە، چونکە، تەنیا لە لایەنێکی کەمی هۆنراوەکانیم کۆڵیوەتەوە. بەلآم، لە کۆتایی ئەو باسەدا نووسیوێتی: (نووسینەکانی زێوەر لەچاو شیعرە کوردی و فارسی و تورکیە کانیدا کەمن بەلآم کەلێنێکی گەورەی لەم بەشەی ئەدەبی کورد پڕ دەکەنەوە، بەتایبەت ئەو لەونووسەرە کەمانەیە کە لەو سەردەمەدا 1919-1920 بۆنەوە چووە کەرێزەوی ئاوارەیی خۆی تۆمارکا و ڕۆژەکانی ئەو سەردەمە بەئەمانەتەوە بنووسێتەوە، هەندێ لایەنی جوگرافی و کۆمەلآیەتی و سروشتی ئەو ناوچانە پێیدا تێپەڕیوە بخاتەڕوو، ئەمە کارێکە جێگای تایبەتی خۆی هەیە.)«20،3»

لە کاتی خۆیدا، هەڵەی زمانەوانیی ئەم چەن دێرەمان دەسنیشانکرد. بەلآم، ئێستە دەمەوێ، بڵێم: بە ڕاستیی، من خۆم یەکێکم لەو کەسانەی، بە هیچ جۆرێ، ڕێزم لەو هۆنەرانە نەگرتووە، پشتیان لە زمانەکەی خۆیان کردووە، هۆنراوەیان بە یەکێ لە زمانەکانی دیکەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان گوتووە. چونکە، ئەو هۆنراوانە، هەرگیز نە بە هۆنراوەی کوردیی و نە بە هۆنەری کوردییش دادەنرێن. وەک: « ئەحمەد شەوقیی، جەمیل سدقی زەهاویی، مەعروف رەسافیی، بڵند حەیدەریی، سەلیم بەرەکات ... تاد » بەلآم، ئەو هۆنەرانەی، جگە لە کوردیی، بە زمانێ یا بە چەن زمانێکی دیکەی داگیرکەران هۆنراوەیان داناوە، هیچ جۆرە حسێبێکم، بۆ ئەو بەشە هۆنراوانەیان نەکردووە و ناشیکەم، گەر لە باری خراپ و چەوساندنەوەی نەتەوەکەی خۆی نەدوابن! بەڵکوو، بە بەشێ لە هۆنراوەی ئەو نەتەوانەم داناوە و داشیدەنێم. جا با « بەرزنجیی » تا لە ژیان دایە، بەیتوبالۆرەی ئەوەمان بۆ لێدا، گوایە: « زێوەر » هێندێ هۆنراوەی بە زمانەکانی « فارسیی و توورکیی »ش گوتووە، لای من، بایەخی یەک پێنی کوردییان نییە، گەر ئەو پێتە

جنێویش بێ! وەک « حاجی قادری کۆیی »ش فەرموویەتی:

وەک مریشکێک کە بەختی نەیهێنێ
بێتو جووچکەی مـــــراوی هەڵبێنێ
هەر بگاتە کەنـــــــاری جۆگەلەیەک
نایەتە شوێنی، بمرێ، جـوجەڵەیەک
ئەم لە وشکانی، ئەو لە نـــــاو ئاوە
تێ دەگا ..... درانــــــــی پێ ماوە «37،14»

## 12/3 . پێداچـــــوونەوە :

« بەرزنجیی »، لە باسی « گەڕانەوە بۆ سەرەتا »دا، باسێکی مێژوویی گرنگی وروژاندووە. لەو باسەدا، ئێستەش، بە چاوی لێشاوی بیری کۆمۆنیستیی، کۆتایی ساڵی پەنجاکان و سەرەتای ساڵی شەستەکان دواوە، کاتێ تازە، کۆدەتا سەربازییەکەی « 1958/07/14 » ئەنجام درابوو. باسی داگیرکردنی باشووری کوردستانی کردووە. ئایا، بە دەوڵەتی داگیرکەری عێراقەوە بلکێنرێ یا هەر لەگەڵ تورکیادا بمێنێتەوە. هەر چەندە زۆرە، بەڵام، ناچارین، بۆچوونەکانی بە هەموو هەڵەی رێنووس و زمانەوانییەوە راگوێزین. چونکە، پێویستمان پێیان دەبێ، تا تاووتوێیەکی بۆچوونەکانی بکەین. نووسیوێتی: (بەئاگاداربوونێکی کەم لەمێژووی نێزیکی ناوچەی سلێمانی لەو سەردەمەدا، دەردەکەوێ کەتەنیا دوو دەستەو تاقم حەزیان بەو گرێدان و بەستنەوەیە کردووە:

ـ بازرگان و دەوڵەمەندە دەستڕۆیشتووەکانی ناوشار کەئیشەکەیان لەگەڵ بەغدا دەچوو بەڕێوە، بەرژەوەندیەکـــەیان وای دەویست، بۆیە لەهەر بۆنەو هەلێکدا کەبۆیان رەخسابێ حەزو ویستی خۆیان زوو پیشانداوە؛ لە راپرسەکەی «لامباشەو لامباشنیە »ی1921ولە سەردانەکەی سەرک وەزیرانی عێراق «عبدالمحسن السعدون » بۆ سلێمانی لە 29ی مایسی 1923و ئەو کۆبوونەوەیەی لەمزگەوتی گەورەکرا، بۆ یەکەمجار « لە طرف همموانەوە اشتراک بم صدایە بوو: بژی حکومت معظمە ی بریطانیا، بژی حکومت علیەی عێراق و لەسایەی بریطانیادا بژی قوم کوردو کوردستان »

ـ هەندێ کاربەدەست و فەرمانبەر کەحەزیان بەئاسودەیی یەکی یەکجاری دەکردو دەیانویست مووچەو گوزەرانیا لەسایەی حوکمێکی بەردەوامی پاسایی دا بڕوات، هەروا چەند عەشایرو سەرۆک هۆزێ کەیان هەرخۆیان حەزیان بەبونی حوکمەتی مەرکەزی دەکردو خوازیاری ژیانێکی بێ قیرەو برەبوون؛ وەک « جاف »

که « مس بیل » به « لعشائر الملاکیە » ناویاندەبات وەیا هەشبوو هەر ناحەزی دەسەلاتی شێخ مەحمود خۆی بوو.)«3، 21-22»

باشـتـر وابوو، هەر دەسی بۆ ئەم باسـە نەبردایە. چونکە، نە بابەتی ئەوە و نە شارەزایی تێیدا هەیە. لە ڕاسـتـیـدا، لە لایەکـەوە، لەبەرئەوەی لەو سـەردەمـەدا، گەلی کورد لە باشووری کوردستـاندا، یەکێتییەکی نەتەوەیی نەبوو، ریزەکانی پچڕپچڕبوو، ڕێکخراوێکی نەتەوەیی یا ڕامیاریی نەبوو، ئاراستـەیکا، ئامانج و داواکارییـەکانی، لە چوارچێوەی چەن دروشمێکی نەتەوەیی و ڕامیارییدا دارێژێ و بەرزکاتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، لە کاتێکدا، ئەو کێشە و باسە هاتۆتەکایەوە، « شێخ » دوورخرابۆوە، گەلەکە بێ گەورە و سەرکردە مابۆوە. لەبەرئەوە، شتێکی ئاسـاییـە، گەر کۆمـەڵی کورد لەو کاتانەدا، بە سـەر چەن دەستـە و کۆمـەڵێکدا دابەشـبـووبێ. هـەر دەسـتـە و کـۆمـەڵێکیش، بەپێی بەرژەوەندیی دیاریکراو و ئارەزووەکـانـی خـۆیان، لە ئاوازێکی تایبـەتییـان خـوێندبێ. هەر بەو پێیـەش، دانوسـتـانیـان لە سـەر بەرژەوەندییـەکانـی خۆیان کردبێ. من پێم وایە، گـەلی باشووری کوردستان لەو ڕۆژەدا، لە ڕووی بۆچوونی ڕامیارییـەوە، بە سـەر سێ دەستەدا دابەشبووبوون:

1. تورکخوازەکان: ئەمانە ویستوویانـە، باشووری کوردستان، لە نێو چوارچێوەی سنووری دەوڵەتی تازەی « تورکیا »دا بمێنێتەوە.

2. ئینگلیزخوازەکان: ئەمانیش دوو گروپ بوون. یەکەمیان: باوەڕێکی تەواویان بە ئینگلیز هـەبووە، کە دەوڵەتی کوردسـتـانیان بۆ دادەمـەزرێنێ. دووەمیشـیـان: لەو باوەڕەدا بوون، گەر لە ژێر سایە و دەسەلاتی « بریتانیای گەورە »دا، بە دەوڵەتی « عێراق »یشیانەوە بلکێنێ، مافەکانی گەلی کورد مسۆگەردەبێ.

3. نیشتمانپەروەرانی کورد، ئەوانەی داوای کوردستانێکی سەربەخۆیان کردووە. بەلام، ئەمـانە هەم خـۆیان زۆر کـەمـبـوون، هـەم دەسـەلاتێکی ئەوتۆیان نـەبوو، تا پروپاگەندە بۆ ئامانجەکانیان بکەن، خەڵکی لە داواکارییەکانیان تێبگەیەنن. یا، بڵێین: دەمی هێندێ لەو « هەلپەرست، بۆرژوا، سەرەک تیرە و هۆز »انە چەورکەن.

لێرەدا دەتوانین، دەمەتەقێیەک لە سەر چەندین خاڵ بکەین. ئەوەی ویستوویەتی، باشـووری کـوردسـتـان، بە عـێـراقـەوە گرێدرێ، چەن دەسـتـە و کـەسـێکی زۆر کـەمـبـوون، چونکە، زۆربەی زۆری دانیـشـتـووانی پارێزگـەی « سـولەیمانیی »، دەنگیـان بۆ سـەربەخـۆیی داوە. ئەمـەش زۆر بە ڕوونیی، لە نامـە و گـوتەکـانی نوێنـەرانی « هەیئـەتی وەتەنیـیـە »دا، دەردەکەوێ. کـاتێ، « مـەندووبی سـامیی و

سەرۆک وەزیرانی عێراق ». سەریان لە « سولەیمانیی » داوە، لەگەڵ ئەو نوێنەرانەدا کۆبوونەتەوە. چەن کەڵەپیاوێکی وەک « حەمەی ئەورەحمان ئاغا، شێخ قادری حەفید، رەمزی فەتاح، عیززەت بەگ، مەجید ئەفەندی حاجی رەسووڵ ئاغا، تۆفیق قەزاز » زۆر بە راشکاویی، وەڵامیان داونەتەوە. بە ئاشکرا، داوای سەربەخۆیی کوردستانیان کردووە.
من پێم وایە، ئەو کۆمەڵەی هاواریانکردووە، « بژی حکومت معظمە ی بریطانیا، بژی حکومت علیەی عێراق و لەسایەی بریطانیادا بژی قوم کوردو کوردستان » سەر بە دەستەی دووەم بوون، وا تێگەیشتوون، گەر کورد سەربەخۆش نەبێ، ئەوا هێندێ لە مافە نەتەوەییەکانی خۆی دەسدەکەوێ. چونکە، گەر ئەو کۆمەڵە سەر بە ئینگلیز بووبن، یا هەر لە دژی تورکەکان ئەو هاوارەیانکردبێ، یا لە ساویلکەیی خۆیانەوە بوویێ، یا بەکرێگیراوی « بریتانیا » بووین، یا بەرژەوەندییان وای پێویستکردبێ، هێشتا، لە کۆمەڵی تورکخوازەکان باشتر، لە کێشەکە گەیشتبوون و باشتر بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە چووبوون. چونکە، دەوڵەتێکی شەپلێدراوی دۆڕاوی بێ ئابڕووی هەلپەرستی وەک « تورکیا »، لەو رۆژەدا بەهێزتر و دەسڕۆشتووتر بوو، یا ئیمپراتۆریایەکی وەک « بریتانیا »ی سەرکەوتووی جەنگ، کە تیشکی خۆر لە ئاڵاکەی ئاوا نەدەبوو؟ لە هەمان کاتیشدا، بە یەکەم دەوڵەتی بەهێز و خاوەن دەسەڵاتی ئەو سەردەمەی جیهان دادەنرا!
ئەمە وەک ئەوە وایە، سەرانی پارتەکانی ئەمڕۆی باشووری کوردستان، دوای جەنگی دووەمی کەنداو، گرێیان لە سەر ئەسپە تۆپیوەکەی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق و سوارە گڵاوەکەی جەنگە چەپەڵە دۆڕاوەکەی « قادسیی »ەی پڕ لە شەرمەزاریی « سەددام حوسێن » بکردایە، خۆیان بە چەمەلەغی ماشێنی ئەو رژێم و کلکی ئەسپەکەی سوارەگڵاوەکەدا هەڵواسیایە، دژی هێزی هاوپەیمانەکانی « ئەمێریکا، بریتانیا، فەرەنسا ... تاد » بوەستانایە. دە دیارە، ئەوانەی لە بەر هەر هۆیەک بوویێ، خۆیان لە تورکە داگیرکەرەکان نزیککردۆتەوە، ئەو کاتە و هەموو کاتێکیش، بە هەموو لێکدانەوەیەکیش بێ، زۆر بە هەڵەدا چوون.
من پێم وایە، کاتی خۆی، « جاف »ەکان، باش بۆ کێشەکە چوون و لێکدانەوەکەیان راستربووە، گەر واز لە باسی سەربەخۆیی تەواوی باشووری کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردییش بێنین. جا، با هەر دژی « شێخ مەحموود »یش بووین، یا پیا یەکێکی وەک « مس بیل »یش ئەو قسەیەی کردبێ، کە لە دەلاقەی بەرژەوەندییەکانی « بریتانیا »وە گوتوویەتی. چونکە، « جاف »ەکان خەڵکی

خوێنەواریان زۆرتر تێدا بووە، باشتر لە کێشەکە گەیشتوون. لە رووی شارستانییشەوە، گەلێ لە خەڵکی ناوچەکانی دیکەی کوردستان و پیاوەکانی دەوڵەتی « شێخ » پێشکەوتووتر و زیرەکتر بوون! جگە لەوەی، دوور نییە، لە سەر فەرمانڕەوایی کوردستان، ململانێیەکی شاراوە، لە نێوان ئەوان و « شێخ »دا هەبووبێ. خۆیان بە شایانی ئەوە زانیبێ، سەرکردایەتی گەلی باشووری کوردستان بکەن، وەک ئەمڕۆ بە ئاشکرا دەبینین، ئەو ململانێ و ناکۆکییە، لە نێوان سەرانی هەر دوو پارتە زلهێزەکەی باشووری کوردستاندا هەیە.

## 13/3. ڕۆڵـــی « زێوەر » :

ئینجا، با لە باسەکەمان زۆر لا نەدەین، تا بزانین، لەم گێژاوی ململانێ و لە چارەسەرکردنی ئەم گرفتە گەورەیەدا، « زێوەر » ڕۆڵی چی بووە؟ وەک ئەو نووسیویتی: (ئەو لەناو هیچکام لەو دووانە نەبوو، ئیدی بۆچ سەبارەت بە بۆچوونی ئەو نووسەرە « ئاوا بایداوەتەوە لەهەڵوێستیدا گۆڕراوە؟)«22.3».

منیش دەڵێم، ئەو کاتە، « زێوەر » بای نەداوەتەوە، بەڵام، « بەرزنجیی » یا خۆی لێ گێلکردووە، یا لە من تێ نەگەیشتووە، کەی بایداوەتەوە! بەڵکوو، ئەو لەو کاتانەدا، تا بڵێی، وەک کوردێکی بێ هەڵوێست هەڵسوکەوتیکردووە. خۆی لە کێشە و باسەکان دزیوەتەوە، شوێنپەنجەی بە هیچ جۆرە بڕیار و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەی دوای گەڕانەوەیەوە، بە هیچ شێوەیەک دیار نییە. بە باوەڕی من، ئەمەش هیچ نەنگییەکی تێدا نییە، وەک « بەرزنجیی » لێی تێگەیشتووە، وەک کوێخاکەی « توکاوا »، ئالای یاخیبوونی لێ هەڵکردووە و بە پێخاوسیی نێو ماشان کەوتووە! چونکە، نەک هەر « زێوەر »، هەڵوێستی نەبووە، نەک هەر ئەو سەری خۆی کزکردووە و دانیشتووە، بەڵکوو زۆر کەسی دیکەش هەبوون، بە هەمان شێوە، کەنارگیربوون و بێ دەنگییان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە، بەشداریی هیچ ڕووداوێکی نەتەوەیی و ڕامیارییان نەکردووە. هەر دوور نەڕۆین، « شێخ » خۆی، دوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی « 1931 »، چی کردووە؟ هەڵوێستی بەرانبەر ڕووداو و گۆڕانکارییە ڕامیارییە « نەتەوەیی، عێراقیی، ناوچەیی و جیهانیی »ە گرنگەکانی ساڵانی نێوان « 1931-1956 » چی بووە؟ کە بە دەیان ڕووداوی گرنگ، تەنیا هەر لە کوردستاندا ڕوویانداوە. بۆ نموونە: چەندین کۆمەڵە و پارتی کوردیی و کوردستانیی وەک: « کۆمەڵەی لاوان، کۆمەڵەی فیدائیانی نیشتمان، یەکێتیی، برایی، پشتیوانیی کورد، هیوا، ڕزگاریی، شۆڕش، ژ.ک و پ.د.ک. » دامەزراوە، کۆماری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە « مهاباد » پێکهاتووە، شۆڕشەکانی

« بارزان » هەڵگیرساوە، ڕاپەڕینی « مایسی1941 » لە عێراق بەرپابووە، ئاگری جەنگی دووەمی جیهان، هەموو قوژبنێکی جیهانی گرتۆتەوە، گەلێ ڕووداوی گرنگی دیکەی مێژوویی و ڕامیاریی ڕوویانداوە، بەڵام، « شێخ » هیچ دەنگی نەبووە! ئەو پەیمانەی بە ئینگلیزی داوە، هیچ نەکا و دانیشێ، تا مردووە، نەیشکاندووە، پاراستوویەتی و هیچی نەکردووە. ئیدی بەوەش، ڕۆڵی بنەماڵەکەیان، لە سەرکردایەتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی باشووری کوردستاندا، بە تەواویی کۆتاییپێهاتووە.
هێندێ جار، ئەم پرسیارەم، لە بنەماڵەی « شێخان » و کەسانی دەوری « شێخ » کردووە، بەڵام، وەڵامێکی بنجبڕیان نەداوەمەتەوە. من لەو باوەڕەدام، « شێخ » خۆی بەو باوەڕە گەیشتووە و زانیویەتی، لە لایەکەوە، تازە کار لە کار ترازاوە، کێشەی کورد، سەرەونگومکراوە، هەموو شت لەکیسچووە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەم هیچ لەگەڵ هێز و توانای هەر دوو دەوڵەتی « عێراق » و « بریتانیا » ناکرێ، هەم باوەڕێکی زۆریشی بە گەلەکەی نەماوە. چونکە، زۆری بێ هەڵویستیی، لە هێندێ کەسایەتیی، سەرۆک تیرە و هۆزەکانی کورد بینیوە. یا هێندێ سەرۆک تیرە و هۆزی کورد، بە ئاشکرا، دژایەتییانکردووە و لەگەڵی نەبوون، لە بنەوە، لەگەڵ هێزەکانی داگیرکەراندا دەسیان تێکەڵکردووە. تەنانەت، لە بزچوونەکانیدا، هەم لەگەڵ « شێخ قادر »ی برای، زۆر کۆک و تەبا نەبوون، هەم ڕەشەخەڵکەکەش، بەپێی سەردەم و دەسەڵاتی « شێخ » گۆڕاون. کاتێ دەسەڵاتی هەبووە، خۆیان بۆ بە کوشتداوە. کاتێکیش لێکەوتووە، خۆیان لێ دزیوەتەوە! با بزانین، کە « زێوەر » و هاوەڵەکانی هەڵاتوون، لە یادداشتەکانی خۆیدا چیمان بۆ دەگێڕێتەوە؟ (گەیشتمە نۆدێ. بە خواردنێکی کەم شیوەمکرد و نووستم. کەس خەیاڵی دیلیی شێخی نەدەکرد. وە ئیللا لەو نەوعە جێگایانەش نانمان دەست نەدەکەوت.)«153،40»
ئەوە لای خۆی، « نۆدێ » گوندی خۆیان بووە، باو باپیری « شێخ »، هەر لەو گوندەوە هاتوون، زۆربەشیان خزمیبوون، هۆنەر بەو شێوەیە باسیکردوون! جا، ئەوە بەشێ لەو گەلە بووە، کە « شێخ » قوربانیی بۆ داوە. هەر کاتێ خۆی لە کوردستان فەرمانڕەوا بووە، لە نێو خەڵکەکەدا بووە، هەموو سوێندیان بە سەری خۆی و باووباپیری خواردووە. کاتێ دیاریش نەماوە، لێی تەکیونەتەوە، پشتیان تێکردووە. ئیدی چۆن « شێخ »، باوەڕی بەو گەلە دەمێنێ! چۆن پیاوێکی وا، کە زۆربەی تەمەنی خۆی، لە پێناوی کوردا بەختکردووە، گەر تووشی ڕەشبینیشبێ، لە ماڵی خۆی دانیشێ، دەس بە کڵاوەکەی خۆشییەوە بگرێ، تا ڕەشەبای « پیاوە

خراپەکانی کورد! » و « داگیرکەرانی عێراق و بریتانیا » نەیبا، دەبێ، چ نەنگییەکی تێدابێ؟ بۆ دەبێ، ئێستە گلەیی لێ بکەین و دادگای بۆ دامەزرێنین، دوای ئەوەی، داوای کوردستانێکی سەربەخۆ و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی ئازادی کردووە؟ دوای ئەوەی، دوو جار، دەوڵەتی لە باشووردا دامەزران؟ ئەمە گەر وا لێکدرێتەوە، بێ ویژدانییەکی زۆر گەورە، لە پێشدا لە مێژووی کورد و پاشان لە « شێخ »ی نەمر خۆی دەکرێ. ئەوەشی بەو شێوەیە بیردەکاتەوە، دیارە، بەر لووتی خۆی نابینێ!

خۆ « شێخ »، دوای ئەوەی دانیشتووە، گەر کارێکی گەورە و بەکەڵکی بۆ کورد نەکردبێ، هەرگیز زیانیشی لێ نەداوە. دەسی لە کاری پارت و شۆڕشەکانی دیکەی دوای خۆی وەر نەداوە. ئاژاوەی نەناوەتەوە. شۆڕشی چەواشەی بەرپا نەکردووە. وەک پوازی کوردیی، پیاوی سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکەی عێراق نەبووە، تا چەکداریان بۆ کۆکاتەوە و دژی کورد بجەنگێ! هەموو مرۆڤێکیش، لە گۆشت و ئێسک پێکهاتووە. ئەو گۆشت و ئێسکەش، مێشک دەیجوڵێنێ. هەر کاتێکیش، ئەو مێشکە بەو بڕوایە گەیی، ئیدی نابێ، لەوە پتر لە سەر کارێکی دیاریکراو بەردەوامبێ، با ئەو کەسەش، زۆر « لاو، بەهێز و بە توانا »ش بێ، ئەو مرۆڤە هیچی بۆ ناکرێ و وازدێنێ!

لە بەر ئەم هۆیانە، جگە لەوەی، تەمەن ڕۆڵی دیاریکراوی خۆی بینیوە، دوور نییە، « شێخ » تووشی رەشبینیی بووبێ، لە هەموو شت نائومێدبووبێ. بۆیە، وازیهێناوە. بە لای منەوە، ئەو بڕیارەی « شێخ » داوێتی، ئەو کارەی کردوویەتی، زۆر جێگەی سەربەرزیی و شانازییەکی بێ ئەندازە بووە. چونکە، کەسێ کارێکی پێ نەکرێ، زوو وازبێنێ، چیدیکە، کەسی دیکە دەسخەڕۆ ناکا، چیدیکە، خوێنی کوڕی خەڵکی، بە خۆڕایی لە کاسە ناکا، سوور بزانێ، گەر بەردەوامبێ و ئەو کارەیدەیکا، هیچی لێ دروس نابێ، بە خۆڕایی ئاسنی سارد نەکوتێ، جێگەکەی خۆی بۆ کەسانێکی دیکەی بە توانا ولێهاتوو چۆڵکا، ئەوا دەبێ، ڕۆڵەکانی گەلەکەی، سەری ڕێز و نەوازشی بۆ دانەوێنن و لە کوڵ کاڵتری پێ نەڵێن!

دە دیارە، چیرۆکی « تێکۆشان، گەڕانەوە، دانیشتن و وازهێنان »ی، یەکێکی وەک « زێوەر »یش، هەر لەم قاڵبەدا جێگەی دەبێتەوە. ئەمەش وەک گوتم: بە هیچ جۆرێ، هیچ نەنگییەکی تێدا نەبووە و نییە. بەڵام، کورد ڕاستی فەرمووە: « شەڕ بە کۆنەقین دەکرێ. » جا، گەر « بەرزنجیی »، زارخۆشی سکرەش نەبێ، بەرگی مەڕ و دانی گورگی نەبێ، هەر لە بنی پێیەوە، تا سەر لووتکەی دوا تاڵە قژە خاوەکانی،

له « ڕق و نیرمیی »دا نقوم نەبووبێ، ئیدی، ئەم شەرە چییە، وا بە خۆڕایی بە منی دەفرۆشێ؟ بۆ وا سواری ئەسپی پڕ لە ڕق و گای هاری نیرمیی بووە؟!! بۆ لێوێکی با و ئەوی دیکەشیان بۆران دێنێ؟!! بۆ کە مەلە نازانێ، لەو زەریا پان و بەرینەی نووسینی کوردییدا دەیەوێ، بە کەڵەکی پەڕۆ بیەڕێتەوە؟!! بۆ هەر بە تەنیا، خۆی بە خزمی سەپانی « زێوەر » دەزانێ؟ بۆ بێ ئەوەی، زانیارییەکی تەواوی، دەربارەی ئەو کێشە و باسانە هەبێ، بە دەسی ڕووتەوە، پەلاماری شیری نوکتیژی ڕاستیی ڕووداوەکان دەدا؟ دەبێ، ئەوە باش بزانێ، خەرمانکوتان کاری بزن نییە و ڕم بە کەوان ناهاوێژرێ! تۆ بڵێی: خەڵکی دیکە، بە دەسی « بەرزنجیی » مار بگرن! ڕاوە ژیشکی پێ بکەن و تەنەکەشی پێ لێدەن! ئەمە هەر لەوە دەچێ، قینەی کوڕی قینە بێ، باکی هیچی نەبێ! وەک پشیلە، ختووکەی شێر بدا! وەک مێرووله، بە کۆ قوولەی قافدا بچێ! جا، گەر واشبێ، هەر بازیی بازیی، بە ڕیشی من بازیی! خۆ ئێمە، منالی کۆنە کۆڵانەکەرەکێ بووین، یەکدی باش دەناسین!!!

## 14/3. خەسڵەت و ڕەوشت :

دەربارەی ڕەوشتی « زێوەر » نووسیوێتی: (لەسەرەتاوە چۆنبووە هەرواش ماوەتەوە، بادانەوەو سەنگەرگۆڕینی نەزانیوە، چونکە ژیرو ڕاست و خاوەن هۆش و بیرێکی کامڵ بووە، ئەو بڕوای وابووە کە « هەموو ڕێگایە با بۆیانە بچی » ! یانی هەمو جۆرە بیرو ڕوکارێ کە دەگیرێ با بۆ خزمەتی قەوم و نیشتمانبێ. بێ تەماع و خاوەن نەفسیەتێکی بەرزبووە، وەک زاناو مامۆستایە حەزی بەیاساو بەرپابوونی قانون بووە لەوڵاتەکەدا.)«22،3»

لە ڕاستییدا، نە من و نە « بەرزنجیی »، هیچمان هاوتەمەنی « زێوەر » نەبووین، هیچمان، بە چاوی خۆمان، « زێوەر »مان نەدیوە. لەبەرئەوە، من نازانم، ئەو خەسڵەتانەی ئەو باسیکردوون، ڕاستە یا نا! مەگەر هەر ئەو خۆی بزانێ، چۆنیان دادەڕێژێ! چونکە، هیچ کەسێ لەم جیهانەدا نەبووە و نییە، هەڵەی نەکردبێ و هەڵە نەکا، خاڵی لاوازی نەبووبێ و نەبێ! بەڵام، ئەو « زێوەر »ی وا شیرین کردووە، بە قوزەڵقورتیشەوە بخورێ! لەوە دەچێ، زۆر لە نزیکەوە ناسیبێتی، بە دەمێ خواردبێتیان و بە قنگێ ڕیابن! بۆیە، وا بەو شێوەیە، بە شان و بازوویدا هەڵیداوە! تەنانەت، گەر پەیامبەری ئیسلام نەیفەرمووایە، دوای من پەیامبەر نایە، ئەوا دەمگوت: ئەوانە نیشانەی پەیامبەریی « زێوەر » بووە!

جگە لەوەی، « زێوەر » خۆی گوتوویەتی: (ئەم قەومی کوردە، لە هەر جێگابێ، کە هەن، لێم مەعلوومبووە، بەواسیتەی بێ حوکوومەتی و جەهالەتەوە، دوچاری

شەقاوەت و سەفالەت بوون، بەڵێ حوکوومەت موعەللیمی ئەخلاقە، دەتوانێ، تەربیەی میللەتی بگەیەنێتە لای ژووروویی سەعادەت.)«157،40»
جا کە « زێوەر »، هەستی بەو خەوشە گەورەیەی کورد کردووە، هەر بە دەستی خۆشی تۆماریکردووە، بۆچی، هەوڵی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی نەداوە. تەنانەت، بە هۆنراوەیەکیش، باسی ئەو ئامانجە پیرۆزەی نەکردووە، ڕۆڵەکانی کوردی، بۆ ئەو مەبەستە هان نەداوە، بەڵکوو، وەک ڕەشەخەڵکەکەی دیکە، هەر لە ماڵی خۆی دانیشتووە و ژیاوە؟!!

## 15/3 . بادانــــــەوە :

دوای ئەوەش، نووسیویێتی: (لەم ڕووەوە ئەگەر چاو بەهەڵوێستی شاعیرانی کوردی ئەو ڕۆژانەدا بگێڕین ئەوا زۆر نموونەی بادانەوەمان دێتە بەرچاو، بەڵام خۆناکرێ بەسەنگ و ترازووی ئەمڕۆ هەڵوێست و ڕاو بۆچوونی ئەوسا بپێوین.)«22،3»
لە وەڵامی ئەم چەن ووشەیەدا، دەڵێم: هەموو هەڵوێستێکی « خراپ، زیانبەخش، جەنگی نێوخۆ و ناپاکیی » بە سەنگ و تەرازووی هەموو سەردەمەکان دەکێشرێ. بەڵام دەبێ، باری ئەو سەردەمە، لەبەرچاو بگیرێ. ئەگینا، ئەوەی لە سەردەمی « ماد »ەکانەوە، تا ئەوڕۆ لە کورد ڕوویداوە، گەر زیانبەخشبووبێ، ئێستە و تا کورد ماوە، هەر بەو شێوەیە ناودەبرێ، کە هەبووە و ڕوویداوە. یا گەر کوردێ، لە سەرانسەری مێژووی نەتەوەکەی خۆیدا، ناپاکیی لە نەتەوە و نیشتمانەکەی کردبێ، ئەوا تاهەتایە، هەر بە ناپاک ناودەبرێ. بەڵام، لەگەڵ سەردەمەکەدا، هۆکارەکان دەگۆڕێن. لەبەرئەوە، هۆکار هەرچی بێ، هیچ جۆرە بیانوویەک، بۆ کاری خراپە و ناپاکیی نییە و نابێ، ببێ. مەگەر ئەو کوردە، هێندە « ئازا، چەسوور و مەرد » بێ، هێندە بە هۆش و گیۆشبێ، لەگەڵ هەستی بە هەڵە و تاوانەکەی خۆی کرد، هۆشی بە بەر خۆیدا هاتەوە، ڕاچڵەکیی و زۆر بە هوشیارییەوە، بێ ئەوەی یەک و دووی لێ بکا، دانی بە « هەڵە، کەموکوڕیی، تاوان و ناپاکیی »یەکانی خۆیدا نا، ئەو کاتە، هیچی لەگەڵ ناکرێ و نابێ، بە هیچ شێوەیە برەنجێنرێ. جا، ئایا « بەرزنجیی »، هێندە ئازا و مەردە، خەباتی ڕامیاریی خۆی، بەو شێوەیە هەڵدەسەنگێنێ؟ ئایا، دان بە ناپاکیی خۆیدا دەنێ، یانا؟ چونکە، ئەویش سەردەمێ، ناپاکیی بەرانبەر خاک و خەڵکەکەی کردووە، بە هەموو شێوەیە، دژی شۆڕش و گەلەکەی خۆی وەستاوە. تۆ بڵێی: هیچ هۆیە بدۆزێتەوە، هیچ بەڵگەیەکی پێ بێ، داکۆکیی لەو هەڵوێستە خراپەی خۆشی بکا، چونکە، ئەو ڕاستییە، لای ڕۆڵەکانی گەلەکەمان و مێژووی نوێی کورد لە

باشووردا، وەک تیشکی زێڕینی خۆر دیارە و تاهەتایە هەر دەدرەوشێتەوە!
جگە لەوەی، « بادانەوە » وەنەبێ، کارێکی هێندە خراپبێ، کەس ڕووی نەیە، لێی بدوێ و باسیکا. بەڵکوو، گەر هەر کوردێ، دان بە کارە چەوتەکانی خۆیدا بنێ، کە زیانی خاوەنەکەی و تێڕینی خۆی تێدابووە، ئەوا کارێکی گەلێ باش دەکا. ئەو کارەش، لە دەس هەموو کوردێ نایە! جا، چی دەبوو، گەر هەموو کوردێ، کەمێ دانیشتایە، لەگەڵ خوا و خودی خۆیدا، بە شریتی سینەمای ژیانی تایبەتیی و گشتیی خۆیدا بچوایەتەوە، بە دڵێکی پاک، بە دەروونێکی خاوێن، بە سنگێکی فراوان و بە مێشکێکی کراوەوە، هەڵەی لە ڕاستیی، خراپەی لە چاکە جیا کردایەتەوە، وازی لە هەڵە و خراپە بێنایە، ڕووی لە ڕاستیی و چاکە کردایە.
ئەوجا، بیگوتایە: من هەڵەبووم، بە خۆڕایی دژایەتی فلانە کەس یا فلانە لایەنم کردووە، داوای لێبووردنی بکردایە، ئیدی پێکەوە وەک برا، کاریانبکردایە، پێکەوە بژیانایە و بمردنایە! ئەمەش، خۆی لە خۆیدا، بە جۆرە بادانەوەیەک دەژمێررێ، وەک چۆن لە کاری خراپەشدا، مرۆڤ دەتوانێ، بابداتەوە. بۆیە، کورد گوتوویەتی: « بایدایەوە سەر بای بەرە کۆن. » هەزار خۆزگە، چ « شێخ » و چ هەزارانی وەک « زێوەر »یش، هەر ئەو کاتە، بە لای ئینگلیزەکاندا بایاندایەتەوە، جا ئێستە دەمانزانی، کەڵکی بادانەوە چی دەبوو!

## 16/3. بەزیـــی :

پاشان نووسیویتی: (چۆنێتی خەبات و هەڵوێست وەرگرتن لەقۆناغەکانی ژیانی نەتەوەکەدا لەگۆڕراندایە، دیارە بەپێی گۆڕانی باری قۆناغەکە، ناکرێ داوا لە زێوەر وەیا هەر شاعیرێکی دی، بکرێ کەبۆچی لەبیستەکاندا دوژمنی کاڵە لەپێی نازیەت و فاشیەت نەبووە؟ ئەی بۆ بانگاشەی دیموکراتیەتی نەکردووە پشتگیری داواکارییەکانی چینی جوتیارو کرێکاری نەکردووە؟و داوای یاسای چارەسەرکردنی کست و کاڵی نەکردووە؟ بۆ شیعری بۆ بەلشەفیەکان و لینین و شۆڕشی ئەکتۆبەر نەوتووە؟)«23،3» بە ڕاستیی، کاتێ ئەم چەن دێرە ساکار و بازاڕییانەم خوێندەوە، پڕ بە دڵ بە زەییم بە خاوەنەکەیدا هاتەوە. چونکە:
1. کێ داوای لە « زێوەر » یا هەر هونەرێکی دیکە کردووە، هۆنراوەی لەو جۆرانە بڵێن؟ خۆ گەر خۆشیان گوتبێتیان، ئەوا ئەو جۆرە هۆنراوانە، کاتیی و وەرزیی بوون، لە دڵ و دەروونی جەماوەردا، زۆر نەژیاون و نەمر نەبوون.
2. من لە « بەرزنجیی » خۆی دەپرسم: بۆچی ناکرێ، داوا لە هونەران بکرێ، ئەو جۆرە هەڵوێستانە وەرگرن؟ ئەدی، « ڕووناکبیر، نووسەر و هونەر مەکانی هەموو

نەتەوەیەک، بە چ جۆرێ، لە خەڵکی ئاسایی و نەخوێندەوارەکان جیادەکرێنەوە؟
ئەدی بۆچی، چەن هۆنەرێکی دیکەی وەک: « مەلای گەورە، بێکەس، گۆران، هەژار، دڵزار ... تاد » ئەو ئەرکە نەتەوەیی و مرۆڤایەتییە پیرۆزەیان کێشاوە؟ هەر زۆر دوور نەڕۆین، هۆنەرێکی وەک « قانع » بەو خوێندەوارییە کەمەی هەیبووە، گەلێ یاقووت و زمرووتی جوانی هەڵرشتووە، کە شتێکی ئاسان نییە، هێندێ هۆنەری ئەوڕۆش بیڵێن! چونکە، ئامانجی بەرەکان زۆر ڕوون و دیاربوون، بەرەی « نازیی و فاشیی »، بەرمیەکی خوێنڕێژ و دژی کۆمەڵگەی مرۆ بوون، بەرەی « دیمۆکراسیی و ئازادیی »ش، داکۆکییان لە بوون و مانەوەی کۆمەڵگەی مرۆ کردووە. جگە لەوەی، لەو سەردەمەدا کۆمەڵگەی کوردەواریی، هێندە دواکەوتوو نەبووە، وەک ئەو بیری لێ کردۆتەوە! چونکە، لە بیستەکان بە گشتیی و سییەکان بە تایبەتیی، کورد ڕۆژنامە و گۆڤاری تایبەتیی خۆی دەرکردووە. چەندین پارتی ڕامیاریی دامەزراندووە. چەندین ڕاپەڕین و شۆڕشی چەکداریی خوێناویی بەرپاکردوووە. خوێندەواریی و زانیاریی، پتر بڵاوبۆتەوە. ئەمانە هەموویان، وایان لە بیر و هۆشی کۆمەلانی خەڵک کردووە، هەست بە ڕاستیی و دروستیی کارەکان بکەن. هۆشی نەتەوەیی و ڕامیاریی خەڵکەکە، ڕۆژبەڕۆژ، لە گەشەکردندا بووە.
3. « بەرزنجیی »، چونکە ئاگای لە ڕووداوەکان نییە، چونکە بە وردیی، سەرنجی لە هۆنراوەکانی « زێوەر » نەداوە، نازانێ، ئەویش گەر کەمیش بووبێ، یا گەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بووبێ، بە چەن دێرە هۆنراوەیەک، هەر هەڵوێستی خۆی، بەرانبەر ئەو ڕووداوانە دەربڕیوە. ئەوەتە، ساڵی «1944»، بە حەوت دێڕ هۆنراوە، دەربارەی « هیتللەر » گوتوویەتی:

« سیاسی نیم و عەسکەر نیم »، بەلام دیارە بە ئاساری
کە « هیتللەر » لەڕبووە، نەیماوە هەڵپەی پار و پێراری
لە « بەڕ » گەڵبە و برەی ووردکردووە ورچێکی کوێستانی
لە « ئاو »یشا بە جارێ، دوو نەهەنگ داویە پەلاماری
ڕەفیقیشی کە « مۆسۆلۆنیی »یە، مەعلوومە لای عالەم
لە دەست « یۆنان » گەیشتە ئاسمان فریاد و هاواری
« ڕەفیقی حیزە » خۆی بێ هێزە، مانەندی کەری دێزە
بە تۆپینیش ڕەزایە، مەرگی هاوەڵ بوو بە سەرباری
بە توند و تیژیی هاتەپێشەوە « هیتللەر »، بەلام دوایی
پەتی پچڕا، هیوای بڕا، دەفی دڕا، ئەما چاری

دەخیل ئەی خێڵی « ئینگلیزیی »! « سەقالیا » پڕ لە ئیسلامە
ئەبێ، چاودێرییان بکرێ، چ دیهاتی چ ناوشاری
سەداکەی « فاتیکان » فتوای جیهادی دابوو، بۆ سەر « ڕووس »
منیش فتوانەدەم، « پاپا » بە پایەک بێننە یاری «52،39»
4. جا، یەکێکی وەک « زێوەر » گەر لەو بارەیەشەوە هیچی نەنووسیایە، جگە لەوەی، بە بێ هەڵوێست باسدەکرا، کەسیش داوای لێ نەدەکرد، خۆی لەو باسە ڕامیارییانە هەڵقورتێنێ! چونکە، هەر وەک خۆشی، لە سەرەتای هۆنراوەکەدا گوتوویەتی، ئەو پیاوێکی ڕامیار نەبووە.
5. بۆ پشگیریکردنی چینی جووتیار و کرێکاری کورد بە تایبەتیی و هەموو چەوساوەکانی جیهانیش بە گشتیی، ئەوە پێش ئەوەی، یەک پیت لەو بارەیەوە بنووسرێ، هەمیشە باسی هەژار و زۆرلێکراوان کراوە. تەنانەت، هەموو ئایینە ئاسمانییەکان بە گشتیی و ئایینی ئیسلام بە تایبەتیی، زۆر داکۆکییان لە هەژاران کردووە، لە سەر شانی هەموو موسوڵمانێکی داناوە، یارمەتیی هەژاران بدەن، دەسگیرییان بکەن، کۆمەکی مەتیریاڵییان پێ بکەن، گرفتەکانیان بۆ چارەسەرکەن. ئەگینا، گەر وا نەبووایە، ئەدی « زەکات، سەرفیترە، خێرکردن .. تاد » لە ئایینی ئیسلامدا چی دەگەیەنێ؟ لە چییەوە هاتووە؟ بۆچی دانراوە؟ خۆ یەکێکی وەک « زێوەر » خۆی، خواناسێکی ڕاستەقینە، شارەزایەکی باش، زانایەکی ناسراو بووە، ئەدی گەر پشگیریی هەژارانی کوردی بکردایە، چی تێدا بوو؟ خۆ داوامان لێ نەکردووە، وازی لە کەوا و سەڵتە، کڵاو و مێزەر، عەبا و جبەکەی خۆی بێنێایە. لە بری ئەوانە، چاکەت و پانتۆڵی لەبەرکردایە، قورئان و پەرتووکە پیرۆزە ئایینییەکانی وەلاخستایە، بەرهەمە فەلسەفییەکانی « مارکس، ئێنگلز و لێنین »ی بخوێندایەتەوە. ئایا ئەوانە، چ جۆرە پێوەندییەکیان بە هەست و هەڵوێستی مرۆڤەوە هەیە، گەر یەکێ بە ڕاستیی، مرۆپەروەر بێ، ڕێزی هەژاران بگرێ و لە پێناوی ئەواندا، وەک مۆم بسووتێ؟
6. وا بزانم، هەموو هۆنەران ئازادن، گەر بیانەوێ، هۆنراوە بۆ « لێنین، بەلشەفیک و شۆڕشی ئەکتۆبەر » بڵێن. چونکە، ئەوە پێوەندییەکی زۆری، بە ئایدۆلۆژیا و پێوەندیی ڕامیاریی ئەو هۆنەرانەوە هەیە. بەڵام، ڕەخنەکە لەوەدایە، ئەوانەی ئەو جۆرە هۆنراوانە، بۆ ئەو جۆرە کەسێتیی و ڕووداوە گەورانە دادەنێن، ئایا بەر پێی خۆیان دەبینن؟!! هیچ بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەیان دەهۆننەوە؟ ئەگینا، من بۆ ڕەخنە، لە هۆنەرێکی وەک « قانع، هەژار، گۆران، دڵزار ... تاد » بگرم، گەر

هۆنراوەی لەو بابەتانەیان دانابێ؟ چونکە، هۆنەران بۆیان هەیە، چ هۆنراوەی تایبەتیی، بۆ ئایدۆلۆژیا و ڕێبازە ڕامیارییەکەی خۆیان، چ هۆنراوەی گشتیی، بۆ نیشتمان و کێشەی ڕامیاریی نەتەوەکەی خۆیان بڵێن. ئەوانیش، چەندین هۆنراوەیان بۆ کورد و کوردستان گوتووە، کێشەی کوردیان، بە باوەڕەکەیانەوە گرێداوە. جگە لەوەی، خۆیان ئەوە باوەڕیان بووە، لە سەر ئەو ڕێبازە ڕۆشتوون، لە بەر تیشکی بەرژەوەندییەکانی ئایدۆلۆژیا و فەلسەفەی مارکسیزمدا، هەنگاویان ناوە. بریا، هەموو کورد، « نەتەوەپەروەرێکی کۆمۆنیست » بووایە. کوردیش، تاکە ڕێکخراوی سەرانسەریی کۆمۆنیستی خۆی ببووایە، وەک ئەو پارتە کۆمۆنیستانەی جیهان، نیشتمانەکەی خۆیان ئازادکردایە.

جا ئیدی، من چۆن، گلەیی لە یەکێکی وەک « زێوەر » دەکەم، کە هۆنراوەی لەو بابەتانەی نەگوتووە، گۆرانیی بۆ « لینین » و شۆڕشەکەی نەچڕیوە. چونکە، لە لایەکەوە، ئەو هیچی بۆ چەن سەرکردەیەکی قارەمان و شەهیدی وەک: « شێخ سەعیدی پیران، سەیید ڕەزای دەرسیمیی، سمایلاغای سمکۆ، شێخ مەحموودی بەرزنجیی » نەگوتووە! لە لایەکی دیکەشەوە، پیاوێکی موسوڵمان بووە، لە هەموو کاتێکدا، هەر خەمی ئیسلامی خواردووە. ئەوەتە، لە کوردستانەوە هاواری لە ئینگلیزەکان کردووە، ئاگایان لە خەڵکی « سەقەلیا » بێ، چونکە ئیسلامن:

دەخیل ئەی خێڵی « ئینگلیزیی »! « سەقالیا » پڕ لە ئیسلامە
ئەبێ، چاودێرییان بکرێ، چ دیهاتی چ ناوشاری «52،39»

ئیدی من، داوای هۆنراوە و هەڵوێستی چی، لە پیاوێکی موسوڵمانی وەک ئەو بکەم، کە سەری لە کاری ڕامیاریی دەر نەچووە و تەقەی هاتووە؟

کەواتە دەتوانم، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: هەر هۆنەرێ، لەگەڵ ڕووداو و کارەساتەکانی سەردەمی خۆیدا نەژیا، یا هەڵوێستی نەبوو، یا ترسنۆک و هەلپەرستبوو، یا ئاگای لە « مەحموودی بێ زەوا » نەبوو، ئیدی بۆ ناوی هۆنەر لە خۆی بنێ؟!!

## 17/3. تـــــــوڕەهات :

سەیر ئەوەیە، « بەرزنجیی » زۆر بە ڕاشکاویی نووسیوێتی: (خۆ خەریککردن بەم توڕەهاتانەوەو سەرێشانی ئەدیب بەم خواستانەوە مایەی نابووتی بیروبۆچوونی خاوەنەکەیەتی.)«23،3»

ئینجا، گەر ئەو هەڵوێستوەرگرتنە مەردانەیە و ئەو بیرە بەرزە، لای « بەرزنجیی » بە « توڕەهات » دابنرێ، « مایەی نابووتی بیروبۆچوونی خاوەنەکەی » بێ، ئەوا

دیاره، ئاستی « کۆمەڵایەتیی، ڕامیاریی و کەلتووریی » خۆی چەن بەرزە! چۆن بیر دەکاتەوە؟ پێشینان ڕاستیان فەرمووە، کاتێ گوتوویانە: کورد بدوێنە، شەرعی خۆی دەکا! هەڵبەتە، ئەویش بڕیاری خۆی داوە، خۆی بە « تورەهات »ی کێشەی جووتیار و کرێکارەوە خەریک نەکا، دژی بەرەی نازیزم و فاشیزم نەوەستێ، لەگەڵ بانگاشەی دیمۆکراسیی و ئازادییدا نەبێ. بۆیە، وا بەو ئاشکراییە، تا توانیویێتی، باوێژی لە سکی خۆی دەرکردووە، تەپڵی بێ عاریی کوتاوە، زوخاوی هەڵێناوەتەوە، جواناوی ڕشتووە، چونکە، زۆری تێکۆشیوە!

ئایا، « بەرزنجیی » بیریچۆتەوە، سەردەمێ خۆشی، وەک کوڕە گەورەی گوێ ئاگردان، کون لە جەرگیدا نەبوو، بانگەشەی بۆ بیری « ماویزم » دەکرد. گەرمە کوتاری، لە سەر جەنگی « پارتیزانیی » دەنووسی؟!! ئایا، ئەوانەش هەر لە خانەی ئەو « تورەهاتانە »دا جێیاندەبێتەوە، کە خۆی باوەڕی پێیان نییە؟!! ئایا، ئێستە کێڕی هەڵوێستی گۆڕیوە و سەرلەنوێ بایداوەتەوە، وا بەو چەشنە دەدوێ؟!!

## 18/3 . کام بەربەرەکانیی؟

لەوە دەچێ، « بەرزنجیی » هۆنراوەکانی « زێوەر »ی نەخوێندبێتەوە، یا تووشی نەخۆشیی بیرچوونەوە بووبێ! بۆیە، وا بێ ئاگایانە نووسیوێتی: (ئەگینا کاتێ زێوەر بەشیعرەکانی بەربەرەکانی داگیرکەری ئینگلیزی کردووە، بانگەشەی بۆچونە قوتابخانەو فێربون کردووە، باری ئیفلیجی دەسەڵاتی نەشارەزاو فەریکی خستۆتەڕوو ڕێنمایی کردوون « کە ئەوانە باس و کێشەی ئانی ئەوکاتە بوون ». ئەمانە لەگەڵ پێداویستیەکانی قۆناغی ڕۆژی خۆی لەبارو گونجاو بوون و دەستخۆشی لێ دەکرێ.)«23،3»

جگە لەوەی، ئینگلیزەکان خۆیان، خوێندن و خوێندەوارییان، بە زمانی کوردیی بڵاودەکردەوە و هەرگیز دژی ئەو کارەش نەبوون، « زێوەر »یش، هەرچییەکی بۆ خوێندن و فێربوون گوتبێ، کارێکی زۆر پیرۆزی کردووە و منیش هەر دەسخۆشانەی لێ دەکەم. بەڵام، لە کەسم نەبیستووە، یا هێندەی من سەرنجم، لە دیوانەکەی داوە، شتێکی لەو بابەتەم نەدیوە، بە هۆنراوەکانی بەربەرەکانی داگیرکەری ئینگلیزی کردبێ، وەک « بەرزنجیی » بوختانی بۆ کردووە! هەڵبەتە، هێندێ هۆنراوەی دیکەی هەیە، تا ئێستە، چاپ و بڵاو نەکراونەتەوە، یا بەر چاوی من نەکەوتوون، بۆیە، ئەوەی نووسیوە! بە پێچەوانەوە، من دەڵێم: « زێوەر » نەک هەر بەربەرەکانیی ئینگلیزەکانی نەکردووە، نەک هەر نێوانیان باشبووە، بەڵکوو، سەرکەوتنی ئەوانیشی، بە سەرکەوتنی خۆی و کورد زانیوە و هۆنراوەشی بۆ

گوتوون. چونکە، کاتێ لە ساڵی « 1924 »دا، « کۆمەڵەی نەتەوەکان » بڕیاریداوە، باشووری کوردستان لە « تورکیا » دابڕێ و بە « عێراقی عەرەبیی »ەوە بلکێنرێ، کە ئەوەش، هیوا و ئامانجی ئینگلیزەکان بووە، « زێوەر » خۆشیی خۆی دەربڕیوە، بە « حوکمی عەدالەت »ی داناوە، هۆنراوەیەکی درێژی بۆ هۆنیوەتەوە و لە دوا دوو دێڕی هۆنراوەکەدا گوتوویەتی:

که « عوسبەت ئەلئومەم »، ئەم « حوکمە » عادیلانەی دا
حەیاتی دا بە « عراق » و نەماوە « مەحروومیی »
بژی بە ـ عەدلەوە عوسبە ـ لەگەڵ « بەریتانیی »
چرای وولاتە قەراریان، بە « لەفزی مەفهومیی » «47-46،39»

## 19/3. لام باشە و لام باش نییە :

پاشان، کاتێ بایداوەتەوە، وەک ئەو نووسیویتی: (خۆکە لە سی و چلەکانیشدا هاتۆتە سەر برایەتی کورد وعەرەب و خاکی عێراق و شا فەیسەڵ! ئەوە بەپێی ئەو ڕۆژە راست و بێ هەڵەیە، چونکە مەسەلەی شۆڕشی کوردو « لامباشەو لامباشنیە »ی ئەوسا رۆی و تێ پەڕی، ئێستا « سی و چلەکان »ە دەبینین «مستجدات »ی تازە هاتۆتە گۆڕێ و دەبێ ئەدیب بەرەنگاری ئەوانە بێتەوە.) «23،3» ئەم وڕێنانەی « بەرزنجیی » چەن شتێکمان بۆ ڕووندەکاتەوە:

1. هۆنەر لە هەر سەردەمێکدا بژی، هۆنراوە بۆ سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان بڵێ، بە شان و بازووی « خاک، ئاڵا، بەرووبووم، رووبار و جوانیی وولات » کەیاندا هەڵدا، ئیدی هەر کەسێ دەبێ، با ببێ، بە هەڵەیەکی گەورەی مێژوویی دەژمێررێ. چەن زیان بە کورد و وێژەکەی دەگەیەنێ، دوو هێندە پتریش، زیان بە ناو و ناوبانگی هۆنەرەکە خۆی دەگەیەنێ.

« هێمن »ی هۆنەری گەل،(بە شیعری « بەهاری بێ خەزان » " 1961 " هەوڵیدا، قەڵغانێک بۆ داکۆکییکردن لە خۆی دژ بە « ساواک » دروستبکات.)«25،13» بەلام، تا چاوی لێکنا، داخی ئەو هۆنراوە بەرتیلدانەی، بە بنەماڵەی دەسڕۆشتووی شای « ئێران » لە دڵ دەر نەدەچوو. جا ئەوە خۆی لە خۆیدا، بە هەڵوێست دادەنرێ، چونکە، هەر زوو دانی بەو هەڵەیەی خۆیدا ناو و لێی پەشیمانبۆوە، نەک شانازیی پێوە کردبێ!

2. هەر هۆنەرێ « بەپێی ڕۆژ » هۆنراوەی قەڵب و قۆڕ بڵێ، هەر کەسێ کاری خراپ بکا، هەرگیز نابێ، بە چاکە بۆی بژمێررێ. بەڵکوو، ئەوانە لە نێو کورددا بە « کوڕی ڕۆژ، هەلپەرست و کاسەلێس » نێوزەدکراون و دەکرێن! « بەپێی ڕۆژ » و

فەرمایشتەکانی « بەرزنجیی » بێ، دەبێ، چاو لە ناپاکیی نیو میلیۆن جاشی کوردیش بپۆشین، جاشێتییەکەیان، بە ڕازەکردن و نیشتمانپەروەریی بۆ دابنێین!
3. هەڵوێست و کوردایەتیی، چ پێوەندییەکی بە « لام باشە و لام باش نییە »وە هەیە؟ ئایا، کاتێ باشووری کوردستان، بە زۆر بە دەوڵەتی « عێراق »وە بەسرایەوە، ئیدی « زێوەر »ناسا دەبێ، هەموو شتێ لە بیرکرێ، هۆنراوەی بێ تام و بۆنی بۆ ڕێزکرێ؟ گریمان، ئەوا « شۆڕشی کورد، لام باشە و لام باش نییە » ڕۆیی و تێپەڕی، ئەدی ڕۆڵی ڕەخنەگر و مێژوونووس چییە و خۆی لە چیدا دەنوێنێ؟ مێژوونووسەکانمان، بۆچی ئەو ڕووداوانە دەنووسنەوە؟ چۆن دەتوانین، لە لایەنە گەش و سیسەکانی مێژووی کورد بکۆڵینەوە؟ چۆن پەند لە مێژوو وەرگرین؟ بە ڕاستیی، ئەو قسەیە گەر یەکێکی نەخوێندەوار بیکردایە و ئەو نەیکردایە، (کە لەقەڵەمی کەسێکەوە دەردەچێ خۆی بەخاوەنی ڕادەیە لەسەروساختی کردن لەگەڵ ئەدەب و ڕۆشنبیریدا دادەنێ.. )«4،3» زۆر گوێمان پێ نەدەدا! بەڵام، « کەڵە نووسەر، مامۆستایەکی گەورە، خوێندەوارێکی تێگەیشتوو، ڕووناکبیرێکی پایەبڵند و ناسراو »ی وەک « بەرزنجیی » بیکا، (هیچ ناوترێ لەوە زیاتر کە بڵێم:)«4،3» لەو نەخوێندەوارەشی بە کەمتر سەیردەکەم و هەرگیز لێی قەبووڵ ناکەم!
4 . ڕاستە، لە هەموو سەردەمێکدا، نووسەر دەبێ، لەگەڵ سەردەمەکەی خۆیدا بژی. بەڵام، با بیرمان نەچێ، هەموو ڕووداوێ، پاشینە و پێشینەی مێژوویی تایبەتیی خۆی هەیە. چونکە، ئەوڕۆ « ئێستە » لە سەر پایە سەرەکییەکانی دوێنێ « ڕابوردوو » هەڵساوە. کۆشک و تەلاری سبەینێش « ئایندە »، هەر لە سەر بنچینەی « ڕابوردوو + ئێستە » لەگەڵ ئاسماندا دەبن بە برواسێ و دەیرازێننەوە! واتە: ڕابوردوو ئێستەمان بۆ لێکدەداتەوە. ئێستەش، پێشبینیی داهاتوومان بۆ دەکا. ڕاستە دەبێ، نووسەر بەرەنگاری « کاری خراپ، هەڵە و زۆرداری نێوخۆ و دەرەوە » ببێتەوە. ئێمەش، هەر ئەوە لە نووسەر و هۆنەرەکانی کورد داوادەکەین، هەڵوێست وەرگرن. بەڵام، نەک پرۆسێسی « لام باشە و لام باش نییە » لە بیستەکاندا کرابێ، کەچیی، لە سی و چلەکاندا، بازی بە سەردا بدرێ. بە هۆنراوە، دیواری قرچۆکی ئەو پێکەوەلکانەی باشووری کوردستان بە عێراقەوە پتەوترکرێ، لە « لەنگاندن، لەقان و ڕمان » قووتارکرێ. ئایا، ئەوە واتای ڕاستەقینەی « بەرەنگابوونەوە » دەگەیەنێ، کە « بەرزنجیی » تێیگەیشتووە و داوا لە نووسەران دەکا، بەرەنگاریانبێتەوە؟!!

گەر بهاتایە، وەک ئەو نووسیویتی: (زێوەر، قانیع، حەمدی و پیرەمێرد.. لەو ڕۆژانەدا دوای تەوژمی نازیەت و فاشیزم بکەوتنایە » لەچوارچێوە کشتیەکەی باری سیاسی ئەو ڕۆژە نەک وەک کوردێ کە لەوانەیە هەبووبێ رزگاربوونی لەواندا بینیبێ. » ئەوا کارەکانیان تاوێر جولاندن بوو بۆ سەرە ڕێگای بەرەو پێشەوە چوون.)«24،3» منیش هەر وا دەڵێم: گەر بهاتایە، وایان بکردایە، ئەوا ئەوڕۆ، بە کارێکی زۆر خراپ بۆیان دادەنرا. چونکە، هەر چەندە هیچ لایەکیان، هیچیان بۆ کورد پێ نەبووە، بەلام، هەرچی چۆنێبێ، بەرەی » دیمۆکراسیی و ئازادیی «، لە بەرەی » نازیزم و فاشیزم » باشتربووە و هەر بەراوردیش ناکرێن! خۆ بە لانی کەمەوە، ئەوان ئەو جەنگە ماڵوێرانکەرانەیەیان هەڵ نەگیرساندبوو، کە جگە لە زیانی مەتیریالیی، بە خنوخۆراییی، نزیکەی پەنجا ملیۆن مرۆڤی، تێیدا کوژرا. جگە لەوەی، مرۆ کە نموونەی هێنایەوە، پێویستە بزانێ، چی دەڵێ و باسی چی دەکا! چۆن » زێوەر، قانع، حەمدیی و پیرەمێرد » پێکەوە تێکەلاو و بەراورد دەکرێن؟ چونکە، هەڵوێستی لاواز و ناڕاستەوخۆی » زێوەر » و هەڵوێستی بەهێز و ئاشکرای هەر یەکێ لەو هۆنەرانەی دیکە، بەرانبەر ئەو ڕووداو و ڕۆژگارە دیارە!

## 20/3. هێڵی سوور :

پاشان، » بەرزنجیی » هاتووە، پێناسەی زانستی ڕامیاریی بۆ کردووین و نووسیویتی: (سیاسەت » علم الممكنات «، یانی هێڵی سور دانەنراوە کەنابێ لێی ڕەتبێ و تەجاوزی بکەی، ئەو شێوازەی دوێنێ دەگیرا ئەمڕۆ پەیرەو ناکرێ، وەک هەموان دەزانین ئەمڕۆ تیۆری » بؤرە الثوريە، العمق الاستراتيجي، حرب طويلە اللامد، اضرب و اهرب .. » وە زۆری تر لەم شتانەی لەپەنجاو شەستەکاندا هەبوون لەبواری خەباتی گەلاندا، ئەمڕۆ » زانست و تەکنۆلۆژیاو شۆڕشی گەیاندن و مانگە دەستکردەکان.. » هەموی وەلاخستن و گیڤارا زیندو بێتەوە گەر بیانەوێ لەسەعاتدا قۆڵبەست دەکرێ، کەواتە ئەو مێشوولەیە ئەما کەفیلێک وەرسک ئەمە بۆ ئەمڕۆمان ، کە نووسەر حەزی لێیە بەپێوانەی ئەمڕۆ موحاکەمەی مامۆستا زێوەر بکات.. کە دیارە ئەمەش کاری نەکردنە.)«24،3»

ڕاستە، بەو شێویە پێناسەی ڕامیاریی کراوە، گوایە : » زانستی ئەشێکانە «. بەلام، وەک ئەو لنگەوقوچ تێیگەیشتووە، لە مێژە هێڵی سوور، بۆ کاری خراپ و ناپاکیی، لە کاری ڕامیارییدا دیاریکراوە. چونکە، کاری ڕامیاریی دەبێ، لە ڕاژەی نەتەوە و نیشتماندا بێ. بەرژەوەندیی بالای نەتەوە و نیشتمانەکە، لە پێش هەموو شتێکی دیکەوە دانرێ. یا بە لانی کەمەوە دەبێ، لە ڕاژەی بەرژەوەندییە

ستراتیژییەکانی پارتێکی دیاریکراو، یا دەستەی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدارانی ئەو دەوڵەتەدا بێ. ئەگینا، ئەوە پۆلیتیکی پێ ناڵێن، بەڵکوو، زانستی خۆخەڵەفاندن و خۆکەوجکردنی پێ دەڵێن، کارەکەشیان وەک ئەوە وایە، گوێز بە گومەزدا هەڵدەن!

بەڵام، ناپاکیی مەگەر هەر لە هەگبە شڕەکەی « بەرزنجیی »دا جێی بێتەوە، ئەگینا بە هیچ شێوەیە، لە فەرهەنگی زانستی ڕامیارییدا، ناپاکییکردن لە نەتەوە و نیشتمان، بە کاری ڕامیاریی و « زانستی نەشێکان » ناژمێررێ! جا کەواتە، سەرانی کورد، هەموو ڕۆژێ دەتوانن، بەر بە تاوانی ناپاکییەوە بنێن، هێندەی دیکە، نەتەوەکەمان بەقوڕدا بەرن، پاساوی ئەو ناپاکییەش بەوە بدەن و بڵێن: فەیلەسووفی ناسراوی سەدەی بیستویەکی کورد « بەرزنجیی »، بڕیاری لە سەر داوە، گوایە: جیاوازیی لە نێوان زانستی پۆلیتیک و ناپاکییدا نییە! چونکە نابێ، هێڵی سوور و جیاکەرەوە، لە کاری ڕامیارییدا دانرێ! ئەی ئافەرین، بۆ خۆت و تیۆرییەک، بۆ نەتەوە بندەسە هەژارەکەی خۆتت داناوە. بە ڕاستیی، « بەرزنجیی » هەق نەبوو، مامۆستا بووایە، بەڵکوو دەبووایە، « مەلا » بووایە، وا بەو شێوەیە، یەک لە سەر یەک « فتوا » دەدا! لەوە دەچێ، وەک بێچوە قاز، هەر سەری لە هێلکە جوقاوە، وەک مەلەوانێکی شارەزا و بە توانا، لەو زەریا پان و بەرینەی زانستی پۆلیتیکدا، شان و پەلی کوتابێ. بۆیە، وا زیرەک و شارەزایە و تیۆری ناپاکییمان بۆ دادەنێ! ئەدی، بەرژەوەندیی بڵندی نەتەوەکە چی لێهات و بە چی لێکیدەینەوە، گەر هێڵی سوور لە ڕامیارییدا نەبێ و دانەنرێ؟ ئایا، لەو بەرژەوەندییەش ڕەتبێ، هەر نابێ، هێڵی سوور دانرێ؟ ئاخر بۆیە، ناپاکیی لە نێو کۆمەڵگەی کورددا، وەک یاری منالانی نێو کۆڵانەکانی « سولەیمانیی » لێهاتووە، هەر ڕۆژەی پارتێکی کوردستانیی، بە شێوەیە لە شێوەکان، ناپاکیی بەرانبەر نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی دەکا. دوایش، سەرانی ئەو پارتە دەڵێن: یاری پارت و کەلەکەمان وا پێویستیکرد، هیچ چارەمان نەبوو، ئەوەی ڕۆی، ڕۆی، با، لاپەڕەیەکی نوێ بکەینەوە!. وەک ئەوەی خوێندکار بن و لە زانکۆ بخوێنن، لە پۆلێکەوە بۆ پۆلێکی دیکە دەرچووبن، وا لاپەڕە و پەڕاوی نوێمان بۆ دەکەنەوە! وا دیارە، ئەوانیش، شارەزای ئەو تیۆرییەی « بەرزنجیی »ەن، بۆیە، گوێ بە هیچ نادەن، بە ئارەزووی دڵی خۆیان و بەپێی بەرژەوەندیی تەسکی پارتەکەی خۆیان، هێڵی سوور دەبڕن، بە دەیان جار، مل بە تاوانی ناپاکییەوە دەنێن، ناپاکیی بەرانبەر گەل و نیشتمانەکەیان دەکەن!

## 21/3. دوێنێ و ئەوڕۆ :

بۆ ئەوەی « بەرزنجیی » باشتر تێبگا و بزانێ، « ئەو شێوازەی دوێنێ دەگیرا »، ئەوڕۆ، لەو ناوچانەی جیهاندا، کە هێشتا ڕزگاریان نەبووە، گەر هەر هەمووی پێڕەو نەکرێ، ئەوا بەشێکی زۆری پێڕەودەکرێ. بەڵام، هەر بەو شێوە کۆنە نا، بەڵکوو، زۆر بە جوانیی ئارایشتدەکرێ و سەر و گوێلاکی دەڕازێنرێتەوە. چونکە، لە ژێر ئەم خۆرەی دەیبینین، شتێکی نوێ نییە. جا، گەر ئەمە لای نەتەوە سەربەست و پێشکەوتووەکانی جیهان، تا ئەندازەیەک گۆڕابێ و بگۆڕێ، ئەوا لای کوردە دڵ و گیانەکەی « بەرزنجیی »، ئەوەتەی دوو گوێی لێ ڕواوە، فێری کاری ڕامیاریی بووە، مەلایەکی وەک « بەرزنجیی »، بانگی بە گوێدا داوە، هەر هەمان قوڕ و چڵپاوی زستانە کۆنەکانی سەدەکانی پێش زایینە و دەیشێلێتەوە. چونکە، « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، جەنگی نێوخۆ، ناپاکیی و بێگانبەرستیی »، هەر لە سەردەمی « ماد »ەکانەوە تا ئێستە، بە شێوەیە لە شێوەکان، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا بەردەوامە. دەڵێی، ئەو خەسڵەتە خراپانە، لەگەڵ کورددا لەدایکبوون! بۆیە، ئەوەتەی کورد هەیە، هەر ڕادەپەڕێ و شۆڕش بەرپادەکا، داگیرکەرەکانیش، لە گۆمی خوێن و فرمێسکی هەڵدەکێشن. تا ئێستەش، هیچ ئەنجامێکی نەبووە، تەنانەت، دەوڵەتێکی سەربەخۆمان، لە دەرەوەی کوردستانیش دانەمەزراندووە! بە تایبەتیی، لە ماوەی سەد ساڵی ڕابوردوودا، هەرچی هەیە و کراوە، هەمووی هەر دووبارەکردنەوەی پێشوو بووە. جا با، فەیلەسوف و بلیمەتێکی وەک « بەرزنجیی » هەر بڵێ: « ئەو شێوازەی دوێنێ دەگیرا ئەمڕۆ پەیرەو ناکرێ. » ئایا، کێ دەتوانێ، پێمان بڵێ، کامەیە ئەو شێوازە نوێیەی، ئەوڕۆ لە کوردستاندا پێڕەودەکرێ؟ مەگەر هەر ئەو، لە مێشکی خۆیدا و بە ئەندێشە، شێوازێکی نوێی بۆ داهێنابێ و هێشتا بۆ سەرانی پارتەکانی کوردستانی هەڵ نەڕشتبێ! جا، گەر پیاوێ، خڕنوک ئاسا هەر لە بیاباندا بڕوێ، هەڵبەت، هەر هێندەی پێ دەکرێ، تری خۆی و گوێزەر لێککاتەوە، زەرینی هەبێ و پەڕینی نەبێ، هەرچی قسەیەکیش بکا، وەک قوڕی زستان عافووبێ! ئەگینا، گەر وا نەبێ، ئەو زاراوە ڕامیارییە قەبەقەبانەی هێناوێتییەوە، چ پێوەندییەکی بە سەر باسەکەی من و « زێوەر »ەوە هەیە؟ جگە لەوەی، تۆ بڵێی، ئەو نهێنییە گەورە و گرنگانەی درکاندوونی، هەر تەنیا خۆی زانیبێتی و کەس پارمەتی نەدابێ! بە ڕاستیی، جێی پێکەنینە، گەر ئەو زاراوانەی ئەو باسیکردوون، باویان نەمابێ! چونکە، گەر ئەوانە، بۆ سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراو، شیاو و گونجاوبووبن، هەرگیز ناشێ، بشێ، هەموویان توورڕدرابن و لە

قوژبنێکی ئەم جیهانەدا پێڕەو نەکرێن. ئەدی گەر وایە، ئەو هەموو ڕاونان و گرتنە، ئەو هەموو کوشتن و بڕینە، لە چەن دەوڵەتێکی وەک: « فیلیپین، سپانیا، بریتانیا، پاکستان، ئەفگانستان، کشمیر، فیجی، کۆلۆمبیا، ئیسرایل، تورکیا، عێراق، لوبنان، جەزایر ... تاد » دەکرێ، چییە و بە چی دادەنرێ؟

ئەورۆ، بە سەدان ڕێکخراوی نهێنیی و ئاشکرای چەپ و ئیسلامیی، لە جیهاندا هەن، دژی دەسەلات و دەوڵەتەکانیان خەباتدەکەن و دەجەنگن، هەوڵی ڕووخاندنی ڕژێمەکان دەدەن، بە دەیان کاری تیرۆریستیی، دژی خەڵکی « سیڤیل، بێ گوناح و دەسەلاتدار »ان ئەنجامدەدەن. کەچیی، تازە « بەرزنجیی » نووسیوێتی: باویان نەماوە!

جگە لەوەی، کەرەنتیی چییە، لە دوارۆژێکی نزیک یا دووردا، جەنگێکی سەرانسەریی جیهانیی ڕوو ناداتەوە، وولاتەکانی جیهان جارێکی دیکە، لە نێوان لایەنە سەرکەوتووەکانی جەنگدا، دابەش ناکرێنەوە؟ بەپێی بەرژەوەندییە گڵاوەکانیان، لە سەر نەوت و ئاو، ناوچە ستراتیژییەکانی جیهان داگیر ناکەن و لە نێوان خۆیاندا دابەشی ناکەن! ئەو کاتە دەبێ، سەرلەنوێ نەتەوەکان، بۆ ڕزگاریی و سەربەخۆیی نیشتمانەکانیان تێکۆشن.

دیارە، « بەرزنجیی » وەک فاڵچیی وایە و فاڵدەگرێتەوە. بۆیە، ئەو بڕیارە بنچیرانانەی داوە! ئەگینا، گەر ئاگاداری بەرنامەی ڕامیاریی و سیستێمی نوێی جیهانیی نەبێ، ئەوا دەبێ، بڵێین: لە بێ خەبەران، کەشکەک سەڵەوات!

هەر چەندە، ئەورۆ گۆڕەپانە نێو دەوڵەتییەکە، تا ئەندازەیەکی زۆر گەورە، لە لایەن « ئەمێریکا »وە پاوەنکراوە، بەلام، دەوڵەتەکانی جیهان، تا سەر بەو پاوانکردنە قایل نابن، بەرانبەر ئەو کارە دەسەوسان ناوەستن و نەوەستاون. بە شێوەیەکی بەردەوام، لە هەوڵداندان، تا بەر بە لێشاوی ئەو مەترسییە گەورەیە بگرن. ئەگینا، گەر وا نەبێ، « یەکێتیی ئەورووپا » بۆچی دامەزراوە؟ ئەوەی هەر دوو دەوڵەتی زلهێزی « چین » و « ڕووسیای فیدراڵ » و دەوڵەتەکانی وابەستەیان، چین؟ چۆن تەماشای دەوڵەتێکی زەبەلاحی سەرمایەداری دەوڵەمەندی پێشکەوتووی وەک « ژاپۆن » دەکرێ؟! بە چ شێوەیە، ژمارەی دانیشتووانی دەوڵەتێکی وەک « هیندستان » و توانای « ئەتۆمیی » هەڵدەسەنگێنرێ؟

ئەوەیان ڕاستە، لەگەڵ سالانی جاران و پێش ئەوەی، « یەکێتی سۆڤێت » و بلۆکی « وارشۆ » هەڵوەشێنەوە، جیاوازیی هەیە و شتەکان زۆر گۆڕاون. بەلام، هێشتا جیهانێکی هێمنی پڕ لە ئاسایش دا نەمەزراوە. هێشتا، کێشەی نەتەوەیی لە

هێندێ دەوڵەتی جیهاندا، بە تەواویی چارەسەر نەکراوە. هێشتا، گرفتی بێ کاریی و برسێتیی، لە زۆربەی وولاتەکانی جیهان بە گشتیی و هەر دوو کیشوەری « ئاسیا و ئەفریکا » بە تایبەتیی لەنێو نەبراوە. هێشتا، بە تەواویی لە هەموو جیهان و لە هەموو بوارەکاندا، « زانست، تێکنۆلۆژیا، هۆکانی گەیاندن و مانگە دەسکردەکان »، جێی بە هەموو شتەکان لەق نەکردووە و وەک یەک بڵاو نەبوونەتەوە.. هێشتا، لەم جیهانەدا، زۆر شتی دیکە ماوە، نهێنیی بێ، بدۆزرێتەوە و ئاشکراکرێ. وەک یەزدانی مەزنیش، لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: « و ما اوتیتم من علم الا قلیلا. »

## 22/3. جیڤــــــــارا :

جا گەر بڵێین، یەکێکی وەک « جیڤارا »، بۆ وای بەسەرهات، دەڵێم: ئەو خۆی بڕیاریدابوو، گۆڕەپانی خەبات چۆڵ نەکا، تا دوا دڵۆپی خوێن، دژی داگیرکەران و چەوسێنەران بجەنگێ. چونکە، بۆ باوەڕ و ڕێبازەکەی خۆی دڵسۆزبوو. بۆیە، گیرا و کوژرا. ئەوڕۆش، وەک سونبولێکی خەباتی نێونەتەوەیی تەماشادەکرێ و ڕێزی لێ دەگیرێ، گەر چی، هێندێ هەڵەشی هەبووبێ. بەڵام، خەڵکی دیکە، ترسنۆکبووە و ڕایکردووە، بۆیە، گیراوە و سزادراوە، یا بە دەم داخەوە سەری ناوەتەوە و مردووە. وردەوردەش، ناوی لە لاپەڕەکانی مێژوودا سڕاوەتەوە و دەشسڕێتەوە!

من پێم وایە، نەک هەر خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕێکی وەک « جیڤارا »، بەڵکوو، هیچ کەسێکی دیکەیان بۆ قۆڵبەس ناکرێ، وەک « بەرزنجیی » نووسیوێتی! بە مەرجێ، ئەو شۆڕشگێڕە خۆی، بە ئاگا و هوشیار بێ. جا گەر، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، مەبەس لە فڕاندنەکەی « عەبدوڵڵا ئۆجەلان » بێ، ئەوا بە پلەی یەکەم خۆی تاوانبارە. چونکە، لە لایەکەوە، گەر « ئۆجەلان » وەک سەرکردەکانی دیکەی کورد، لە نێو گریلا و گەلەکەی خۆیدا بژیایە، لە نێو کێو و چیا سەرکەشەکانی کوردستاندا، خۆی حەشاردایە، هەر بە تێلیفۆن سەرکردایەتی پارت و شۆڕشەکەی نەکردایە، باوەڕ ناکەم، هیچ هێزێ لە جیهاندا بیتوانیایە، بیفڕێنێ، وەک « بەرزنجیی » نووسیوێتی: « لە سەعاتدا قۆڵبەست بکرایە !»

لە لایەکی دیکەشەوە، کاتێ « ئۆجەلان »، لە وولاتێکی دیمۆکراسیی وەک « ئیتالیا » گیرسایەوە، بۆچی بە قسەی دەیان دڵسۆز و نیشتمانپەروەری کوردی نەکرد، ئەوێی جێهێشت و ملی ڕێی وولاتانی دیکەی گرت. خۆ گەر هەر لە « ئیتالیا » بمایایەتەوە، هەموو هێز و دەزگە سیخوڕییەکانی دەوڵەتە دژەکانی « ئۆجەلان » و دۆستەکانی تورک نەیاندەتوانی، پەنجەی بۆ بەرن! بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەش

دەڵێم: دەوڵەتێکی ئیمپریالیزمی سەرمایەداری زلهێزی وەک « ئەمێریکا »، هەموو دەزگە سیخورییەکانی دەوڵەتە سەرمایەدارییەکان، ئیسرایل و هێندێ لە دەوڵەتە عەرەبییەکانیش، ئەوا چەندین ساڵە دەیانەوێ، پیاوێکی یاخیبووی موسوڵمانی وەک « ئیبن لادن »ی دژ بە « ئەمێریکا، ئیسرایل و ڕژێمە نائیسلامییەکانی دەوڵەتە عەرەبیی »یەکان دەسگیرکەن، تەنانەت، « ئەمێریکا » بۆردومانی هێندێ ناوچەی « ئەفگانستان »یشی کرد، وایزانی، لەو ناوچەیەدا خۆی شاردۆتەوە، چەن میلیۆنێکی بە خەڵاتیش بۆ گرتنی داناوە، ئینجا تا ئێستە نەیتوانیوە، هیچ بە هیچ بکەن، « لە سەعاتدا قۆڵبەستی بکەن »، وەک « بەرزنجیی » بیری لێ کردۆتەوە!

## 23/3. مێشـــووله و فیل :

بۆیە، ئەو مێشوولەیەش تا ئەوڕۆ، لە هێندێ ناوچەی جیهاندا هەر ماوە، کە فیلێ وەرزکا. نموونەش لە سەر ئەمە زۆرە. هەڵبەتە، مێشوولەیەکی پچکۆلانـــەی وەک « ئیبن لادن »، مێشکی فیلێکی زلوزەبەلاحی وەک « ئەمێریکا »ی وێران و نیگەران کردووە. هەر مێشوولەی خرکەبەردی ساردی خواکردی بەردبارانی منداڵان و لاوانی گەلی « فەلەستین » بوو، بە گژ کوللەی گەرمی دەسکردی دەسی سەربازە داگیرکەرەکانی زایۆنیزمدا دەچوو، کۆڵی بە فیلێکی خاوەن دەوڵەتی « زانست، تێکنۆلۆژیا، شۆرشی ڕاگەیاندن و مانگی دەسکرد »ی وەک « ئیسرایل »دا، دانی بە مافەکانیاندا نا. هەر ئەو مێشوولەیەی « اضرب و اهرب »ی « حزبوللا »ی وڵاتی « لوبنان » بوو، جێی بە فیلێکی وەک « ئیسرایل » تەنگ و لێژ و لەقکرد و دەرپەڕان. هەر مێشوولەی ڕێکخراوی « ئیتا »ی « باسک »ەکانە، تا ئەوڕۆش، ســەری لە فیلێکی گــەورەی ئەندامی « ناتۆ »ی وەک « سپــان » تێکداوە و بە دەسیانەوە بێزارن! هەر مێشوولەی ڕێکخراو و « سوپای نهێنیی ئێرلەندە »یە، ژیانی بە فیلێکی زلهێزی وەک « بریتانیا »ی گەورە تاڵکردووە. ئەوە جگە، لە دەیان ڕێکخراوی « مافیا » و قاچاغچیی تلیاک، لە هەموو « ئەورووپا » و « ئەمێریکا »دا، سەرانی دەوڵەتە جیاوازەکانیان بە خۆیانەوە خەریکردووە.

ئەمانە، هەمووی چەن نموونەیە بوون، ناڕاستیی بۆچوونەکانی « بەرزنجیی » دەردەخەن. چونکە، ئەو لە بەر ڕۆشنایی، هەڵوێست و کردەوەکانی ڕێکخراوە کوردستانییەکانی لە مەڕ خۆمان، لە کێشە و گرفتەکان دەڕوانێ، بۆچوونەکانی خۆشی، هەر لە هەمان سەرچاوەی ئاوی لێڵ و لیخنەوە هەڵدەهێنجێ، بۆیە، بەو شێوەیە، لێی تێگەیشتووە! جا کەواتە، « بەرزنجیی » چی لەم جیهانە جەنجاڵە تێگەیشتووە، وا بە خۆڕایی منی تاوانبارکردووە، گوایە، من دەمەوێ، بە پێوانەی

ئەمڕۆ، حەزم لێیە، دادگایی « زێوەر » بکەم! گەر کەمێ بە دڵێکی خاوێن و بە دەروونێکی پاکەوە، لە نووسینەکەی بڕوانیایە، هەڵبەتە، جیاوازیی لە نێوان دادگایی و ڕەخنەگرتنندا دەکرد. ئەگینا، ئەو شەکرەی، بەو شەکرشکێنە سەرشکێنەی خۆی نەدەشکان!

## 24/3 زانستی ئەشێکان :

لەبەرئەوەی، « بەرزنجیی » لە کاری ڕامیاریی و نەتەوەییدا، زۆر ناشارەزا و دەسکورتە، بۆیە نووسیوێتی:(« زێوەر » بەپێی گۆڕانکاری و بۆچوون و ڕۆژەکەی خۆی جوڵاوەتەوە، یانی لەو ڕۆژانی سی و چلانەدا، زانیبێتی یاننا، « علم الممکنات »ەکەی پراکتیزەکردووە.) «24،3»

جارێ، با بزانین، « زێوەر » جگە لەوەی پیاوێکی نووسەر، هونەر و زانایەکی ئایینیی بووە، کەی ڕامیار بووە، تا ئەو « علم الممکنات »ەی فەیلەسووفی کورد « بەرزنجیی » دایناوە، پراکتیزەیکردبێ؟!! باوەڕ ناکەم، لەو ڕۆژەدا نەک هەر ئەو، بەڵکوو، زۆربەی کورد بە گشتیی، سەریان لە کاری ڕامیاریی دەرکردبێ و هەر ناوی « علم الممکنات »ەکەشیان بیستبێ!

لە ڕاستییدا، ماوەیەک دەبێ، باوەڕێکی نوێم پەیداکردووە. ئەویش ئەوەیە، پێم وایە، کورد هەرگیز کاری ڕامیاریی نەزانیوە. بەڵکوو، ئەوەی فێریشبووە و ئەوڕۆ دەیزانێ، تەنیا لە دەسی دووەمەوە وەریگرتووە و فێربووە. بەڵگەشم بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە، لە دوای سالانی سی سەدەی بیستەمەوە، لە هەموو دەوڵەتەکانی « تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » و هێندێ دەوڵەتی دیکەی لە ناوچەکەدا هەبوون، فێربووە. زۆر بە کێرپی و ناتەواوییش، پرینسیپەکانی زانستی ڕامیاریی، لێ وەرگرتوون. چونکە، ئەوەی وەریگرتووە، هەمیشە لە قازانجی ئەوان دا بووە و بە زیانی خۆی شکاوەتەوە. ئەگینا، ڕۆژێ لە ڕۆژان، بەرنامەیەکی سەرکەوتووی ڕامیاریی دەبوو، ئامانجەکانی خۆی دەپێکا، ڕۆژی بەم ڕۆژە ڕەشە نەدەگەیی!

پاشان، با بزانین، یەکێکی وەک (« زێوەر » بەپێی کام گۆڕانکاریی و بۆچوونی ڕۆژەکەی خۆی جوڵاوەتەوە؟) چی لە کاری ڕامیاریی و زانستی ئەشێکان دابوو؟ خۆ، لە بواری ڕامیاریی ئەو ڕۆژانەدا، ناوی لە کولەکەی تەڕیشدا نییە و لە هیچ سەرچاوەیەکیشدا باس نەکراوە! بۆچی، سەرکردەی ڕێکخراوێکی ڕامیاریی کوردیی یا کوردستانیی یا عێراقیی نهێنیی یا ئاشکرای کردووە، تا ئەو پرینسیپانەی پێڕەوکردبێ؟!! بەڵێ، نکولیی ناکرێ، « نووسەر، هونەر و زانایەکی

ئایینیی » بووه، خەڵک خۆشیویستووه. چونکە، پیاوێکی بێ وەی بووه. بەڵام، هەرگیز رامیار نەبووه، تا زانستی ئەشێکانی پیادەکردبێ، وەک » بەرزنجیی » بە ختوخۆرایی، وە باڵ بە تەختی کەردنی بۆ لێدەدا و تاوانباریدەکا! وا دیارە دەیەوێ، مێژوویەکی ساختەی بۆ دروسکا. من پێم وایە، نەک هەر پیاسەی نەکردووه، بەڵکوو، هەر نەشیزانیوه، » زانستی رامیاریی و ئەشێکان » بەری بە کوێوە بووە!

## 25/3. مینی کۆمەڵایەتیی :

سەیر ئەوەیە، منیش هەر ئەوەم لە سەر » زێوەر » نووسیوە، کە ئەو خۆی نووسیوێتی: (بەمەش نامانەوێ زێوەرو هاورێکانی وەک فریشتەیە بخەینەڕوو کە خەرمانەی رووناکی دەوری دابن،نەخێر، ئەوانیش تاکێکبوون لەم میللەتەو دەبێ چاوەڕوانی ئەوەشبکەین کەبەهەڵەشدا بچن، چونکە » هونەرمەندیش وەک کۆمەڵانی دیکەی خەڵک لەماوەی ژیانیدا بەسەردەیان ـ مین ـ ی کۆمەڵایەتیدا تێپەردەبێت، کەوا هەیە یەکیان لەژێر پێیدابتەقێتەوە،)«25-24،3» ئیدی نازانم، ئەم کەڕی بارە ترێیە چییە، بە منی کردووه! بەڵام، لە هەمان کاتدا، گرنگ ئەوەیە، ئەو هونەرمەندەی لە ماوەی ژیانیدا، بە سەر دەیان مینی کۆمەڵایەتییدا تێپەردەبێ و جاری واش هەیە، مینێکیان لە بن پێیدا دەتەقێتەوە، خۆی هێندە ئازا و مەرد بێ، دان بە هەڵەکانی خۆیدا بنێ! چەن کەسێکی دیکەی وەک » بەرزنجیی مش، کە ماڵیان لە شووشە دروسکراوە، بەرد لە ماڵی کەسی دیکە نەگرن و بەردەفڕکێ نەکەن، هەر لە خۆیانەوە، کوێرانە داکۆکیی لە هەڵەی هونەرمەندانی دیکە نەکەن.

## 26/3. دەرفەتی لواو :

پاشان، » بەرزنجیی » بروانامەی چاکیی و زیرەکیی، بە » زێوەر » و هێندێ لە هونەرەکانی دیکەی ئەو سەردەمە بەخشیووه و نووسیوێتی: (من وای بۆ دەچم، زێوەرو شاعیرانی تریش لەدوای جێگیربوونی حوکمی بەغدا لەباشووردا چاکیانکردووه کە » مسایەرە مهادمنە » ی ئەو رۆژگارە تازەیان کردەوەو بەپێی دەرفەتی لواو خزمەتی خۆیانکردووەوە ...)«25،3»

با بزانین، بۆچی چاکیانکردووه؟ ئایا لەو کلکەلەقێ، هەڵەکەسەما و ماستاو ساردکردنەوەیە، جگە لە ناوزڕاندنی خۆیان، چیدیکەیان بۆ ماوەتەوە؟ ئەدی، ئەو کاتە کورد چی دەسکەوتبوو، ئەوان بەو شێوەیە، رەفتاریان کردووه؟ ئەوە لە کاتێکدا، دەسەڵاتی نوێی » بەغدا » ی داگیرکەر، پێشتر زنجیرە شۆڕشەکانی » شێخ مەحموود » و پاشتریش، شۆڕشەکانی » بارزان » ی بە ئاگر و ئاسن

کوژاندبۆوە. هەر چی باسی کوردکوردینەشی بکردایە، لە قوژبنی گرتووخانەکان توندیاندەکرد. ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان و عێراقیش، دژی ئەو دەسەلات و ڕژێمە بوون. ئیدی دەبێ، چ هونەرێکی تێدابووبێ، گەر هەر هۆنەرێکی کورد، ئەلقەی پێوەندیی دۆستایەتیی و خۆنزیککردنەوەی، لەگەڵ ئەو ڕژێمە داگیرکەرە نۆکەرە بۆگەنەی سەردەمی پاشایەتییدا گرێدابێ! ئەدی، نیشتمانپەروەر و هۆنەرێکی وەک « بێکەس »، بۆچی تا مرد، بۆ ئەو کارەی نەکرد، هەر دژایەتیی هەر دوو دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » و « بریتانیا »ی دەکرد؟ دوای ئەوە، ئەوان کێ بوون، تا ئەو بڕیارە بدەن، خۆیان لە دەسەلاتی فەرمانڕەوایی « بەغدا » نزیککەنەوە؟ نوێنەری کێ بوون؟ کێ باوەڕی پێ دابوون، ئەو کارە بکەن؟ لە پێناوی چیدا، ئەوەیان کردووە؟ ئایا، کورد بێ خاوەن بووە؟ پارتە کوردییەکانی وەک « ژ. ک.، ڕزگاریی و شۆڕش » لە سەرەتادا و پاشتریش « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » لە سالّی « 1946 »ەوە ڕۆڵیان چی بووە؟ ئەوە جگە، لە « لقی کوردستانی – پارتی کۆمۆنیستی عێراق »یش، کە هەر لە سییەکانەوە لە کوردستاندا کاریانکردووە. ئایا، بەو خۆنزیککردنەوەیە، چییان بۆ کورد کردووە؟ خۆ کە ئەمانەش دەڵێم، مەبەسم ئەوە نییە، « زێوەر » و هاوەڵەکانی دیکەی، هیچ جۆرە پێوەندییەکیان لەگەڵ سەرانی دەوڵەتی « عێراق »دا کرێ نەدایە، ڕوویان لە شاخ کردایە، چەکیان دژی هەڵگرتایە، شەڕی ئەو ڕژێمەیان بکردایە. بەڵکوو، باشتر وا بوو، وەک ئەو خەڵکەی دیکە، سەری خۆیان کزکردایە، گەر کاری ڕامیارییشیان نەدەکرد، خەباتیان بۆ گەلەکەیان نەدەکرد، گەر شتی باشیشیان نەدەگوت، ئەوا شتی خراپیشیان نەگوتایە، هەر تەنیا، خۆیان بە هۆنراوەی « پیاهەڵدانی سروشت، باسی جوانیی، چیرۆکی ڕۆمانسیی و ستاییشی ئایینیی »یەوە خەریککردایە، گەلێ باشتربوو. جا با بزانم، ئێستە کەس دەیتوانی، ڕەخنەیان لێ بگرێ، لە گوڵ کالّتریان پێ بڵێ! بەلام، من ئەوە بە هەلپەرستیی دادەنێم، جا کێش ئەم ڕاستییەی پێ ناخۆشە، با لە ئاوی « زەریای مەرگ »بخواتەوە! ئەمە کێشەی مێژووی نەتەوەکەمە، منیش وەک کوردێ، قسەی خۆم بۆ مێژوو دەکەم، بێ ئەوەی شەرم لە کەس بکەم. چونکە، شاباشی خۆم داوە، بۆیە، قنج هەڵدەپەڕم!

نەتەوەکەمان، نەک هەر هۆنەر و نووسەری وای هەبووە و هەیە، هێندێ لە هۆنراوە و نووسینەکانیان، لە ڕاژەی بیری « عێراقچێتیی »دا بووە، بە سەر سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانیاندا هەڵداوە، بەڵکوو، هێندێ هونەرمەندی لەو بابەتەشمان

هەبووە و هەیە، لە ژیانی هونەریی خۆیاندا، ئەو هەڵانەیان کردووە. بۆ نموونە: دەنگخۆشێکی بە ناوبانگی وەک « حەسەن زیرەک »، کە لە هەموو دەنگێکی دیکەی کوردیی، بە رەسەنتر و خۆشتری دەزانم، هۆنراوەی « نەورۆز » بە ناوبانگەکەی « پیرەمێرد »ی تێکداوە، لە کۆتاییییەکەیدا، بە ئاشکرا بە سەر شای « ئێران »دا هەڵداوە و « بە پشتیوانی شاهەنشای ئێران »ی بۆ گوتووین! خۆزگە، « زیرەک » پێش ئەوەی ئەو گۆرانییە دزێوە بڵێ، ماڵاوایی لە ژیان بکردایە! خۆزگە، ئەو سرووده بەرزەی تێک نەدایە! خۆزگە، هەر ئەو گۆرانییەی نەگوتایە! خۆ باوەریش ناکەم، یەکێکی وەک « زیرەک » پیاوی « ساواک و شا » بووبێ. چونکە، ئەوەی ناسیوێتی، لە کوردپەروەریی و دڵسۆزیی بۆ کورد و کوردستانەکەی، هیچی دیکەی لێ ناگێڕێتەوە. هەمیشە، لە هەر دوو دیوەکەی کوردستان « خۆرهەڵات و باشوور »، دەربەدەر و تێهەڵدراوبووە. کەچیی، ئەوەشی بۆ شای « ئێران » گوتبووە! ئاخر بۆ گوتوویەتی؟ تۆ بڵێی، بە زۆر ئەو گۆرانییەیان پێ گوتبێ؟ نەخێر باوەڕ ناکەم. ئەوەتە، هۆنەرێکی وەک « سولەیمانی چیرە – هێرش »، چونکە دۆستی « هێمن » بووە، دەیەوێ، هۆنراوەکەی بۆ کوڕەکەی شای « حەمە رەزا شا »، گوتووە، بۆی پینەکا. بە دوای بەڵگەدا دەگەڕێ، گوایە: ئەو هۆنراوەیە هی « هێمن » نییە، بەڵکوو، یەکێکی دیکە نووسیوێتی و « ساواک » بە زۆر پێیان ئیمزاکردووە!

من پێم وایە، هۆنەر و هونەرمەند بە گشتیی، هێندێ جار، لە ساویلکەیی خۆیانەوە بێ، یا لە بەر هەلپەرستیی بێ، یا بێ مەبەستبێ، هەڵەی وا دەکەن و پاشانیش لێی پەشیمان دەبنەوە. نەک هەر لەو هۆنراوانەش پاشگەزدەبنەوە، کە بۆ سەرانی داگیرکەرانیان نووسیوە، بەڵکوو، لە هێندێ هۆنراوەی دیکەش پەشیماندەبنەوە، کە بۆ پیاوە نیشتمانپەروەرەکانی نەتەوەکەی خۆشیان هۆنیوەتەوە. بۆ نموونە: یەکێکی وەک « رەسووڵ هەمزەتۆڤ »، لە گەلێ هۆنراوەی خۆی پەشیمانبۆتەوە، کە لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکانی « یەکێتی سۆڤیەت »دا نووسیوێتی! جا لە ڕاستییدا، سروشت و خەسڵەتی کەسێتیی هۆنەر و هونەرمەند، بە شێوەیەکی گشتیی، بەو شێوەیەیە، کەمێ لە سروشت و خەسڵەتی کەسێتییەکانی، مرۆڤی ئاسایی جیاوازن!

هەڵبەتە، « بەرزنجیی » ئەو مافەی بەو هۆنەرانەی کوردی داوە، کە لەو سەردەمەدا چاکیانکردووە، « مسایرەو مهادنە »ی ڕۆژگارەکەیان کردووە و سەرە داوی دۆستایەتیی یەکیان لەگەڵ ڕژێمی « بەغدا » گرێداوە، بە خۆی و هەموو ئەوانەی

ئەو کارەشـدەکەن، بە رەوا دەزانێ. بۆیە، بە قـوڕوچڵپـاوی ناپاکیی قاچەکانی، خاکی کوردسـتانی پیسکردووە! هـەر لە ئێسـتەشـەوە، پۆزشی بە دەس ئەوانەوە داوە، گەر ڕۆژێ لە ڕۆژان و لە ناچاریدا، ناپاکییان لە نەتەوە و نیشـتمـانەکەی خۆیان کردووە! بە ڕاستیی، « بێچووە سەیید »، فتوای چاکی داوە!

ئاخـۆ، بەپێی دەرفـەتـی لواو، چیـیـان کردووە؟ ئایا، گـەر ئەو کـارەیان نەکـردایە، نەیاندەتوانی، ڕاژەی خـۆیـان بکەن؟ جگە لە نووسـین و کـارکـردن، لە یەکێ لە بەڕێوەبەرێتییەکانی دەوڵەتدا دەبێ، چ کارێکی دیکەی باشیان کردبێ؟ هەڵبەتە، ئەو کارانەش، لە هەمـوو کات و سـەردەمێکدا، بێ پێوەندییکردنیش، هەر دەکرێ، چونکە، بە مافێکی سروشتیی، هەموو هاو نیشتمانییەکی ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانانە دادەنرێ، دەوڵەت دەبێ، کاریان بۆ دابینکا و بیانژێنێ. بە تایبەتیی، گەر بەو ژیانە ملکەچیی و بندەستیی یە قایلبن !

لە هەمـان کـاتیشـدا، بە دەیان هۆنەر و نووسـەری دیکەمـان هەبوون، سـەرە داڵای ئەو پێوەندییەیان درێژ نەکردووە، بۆ دەرفەتی لواو نەگەڕاون، کەچیی، هۆنراوەی خۆشیان هۆنیوەتەوە! بە سەدان مامۆستا و فەرمانبەرمان هەبوون، کاری ئاسایی خۆیان کردووە، ڕاژەیەکی گەلێ مەزنیشـیان پێشکەش بە ڕۆڵەکانی گەلەکەیان کردووە. بەڵام، وەک ئەوانیش، هیچ جۆرە پێوەندییەکیان گرێ نەداوە، هەڵپەرست نەبوون، خـۆیان بە قـوڵفی بەرژەوەندییـەکانی خـۆیان و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا هەڵ نەواسیوە!

## 27/3. چەک و پێنووس :

هەر دوای ئەوە، شـتێکی سـەیرتری باسکردووە و نـووسـیـوێتی: (چونکە ئەوەی بەلولەی « پێنج تیـرو مـاوزەر » نەهاتەدی و نەکرا، نابێ بەتەمـابـین کـەنووکی قـەڵەمێ بیکات. وەک دیاریشـە کـارەکـەی ئەوان لەگـەڵ هی نـاحـەزو داخ لە دڵ و ناپاکی ناوخۆدا وەک ڕۆژی ڕووناک دیارەو هیچ زیرەکی و زانینێکی ئەوتۆی ناوێ بۆ لەیەک جیاکردنەوەیان.) «25،3»

بە ڕاسـتیی، « بەرزنجیی » لە زانیـاریی نەتەوەیی و ڕامیـارییدا، بە تەواویی پێ خـاوسـە! چونکە، لەوە دەچێ، تا ئێسـتـە، هەسـتی بەوە نەکـردبێ، یا ئەوەی نەزانیـبێ، ئەوەی دواتریش بەدیهـات، بەری ڕەنج و خـەباتی لوولەی تفـەنگە شـرەکـانی « پێنجـتـیـر و مـاوزەر »ی شـۆڕشـەکـانی « شـێخ » بوو، نەک ئەو داگیرکەرانە، بە دیاریی بە کوردیان بەخشیبێ! هەر ئەوەبوو، وای لە ئینگلیز کرد، دان بە هێندێ مافی وەک « ئۆتۆنۆمیی » و ڕووناکبیرییدا بنێ، زمانی کوردیی، بە

فەرمیی بناسێنێ و خوێندن لە خوێندنگە سەرەتاییەکانی هێندێ ناوچەی باشووری کوردستاندا، بە زمانی کوردیی بێ.

جگە لەوەی، گەر یەکێ باوەڕی بە « بیر، نووسین و پێنووس » هەبێ، هەرگیز ئەو قسەیە ناکا. چونکە، خەباتی کەلتووریی، بە تەواوکەری خەباتی ڕامیاریی و چەکداریی دادەنرێ. چ بۆ هوشیارکردنەوەی ڕۆڵەکانی گەل بێ، چ ڕاستەوخۆ لەگەڵ سەرانی داگیرکەدا بدوێ، لە ڕێگەی یادداشت و داواکارییەکانی گەلەوە، سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان ئاگادارکەنەوە و ناچاریانکەن، دان بە مافە ڕەواکانی کورددا بنێن!

من پێم وایە، مێژوو ئەوەیە، کە هەیە. بۆیە دەبێ، چۆن بووە و ڕۆیشتووە، هەر واش سەیرکرێ و تۆمارکرێ، هەڵسەنگێنرێ، لایەنە سیس و پیسەکانی بژارکرێ و توڕدرێ، لایەنە گەش و پاکەکانی هەڵبژێررێ و لە ئامێزگیرێ. تا پەند لە خراپە و کەڵک لە چاکەکانی وەرگرین، ئەگینا، هەرگیز مێژوو، بە ئاوێنەیەکی بالانمای ڕاستەقینەی ڕووداوەکانی نەتەوەکە دا نانرێ!

هەموو ئەو بزووتنەوە ڕامیاریی و ڕاپەڕینە چەکدارانەی، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، لە مێژووی نەتەوەکەماندا ڕوویانداوە، بە هەموو هەڵەوپەڵەکانیانەوە، بە بەشێکی گرنگی مێژووی نەتەوەکەمان دەژمێررێن. چۆن کەڵکیان هەبووە، بە هەمان شێوەش زیانیان هەبووە. جا چۆن کەڵکیان لێ وەردەگرین، ئەوەیان باسێکی دیکەیە، پێوەندیی بەو کەس و لایەنانەوە هەیە، کە لاپەڕەکانی مێژوو تەماشادەکەن و دەیانەوێ، کەڵکی لێ وەرگرن. هەر لە پاڵ ئەو بزووتنەوانەشدا، نووسەر و هونەرەکان جووڵاون و جوڵەیەکی گەشەداری کۆمەڵایەتیی و کەلتووریی پێکهاتووە. لە ئەنجامیشدا، ئەوەی بەدیهاتووە، هەمووی بەرهەمی خەباتی « نووکی تیژی پێنووس، هەوڵدانی ڕامیاریی و ڕاپەڕینی چەکداریی »، هەموو ئەو پیاوە ئازا مەردە قارەمانە لەخۆبوردوو و ڕووناکبیرانەی کورد بووە. بۆیە دەبێ، لە لایەکەوە ڕێزیان بگرین. لە لایەکی دیکەشەوە، ئێستەش و تا دەشمرین، هەر بە تەمای لەوە پترتربین، بەدیبێ. هێندەی باوەڕیشمان بە بزووتنەوەی کەلتووریی و نووکی پێنووس هەبێ، هێندە باوەڕمان بە لوولەی تفەنگ و بەکارهێنانی چەک نەبێ.

من پێم وایە، تەنیا هەر گۆڤاری « گەلاوێژ » و دەستەی نووسەرەکانی، بەقەدەر شۆڕشێکی بێ بەرنامەی کورد، ڕۆڵیان لە « بوژاندنەوەی هەستی نەتەوەیی، وشیارکردنەوەی کۆمەڵایەتیی، پترکردنی زانیاریی، هوشیاریی ڕامیاریی، گەشانەوە و پێشکەوتنی زمانی کوردیی، گەشەکردنی هونەر و وێژەی کوردیی دا

هەبووە! کەسێکیش باوەڕ ناکا، ئەوە لاپەڕەکانی مێژووی شۆڕشەکانی کورد و ئەوەش لاپەڕەکانی گۆڤاری « گەلاوێژ » دەتوانێ، بە بالای یەکدیان ببڕێ. لەو لا، جگە لە « ماڵوێرانیی، ڕاونان، گرتن، ئازاردان، کوشتن و بڕین، سووتاندن و کاولکردنی گوندەکانی کوردستان »، چی دیکەی دەسکەوت نەبووە. لەو لاش، بە پێچەوانەی هەموو ئەوانەوە، مێژوویەکی پاک و پڕ لە گەنجێکی وێژەییمان بۆ بەجێماوە، تا ئاکە کوردێکیش مابێ، شانازیی پێوە دەکا و وەک سەرچاوەیە کەڵکی لێ وەردەگرێ. هەڵبەتە، بە کاڵتە نەبووە، چەن هۆنەرێکی نیشتمانپەروەری وەک: « ئەسیریی » و « موفتیی » دژی چەکهەڵگرتن، هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە، چونکە، بە تەواویی لە هەموو ئازار و زیانەکانی گەیشتوون.

« ئەسیریی »، لەو سەردەمەی تێیدا ژیاوە، لە بواری هونەری هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانییدا، وەک هۆنەرێکی شۆڕشگێڕی کوردپەروەر، زۆر بە ئاسانیی، جێگەی خۆی لە ڕیزی کاروانی وێژەی کوردیدا کردۆتەوە. هێندە بە شێوەیەکی ژیرانە و زانستانە، هۆنراوەکانی دارشتووە، بیری لە باری دواکەوتوویی نەتەوەکەی کردۆتەوە، ئامۆژگاریی پڕ بە کەڵکی پێشکەش کردوون. بۆیە، هێندێ کەس پێیان وایە، « ئەسیریی » جگە لەوەی هۆنەرێکی گەورە بووە، وەک فەیلەسوفێکی کوردیش وابووە. گەر زۆر بە قووڵیی، لە زۆربەی زۆری دیاردەکانی « کۆمەڵگەی کوردەواریی، ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی، پلانی پاشەڕۆژ » و گەلێ شتی دیکەی نەکۆڵیبێتەوە، هەڵبەتە، ساڵی « 1925 »، واتە: پێش حەفتاوپێنج ساڵ لەمەوبەر، دەربارەی چەکهەڵگرتن و شۆڕشی چەکداریی، هۆنراوەی « بۆ زانین ی بە بیستوشەش نیوەدێڕ نەدەگوت. دژی بەکارهێنانی چەک نەدەبوو، کە ئەوڕۆ بۆ مان سەلماوە، نەتەوەکەمان لە هەموو پارچەکانی کوردستان و لە سەراسەری مێژووی نوێماندا، زیانێکی گەورەی لێ بینیوە. بۆیە، دید و بۆچوونەکانی، وەک نەخشی بەرد وابوون، بە تەواویی جێگەی خۆیان گرتووە. هەر چەندە، لە ڕووی هونەری هۆنراوەوە، بە شێوەیەکی ساکار نووسراوە، بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، بە زمانێکی ئاسان، بۆچوونەکانی خۆی دەربڕیوە، بیرێکی بەرز و وردەکارییەکی جوانی تێدایە، بە تایبەتیی کاتێ گوتوویەتی:

کوردە! چ فائیدەی هەیە ئەم خەنجەرە
ئەم فیشەک و ئەسلیحە و وەروەرە
باری مەکە ئاسن و باڕووت لە خۆت
باری گران لایەق گا و کەرە

بەس بخۆ نانی جۆ، لە پێکە کڵاش
سواری کەر و حەچە برۆ و وا وەرە
ڕووت و ڕەزیل بی، بەمە خوا ئەمری کرد؟
بەسیەتی ئەم کەوجییە، زوو هەڵگرە
عیلم و مەعاریف، ئەوەتا بەشدەکەن
هەڵسە، وەرە هیسسەی خۆت وەرگرە
سواری سیلاحی خۆ دەبن ئەورووپا
سەیری تەیارە بکە، عیبرەت گرە
کەر، نەفرۆشێ بە تۆ ماڵ ئەچنەبی
ڕووت دەمێنێ، لە قسەم کوێگرە
میللەتێ نەتوانێ، بکا دەرزیێ
ئیشی پەرێشانیی یە، ئەو بێ فەڕە
فێری عیلم بە، لە هەچی جێ ببێ
گەرچی لە چین، گوفتەی پێغەمبەرە
کاکە فەقێ! تۆ بچۆرە مەکتەبێ
سەعیبکە، ڕێگە بە مەقسەد بەرە
چونکە، موسڵمانی حەقت پێ دەڵێم
دەرسی علوومی ئەجانب وەرگرە
فرسەتە، ئەم وەقتی جوانیی یە، برا
مەسخەرە و کەیف و خورافات هەڵگرە
کوردە! « ئەسیریی » قسەی حەق دەڵێ
تەربییەی حیکمەتی لێ وەرگرە
«106-105،4»
بریا، هەر ئەو کاتەی « ئەسیریی »، ئەو «ۆنراوەیەی دژی چەک گوتووە، سەرانی کورد چیدیکە، پەنایان بۆ بەر چەک نەبردایە. چونکە، گەر کێشەی کوردیان، لە ڕێی چارەسەری ڕامیاریی و بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە چارەسەرکردایە، گەلێ باشتربوو، خوێن و فرمێسکێکی زۆریشمان بۆ دەگەڕایەوە!
« موفتیی » هۆنەریش، بە چل نیوەدێڕ هۆنراوە، لە هۆنراوەی « لەمەولا »دا، دژی بەکارهێنانی چەک دواوە و گوتوویەتی:
کوردە! لەمەولا، هۆشێ بێنەسەر
لادە لە بەزمی بێهوودە و سەمەر

تا ئێستە ئاخر، بە جەنگ و بە شەڕ
چی کەوتە دەستت، بە غەیری زەرەر؟
ئەم ڕۆژە ڕۆژی، عەقڵ و زەمانە
نەک ڕۆژی شەڕی، تیر و کەوانە
پاشان دەڵێ :
گەر لە هۆزەکەت، پیاوی ژیرت بێ
ڕەنگە ئارەزووی، دڵ دەسگیرت بێ
دواتریش دەڵێ :
کوردە! بە زاتی خوای تاک و تەنیا
ناگەیتە هەوار، بە هەراوهوریا
بزن بەخێوکەی، لە دەشت و سەحرا
چاکترە لە شەڕ، بۆ دین و دنیا «55-54.58»
کەچیی، ئێستەش سەرکردەکانی کورد، پەندیان لەو کارانە وەر نەگرتووە. جگە لەوەی، هەموو هێوایەکیان هەر چەکە، چەکیش دژی یەکدی و ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆیان بەکاردێنن!

## 28/3. ڕۆژنامە و گۆڤـــار :

هەر چەندە، تا « ڕۆژنامە، گۆڤار، وێزگەی ڕادیۆ یا ئێسگەی تێلێڤیزیۆن » لە کوردستاندا هەبێ و زۆربێ، سەر بە دەستەی خۆفرۆشی کورد و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش بێ، هێشتا هەر بوونیان لە نەبوونیان گەلێ باشترە. « بەرزنجیی » هەر سێ ڕۆژنامەکانی « ژین، ژیانەوە و زیان »ی بە (سێ ڕۆژنامەی ڕامکراوو لغاوکراوی حوکمەت) داناوە، چونکە، (لاپەڕەکانیان ئاوەلابوون بۆ ئەو قەڵەمە داغ لەدڵ و ژاراوڕێژانەی بەکەیفی دوژمن هەڵدەسووڕان.)«25.3». گەر ئەو بۆچوونەی ئەو، هێندێ ڕاستییشی تێدابێ، هێشتا، ئەو ڕۆژنامانە، هەر ڕازەیەکی زۆری « زمان، هونەر و وێژە »ی کوردییان کردووە. گەلێ نووسەر و هۆنەری نیشتمانپەروەریش، بەرهەمەکانی خۆیان تێدا بڵاوکردۆتەوە! بۆ نموونە: ڕۆژنامەی « هاوکاریی »، ماوەی پتر لە سی ساڵ دەبێ، لە « بەغدا » دەردەچێ. ڕۆژنامەیەکی کوردیی و چەن ڕووناکبیرێکی کورد دەریدەکەن. هێندێکیان سەر بە دەوڵەت و هێندێکیشیان بێ لایەن بوون. لەو ڕۆژەوە دەردەچێ، بە دەیان پێنووسی نیشتمانپەروەر و خۆفرۆشی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە. تەنانەت، یەکێکی وەک « بەرزنجیی »ش، هێندێ لە کورتەچیرۆکە بێ

پەردە « سێکسیی »ەکانی خۆی، تێدا بڵاوکردۆتەوە! ئیدی بۆچی دەبێ، هێڵێکی ڕاست و چەپ، بە سـەر « هاوکـاریی »دا بێنین، هەر لەبەرئەوەی، چەن خۆفرۆشێکی کورد، لە چەن سەردەمێکی جیاوازدا، دژی هەر دوو شۆڕشی سێپتێمبەر و نوێی گەلەکەمان نووسیویانە، قسەی ساردوسووکیان، بە سەرانی کورد کوتووە، بە شان و بازووی « سەددام » و جەنگە دۆڕاوەکەی « قادسیە »دا هەڵیانداوە؟!! لەبەرئەوە نابێ، وەک « بەرزنجیی » بەکلایەنانە، لە دیاردەکان بڕوانین، هیچ شتێ لەم گەردوونەدا نییە، هەر دوو لایەنی چاکە و خراپەی نەبێ، هیچ شتێکیش بە ڕاستیی ڕەها دانانرێ، تەنیا مردن نەبێ، هیچ جۆرە دەمەتەقێ و چەندوچوونێ هەڵ ناگرێ، جێگەی خۆی لە خانەی ڕاستیی تەواوەتیی و ڕەهادا کردۆتەوە، هیچ کومانێکی لای هیچ کەسێ نەهێشتۆتەوە!

## 29/3. وێـــــژەی دژ :

« بەرزنجیی »، ئەوانەی دژی « کورد، شۆڕش و سەرکردە »کانی، هۆنراوەی خراپیان کوتووە، بە قازانجی دوژمن شکاوەتەوە، نەک وەک « حەمدیی، پیرەمێرد، خالسیی ... تاد »، لە دڵسۆزییـیەوە، ڕەخنەیان گرتووە، بە « وێژەی دژ » ناوی بردوون و نووسیـویێتی: (کەواتە ڕۆژگارە تازەکە ئەم جۆرە ئەدەبەشی هێنایە کایەوە « ئەدەبی دژ » بەهەست و خـواست و ڕێبـازی زۆربەی خـەڵکەکە.. چاوداخستن لە ئاستیدا نادروستە، دەبێ لەو ڕاستیە بگەین کەمێژووی ئەدەبی کوردی هەمـووی بریتی نیە لەبەرهەمی شۆڕشگێڕی و مولتەزیم بەمەسەلەی نەتەوەکەوە.)«26،3».

لە کاتێکدا، ئەوە خـۆی لە خۆیدا، وێژەی کلکەلەقێ و مـەرایی نەبێ، بۆ دوژمنی داگیرکەریان کردووە، هیچ ناوێکی دیکەی بە سەردا ناسەپێ. گەر هێندێکیشیان یا هەمووشیان، لە خانەی ناپاکییدا دا نەنرێن!

منیش، لە مێژە لەو ڕاستییە تێگەیشتووم، مێژووی وێژەی کوردیی بە گشتیی و هۆنراوە ڕامیارییـەکان بە تایبەتیی، پێویستی بە بژارکردنێکی باش هەیە. هەر بۆیەشـە، پەردەم لە سـەر هێندێ هۆنراوەی نامـۆ و زۆڵەک، بە وێژەی ڕەسـەنی کوردیی هەڵداوەتەوە، کە خۆی لە چەن بەرهەمێکی « مەحویی، پیرەمێرد، ناریی، زێوەر، حەمدیی، موفتیی، گۆران، هێمن ... تاد »دا دەبینێ! ئەو جۆرە بەرهەمانە، نەک هەر شـۆڕشگێـڕیی نین، نەک هەر بە کـێـشـەی نەتەوەی کـوردەوە نەبەسـراونەتەوە. بەڵکوو، ئەو باخە ڕەنگینە ڕازاوەیەی وێژەی کوردییشیان، بە دڕکوداڵی هۆنراوە نامۆکانیان، ناشیرین و پیسکردووە. تازە خۆ چاریش نییە،

تف کە ڕۆکرا، هەڵ ناگیرێتەوە! ناتوانین، بە تەواویی لە لاپەڕەکانی مێژووی وێژەی کوردییدا بیانسڕینەوە، وەک مشکێکی تۆپیوی بۆگەن، بە پەڕۆیەکی دڕاوی پیس، کلکیان بگرین و توڕیان دەین! ئاشکرایە، چ مێژوو، چ وێژەی کوردیی، لە هەڵە و کەموکوڕیی بە دەر نین. بەڵکوو، بەشی خۆیان شتی خراپیان تێدایە. لە مەشدا وەنەبێ، تەنیا هەر کورد وابێ، بەڵکوو، لە مێژووی نەتەوەیی و وێژەی هێندێ نەتەوەی دیکەشدا، ئەو هەڵەوپەڵانە بەدیدەکرێ و هەر هەن. بەڵام مێژووی هیچ نەتەوەیەک، وەک نەتەوەی کورد بە بێگانەپەرستیی، سەروبەری نەگیراوە. جا، هەر لە « ماد »ەکانەوە بیگرە، تا بە چەن کوردێکی وەک « بەرزنجیی » دەگا!
دوایی نووسیویێتی: (تا لاپەڕەکانی رۆژنامە دەستەمۆکراوەکان هەڵدەینەوە شتی تازەترمان دێتەبەرچاو، « کوردی » ناوێک، دوای سەردانی مەندوبی سامی بۆ سلێمانی و کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەشراف و ئەعیانی شاردا وتارێکی داوە)«26.3» نموونەی هۆنراوەکەشی هێناوەتەوە، بەڵام لێرەدا، بە پێویستم نەزانی، دووبارە بینووسمەوە.
ئەز، جگە لەو هۆنراوانەی سوکایەتیی بە کورد و پیاوە هەڵکەوتووکانی کردووە، هەرچی نووسەرێ یا هۆنەرێ، شتێکی بۆ ئینگلیز گوتبێ، بە هیچ جۆرێ گلەیی لێ ناکەم. چونکە، هێندە ستەم و زۆرداریی تورکە عوسمانییەکانیان دیووە، تەنانەت، « گاور »ێکی وەک ئینگلیزیان، وەک فریشتەی بەهەشت لا وابووە و لە « موسوڵمان »ێکی وەک تورکەکانیان پێ باشتربووە. جگە لەوەی، ئەو هۆنراوانە، هیچ جۆرە زیانێکیان بە کورد نەگەیاندووە، باسی « عێراقچێتیی »یان نەکردووە! چونکە، هەر ئەو ئینگلیزانە بوون، ئەو خەڵکەیان فێری خوێنەواریی کردووە، رۆژنامە و گۆڤاریان بۆ دەرکردوون، چاپخانەیان بۆ دامەزراندوون، خوێندنیان بە زمانی کوردیی، لە خوێندنگە سەرەتاییەکاندا چەسپاندووە، زانست و زانیارییان بڵاوکردۆتەوە. بەڵام، برا تورکە « موسوڵمان »ەکان، تەنانەت نەیانهێشتووە، رۆڵەکانی کورد، بە زمانەکەی خۆشیان بخوێنن، ئیدی، بۆ دەبێ، « بەرزنجیی » بەو جۆرە هۆنراوانە، تەنگەتیلکەبێ، رەنگی زەرد هەڵگەڕێ، کەف بچەنێ و هەناسەی سواربێ! ئەوەتە، هۆنەرێکی وەک « موفتیی پێنجوێنیی »ش، ساڵی « 1946 »، لە ژێر ناوی « ناساندن »دا، بە هۆنراوەیەکی چل نیوەدێڕیی، لەو بارەیەوە گوتوویەتی:

من خاسی ئینگلیز ناچێ لە بیرم
کە پێمی ناسی باوک و باپیرم

هەر کەسێ سپڵە و حقوق نەزانە
نابێ بە بەشەر هەر چەن ئینسانە
با بڵێین ئینگلیز ئاپینی جوێ بە
بەلام کردەوە و دادی بەجێیە
هەر ئەو بوو کە وا بە دەست و بردی
بۆ فێرکردنی زمانی کوردیی
ئەو فێری کردین کوردی بنووسین
هەواڵی قەومی و میللیی بپرسین
هەر کەسێ ئیشی چاکی بۆ کردی
تۆیش چاکی بڵێ گەر کوڕی مەردی
لە خەوی غەفلەت ئەو رای پەڕاندین
ئەم گەنمە ئەیخۆین ئەو بۆی داچاندین
ئێستەش بە کوردیی، تەفسیری قورئان
کفرە لای گەلێ، نەفام و نەزان
بەلام، بە تورکیی یان بە فارسیی
کەشکەدارئەبن، بۆیان بنووسی
وا عەرەبییمان، کۆڵەکەی دینە
تورکیی و فارسیی، بۆچ وا شیرینە؟
• زەرب ئەلەسەل ێک، هەبوو لە ناومان
ئەمانخوێندەوە، ڕوون ئەبوو چاومان
عەرەبیی گەوهەر، تورکیی زۆر هونەر
فارسیی شەکەر، کوردیی تری کەر
ژیشک بێچووی خۆی، لا شل و نەرمە
کەچی بێچووی من، مشاری سەرمە
ئەو تێیگەیاندین، هوشیاری کردین
ئەم نەزانینەی، لە سەر لابردین
هەر کەسێ کەسە، حەرفێکی بەسە
گەورەمە هەر کەس، کە فریادرەسە
دوژمنیش پەیکوڵ، دەربێنێ لە پێم
گەر خاسی نەڵێم، ئەبێ چی بڵێم

چونکە خوا ڕاستە، ڕاستی خۆشئەوێ
هەر کەس ڕاست بڕوا، ڕاستیشی تووشدێ
من کە بە ڕەنجی شانی خۆم ئەژیم
بۆچ ڕیائەکەم، سا بە تەمای چیم
خۆ من مەئموڕ نیم، بۆ ڕوتبە و نیشان
بە درۆ خەڵقی بەرمە ئاسمان
بە ڕاستی ـ ژین ـ یش، هیمەتی نواند
بە تەنیا کوردی، داچەند و ڕواند «169-168،58»

باوەڕیش ناکەم، هـــۆنەرێکی نیشتمانپەروەری دڵسۆزی وەکـ موفتیی « پیاوی « بریتانیا » بووبێ، یا وەک خۆی گوتوویەتی: « فەرمانبەری دەوڵەتیش نەبووە، تا بۆ پلەوپایە، مەرایی بکا! » وا ئەو هۆنراوەیەی بۆ ئینگلیزەکان گوتووە، بەڵکوو، ئەوە تەنیا ڕاستییەکی ڕووتبووە. چونکە، چەن هۆنەرێکی وەک « موفتیی و پیرەمێرد »کە هۆنراوەیان پێشکەش بە « ئەدمۆنس » کردووە، زووتر و پتر، لە خەڵکی دیکەی ڕووناکبیر و کوردپەروەری ئەو سەردەمە، هەستیان پێ کردووە. بۆیە، لە چاکەی ئەو کارانەدا، بە سەر « مام ئینگلیز »یاندا هەڵداوە. جا، با یەکێکی وەک « بەرزنجیی »یش، چۆن لێکیدەداتەوە بیداتەوە، هیچ گرنگ نییە. چونکە، مێژوو سەلماندی، ئەو بۆچوونەی ئەوان ڕاستبوو، ڕاستیی و مێژووش، هیچ بە کڵاوی‌کەس ناپێوێ!

ئەز بە ڕاشکاویی دەڵێم: کەم کورد هەیە، لە سەردەمی بیستەکاندا، بە قەدەر چەن ئینگلیزێکی وەک: « ئەدمۆنس و سۆن »، ڕازەی زمانی کوردییان کردبێ، هەوڵیان بۆ گەشەپێدان و پێشکەوتنی دابێ. خۆ ئەوانە، هیچ بەرژەوەندییەکیشیان، لەو کارەدا نەبووە. تەنیا ئەوە نەبێ، وەک زانایەک، لە لایەکەوە، هەستیان بە جوانیی و پاراویی زمانەکە کردووە. لە لایەکی دیکەشەوە، بینویانە، چەن دواکەوتووە، ڕاژە نەکراوە، دەستوورێکی یەککرتوو و گرامەرێکی دیارکراوی نییە، فەرهەنگی تایبەتیی زمانەوانیی نییە، گەلێ ووشەی بیانیی، تانوپۆی تەنیوە. لەبەرئەوە، وەک زانایەک، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ زمانی کوردییدا کردووە. ئەوەی لە دەسیان هاتووە، کردوویانە و درێغییان نەکردووە! ئێمەش ئەورۆ دەبێ، لە چاکەی ئەو کارانەیاندا بڵێین: ماڵیان ئاوەدان و گۆڕەکانیان پڕ لە ڕووناکیی بێ!

جا، سەیرەکە لەوە دایە، هۆنراوەیەکی « حەمدیی » و ئەو « کوردی » ناوەی تێکەڵاوکردووە! چونکە، هۆنراوەکەی « حەمدیی »، لە خانەی هۆنراوەی ڕەخنەی

رامیاریی و کۆمەلایەتییدا جێیدەبێتەوە. بەلام، ئەو هۆنراوەیەی دیکە، لە پیاهەڵدان و مامەیکردن پتر، هیچی دیکە نییە! راستە، ئەوەی لە پێناوی بەرژەوەندیی کورددا، هەرچییەکی گوتبێ، هەر کارێکی کردبێ، هەڵبەتە، لە دڵسۆزییەوە بووە، ئەندازەی نیشتمانپەروەریی دەردەخا. بەلام، ئەوانەی بێ هۆ، هۆنراوەی بێ تامی پیاهەڵدانیان ریزکردووە، سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیان گوڵباران کردووە، ئەوا بە پێچەوانەی ئەوەی ئەو نووسیوێتی: (ئەم جۆرە کەسانە، رۆشنبیرو ئەدیبان، لەو بڕوایەوە کە دەکرێ لەم رێگایەوە هەندێ مافی زەوتکراو بەدەستخرێ و خێری خەڵکەکەی تیابێ، دەتوانین بڵێین کەئەمانە هەموو پیاوانی رۆشنبیرو دڵسۆزو خاوەن رابوردوی پاک بوون، هیچیان گومانی ئەوەیان لێ ناکرێ کە کاسەلێسی ئینگلیزو دژبەکورد بووبن، ئەمانە تەنیا شێوازی هەوڵدانەکەیان جیابوو.)«27،3»

جا، هەر لەو پێوەدانگەوە، « بەرزنجیی » پۆزش و بەڵگەی، بۆ خۆی و ئەو هۆنەرانەش دۆزێتەوە و هێناوەتەوە، کە بە « عێراق » و شاکانیاندا هەڵیانداوە، بۆیە گوتوویەتی: (بۆیە لە سی یەکانەوە بەرەو ژوور، ئەدەبی کوردی بەشێکی زۆر لەو شیعرو نووسینانە دەگرێتە خۆی کەپیاهەڵدان و ستایشی حوکمی تازەی و « موسایەرەکردنە » لەگەڵیدا، دیارە ئەمە مەلیکەکانی عێراقیش دەگرێتەوە، لە فەیسەڵی یەکەمەوە بۆ کوڕو کوڕەزاکەشی.)«27،3»

وەک پێشتر گوتم: ئێمە ناتوانین، ئەو هۆنراوە خراپانە، رەتکەینەوە، تازە گوتراون و نووسراون، تیریش لە کەوان دەرچوو، ناگەڕێتەوە! هەروەها ناشتوانین، لێیان بێ دەنگبین و بیانشارینەوە. بەڵکوو دەبێ، باسینکەین. چونکە، بە بەشێ لە وێژەی کوردیی دەژمێررێن. بەلام، لێرەدا گرفتەکە لەوە دایە، ئێمە چۆن لەو هۆنراوانە بڕوانین و باسیان بکەین؟!! بە چاک یا بە خراپ تەماشایانکەین، بەڵگەی قرچۆک و لاوازیان بۆ داتاشین و پاساویاندەین، یا زۆر ئازایانە، لێیان بکۆڵینەوە و رەخنەیان لێ بگرین. باوەڕ ناکەم، نەک هەر ئەو جۆرە کارانە، لە دەس مامۆستایەکی وەک « بەرزنجیی » نایە، بەڵکوو، بە رەخنە لێ گرتنیشیان، قوشقیدەبێ و وەک فیشەکەشێتە بە هەوادا دەچێ!

## 30/3. بەراوردکردنێکی نابەجێ :

« بەرزنجیی »، سیبارەکەی بە هێندێ هۆنراوەی، هۆنەرانی کورد پڕکردۆتەوە، هیچ جۆرە پێوەندییەکیان بە سەر باسەکەی منەوە نییە. بۆ نموونە: هۆنراوەیەکی « پیرەمێرد »ی هێناوەتەوە، نە لە دوور و نە لە نزیکەوە، لەگەڵ هۆنراوەکانی

مزێوەر »دا ئاشنایەتییان نییە. چونکە، هۆنەرێکی گەورەی وەک « پیرەمێرد »، ڕەخنەی لە سەرانی کورد گرتووە، ڕەخنەکەشی تا ئەورۆ، لە جێی خۆی دایە، کاتێ گوتوویەتی:

ئەم کوردە وەکو مەڕی بەسەزمان
دوای هەر کەسێ کەوت نەیبردە ناو ڕان «28.3»

وەک خۆی لە پەراوێزی ژمارە سێدا نووسیوێتی: سەرچاوەی ئەم دێرە هۆنراوەیەی، بە دەمی لە « عومەر مارف بەرزنجیی » وەرگرتووە. بۆیە، وا دەڵێم: چونکە، ئەو تاقەتی خوێندنەوەی نییە، یا زۆر بە پەلەبووە، وەڵامی گوتارەکەم بداتەوە. ئەگینا، نووسەرێ نووسەر بێ، چۆن هۆنراوە لە دەمی کەسێکی دیکەوە وەردەگرێ و وەک سەرچاوە بەکاریدێنێ. بە مەرجێ، دیوانی ئەو هۆنەرە، چاپ و بڵاوکرابێتەوە! لە ڕاستییدا، « پیرەمێرد » ساڵی « 1945 » هۆنراوەی « تەنها دڵسۆزی » داناوە و لە سیازدە دێڕ هۆنراوە پێکهاتووە. لەبەرئەوە دەبینین: ئەم دێرە هۆنراوەیەشی، وەک شتەکانی دیکەی، یا بە هەڵە گواستۆتەوە، یا بە ئارەزووی خۆی شێواندوویەتی. چونکە، لە دیوانەکەیدا، بەم جۆرە نووسراوە:

ئەم قەومە وەکوو مەڕی بێ زمان
دوای هەر کەسێ کەوت، نەیبردە ناو ڕان «110.8»

بەڵام، « زێوەر » ڕەخنەی لە سەرانی کورد، گروپ و ڕێکخراوە ڕامیارییەکان نەگرتووە، هۆنراوەی ڕامیاریی نەهۆنیوەتەوە. بەڵکوو، بە خاکی « عێراق » و سەرانی داگیرکەریدا هەڵداوە! جا گەر ئەمە، لە لایەکەوە بەراوردێکی نابەجێ و شێواندن نەبێ، لە لایەکی دیکەشەوە، ناشارەزایی، درێژدادڕیی و لە باس لادان نەبێ، چییە؟!!

جگە لەوەی، هەر لە خوار هۆنراوەکەوە نووسیوێتی: (دیارە هەر یەکەو ڕۆڵەی ئەم خەڵکەی بەرەو قەسابخانە بردو نەیگەیاندە لەوەڕگای ئاسودەیی و سەرفرازی و پێدەشتی حەوانەوە.)«28.3» دیارە، تەماشای هۆنراوەکەی کردووە، باسی « مەڕ و ناو ڕان »ی تێدایە، ئیدی وایزانیوە، « پیرەمێرد » مەبەستی هەر لە ئاژەڵ بووە، بۆیە، ئەمیش ووشەی « لەوەڕگا »ی بەکارهێناوە!

## 31/3. داگیرکەر هەر داگیرکەرە؟

« بەرزنجیی »، وەک هەموو « عێراقچیی »ەکی هێندێ لە کۆمۆنیست و موسوڵمانەکان، هەر ئینگلیزی بە داگیرکەر داناوە، چ لە نزیک و چ لە دوورەوە، دەوڵەتی « عێراق »ی بە دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان دا نەناوە. بەڵکوو، بە

لانەیەکی سروشتیی خۆی و کوردی زانیوە. چونکە، لە سەراپای سیبارە زەردباوەکەیدا، بە دەیان جار، ناوی داگیرکەری ئینگلیز و « بریتانیا »ی بردووە، بەلام، وەک هەموو « عێراقچیی »یەکی ترسنۆک و پەیامنێری رۆژنامەکانیان، خۆی لەو راستییە پاراستووە، ناوی دەوڵەتێکی داگیرکەری فاشیی هەڵتۆقیوی دەستی « Sir Percy Cox » بێنێ و بە داگیرکەری دانێ!
ئەو هۆنراوەیەی « پیرەمێرد »یش، پێشکەش بە یادی « میستەر ئەدمۆنس »ی کردووە، زۆر لە جێی خۆیدا بووە. چونکە زانیویەتی، ئینگلیزەکان چ کارێکی باشیان کردووە، رێگەیان بۆ راکێشاون و قیرتاویانکردووە. بۆیە، ئەو هۆنراوەیەی بۆ گوتووە. شتێکی سەیریش نییە، سەردەمێ، کۆلکە مارکسیی و کۆمۆنیستەکانی کورد، « پیرەمێرد »ی بلیمەتیان، بە پیاوی ئینگلیز داناوە. چونکە، کاتێ مرۆڤ لە بری مێشکی، چاوی بەکارهێنا، چاو، تەنیا چاویلکەی مێشک نەبوو، ئەوا تووشی ئەو جۆرە قرقێنانەی مێشک دەبێ!
دەبێ، زۆر باش بزانین، « موفتیی و پیرەمێرد »، هۆنەرەکانی دیکەی کوردیش، ئەوانەی هۆنراوەیان بۆ ئینگلیز هۆنیوەتەوە، کارێکی زۆر باشیان کردووە. چونکە، ئینگلیزەکان داگیرکەرێکی راستەوخۆ نەبوون، بە تایبەتیی، باشووری کوردستانیان داگیر نەکردووە. بەڵکوو، هەموو خاکی عێراقیان داگیرکردووە، هەر لە سەرەتاشەوە، وەک دەوڵەتێکی گەورەی براوەی جەنگ رەفتاریانکردووە، خاکەکەیان لە دەس تورکە عوسمانییەکان سەندۆتەوە، دەوڵەتێکیان بۆ عەرەبی عێراق دامەزراندووە، باشووری کوردستانیشیان پێوە لکاندووە. بەو مەرجەی، سەرپەرشتیی دەوڵەتەکە بکەن، تا سەران و کاربەدەسانی ئەو دەوڵەتە، فێری کاری دەوڵەت دەبن و کارەکانی خۆیان بە باشیی رادەپەرێنن. هەر کاتێکیش، ماوەی « مەندات » تەوابوو، ئەوا ئەوان سەربەخۆیی عێراق رادەگەیەنن.
ئەو کوردانەی، دژایەتیی « بریتانیا »یان کردووە، گەر ئێستە زیندووبنەوە، کردەوە رەش و تاوانەکانی حەفتاوپێنج ساڵی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »یان بۆ بگێرینەوە، بە هەر دوو دەس، قوری پەشیمانی لە سەری خۆیان دەگرن! چونکە، ئینگلیزەکان و عەرەبی عێراق، بە هیچ شێوەیە، بەراورد ناکرێن! جا ئیدی، با چەن « عێراقچیی »یەکی وەک « بەرزنجیی »، تەنیا هەر ئینگلیزەکان بە داگیرکەر دابنێن و خۆشیان بە ئامۆزای شا « فەیسەڵ » بزانن!
راستە، هەر نەتەوەیەک یا دەوڵەتێکی دیاریکراو، لە ژێر هەر ناوێکدا بێ، خاکی نەتەوەیەک یا دەوڵەتێکی دیکە داگیرکا، هەر بە داگیرکەر دەناسرێ. بەلام،

داگیرکەر تا داگیرکەر، جیاوازییان هەیە. تەنانەت، دوو برای دایک و باوکییش، هەر جیاوازییان هەیە. گەر داگیرکەرێ بیەوێ، لە بۆتەی نەتەوەکەی خۆیدا بمتوێنێتەوە، سەروەت و سامانی وولاتەکەم هەڵلوشێ، ناوم نەهێڵێ، ڕەنگم بشێوێنێ، دەنگم بتاسێنێ، خاکی نیشتمانەکەم لەتوپەت و دابەشدابەشکا، چۆن لەگەڵ داگیرکەرێکی دیکەدا جیاوازییان نییە، کە ئەو مافانەم لێ زەوت ناکا، بەڵکوو، هێندێ مافی نەتەوەییشم پێ ڕەوادەبینێ؟!!
کەواتە، (هەر چەندە، خەسڵەتی « داگیرکەران، کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم »، لە ڕووی داگیرکردنی وولاتان و گەلانەوە، لە هەموو جیهاندا چوونیەکن، جا ئەو داگیرکردنە، لە ژێر پەردەی هەر ناوێکدا بێ، گرنگ نییە. بەلام، داگیرکەر تا داگیرکەر جیاوازیی هەیە. داگیرکەرێ لە داگیرکەرێکی دیکە، بە پلەی « پێشکەوتن، ژیاریی، شارستانێتیی، ئاستی ڕووناکبیریی و کەلتووریی گەل و سەرکردایەتییەکەی، باری ئابووریی » جیادەکرێتەوە. بۆ نموونە: گەر داگیرکەرێ، لە سەر بنچینەی سیستێمێکی دێمۆکراسیی بڕوا، لەگەڵ داگیرکەرێکی کۆنەپەرستی دیکتاتۆری ڕەفتارفاشییدا، گەلێ جیاوازیی هەیە. تەنانەت دەستەیە لە دەستەیەکی دیکەی فەرمانڕەوا و کاربەدەسان، لە نێو هەمان نەتەوەی بالادەسدا لە یەکدی جیاوازن.
بۆ نموونە: داگیرکەرێکی وەک ئیمپریالیزمی « فرەنسا »، خاک و گەلی عەرەبی «جەزایر »ی داگیرکردبوو، لەگەڵ ئیمپریالیزمی « تورکیا »ی داگیرکەری باکووری کوردستان، گەلێ جیاوازییان هەیە. لە ماوەی هەشت ساڵی پڕ لە « قارەمانێتیی، خەبات، ژان، فرمێسک و خوێن »دا، گەلی « جەزایر » نەیتوانی، چۆک بە داگیرکەرە فرەنساییەکان بدا و سەربەستیی بەدەسبێنێ. هەر چەندە، ئەوان خاکی « جەزایر »یان، بە پارچەیە لە خاکی« فرەنسا » دادەنا. بەلام، کاتێ پیاوێکی ژیری وەک ژەنەراڵ « دیگۆل »، لە سەرەتای شەستەکاندا، دەسەلاتی ڕامیاریی وەگرت، دانی بە مافی چارەنووسی گەلی « جەزایر »دا نا. بەلام، ئەو پیاوە ژیرە، ئەو دەستە دێمۆکراسییە، تا ئێستە لە نێو تورکدا پەیدا نەبووە و هەڵ نەکەوتووە. ئیمپریالیزمێکی بەهێزی وەک « بریتانیای گەورە »، نزیکەی سێ سەدە، گەلانی « هیندستان »ی دەچەوسانەوە و خاکەکەیانی داگیرکردبوو. گەر هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، لەگەڵ ئیمپریالیزمی « ئێران »ی داگیرکەری ڕۆژهەلاتی کوردستان بەراوردیانکەین، گەلێ چاکتربووە. چونکە، لە زۆر ڕووەوە، یارمەتیی « هیندستان »یان داوە.)«336،29»

ده دیاره، ئەو هۆنەرە کوردانەی، هۆنراوەیان بۆ ئینگلیز گوتووە، بۆ ئەو داگیرکەرە باشەیان گوتووە، کە لەگەڵ داگیرکەرە تورکە خراپەکاندا، جیاوازییەکی زۆریان هەبووە و هەیە. ئاخر ئینگلیزێ، وەک « بەرزنجیی » خۆی نووسیوێتی و دانی پێدا ناوە، رێگەوبانی کوردستانی چاککردبێ، قیرتاویکردبێ، پردی دروسکردبێ، کارگە و بەنداوی ئاوی دامەزراندبێ، کارەبای بۆ ڕاکێشابێ، ئۆتۆمۆبیلی بۆ هێنابێ، زانست و زانیاریی بڵاوکردبێتەوە، زمانی کوردیی بوژاندبێتەوە، هونەر و وێژەی کوردیی پێشخستبێ، هۆنەرەکانی کوردی هاندابێ، بە کوردییەکی ڕەسەن و پەتیی بنووسن. ئیدی، بیانییەکی ئەورووپایی « گاور »، لە چاو برا « تورک و عەرەب » موسوڵمانەکانی « بەرزنجیی » دا دەبێ، چیدیکەی بۆ کورد بکردایە؟!! کەچیی، هێشا هەر دژیشیان بین! هێشتا، هەر ئەوان بە داگیرکەر و عەرەبەکانیش بە برا بزانین!

هۆنەرێکی شێرەپیاوی وەک « بێکەس »، بە « بیستوحەت ساڵە مکەی، نووکی تیژی پەنجەی ئازایەتیی و مەردایەتیی، ڕەخنە و دوژمنایەتیی، لە چاڵی چاوی « ئەدمۆنس » ێکی یەکەم گەورە پیاوی، دەسڕۆیشتووی ئەو سەردەمەی ئینگلیز لە کوردستاندا چەقان. ئینجا، هیچیشیان پێ نەگوت. کەچیی، ئەوڕۆ پێنووس، لە ئاستی تاوانەکانی سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقدا بێ توانایە و ناتوانێ، هەرچییان بەرانبەر بە گەلی باشووری کوردستان کردووە، هەموویان دەربڕێ!

جگە لەوەش، ئایا، سەرانی پارتە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان خۆیان، بەقەدەر ئینگلیزەکان، ڕەخنە قەبوڵدەکەن؟ کوردستانیان ئاوەدانکردۆتەوە؟ ڕاژەی « زمان، هونەر و وێژە » ی کوردییان کردووە؟ ئایا، گەر « شێخ مەحموود »، تاکە کڵاشەکەی، نەک لە سەروگوێلاکی سەرۆکی دادگەی ئینگلیز یا دەوڵەتی « عێراق » بگرتایە، بەڵکوو، لە سەرۆکی دادگەیەکی کوردستانی ئەوڕۆی بگرتایە، چییان لێ دەکرد.؟!! جا، گەر « بەرزنجیی »، لە پەندە کوردییەکە بگەیشتایە، کە دەڵێ: بە هۆی کوڵەکەنێکەوە، هەزار مرۆڕ ئاودەخواتەوە، هەڵبەتە نەیدەنووسی: (کەلەم شیعرە وردبیینەوە دەشێ ئێمە ڕەخنە لەشاعیر بگرین کەبۆ مەدح و ستایشی دیاردەیەک دەکات کەداگیرکەر لەگەڵ خۆی هاوردویەتی و بۆ ئاسانکردنی کاری خۆی کردوویە؟)«31،3».

جا، با بۆ ئاسانکردنی کاری خۆشیان، ئەو پڕۆژەیەیان ئەنجامدابێ، خۆ کاتێ کوردستانیان جێهێشتووە، هیچیان لەگەڵ خۆیان نەبردووە! کەچیی، سیخوڕ و چەکدارەکانی « عێراق »، هێلکەی مریشک ئاساییشیان، لە کولانەی ماڵە

جووتیاری گوندەکانی کوردستان دەدزیی. ئێستەش، پارتە کوردستانییەکان، کاتێ بە یەکدادەدەن، ماڵان تاڵاندەکەن، هاوزمانەکانی خۆیان دەربەدەر و ئاوارەدەکەن! چا نەبوو، ئینگلیزی داگیرکەر، ئەو کارە خراپانەشیان، لەگەڵ هاوزمانەکانی « بەرزنجیی »دا نەکردووە، ئەگینا ئێستە، هیچ نەدەما، پێیان بڵێ!
سەیر ئەوەیە، ئێستەش ئەو تۆزە ئازادیی و نیمچە سەربەخۆییەی، لە باشووری کوردستاندا هەیە، دوو دەوڵەتی ڕەوشت ئیمپریالیزمی وەک: « ئەمیریکا و بریتانیا » دروسیانکردووە و دەیپارێزن. گەر ڕەوشی کورد، لە هەر جێیەکی دیکەی کوردستان، لەگەڵ باشووردا بەراوردکەین، جیاوازییەکی گەورە دەبینین!
جگە لەوەی، داگیرکەری « عێراق »، هەر چاوی زەق و سووری ئەوانی لێ وونبێ، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، ئەم جارە برا گەورە عەرەبەکانی « عێراق سان و سەرۆکی دەوڵەتی « عێراقی خۆشەویست ! » چی بە سەر گەلی باشووری کوردستان دێنن! خۆ ئەو کاتە، ئەوان لە کەس ناپرسن، کێ « عێراقچیی »یانە و کێ « کوردستانیی »یانە بیردەکاتەوە! بەڵکوو، هەمووی بە یەک چاو سەیردەکەن، وەک یەک قڕیدەکەن، چونکە کوردن! ئایا، هەر ئەو دوو دەوڵەتە نین، ئێستەش نایەڵن، « پارتیی و یەکێتیی » پەلاماری یەکدی بدەنەوە، لەوە پتر، کوڕی کورد بە خۆڕایی بە کوشتبدەن، نیشتمانەکەمان چۆڵ و وێرانکەن، ئەو نیمچە سەربەخۆییەشمان، لەکیسدەن!
پاشان، هۆنەرێکی نیشتمانپەروەری گەورەی وەک « پیرەمێرد »ی، بە خۆڕایی تاوانبارکردووە، بەوەی لە دێڕە هۆنراوەیەکدا گوتوویەتی:
ئەوسا ئەبێ بزانین ئەمانە لەکوێوە هات
ئەم خاکە چۆن « لە خوارەوە » وا ڕۆژی لێ هەلات )«30،3»
ئینجا نووسیویتی: (بەدڵنیاییەوە دەیڵێم کە ئەم پرسیارو بۆچوونانە لەڕووی نەزانینەوەیە، چونکە بابەتی ڕۆژگارەکە ئەوەبووە.)«31،3»
بە پێچەوانەوە، هەرگیز ئەو پرسیار و بۆچوونانە، لە ڕووی نەزانینەوە نەبووە. بەڵکوو، ئەوەی لەو سەردەمەدا دیوێتی، بۆ گەلەکەی باشبووە، پێیدا هەڵداوە. نەک بە سنوور و ئاڵای عێراقیدا هەڵدابێ! « بەرزنجیی » خۆی زۆر نەزانانە، سەرنجی ئەو ڕووداو و دیاردانەی داوە و لێکیداونەتەوە. هەرگیز، بابەتی ڕۆژیش نەبوون، چونکە، « ئاوەدانکردنەوە، خوێندەواریی، پێشکەوتنی کۆمەلایەتیی و وولات »، بە بابەتی ڕۆژ دانانرێن. بەڵکوو، لە هەموو سەردەمێکدا، هەن و پێویستن، تا تاکە یەک مرۆڤیش، لەم گەردوونەدا بمێنێ، ئەو پرۆسێسە گرنگانە، هەر بەردەوامدەبن!

## 32/3. بیرۆکەی عێراقچێتیی :

پێش ئەوەی، لە سەر وەلامدانەوەی سیپارەکە بەردەوامبم، لێرەدا هەلدەقرزمەوە و دەمەوێ، کەمێ بە درێژیی، لە کێشەی « عێراقچێتیی» بدوێم. هەر بە دەم دواندنەکەشمەوە، هێندێ نموونە لە سەر نووسینەکەی « بەرزنجیی » دێنمەوە، تا زۆر لە باسەکە دوور نەکەوینەوە.

گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا، لە ڕووی دیدی کوردایەتییەوە، بە شێوەیەکی گشتیی، بە سەر دوو دەستەی جیاوازدا دابەشدەکرێ :

1. عێراقچییەکان : هەموو ئەو کوردانە دەگرێتەوە، کە باوەڕیان بە خەباتی هاوبەشی هەر دوو گەلی عەرەب و کورد، لە چوارچێوەی سنوری کۆماری عێراقدا هەیە. بە هیچ جۆرێ، باوەڕیان بە لەتوپەتکردنی خاکی عێراق و دابەشکردنی نییە. واتە: باوەڕیان بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی سەربەخۆ نییە. ئەمانەش، لە چەن دەستە و گروپێکی جیاواز پێکهاتوون. وەک: « موسوڵمانەکان، چەپ و کۆمۆنیستەکان، پارتیی و یەکێتیی، نۆکەر و چڵکاوخۆرەکانی دەوڵەت، هێندێ کوردی دیکەش، کە هیچ جۆرە پێوەندییەکیان بە بیر و کاری ڕامیارییەوە نییە، تەنیا خەریکی پارەپەیداکردنن ». ئەم دەستە و گروپانە، لە دید و بۆچوونی ڕامیاریی و پێکەوە ژیانی هاوبەشدا، هێندێ باوەڕی جیاجیایان هەیە. بۆ نموونە: چەپ و کۆمۆنیستەکان، لە ڕوانگەی خەباتی چینایەتیی و نێوکۆیی کریکارانی گەلانی عێراقەوە، لە کێشەکە دەڕوانن. موسوڵمانەکان، باوەڕیان بە دەوڵەتی نەتەوەیی نییە، بەڵکوو، بڕوایان بە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان هەیە، کە ڕژێمێکی ئیسلامیی فەرمانڕەواییبکا و لە سەر ڕێوشوێنی قورئان و فەرموودەکانی پەیامبەر بەڕێوەبچێ! ئەوەی هێندێ لەم دەستە و گروپانە، خەباتی بۆ دەکەن و داوای مافەکانی کورد لە چوارچێوەی عێراقدا دەکەن، لانی هەرە بەرزی، خۆی لە « ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی »دا دەنوێنێ.

لە ڕاستییدا، تۆوی ئەم بیرە، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، سەرەتا ئینگلیزەکان و پاشان ناسیۆنالیستەکانی عەرەبی عێراق، لە کوردستاندا چاندیان و بڵاویان کردەوە. دواتریش، کۆمۆنیستەکان لەوانیان وەرگرت و گەشەیان پێدا. ئینجا، پتر لە هەموو لایەک، « پارتی دێمۆکراتی کوردستان »، تیوریی بۆ دارشت و لە پرۆگرامی نێوخۆیاندا، بنچینە سەرەکییەکانیان بە تەواویی دەستیشانکرد.

لێرەدا، پرسیارێ لەدایکدەبێ. ئایا، بیری « عێراقچێتیی »، لە بەرژەوەندیی کێ دایە؟ گومانی تێدا نییە، هەموو کوردێکی بە هۆش و گۆش،، هەموو کوردێکی زێر

دەزانێ، بیری ئیمپریالیزمی « بریتانیا » بناغەکەی دارِشتبێ، ناسیۆنالیستەکانی عەرەبی عێراق، پەرەیانپێدابێ، لە بەرژەوەندیی کێ دایە! ئەورۆش، پتر لە هەموو توێژ و چینەکانی کۆمەڵگەی عێراق، بۆرژوای عەرەب و کورد هەوڵدەدەن، بنچینە سەرەکییەکانی، ئەو بیرە، لە مێشکی رۆڵەکانی هەر دوو گەلدا بچەسپێنن. چونکە، هەم بۆرژوای عەرەب دەیەوێ، کەرەستەکانی خۆی لە بازارەکانی کوردستاندا ساغکاتەوە. هەم بۆرژوای کورد دەیەوێ، بازارە پچووک و لاوازەکانی کوردستان، بە بازارەکانی عێراقی عەرەبییەوە ببەستێتەوە. لەبەرئەوە، کاتێ هێزەکانی ئینگلیز بە تەواویی، لە کوردستان کشانەوە، گۆرەپانەکە بۆ چینی بۆرژوای عەرەب چۆڵبوو، تا بە ئارەزووی خۆیان تەراتێنی تێدا بکەن. بیری پووچی « عێراقچێتیی » بڵاوکەنەوە. بۆیە، لە سەر دەسی ئەواندا، ئەو بیرە، شێوە و ناوەرۆکێکی دیکەی بە خۆیەوە بینی، بەرنامەیەکی نوێی دیکەیان بۆ دارِشت. تا لە لایەکەوە، هەم باشووری کوردستان بە تەواویی بە عێراقەوە ببەستنەوە، هەم سەروەت و سامانەکەی هەڵلووشن. لە لایەکی دیکەشەوە، گەلی کورد لە باشووردا، لە نەتەوەی کورد دابڕن. (بیری « عێراقچێتیی » کە بورجوازی عەرەبی فەرمانڕەوای عێراق هەوڵی بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی دەدا، دەیەوێ، جێ بە بیری کوردستانیبوون لێژکا و لە ریشە هەڵیکێشێ. رێگە لە پێوەندییەکانی نەتەوەیی کورد و نێوان پارچەکانی کوردستان بگرێ و خەڵکی کوردستانی عێراق، لە سەر عێراقیبوون دەسەمۆبکا. عێراقیبوونێک، کە بەشێک بێ لە نیشتمان و نەتەوەی عەرەب. واتە: سڕینەوەی کوردستانێتیی و تواندنەوەی نەتەوایەتی لە قەوارەیەکی عێراقیی نەتەوایەتی عەرەبییدا، کە تیایدا بۆ عەرەبی عێراق هەبێ، بیربکاتەوە و خەباتبکا بۆ ئەوەی بەشێکی یەکگرتوو بێت لە نیشتمان و نەتەوەی عەرەب، تەواوی عێراق بکاتە بەشێکی لە پسان نەهاتووی نیشتمانی عەرەب ... کوردیش بۆی هەبێ، خۆی بگۆڕێ و لە بۆتەی نەتەوایەتی عەرەبییدا بتوێتەوە. بەڵام، بۆی نەبێ، بیر لەوە بکاتەوە، کە بەشێکە لە نەتەوەیەکی دابەشکراو و خاکەکەشی بەشێکە لە کوردستانی پارچەپارچەکراو.)«54،6-7»

لەبەرئەوە، بیری « عێراقچێتیی »، بە پلەی یەکەم، لە دژی بەرژەوەندیی نەتەوەیی و چینایەتیی کۆمەلانی رەشورووتی کوردستان دایە. بە پێچەوانەشەوە، تەنیا بیری « کوردستانیزم »، لەگەڵ بەرژەوەندیی نەتەوەیی و چینایەتیی چینە چەوساوەکانی کوردستاندا، بە تەواویی دەگونجێ. چونکە، جووتیارانی کورد، باش دەزانن، کێ دەیەوێ، لە سەر خاکی خۆیان دەریانبەرێنێ و لێیان زەوتکا! هەروەها، کرێکارانی

کورد، لەو ڕاستییە گەیشتوون، بە بەعەرەبکردنی شار و شارۆچکەکانی کوردستان، جێگەیان پێ لێژدەبێ و لە شوێنی ئەوان، عەرەبی دەشتەکی دەچێنرێ! بەڵام، جگە لەوەی، بیری « کوردستانیزم »، زەوی بۆ جووتیار و کار بۆ کرێکارانی کوردستان دابیندەکا، ئابڕووی خێزان و نەتەوەییشیان دەپارێزێ .

کەواتە: (" عێراقچێتیی " ئەو بیر و بۆچوونەیە، کە داگیرکەر بڵاویدەکاتەوە و بۆرجوازیی کوردستان بالۆرەی بۆ لێدەدا، دەیەوێ کوردستانی عێراق بکاتە بەشێکی هەتاهەتایی و لەیەکچووی عێراق، لە سەر حسێبێ نیشتمانی کوردستان و نەتەوەی کورد دەیەوێ، عێراق بکاتە دەوڵەتێکی سەفت و لەیەکچوو، کوردستانیش بە بەشێکی لە پساندن نەهاتووی و بە بەشێکی نیشتمانی عەرەبیی، کە ڕەنگ و ڕوخساری عێراقی عەرەبیی پێوەبێت.)«2،54»

2. کوردستانچێتیی: هەموو ئەو کوردانە کۆدەکاتەوە، کە لە سەر ئاستی باشووری کوردستان یا کوردستانی مەزن، باوەڕیان بە تێکۆشان هەیە. باوەڕ بەو سنوورە دەسکردانەی کوردستان ناکەن، کە دوای جەنگی یەکەمی جیهان، لە لایەن ئیمپریالیزمی « بریتانیا و فرەنسا »وە ڕەنگینان ڕێژراوە. بەڵکوو، لە پێناوی کوردستانێکی سەربەخۆ و ئازادا خەباتدەکەن، هەوڵ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی سەربەخۆ دەدەن. ئەمانە، باوەڕیان بە « عێراقچێتیی » نییە، چەپلە بۆ خەباتی نێوکۆیی پرۆلیتاریای گەلی عەرەبی سەردەس و گەلی کوردی بندەس ناکووتن. باوەڕیان بە برایەتیی درۆزنانە و ساختانەی نێوان هەر دوو گەلی عەرەب و کورد نییە. بەڵکوو، باوەڕیان بە دۆستایەتییەکی ڕاستەقینەی، نێوان عەرەبە بەرچاوڕوون و مرۆ دۆستەکان و کوردە ئازاد و سەربەخۆکان هەیە. ئەوەش، لە بەر ڕۆشنایی بەرژەوەندیی باڵای هەر دوو گەلدا پێکدێ. بە مەرجێ، ڕێزی بەرابەریی لە نێوانیاندا هەبێ. دوژمنی سەرەکیی ئەم ڕێباز و باوەڕە، خۆی لە « هەموو عەرەبێکی شۆڤێنیی و ڕەگەزپەرست، دەستەی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتە عەرەبییەکانی دیکە، هێندێ هێز و پارتی ڕامیاریی عێراقیی و عەرەبیی، دەستەی یەکەم بە گشتیی و هەموو خۆفرۆش و ناپاکەکانی کورد »دا دەنوێنێ!

کەواتە: (" کوردستانییبوون "یش سووربوونی زەحمەتکێشانی کوردستانە لە سەر پاراستنی کوردستان و نەتەوەی کورد لە تیاچوون و نەتواندنەوە. قایل نەبوونە بە تێکدانی پێوەندیی و مەرجەکانی نەتەوەیی کورد، ڕازی نەبوونە بە جیاکردنەوەی بەشێکی کوردستان و قووتدانی. ئەو بیر و بۆچوونەیە کە دەربازبوونی کورد لە چەوسانەوەی نەتەوایەتیی و گەشەکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردستان لە

چوارچێوەی کوردستـان و لە ڕزگاریی نیشتمـانیی و یەکگرتنەوەی نـەتەوایەتییدا نەبینێ.)«3،54».

لە بەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانەی سـەرەوەدا، زۆر بە ڕوونیی بۆمان دەردەکەوێ، هەر دوو بیری « عێراقچێتیی » و « کوردستانچێتیی »، لە دوو بیری ناکۆک و دژ بە یەک، لە دوو شێوەی جیاوازی بیرکردنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانیی پێکهاتوون و پێکەوە ناگونجێن. ئەم « ناکۆکیی، دژایەتیی و جیاوازیی بیرکردنەوە »یەش، لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلی کورددا، لەو کاتانەوە دەرکەوتووە و هەستیپێکراوە، کە دەوڵەتی عێراق دامەزراوە و باشووری کوردستانیان پێوە گرێداوە.

لەبەرئەوە، هەموو کورد وەک یەک، بیر لە چارەسەرکردنی کێشـەی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورد ناکاتەوە. بەڵکوو، بە شێوەی جیاواز، بیر لە چارەسەرکردنی ئەو گرفتە دەکەنەوە. هەر چەندە، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆش، ململانێیەکی سەخت و توند، هێندێ جاریش خوێناویی، لە نێوان هەر دوو دەستەکەدا ڕوویداوە، بەڵام، لە هەمان کاتیشدا ناتوانین، بە شێوەیەکی ڕەها بڵێین: ئەوەی لە بەر ڕۆشنایی باوەڕی دەستـەی یەکەمدا بیردەکاتەوە، هەر هەموویان دژایەتیی بزووتنەوەی کوردایەتیی دەکەن، یا بە دوژمنی سەرەکیی کورد و کوردستان دادەنرێن. چونکە، ڕۆڵەکانی گەل ئازادن، چۆن بیردەکەنەوە، چ جۆرە ئایدۆلۆژیایەک بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، چ جۆرە چارەسەرێ بۆ کێشەکە پێشنیازدەکەن. کەواتە: لە نێو دەستەی یەکەمدا، گەلێ کوردی دڵسۆزی تێدایە، کە بە هەموو شێوەیە، هەوڵ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەدەن، خەبات دەکەن و تا ئەندازەیەکی زۆریش، گیانی خۆیان بەختدەکەن.

بەڵام، لەبەرئەوەی، هێشتا لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا، بیری کوردایەتیی و پارتی خاوەن ئایدۆلۆژیا، بە تەواویی ڕەگی دا نەکوتاوە، پرینسیپەکانی بیری دەستەی دووەم، بە شێوەیەکی ساکارانە، بە زۆریی لە نێو ڕیزەکانی گەلدا جێگەی خۆی کردۆتەوە. چونکە، پارتێکی نەتەوەیی نییە، بەرنامە و ستراتیژێکی نەتەوەیی دارێژێ، ڕۆڵەکانی کورد لە دەوری بەرنامەکەی خۆی کۆکاتەوە، بۆیە، هەر وا بەو شێوە پەرشوبڵاوییە ماونەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی ئەندامانی « پارتیی و یەکێتیی »، هەر چەندە ستراتیژی پارتەکانیان ئەوە نییە، کەچیی، هەر کوردستـانیانە بیردەکەوەنەوە، خۆیان بە هەڵگرانی بیری نەتەوەیی دەزانن. بۆیـە، بیری « عێراقچێتیی »، لە نێو ڕیزەکانی گەلی کورددا وای لێهاتووە، تا ئەندازەیەکی زۆر، بە خراپ دادەنرێ. گەر لە ڕووی

رامیارییه‌وه، تانووت له یه‌كێ بده‌ی و پێی بڵێی، « عێراقچێتیی » كردووه یا ده‌كا، زویرده‌بێ!
له ڕاستییدا، جگه له هه‌ر دوو ڕێكخراوی نه‌ته‌وه‌یی « كاژیك » و « پاسۆك »، له‌و ڕۆژه‌وه دامه‌زراون، دژایه‌تییه‌كی زۆری بیری « عێراقچێتیی »یان كردووه، مه‌ترسییه‌كانی ئه‌و بیره‌یان، بۆ ڕۆڵه‌كانی گه‌ل ڕوونكردۆته‌وه، له زیانه‌كانی ئاگاداریانكردوونه‌ته‌وه. یه‌كه‌مین ڕێكخراوێكی كوردستانیی« ماركسیی - لینینیی» له‌و بواره‌دا ده‌سپێشخه‌ریكردبێ و به كرده‌وه، هه‌نگاوی نابێ، ڕێخراوی « كۆمه‌ڵه‌ی ڕه‌نجده‌رانی كوردستان » بووه. له‌و ڕۆژه‌وه ئه‌و كۆمه‌ڵه‌یه دامه‌زراوه، تا سه‌ره‌تای ساڵه‌كانی هه‌شتا، دوو باڵی جیاوازی « عێراقچیی و كوردستانچیی » تێدا بووه. له ڕووی بیر و بۆچوونه‌وه، دژی یه‌كدی بوون. ئه‌وه بوو، له ئه‌نجامدا باڵه كوردستانییه‌كه سه‌ركه‌وت، باڵه عێراقچییه‌كه‌ی له ده‌سه‌ڵات ڕووتكرده‌وه! بۆیه، ساڵی « 1983 »، به نامیلكه‌یه‌ك، دید و بۆچوونی خۆیان، بۆ ئه‌ندامان و لایه‌نگرانی خۆیان ڕوونكردۆته‌وه، هه‌موو بنچینه‌كانی ئه‌و بیره پووچه‌یان، شیكردۆته‌وه و به ته‌واویی خۆیان ساغكردۆته‌وه.
ئینجا، بۆ ئه‌وه‌ی زۆر له باسه‌كه‌مان دوور نه‌كه‌وینه‌وه، با بزانین، ئه‌م بیره، لای كه‌سانی « خوێنه‌وار، ڕووناكبیر، ڕامیار، نووسه‌ر، هۆنه‌ر و هونه‌رمه‌ند »ه‌كانی كورد، له كار و به‌رهه‌مه هونه‌ریی و وێژه‌ییه‌كانیاندا، چۆن ڕه‌نگیداوه‌ته‌وه؟ به چ شێوه‌یه، بیریان لێ كردۆته‌وه و بیری لێ ده‌كه‌نه‌وه؟
« به‌رزنجیی »، باسی سیپاره‌ی « ئه‌لئه‌كراد و ئه‌لعه‌ره‌ب »ی كردووه و نووسیوێتی: (سیمایه‌كی تری ئه‌و سه‌رده‌مه، دوای « نائومێدی له‌پێكهێنانی حوكمه‌تێكی كوردی له‌باشوور » ئه‌وه‌بوو كه‌ئاوازێكی تازه‌ی پێكه‌وه ژیان هاته به‌ر گوێی خه‌ڵكه‌كه: برایه‌تی كوردو عه‌ره‌ب. هه‌ر چه‌نده ئه‌م ئاوازه له‌لایه‌ن به‌غداوه ئاوده‌دراو بانگه‌شه‌ی بۆ ده‌كرا، له‌پێناوی زیاتر چه‌سپاندنی حوكمه‌كه‌یان له‌باشووری كوردستان و نائومێدیه‌كه‌ش هێنده‌ی تر كاریگه‌ری خۆی هه‌بوو كه‌شته‌كه هه‌تا له‌لایه‌ن ڕۆشنبیره كورده‌كانیشه‌وه پشتی لێ بگیرێ و له 1937دا سیپاره‌ی «الاكردا والعرب » له‌لایه‌ن « فریق من شبان الكرد »ه‌وه ده‌رده‌چێ، كه‌باسكردن و شی كردنه‌وه‌ی ئه‌م برایه‌تیه‌مان له‌ڕووی مێژوویی یه‌وه بۆ ده‌خاته‌ڕوو، وه‌پێویستی ی ئه‌م دوو قه‌ومه به‌م برایه‌تیه.) «31،3».
« به‌رزنجیی » پێی وایه: برایه‌تیی كورد و عه‌ره‌ب یا بڵێین: سیپاره‌كه‌ی « ئه‌لئكراد و ئه‌لعه‌ره‌ب »، گوزاره‌یه‌كی ته‌واویی، له خواست و ئاره‌زووه‌كانی گه‌لی باشووری

کوردستان کردووە، تینوێتی نەتەوەیی شکاندوون. بەڵام، من پێم وایە، ئەو سیپارەیە، تەنیا دید و بۆچوونی تاکە کەسێ بووە، بە ناوی « دەستەیە لە گەنجانی کورد »ەوە نووسیوێتی و بڵاویکردۆتەوە.

دەتوانم، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: « زێوەر »، سەرەتا بەو جۆرە هۆنراوانە دەستیپێکردووە، بنچینەی بیری « عێراقچێتیی » دارشتووە، ڕەنگ و ڕووی ئارایشکردووە. بەڵگەشمان ئەوەیە، هۆنراوەی « ستاییشی ئاسایش »ی ساڵی « 1920 » داناوە. چونکە، ئەو کاتە، هەموو بەرنامە و پلانەکانی « بریتانیا »، بە تەواویی ئاشکرا بوویوو. ئینگلیزەکان، زۆر بە کوڵودڵەوە، هەوڵیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەککگرتووی « عێراق »ی دەدا و بۆی دەکۆشان.

کاتێکیش « زێوەر »، بە یەکجاریی کۆتایی بە ژیانی دەربەدەریی هێناوە و گەڕاوەتەوە، سەری خۆی کزکردووە و دانیشتووە، ئیدی بە تەواویی، سەرەتاکانی ئەو بیرەی لا چەسپیوە، وردەوردە، هەموو هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی دیکەی هۆنیوەتەوە. وا پێدەچێ، لە نێوان ساڵانی « 1930-1935 »دا داینابن. چونکە، جگە لەوەی، هەموویان مێژوویان لە سەر نییە، هۆنراوەی « نفوسی عراق »ی ساڵی « 1932 » داناوە!

جگە لەوەی، هیچ نووسەرێ یا هونەرێکی کورد، پێش « زێوەر » نووسین یا هۆنراوەی لەو چەشنەیان نەنووسیوە. کەواتە، گەر « زێوەر » یەکەم هونەرێکی کورد بوویێ، هۆنراوەی لەو جۆرانەی هۆنیبێتەوە، ئیدی هیچ گومانی تێدا نامێنێ، بە یەکەم هونەری کورد دەژمێررێ، کە یەکەم بەردی بناغەی بیری « عێراقچێتیی » و « بێگانەپەرستیی »، لە نێو کۆمەڵگەی کورددا داناوە. وەک ئەندازیارێکی باش، ڕەنگی نەخشەی بیرێکی گەلێ خراپی، بۆ هونەر و نووسەرەکانی دوای خۆی ڕشتووە! ئیدی چۆن « بەرزنجیی » توانیوێتی، دوای ئەوەی، هونەر وازی لە خەباتکردن هێناوە، هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی « زێوەر » لەگەڵ بژاری هۆنراوەکانی نێو کێڵگەی پڕ لە بیت و فەڕی دانەوێڵەی هۆنراوەی هونەرە کوردەکانی دیکەدا بەراوردکا؟!! ئەمە گەر پینەوپەڕۆکردن نەبێ، ڕووتووشکردنی جامی وێنەیەکی تەڵخ و دزێو نەبێ، ئایا چی دیکە دەگەیەنێ؟ هەر کەسێکیش، کارێ بکا و بزانێ هەڵەیە، بەپێی هەموو بیروباوەڕێکی زەمینیی و ئاسمانییش بێ، دوو جار تاوانباردەکرێ، وەک « دڵزار »ی هونەریش گوتوویەتی:

کارێ نەیزانی بیکەی خەتایە

وەگەر بیزانی و بیکەی بەلایە « 223،34 »

دوای ئەو هەولانەی « زێوەر » داوێتی، دوای ئەو ناوەی ئەو ڕشتوویەتی، ئیدی، هێندێ لە هۆنەرانی دیکەی کوردیش، هۆنراوەی « عێراقچێتیی یان هۆنیوەتەوە. پاشان، ئەو « دەستە گەنجەی کورد میش، ئەو هەنگاوەیان ناوە. چونکە، « زێوەر » پێش چاپکردنی سیپارەکەی، هۆنراوەکانی گوتووە، خۆ ناکرێ، هەمووشی بە ڕۆژێ هۆنیبێتەوە، تا سالی « 1939 »، هەمووی پێکەوە چاپکردبێ! ئیدی، دوای ئەوەی سیپارەکەی « کورد و عەرەب » سالی « 1937 » چاپ و بلاوکراوەتەوە، ئەویش بە هەلی زانیوە، هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی خۆی کۆکاتەوە و چاپیانکا! جا، گەر ئەو سیپارەیەی « زێوەر »، بە « دەستە گولی لاوان » دانرێ، دیارییەکی هێندە سەنگین و ڕەنگین بێ، هۆنەر پێشکەش بە ڕۆلەکانی کوردی کردبێ، « جوگرافیای بە هۆنراوە و وانەی ڕەوشت و سروود و ناوی ڕۆژەکان و چەن چیرۆکێکی »، بەو شێوەیە فێری منالانی کورد کردبێ، وەک لە سەر بەرگی سیپارەکە نووسراوە، هەر لە شیرییەوە، بەو شیرە تالە بەخێویکردبن، ئیدی دەبێ، ئەوە چ جۆرە پەروەردەکردنێ بووبێ؟ بە کام بیر مەلاشووی هەلدابنەوە؟ چۆن سەرانی دەولەتە داگیرکەرکەی عێراق، تا هەن، سوپاسی ناکەن، کە فێری بیری « عێراقچێتیی » کردوون؟!! چونکە، ئەو بیرە بۆ ئەوان، بۆ پتر لکاندن و بەردەوامبوونی داگیرکردنی کوردستان، زۆر پیرۆز و باش بووە.
ڕەنگە، « بەرزنجیی » بە شانازییەوە، باسی « کورد و عەرەب »ەکەی « برایم ئەحمەد » بکا، یا ڕۆلە نیشتمانپەروەرەکانی کورد، زۆر شانازیی بەو سیپارەیەوە بکەن. بۆیە، ئەویش وەک شاگردێکی بە ئەمەکی ئەو بیرە قرچۆک و باوەڕە نەزۆکە، دوای ئەوەی، شەستودوو سال، بە سەر نووسینیدا تێپەڕبووە، باسیکردووە و بەلگە بۆ هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی « زێوەر »ی هێناوەتەوە!
جا، گەر وا بووایە، ئەو بیرە لە مێژبوو، چەسپابوو. بەلام، سوپاس بۆ خوا، نەک هەر لای کورد، بەلکوو لای عەرەبەکانی عێراقیش نەچەسپاوە، هیچ پایە و بنچینەیەکی نەبووە و نییە، تا ئەوڕۆش، ڕێزی لێ ناگیرێ! ئەوەتە، تەنانەت یەکێکی وەک شا « فەیسەل »یش، ماوەی پتر لە شەستوپێنج سال لەمەوبەر، لە یادداشتە نهێنییەکانی خۆیدا، ئەو ڕاستییەی پێکاوە ونووسیوێتی: (تا ئێستە، شتێ نییە، ناوی گەلی عێراق بێ. کە ئەمە دەلێم، پەژارە دلم دەجنێ. ئەوەی هەیە، جەماوەری زۆری خەلکانێکە، مرۆڤ ناتوانێ، وەبەر زمینی خۆی بدا. دلیان لە هەستی نیشتمانیی خالییە. بەلام، سنگیان لە نەریتی ئایینیی و خورافات پڕە، هیچ پێوەندیی یەک پێکیانەوە نابەستێ. گوێڕایەلی لایەنی شەڕن و بەرەو ئاژاوە

ملدەنێن، لە هەموو میریی یەک، هەرچی چۆنێبێ، وەرسن. ئێمە گەرمکمانە، لەم جـــــەماوەرە، « گـەل ێک پێکبـێنین و ڕابێنین و فێربکەین و خاوێنیکەینەوە. بارەکە وابێ، ئەو هەوڵەی دەبێ، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بدرێ، ناشێ بشێ، بە بیری کەسدا بێ.)«252،9»
لەبەرئەوە، ئەو برایەتیییەی، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، هەر هەموو دەستە و گروپە « عێراقچیی »یەکان دەمۆڵیان بۆ کوتاوە و باسیانکردووە، تەنیا وەک ئەوە وایـە، « بەرزنجیی »، تەلارێکی گەورە و جوانی ڕازاوەی، لە حەوت تەبەقەی ئاسمان، بە ئەنێشە دروسکردبێ، یا وەک دەڵێن: گەرماوی بە فوو گەرمکردبێ! چونکە :
1. باشووری کوردستان، لە ڕێفراندۆمێکی ئازاد و سەربەخۆدا، بە عێراقی عەرەبییەوە نەلکێنراوە. کورد بە ئارەزووی خۆی، لەگەڵ عەرەبی عێراقدا ناژی. بەڵکوو، بە زۆرەملیی، ئەو بارەیان بە سەردا سەپاندووە. بۆیە، تا ئەورۆ، ئەو بیرە بۆ تاکتیک نەبێ، جێگەی خۆی، لە هۆش و بیری زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی کورددا نەکردۆتەوە. چونکە، لەو ڕێفراندۆمـەی بۆ هەڵبژاردنی شا « فەیسەڵ » کرا، زۆربەی زۆری کورد، دژی ئەو پێکەوەلکاندن و هەڵبژاردنە بوون. بۆ نموونە: خەڵکی شاری « سولەیمانیی » دەنگیان نەدا. کوردەکانی « کەرکووک » دژبوون. بەڵام، دانیشتووانی شارەکانی « هەولێر و موسڵ »، بەو مەرجە دەنگیاندا، مافە نەتەوەییە ڕەواکانی کورد جێبەجێکرێ.
2. لەو ڕۆژەوە ئەو دەوڵەتە دامەزراوە، دەستەی فەرمانڕەوایانی عەرەب، بە هیچ شێوەیە، ڕێزیان لە هەست و هۆشی نەتەوەیی و مرۆیی، گەلی باشووری کوردستان نەگرتووە. ئەوەی دەوڵەتە یەک لە دوا یەکەکانی عێراق، بە کوردیان کردووە، مەگەر هەر، « نازیی »یەکانی « ئەڵمان » و « فاشیی »یەکانی « ئیتالیا »، لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهاندا، بە گەلانی بندەستی خۆیان بە گشتیی و جوومەکان بە تایبەتیی کردبێتیان!
3. تا ئەورۆ، گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا، بە مافە نەتەوەیی و دیمۆکراسییە ڕەواکانی خۆی نەگەیشتووە. خاکەکەی داگیر کراوە. بە شێوەیەکی بەردەوام، هەوڵی هەڵلوشین و بە عەرەبکردنی دەدەن. خەڵکی کورد لە زێدی باووباپیرانی خۆی دەردەکەن. دان بە بوونی کوردێتی و کوردستانێتی ناوچەکانی « کەرکووک، خانەقین، شەنگار ... تاد »دا نانێن و بە خاکی عەرەبی دادەنێن.
4. عەرەبەکان خۆیان، بۆ تاکتیک و خەڵەتاندنی کورد نەبێ، هەرگیز ڕێزیان لەو برایەتییە نەگرتووە و ناشیگرن. چونکە، ئەوان دروشمەکەیان « لە ئۆقیانووسەوە

بۆ کەنداو » دیاریکردووە. واتە: « لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسییەوە بۆ چیاکانی پشتکۆ، بە خاکی عەرەبی دەزانن و هەموو ئەو کەمینە و گەلانەی دیکەی سەر ئەو زەمینە، بە عەرەب یا بە میوان دادەنێن. واتە: عێراق و سووریا، بە خاک و گەلەکانیانەوە، بە هەر دوو پارچەکەی کوردستانیشەوە « باشوور و خۆراوا » بە بەشێ لە نیشتمان و نەتەوەی عەرەب دادەنێن.)«30،18»
بۆیە، پێیان وایە، کورد لە عێراقدا، کەمینەیەکی نەتەوەیی پێکدێنێ. خاکی نییە و لە خاکی عەرەبدا دەژی، وەک میوانێ وایە و دەبێ، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوان بێ، ڕێز لە هەست و هۆشی ڕۆڵەکانی عەرەب بگرێ، کارێ نەکا، دژی میوانداریی و خاکی عەرەب بێ. ئەگینا، گەر کارێکی خراپ بکا، دژی بەرژەوەندییەکانی عەرەب بێ، بۆ میوانداریتییەکەی بە ئەمەک نەبێ، بە هەر شێوەیە بێ، دەبێ یا بتوێنرێتەوە، یا بارکا و بڕوا. جا، گەر هێندێ لایەنی عەرەبیی، بە ئاشکرا دان بەم دید و بۆچوونە شۆڤێنییانەی خۆیاندا نەنێن، ئەوا ئەم باوەڕە ڕەگەزپەستانەیە، نەک هەر لە عێراقدا، بەڵکوو، لە هەموو جیهانی عەرەبدا، باوەڕی هەموو عەرەبێکە، هەر بەو شێوەیەش لە کورد دەڕوانن و بیردەکەنەوە.
ئەم کێشەیە، هەر زۆر لە کۆنەوە، بە شێوەیە لە شێوەکان هەبووە و هەر بەردەوامیشە. تا ئێستەش، بێ چارەسەرکردنێکی تیوریی و پراکتیک ماوەتەوە. بۆ نموونە: موسوڵمانەکان، لە گوتەکانی پەیامبەرەوە، باوەڕەکانی خۆیان هەڵهێنجاوە. چونکە، پەیامبەری ئیسلام، کاتێ پێناسەی « عەرەببوون »ی کردووە، گوتوویەتی: (ئەی خەڵکینە! خوا هەر یەکە و باوک هەر یەکە و عەرەبێتی نە لە باوک و نە لە دایکەوە، هی هیچ کەسێکتان نییە. بەڵکوو، عەرەبێتیی زمانە، ئەوەی بە عەرەبیی دوا، ئەوە عەرەبە.)«15،43»* هەروەها گوتوویەتی: (عەرەبم لە بەر سێ شت خۆشدەوێ: ئەز عەرەبم، قورئان عەرەبییە و زمانی خەڵکی بەهەشتیش عەرەبییە.)«66،28» # جا ئیدی، چۆن هەموو موسوڵمانێ، داوا لە کورد و گەلانی دیکەی موسوڵمان ناکەن، واز لە نەتەوە و زمانەکەی خۆیان بێنن و ببن بە عەرەب! لە خاڵی حەوتی بەرنامەی « پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست »دا هاتووە: (نیشتمانی عەرەب، لەو پارچە زەوییە پێکهاتووە، کە نەتەوەی عەرەبی لەسەر دەژی و کەوتۆتە نێوان شاخەکانی تۆرۆس و پشتکۆ و کەنداوی بەسرە و

---

* یا ایها الناس ان الرب واحد و الاب واحد و لیست العربیه باحدکم من اب و لا ام و انما هی اللسان فمن تکلم بالعربیه فهو عربی.
# احب العرب لثلاث: انا عربی و القرنان عربی و لغه اهل جنه عربی.

زەریای عەرەبیی و شاخەکانی حەبەشە و بیابانی گەورە و ئۆقیانووسی ئەتڵانتیک و زەریای سپی ناوەڕاستەوە.)»7،15« پاشان دەربارەی عەرەببوون، لە خاڵی دەدا نووسیویانە: (عەرەب ئەو کەسەیە کە زمانی عەرەبیی بێ و لە خاکی عەرەبدا بژی، یا تێیدا چاوی بە ژیان هەڵێنابێ و باوەڕی بە عەرەبایەتیی خۆی هەبێ.)»8،15« پاشتریش، دەربارەی کەمینە و گەلەکانی دیکەی ناعەرەب، لە خاڵی یازدەدا نووسیویانە: (ئەوەی باسی کۆمەڵە ڕەگەزێکی دیکەی جیاواز بکا، یا دژی عەرەب کاری تێدا بکا، یا بۆ مەبەسێکی داگیرکەرانە هاتبێتە نیشتمانی عەرەب، لە وڵاتی عەرەب بەدەردەنرێ.)»8،15« وا بزانم، کەسێ خۆی ژیربێ، هیچ پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکا و مانگەشەویش سەر لە ئێوارە دیارە و پێویستی بە ئەمووست نییە!

هەروەها، جگە لە عەرەبەکانی عێراق، بیر و بۆچوونی، نووسەر و سەرکردەکانی دیکەی عەرەب، لە هی عەرەبەکانی عێراق باشتر نەبووە و باشتریش نییە، گەر خراپتریش نەبێ! بۆ نموونە: » جەمال عەبدولناسر «، ساڵی » 1963 «، بەرەو ڕوو بە » جەلال تاڵەبانیی « گوتووە: (پێش هەموو شتێ، حەزدەکەم، پێت بڵێم: ئەز دژی هەموو جۆرە پرۆسێسێکی جیابوونەوەخوازانەم، لە هەر پارچەیە لە نیشتمانی عەرەبدا ڕوویدا وە کۆماری یەکگرتووی عەرەب، بەرەنگاری هەموو جۆرە ڕێبازێکی لەم بابەتە دەکا، جا هەلومەرج هەرچۆنێ بێ، بابێ)»219،10« لەوانەیە، تا ئێستە، لە مێژووی عەرەبدا، پیاوێکی دەسەڵاتدار و سەرۆکێکی چەسووری وەک » مەعەمەر قەززافیی « هەڵ نەکەوتبێ، بەو شێوە ڕوون و بەو ڕاشکاوییە، دانی بە مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورددا نابێ! هەر خۆی، چەن جارێ گوتاریداوە، باوەڕی بە نەتەوەی کورد هێناوە، کە نەتەوەیەکی زیندوو و سەربەخۆیە، لە نەتەوەکانی » تورک، فارس و عەرەب « جیاوازە. داوای سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی بۆ کورد کردووە. کەچیی، یەکێکی وەک » عەبدولسەلام جەللوود «ی هاوڕێ و هاوکاری، لە کۆبوونەوەیەکدا لە » دیمشق «، بەرەوڕوو بە سەرانی پارتە کوردستانیی و عێراقییەکانی گوتبوو: (ئێوەی کورد عەرەبن. جا ئێستە کە ئێوە دەبێژن: "کوردین"، هەر کاتێک زوڵمتان لە سەر نەما، ئەوا ئێوەش دەبێژن: "عەرەبین".)»53،10«

لەو جۆرە کەسانەی بەو شێوەیە بیردەکەنەوە و لە کورد دەڕوانن، گەلێکن. لێرەدا لەوە پتر، پێویست بە ناوهێنانیان ناکا! لەبەرئەوە، بیری نامۆ و دەسکردی »عێراقچێتیی «، نەک هەر بە هەموو توانایەوە، دژی ڕێبازی » کوردستانیزم « و

بیری رەسەنی « نەتەوەیی کوردیی » رادەوەستێ، بەڵکوو، زۆر بە کوڵودڵیشەوە هەوڵدەدا، هەموو باشووری کوردستان بعەرەبێنێ. بۆیە، بە عەرەبکردنی هەموو ناوچەکانی « کەرکووک، خانەقین، دوز، تەلەعفەر، شەنگار ... »، بە ئەنجامێکی سروشتیی ئەو بیرە گەندەڵە دادەنرێ. داگیرکەری دەوڵەتی عێراقیش، هەمیشە هانی بیری « عێراقچێتیی » داوە و دەدا، تا هەست و هۆشی نەتەوەیی رۆڵەکانی کورد و بیری « کوردستانیزم »، لە بیر و مێشکیاندا بتاسێنێ.

جا، هەر کوردێکی نیشتمانپەروەر، بیر و هۆشی نەتەوەیی هەبێ، نیشتمانەکەی خۆی خۆشبوێ، تا ماڵە کاولە وێرانە کوردستانەکەی خۆی وەستابێ، هەرگیز روو لە مزگەوتی بەهەشتی داگیرکەران ناکا! چونکە، ئەو بیرە، بۆ رۆڵەکانی گەلی کورد، وەک داری ژەقنەمووت وایە، ئەو کوردەی گۆرانیی بە بالایدا هەڵدەدا و لە دەوری دەناڵێ، دیارە، لە مەلێکی گولی « عێراقچیی » بەو لاوە، هیچی دیکە نییە! مەلی گولیش، هەمیشە عاشق بە داری ژەقنەمووتە!

دوا جاریش دەڵێم: بیری « عێراقچێتیی و کوردستانچێتیی »، وەک بەهاری تەڕ و رازاوە بە کوڵاڵەسوورە و نێرگز، پاییزی فێنک و جوانی پرچ زەرد وان، دووپشکی هاوینی گەرم و ووشکیان لە نێوان دایە. هەرگیز، نە بە یەک دەگەن و نە پێکەوە دەگونجێن!

لەو رۆژەوە، دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دامەزراوە، لەو رۆژەوە، باشووری کوردستان، بە « عێراق »ی عەرەبیی یەوە لکێنراوە، لەو رۆژەوە گەلی کورد، لە پێناوی رزگاریی کوردستان و سەربەخۆیی نەتەوەییدا خوێندەرێژێ، هەر چەندە، تا ئەورۆ دەوڵەتەکە ماوە، کوردستان بە عێراقەوە بەسراوەتەوە، هەموو هەوڵەکانی کورد، بۆ رزگاریی و سەربەخۆیی تێکشکاوە، کەچیی، رۆڵەکانی گەلی باشووری کوردستان، تا ئەورۆ، دژی ئەو بیرۆکە چەوتە، بەردەوام خەباتدەکەن، سەریان بۆ بیری گەندەڵی « عێراقچێتیی » شۆڕ نەکردووە.

بە پێچەوانەوەشەوە، ئەو هەموو هەوڵەی دەستەی فەرمانڕەوایانی یەک لە دوای یەکی « عێراق » داویانە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش دەیدەن، بۆ ئەوەی ئەو بیرە بچەسپێنن، (نەک هەر نەیتوانیوە، بیری کوردستانیبوون ریشەکێشکا، بەڵکوو، بۆتە هۆی ئەوەی، گیانی کوردستانیبوون لە ناو زەحمەتکێشانی کوردستاندا قووڵتر رەگوریشە داکوتێ و خەڵکی سوورتربن لە سەر ئەوەی، پاشەرۆژ و ئامانجەکانی خۆیان و گەشەکردنی کۆمەڵەکەیان لە چوارچێوەی رزگاری کوردستان و یەکگرتنەوەی نەتەوایەتی کورد و پێشکەوتنیدا ببینن.)»7،53«

لەوانەیە، تا ئێستە بە کردەوە، شتێکی ئەوتۆ بە قازانجی بیری « کوردستانیزم » بەدی نەهاتبێ. بەڵام، هەمیشە لە بیر و هۆشی رۆڵەکانی گەلی باشووری کوردستاندا، تای تەرازووی بیری « کوردستانیزم »، لە چاو تای تەرازووی بیری « عێراقچێتیی »دا قورستر و سەنگینتر بووە. هەر هەلێکیان بۆ هەڵکەوتبێ، لەکیس خۆیان نەداوە، بۆ ئەوەی دیواری ئەستووری ئەو گرتووخانەیە بروخێنن، تەلبەندی دڕکاویی ئاگرینی نێوان سنووره دەسکردەکانی کوردستان بقرتێنن، بەرەو ڕزگاریی و سەربەخۆیی هەنگاوبنێن. ڕاپەڕینەکەی بەهاری « 1991 ی باشووری کوردستانیش، بەڵگەیە ئەو ڕاستییە و زیندوێتی بیری پیرۆزی «کوردستانیزم » و قرچۆکی بیری « عێراقچێتیی »مان بۆ دەسەلمێنێ! ئەو نیمچە ئازادیی و سەربەخۆیی نەتەوەییەی، ئەوڕۆ لە باشووردا هەیە، ئەو دابڕانەی لە دەوڵەتی ناوەندی « بەغدا » ڕوویداوە، بە نیشانەیەکی هەرە مەزنی سەکەوتنی هەوڵی ڕۆڵەکانی گەل دادەنرێ، تا لە پێناوی کوردستانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیاردا، پتر خەباتکەن و ڕوو لە پرشنگی خۆری ئازادیی بکەن!

### 33/3. برایەتیی یا دۆستایەتیی؟

دوای ئەوەی، لە سەر حسێبی بیری خۆرسکیی « کوردستانیزم »، بیری دەسکردی « عێراقچێتیی » سەریدەرهێنا و گەشەیکرد، ئیدی، وردەوردە، دروشمی برایەتیی « کورد و عەرەب »یش دەرکەوت، لە لایەن هێزە ڕامیارییە کوردستانیی و عێراقییەکانەوە بەرزکرایەوە. بەڵام، هەر لایەن و هەر گەلەی، بۆ مەبەسێکی تایبەتیی خۆی، ئەو دروشمەی هەڵگرت. هەڵبەتە، پارتەکانی باشووری کوردستان، پتر لە ناچاریدا، پەنایان بۆ بەر ئەو دروشمە بردووە و هەرگیز لە ڕوانگەی بیر و باوەڕێکی ڕاستەقینەوە، ئەو دروشمەیان بەرز نەکردۆتەوە. بەڵام، ئەو دروشمە، هەمیشە لە بەرژەوەندیی عەرەبەکاندا بووە، بۆیە، گەر باوەڕیشیان پێی نەبووبێ، هەمیشە جەختیان لە سەر کردووە، لە هەموو بۆنەیەکدا، باسی برایەتیی « کورد و عەرەب »یان کردووە. تا بە هۆی ئەو دروشمەوە، هەستی نەتەوەیی ڕۆڵەکانی گەلی کورد سڕکەن، وایان لێ بکەن، بیر لە کێشەی نەتەوەیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستانیی نەکەنەوە.

لەبەرئەوەی، عەرەبەکان زۆر بە باشیی، لەو ڕاستییە گەیشتوون، دەزانن، بۆچی هێزە ڕامیارییەکانی کوردستان، دەسیان بە قوڵفی ئەو دروشمەوە گرتووە. لە هەمان کاتیشدا، خۆشیان دەزانن، چ جۆرە برایەتییەکیان دەوێ! بۆیە، عەرەبەکان پێیان وایە، کورد لە عێراقدا، لە ڕێی ئەو برایەتییەوە دەیەوێ، خۆی بە

هاوسان و هاوشانی عەرەب بزانێ. ئەوەش، بە هیچ شێوەیە، هیچ عەرەبێ هەرە لە ئۆقیانووسەوە بۆ کەنداو »، پێی قایل نابێ و باوەڕی پێ ناکا. لە ڕاستییدا، ئەو دروشمە، دروشمێکی خۆڕسکیی و ڕاستەقینە نییە، بەڵکوو، لە ئەنجامی ناچاریدا هاتووە. دروشمی خۆ هەڵواسین بە عێراقەوە بووە، بۆ ئەوەی کوردیش، لەو کەشتییە ناپیرۆزەی دەوڵەتی عێراقدا، هەرچی چۆنێبێ، جێ پێی خۆی بکاتەوە.
برایەتییەکەش، برایەتییەکی زۆلەکی دەسکردی ئینگلیز و چڵکاوخۆرەکانی بووە، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە، وەک بوقێکی هەرزانی پروپاگەندەکردن، پروپاگەندەیان بۆ کردووە. چونکە، عەرەبەکان زۆر باش زانیویانە، « عێراق »ی عەرەبیی، بێ باشووری کوردستان هیچ نییە و پاشەڕۆژیشی باش نابێ. جا ئەوە، چ لە ڕووی سەروەت و سامانی کوردستانەوە بووبێ، چ لە ڕووی هەڵکەوتە ستراتیژییەکەی باشووری کوردستانەوە بووبێ، چ لە ڕووی ئەو دیوارەوە بووبێ، کە لە نێوان « ئێران » و « عێراق »دا، بە کەللەسەری ڕۆڵەکانی کورد هەڵچنراوە! بە ئەندازەیەک دەتوانین، بڵێین: ئەوەی زۆر هەوڵی بۆ ئەم برایەتییە درۆزنانەیەی نێوان کورد و عەرەب داوە، بەپێی بایەخ و ڕۆڵیان ئەمانە بوون: « ئینگلیز، عەرە فەرمانڕەواکانی عێراق، موسوڵمانەکانی کورد و عەرەب، ڕووناکبیرانی کورد، چەپ و کۆمۆنیستەکانی کورد و عەرەب، بە تایبەتیی دوای ئەوەی، پارتی کۆمۆنیستی عێراق دامەزراوە، پارتە ڕامیارییەکانی کوردستان، لە سەروو هەمووشیانەوە، پارتی دیمۆکراتی کوردستان، هەر لەو ڕۆژەی دامەزراوە، ڕۆڵێکی گرنگی لەم بوارەدا وازیکردووە. »
بەڵام، چونکە برایەتییەکە، بنچینەیەکی پتەو و کۆنکرێتیی نەبووە، بە خواستی ڕۆڵەکانی هەر دوو گەلی عەرەب و کورد نەبووە، نەک هەر تا ئێستە، داری برایەتییەکە، هیچ جۆرە بەرێکی نەبووە و نییە، بەڵکوو، تاهەتایە، وەک دارێکی زڕ، بەری نابێ. مەگەر تەنیا، هەر سێبەرێکی چەواشەکەرانە و هەڵخەڵەتێنەرانەی بێ! چونکە، هەم سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکە، کەڵکی لێ وەردەگرێ، هەم هەموو « عێراقچیی »یە هەلپەرست و ناپاکەکانیش، خۆیانی پێوە بادەدەن، قنجوقیت بۆ « عێراق »ی دەسکردی ئینگلیز، « عێراق »ی ئەنفال و کیمیاویی هەڵدەپەڕن. جا گەر وا نەبووایە و وا نەبێ، هەڵبەت، ئێستە لە مێژبوو، ئەم بیرە پووتە چەسپیبوو، میوەی بەتام و شیرینی داری برایەتییمان دەخوارد!
لە ڕووی مێژوویيشەوە، نەک هەر کورد و عەرەب، بەڵکوو، هیچ نەتەوەیەکی دیکەی داگیرکەر و داگیرکراو، برا نەبوون و براش نین. گەر سەرنجێکی سەرپێییش، لە

مێژووی پێوەندییەکانی کورد و عەرەب بدەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ، عەرەب کەی و چۆن، ئەو پێوەندییەیان لەگەڵ کورددا گرێداوە؟ چۆن دەورووبەری هەزار و چوارسەد ساڵێ لەمەوبەر، خاکی کوردستانیان داگیرکردووە. ئەوەی نکوولییش لەم داگیرکردنە بکا، با سەرچاوە مێژووییەکان بخوێنێتەوە، ئینجا بۆی ڕوون دەبێتەوە، ئەو لەشکرە داگیرکەرەی عەرەبەکان، بە ناوی ئیسلامەوە، چییان بە سەر کورد و کوردستان هێناوە. ئەز باوەڕم وایە، دوای ئەوەی پەیامبەر مردووە، ئایینی ئیسلام، بە ڕێبازێکی نەتەوەیی عەرەبیی توندڕەودا ڕۆیشتووە. هەر لە سەردەمی یەکەم خەلیفەی « ڕاشیدین »ەوە، تا ئەو کاتەی دەوڵەتی « عەبباسیی » ڕوخاوە، لە ژێر پەردەی ئاییندا، نیشتمانی نەتەوەکانی دیکەیان داگیرکردووە. بەلام، ئەوان زیرەکبوون، ڕووی دزێوی ئەو داگیرکردنانەیان ئارایشکردووە، ناوی « فتوحات ئەلئیسلامیە »یان لێ ناوە، کە بە لای منەوە، لەگەڵ « ئەلئیحتلال »دا، هیچ جیاوازییەکی نەبووە و نییە. چونکە، بە هەموو شێوەیە هەوڵیانداوە، هەرچی « کەلتوور، ئایین، ترادیسیۆن، باوەڕ و دەسەلاتی نەتەوەیی » ئەو نەتەوانە هەیە، هەمووی لە ڕیشەوە هەڵکێشن. هەر بەوەشەوە نەوەستاون، بەڵکوو، دوای ئەوەی وولاتەکەشیان « داگیر، وێران و تالان » کردووە، عەرەبێکی موسوڵمانیان، وەک فەرمانڕەوایەک داناوە. ئەویش، بە ئارەزووی دڵی خۆی، چی ویستووە، کردوویەتی! ئیدی، گەر ئەمە داگیرکردن نەبێ، ئایا داگیرکردن چییە؟ بە ڕاستیی، عەرەبە موسوڵمانەکان، هەرگیز ئەو پیاوە لە خواترسە نەبوون، تا کۆنترۆڵی ناوچەکە بکەن، لە بەر خاتری خوا و بلاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام، ئەو کارانەیان کردبێ. بەڵکوو، هەر وولاتێکیان داگیرکردبێ، هەرچی شتێ خراپە کردوویانە، نیشتمانەکەیان « وێرانکردووە، سووتاندووە، تالانکردووە، بە هەزاران خەڵکی بێتاوانیان کوشتووە، گەلێکیشیان بە دیل گرتووە، ژن و کیژەکانیان بۆ خۆیان هەڵگرتووە، یا فرۆشتوویانن، یا وەک کەنیزەک ڕایانگرتوون »، وەنەبێ، ئەم شتانەی لێرەدا دەیاننووسم، بەندە بە ئەندێشە دروسیکردبێ. یا لەو سەردەمەدا ژیابم. یا لە سەرچاوەیەکی دژ بە ئیسلامەوە وەرم گرتبێ. نەخێر، بەڵکوو هەمووی لە دوو توێی پەرتووکە مێژوویی و باسە ئایینییەکاندا هەن. با لێرەدا، هەر بۆ نموونە قسەیەکی « ئیبنولئەسیر » بێنمەوە. گوتوویەتی: (هێندێ لە سەرکردەکانی « عومەری کوڕی خەتاب »، ساڵی « 640-644 »ز. وەک « عەزرە کوڕی قەیس و عەتبەبە کوڕی فەرقەد و قەیس کوڕی سەلە ئەلئەشجەعیی، دەسیان بە سەر ناوچەی « شارەزوور »دا گرت، دانیشتووانیان سووتان و نقوومکرد.)« 16،1 »

تەنانەت، سووڕەتی « ئەلئەنفال »، زۆر بە ئاشکرا، « سەر، ماڵ و شەرەف »ی کاوڕەکانی حەڵاڵکردووە. مەبەس لەو کاوڕانەش، جگە لە « فەلە و جوو »، هەموو ئەو نەتەوانە بوون، ئیسلام نەبوون. جا، ئیدی دەبێ، چی دیکەی تێدا مابێتەوە؟!!
لێرەدا دەمەوێ، کەمێ لە هەر دوو زاراوەی « برایەتیی و دۆستایەتیی » بدوێم. ئەو دوو زاراوەیە، دوو پێناسە و تێگەیشتنی جیاوازیان هەیە. چونکە، تەنیا ئەندامانی یەک نەتەوەی دیاریکراو، بە برا دادەنرێن. لەبەرئەوەی، لە زۆر شتی وەک « خوێن، زمان، مێژوو، خاک، کەلتوور، خووڕەوشت، هەستی نەتەوەیی، چارەنووسی هاوبەش »دا بەشدارن و وەک یەکن. بۆ نموونە: کورد و کورد بران. چونکە، سەر بە یەک ڕەگەزی دیاریکراون، لە خاکێکی تایبەتیدا دەژین، مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە، یەک دابونەریتی هاوبەشی کوردەواریی کۆیاندەکاتەوە، هەموو کوردێ، هەستی خۆیەکوردزانینی هەیە، یەک چارەنووس چاوەڕێیاندەکا. هەروەها، « عەرەب و عەرەب، تورک و تورک، فارس و فارس، ڕووس و ڕووس ... تاد » هەموو لە نێو خۆیاندا بە برا دادەنرێن. بەلام، « کورد و عەرەب، عەرەب و تورک، تورک و فارس، ئینگلیز و ڕووس ... تاد » نە هەرگیز برا بوون و نە هەرگیزاوهەرگیزیش دەتوانن، برابن! چونکە، لە هەموو شتێکی نەتەوەییدا، جیاوازییان هەیە. هێندێکیان، تەنیا هەر لە ئاییندا هاوبەشن. ئایینیش، هەرگیز بە یەکێ لە مەرجەکانی نەتەوە نەژمێرراوە و ناشژمێرێ. چونکە، لە نێو هەموو نەتەوەکان و تەنانەت لە نێو نەتەوەیەکی دیاریکراویشدا، چەندین ئایین هەیە و هەموویان لە سەر یەک ئایین نین. بۆ نموونە: کوردی « زەردەشتیی، یەزدیی، جوو، فەلە، موسوڵمان و عەلەویی » هەیە. هەروەها، لە نێو عەرەبیشدا، چەندین ئایین و ئایینزای جیاواز هەیە. لەبەرئەوە، جگە لە ئایینی هاوبەش، لە نێوان کورد و عەرەب، کورد و نەتەوە سەردەستەکانی دیکەی کوردستاندا، هیچ جۆرە خاڵێکی دیکەی هاوبەش نییە. تەنانەت، گەر دوو نەتەوە لە یەک بەرەبابیش کەوتبنەوە، دیسانەوە بە برا دانانرێن، بەڵکوو بە ئامۆزا دەژمێررێن. ئەوەتە، عەرەب و جوومکان، لە یەک سەرچاوەی مێژووییەوە هەڵقووڵاون، لە یەک بەرەبابەوە دروستبوون، کەچیی، هەرگیز بە یەکدی ناڵێن برا، بەڵکوو، یەکێکی وەک « یاسر عەرەفات »، دوای ئەو هەموو خوێنڕشتن و دوژمنایەتییەی نێوانیان، جارێ لە گوتەیەکیدا لە « لەندەن »، بە « کوڕەکانی مام » ناویبردن!
جگە لەوەی، ئەم برایەتییەی عەرەب و کورد، تەنیا لە نێو هەر دوو گەلی عەرەبی عێراق و کوردی باشووری کوردستاندا دەنگی هەیە و ڕەنگی نییە. ئەگینا،

برایەتیی لە نێوان « تورک و کورد، فارس و کورد »دا، بە هیچ شێوەیە، نە دەنگ و نە ڕەنگی نییە. خۆ ئەوانیش وەک عەرەبەکان، هەر بە داگیرکەری دوو پارچەی کوردستان دادەنرێن! گەر چی، فارسەکان وەک « کورە مام »ی ئێمەش وان، کەچیی، شتێ نییە، ناوی برایەتیی « فارس و کورد » بێ! بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، کێ بنچینە سەرەکییەکانی ئەم برایەتییە دەسکردەی، لە نێوان عەرەبی عێراق و کوردی باشووری کوردستاندا داڕشتووە و بۆ چ مەبەسێ بووە!
با بزانین، ڕۆڵە بە جەرگ و دڵسۆزەکانی کورد، دەربارەی برایەتیی « کورد و عەرەب » چییان گوتووە و کردووە؟
سەرکردەیەکی قارەمانی لە خواترسی وەک « شێخ مەحموود »ی نەمر، هەر زۆر زوو، هەستی بەو ڕاستییانە کردووە، چۆن عەرەبەکان بە ناوی برایەتیی و ئایینەوە، کوردستانیان داگیرکردووە و گەلی کورد دەچەوسێننەوە. بۆیە، لە ڕۆژی « 1931/03/31 »، لە نامەیەکدا بۆ « کۆمەڵەی نەتەوەکان » نووسیویتی: (بۆ بەدبەختی ئێمە، خاکەکەمان بە عێراقەوە لکێنرا و ئەورووپاش کە لافی ئەوەی لێدەدا، بۆ بەرگریکردن لە ماف و دادپەروەریی چەکی هەڵگرتووە. لە بەرامبەر ئەم ستەمە گەورەیەدا، بێ دەنگبوو، ستەمێک کە چارەنووس و داهاتووی نەتەوەیەک کە ئەگەرچی نەک بە ڕەسمیی، بەڵام بە کردەوە بووبووە خاوەن دەوڵەتی خۆی بەستەوە بە چارەنووسی نەتەوەیەکی دیەوە، کە نەژاد و داب و نەریت و مێژوو و زمان و سیمایان لە یەک جیاوازە.)« 171،59 »
لە بارەی ئایینیشەوە فەرموویەتی: (نەتەوەی من و خودی خۆشم، بە هیچ شێوەیەک، دەمارگیریی ئایینزاییمان نییە و تینووی خوێنڕێژیی نین و ئەگەر چەکیشمان هەڵگرتووە، تەنیا لەبەرئەوەیە، کە ناچاریانکردووین و بە سەریاندا سەپاندووین.)« 59، 173-174 » پاشان، دەربارەی مافە ڕەواکانی گەلی کورد نووسیویتی: (ئەم دژخی شۆڕشگێڕییەی کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەدنییەتی دەسەڵاتدارانی عێراق، کۆتایی پێ نایەت، ئەو کاتە نەبێت، کە هەموو مافە ڕەواکانی کورد، بە ڕەسمیی بناسرێ و لەبەرچاوبگیرێ.
ئەوەی ئێمە دەمانەوێت، داننانە بە سەربەخۆیی وڵاتەکەماندا ... واتە: « دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانی باشوور »دا و بڕین و لەناوچوونی هەموو پێوەندییەک بە دەوڵەتی عەرەبی عێراقەوە.)« 174،59 »
گەر لەو سەردەمەدا، یەکەم فەرمانڕەوای باشووری کوردستان بەو شێوەیە دوابێ، ئیدی، مێژووی هاوبەشی چی، وەک هێندێ چڵکاوخۆری چەواشەکەری دەوڵەتی

داگیرکەری عێراق، پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن؟ جگە لە مێژووی داگیرکردن و تالآنکردنی کوردستان، هیچ جۆرە مێژوویەکی نەتەوەیی هاوبەشمان نییە. ئەو مێژووە ڕەشەش، هەر لە سەرەتای داگیرکردنی کوردستانەوە دەستپێدەکا، ئەوڕۆش هەر بەردەوامە، تا کوردستانیش بە تەواویی ڕزگار نەبێ، هەرگیز کۆتایی نایە. ئەوە پیاوێکی وەک « شێخ مەحموود » بوو، لە « 1931 »دا، داوای سەربەخۆیی کوردستانی کردووە، کەچیی، « زێوەر »یش ئەو جۆرە مۆنراوانەی هۆنیوەتەوە! « بەرزنجیی »ش نووسیوێتی: (بژی هەبوو، بەبێ پرس بچێتە خزمەتی شێخ و هەرەمسەرای شێخان)«10،3» واتە: زۆر نزیکی « شێخ » بووە!
(« تۆفیق وەهبیی » لە یاداشتەکانیدا، حوکوومەتی عێراق بە حوکوومەتی عەرەبیی و کوردستانی عێراق بە کوردستانی جنوبی ناوئەبا و ئەڵێ: کابرایەکی ئایریش چەند ئینگلیزە، کوردیش ئەوەندە عەرەب و عێراقییە.) «217،59»
کاتێ نوێنەرانی ئینگلیز و دەوڵەتی عێراق، ڕۆژی « 1930/08/10 » سەردانی شاری « سولەیمانیی »یان کردووە بۆ ئەوەی کورد بخەڵەتێنن و هێوریکەنەوە، هێندێ کەڵەپیاوی کوردی وەک : « ڕەمزی فەتاح، شێخ قادر، عیزەت بەگ، حەمەی ئەورەحمان ئاغا، مەجید ئەفەندی حاجی رەسووڵ ئاغا، میرزا تۆفیق » بەرەوڕوو و بە ئاشکرا، داکۆکییان لە مافە ڕەواکانی گەلی کورد کردووە، داوای سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانییان کردووە، پیلانەکانی ئینگلیز و کاربەدەسانی میریی عێراقیان لەقاوداوە، دژی ئەو بڕیارانە بوون، کە بۆ لکاندنی باشووری کوردستان داویانە، بێ ئەوەی مافە نەتەوەییەکانی کورد ڕەچاوکەن.
بۆ نموونە: کاتێ نوێنەرەکان گەیشتوون، خەڵکی شار بە گشتیی و ژنان بە تایبەتیی هاواریانکردووە: (هەر بژی کورد و کوردستان و حوکوومەتی کوردیمان ئەوێ:)«107،59»
« ڕەمزی فەتاح »، بە ناوی خەڵکی شار و « هەیئەی وەتەنیی »یەوە، لە کۆبوونەوەدا بەرانبەر نوێنەرەکانی ئینگلیز و عێراق قسەیکردووە و گوتویەتی: (بەیاناتی ڕەئیس ئەلوزەرا و مەندووبی سامیی، کوللیەن موخالیفی موقرەراتی عوسبەتول ئومەم و ئیعترافاتی فەخیمەی بریتانیا و عێراقە. لە پێش هەموو شتێکدا ئەبێ، حقووقی موقەددەسە و ئیستیقلالی کوردان ببێ بە سەبەبی ئیتیحادی عونسووری کورد و عەرەب.)«108،59»
ئینجا، « حەمەی ئەورەحمان ئاغا » هەستاوە و گوتوویەتی: (ئێمە کوردین و کوردستان عیبارەت نییە هەر لە سلێمانیی. لە زاخۆ وە هەتا خانەقین

کوردەوارێتییە و نایانەوێ، لەگەڵ عێراقدا بژین و حوکوومەتێکی موستەقیللەی کوردیمان ئەوێ لە ژێر ئینتیدابدا. ئەگەر ئینگلیزیش نامانداتێ، موراجەعەت بە عوسبەتول ئومەم ئەکەین.)«110،59».

دواتر« شێخ قادری حەفید »گوتوویەتی: (ئێمە میللەتێکی سەربەخۆین لە ژێر ئینتیدابدا حوکوومەتێکی کوردیمان ئەوێ وەگەر ناژین.)«111،59».

پاشان « عیزەت بەگ » گوتوویەتی: (هیچ کوردێک کەرەتێکی تر لەگەڵ عێراقا ناژی.)«111،59».

دیسانەوە، « رەمزی فەتاح » هەستاوە و گوتوویەتی: (یەک دەفعە عەرزمانکردن کورد و عەرەب قابیل نییە پێکەوە بژین. ئێمە ئارین و ئەوان سامیین، ئێمە شاخیین و ئەوان دەشتەکیین. حەتتا خاکی کوردستان بەرین بۆ عەرەبستان و هی عەرەبستان بێنین بۆ کوردستان هەر دووکیان هێزی ئینباتییەتیان وەئەکەن.) «112،59».

عەرەبە داگیرکەرەکان ویستوویانە، بە ناوی ئایینەوە، نوێنەرەکانی کورد بێ دەنگکەن. بۆیە، « میرزا تۆفیق » لە وەڵامی سەرۆک وەزیراندا گوتوویەتی: (ئێستەکە دیانەت بابەتی باسکردن نییە، مەسەلە میللەتە و دامەزراندنی حوکوومەتێکی کوردییە. ئەگەر بە دین بێ، ئەبێ، ئێرانیش واز لە میللەتی خۆی بێنێ و داخڵی حوکوومەتی عێراق ببێ. داوای لێبووردنت لێ ئەکەم، باسەکە مەگۆڕە.)«114،59» پاشان، جارێکی دیکە هەستاوە و گوتوویەتی: (ئەگەر لە بەر دین لازمە ئێمە تابیعی ئێوە بین، لە هەموو عالەم ئاشکرایە، کە کورد زۆر دیندارە. بینائەن عەلەیهی، پێویستە عەرەب لە ژێر ئیدارەی ئێمەدا بێ.) «114،59».

ئەمە پوختەی باوەڕی ئەو سەردەمەی نوێنەرانی کورد بووە. ئەو کەڵەپیاوانە، بەو شێوەیە، داکۆکییان لە مافە رەواکانی گەلی کورد کردووە. بێ سڵەمینەوە، پەنجەیان بە چاوی نوێنەرانی ئینگلیز و عێراقدا کردووە. چەندین سکاڵانامە و تەلەگرافیان، بۆ سەرانی « میریی عێراق، وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا و کۆمەڵەی نەتەوەکان » ناردووە. لە هەموو ئەو نامانەدا، داوای سەربەخۆیی کوردستانیان کردووە، زۆر بە ڕاشکاویی، دژی برایەتیی عەرەب و کورد، باوەڕی خۆیان دەربڕیوە. ئەدی لەو ڕۆژانەدا، « خوێندەوار، مامۆستا، ڕووناکبیر و هۆنەر ێکی وەک « زێوەر »، لە کوێ بووە؟ چی کردووە؟ باوەڕی چۆن بووە؟ بۆ بە هیچ شێوەیە، ناوی نییە و بەشداریی لە هیچ شتێکدا نەکردووە؟

ئەمە نیوەی چیرۆک و بەسەرهاتی ئەو برایەتییە بوو، کە ئینگلیز دروسیکرد و ڕۆڵەکانی کوردیش بەو شێوەیە، دید و بۆچوونی خۆیان دەربڕی. بەڵام، با ئێستە بزانین، نیوەکەی دیکەی چیرۆکی برایەتییەکە، لای چەن شۆڤێنیی و داگیرکەرێکی عەرەب، چۆن بووە؟

ئەگەر هەر چەن ڕەگەزپەرستێکی عەرەب، باوەڕیان وا بووبێ، کورد و عەرەب نەک هەر بران، بەڵکوو، هەر لە بنەڕەتدا یەک نەتەوەش پێکدێنن، بۆ ئەوەی دەماری نەتەوەیی کورد سڕکەن و داوای سەربەخۆیییان لە بیربەرنەوە. ئەوەتە، شۆڤێنییەکی عەرەبی وەک « عەلی مەحموود » ناوێکی پارێزەر و باوەڕپێکراوی پارتی « نیشتمانیی عێراق »، لە ڕۆژنامەی « ئەلبیلاد »دا، دژی ئەوە وەستاوە، زمانی کوردیی لە باشووری کوردستان، بە زمانێکی فەرمیی بناسرێ و نووسیوێتی: (ویستی ئەزەلی لە چارەی نووسیوون « مەبەستی عەرەب و کوردە » کە هاوکار و یەکگرتووبن بەرامبەر مەترسییەک کە ئەکەوێتە سەر یەکێتیی عێراق، ئێمە و کورد یەک نوممەین. مێژوو و تێکەڵاویی خوێن و دین و قازانجی هاویەش یەکی خستووین.) «192،59».

دیارە، ئەو برا عەرەبە موسوڵمانە، کە ئاینی بە خاڵێکی هاوبەشی نێوان کورد و عەرەب داناوە، هێندە بەرچاو ڕوونبووە، تەنانەت ئەو مافەشی بە کورد ڕەوا نەبینیوە، بە زمانە نەتەوەییەکەی خۆشی بنووسێ و بخوێنێتەوە. بەپێی بەرژەوەندیی شۆڤێنیی و ڕەگەزپەرستانەی نەتەوەی باڵادەس گوتاریداوە، خۆی بە گەورەی هەموو لایەک داناوە و ئەو بڕیارانەی دەرکردووە!

کەواتە، جۆرە پێوەندییەکی دیکەی جیاواز هەیە، پێوەندیی نێوان نەتەوە جیاجیاکان ڕێکدەخا و پێکیانەوە دەبەسێ. ئەویش، پێوەندیی مرۆڤایەتیی و دۆستایەتییە. پایە سەرەکییەکانی ئەم پێوەندییەش، لە بەر ڕووناکایی بەرژەوەندیی هاوبەش و ڕێزی بەرابەرییدا هەڵدەسێ و دەچەسپێ. واتە: نەتەوەی کورد و نەتەوەکانی دیکە دەتوانن، لە بەر ڕۆشنایی بەرژەوندییەکی هاوبەش و ڕێزی بەرابەرییدا، دۆستایەتییەکی ڕاستەقینە و یەکسانانە دامەزرێنن.

جیاوازییەکی دیکەی گرنگ، لە نێوان « برایەتیی و دۆستایەتیی »دا ئەوەیە، هەرچی « برایەتیی » هەیە، لە نێوان ئەندامانی یەک نەتەوەدا ڕوودەدا و تاهەتایە بەردەوام دەبێ. بەڵام، مێژوو سەلماندوێتی، هەرچی « دۆستایەتیی » هەیە، لە نێوان دوو نەتەوە یا پتردا دروسدەبێ، تا سەریش بەردەوام نەبووە و ناشبێ. بەڵکوو، هەمیشە بەپێی بەرژەوەندییە « ئابووریی، ڕامیاریی و کەلتووریی »یەکان

گـۆڕاوە و دەشگۆڕێ. لە مـێـژووی دوور و نزیکمـانـدا، چەندین نموونە لە سـەر پێوەندیی « دۆستـایەتیی » هەیە، کە چۆن دوو نەتەوە، ماوەیەکی زۆر دۆستبوون. پاشـان، یەکێکیان خاکی ئەوی دیکەیانی داگیرکردووە، یا پشگیریی دوژمنەکەی ئەوی دیکەیانی کـردووە. جـاری واش هەبووە، هەر هـەمـان دوو نـەتـەوە، پاش ماوەیەکی دیاریکراو، ئەو پێوەنـدییـە « دۆستـایەتیی »یەیان نوێکردۆتەوە، وەک نەبای هاتبێ و نەبارن باریبێ!

لە ڕاستـیـیدا، زاراوەی « برایەتیی »، لە فەرهەنگی ڕامیـاریی، هیچ نـەتەوەیەکی جیهاندا نییە. واتە: شتێ نییە، ناوی « برایەتیی گەلان » بێ. بەڵکوو، تەنیا هـەر « دۆستـایەتیی » هەبووە و هەیە. لەبەرئەوە، پتر حسێب بۆ ئەو زاراوەیە کراوە و دەشکرێ. تەنانەت، لە فەرهەنگی ڕامیـاریی دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشـتمـانی کۆمۆنیستی وەک « یەکێتی سۆڤیەت »ی پێشووشدا، تەنیا زاراوەی « دۆستایەتیی نێوان گـەلان ـ Dreujba mejdy Narodov » بەکـاردەهێنرا. بەڵام، ئەم زاراوەی « برایەتیی »یە، سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان و پارتە ڕامیارییەکانی نێـو نەتـەوە سـەردەسـەکـان دایانهـێناوە، تا مـێـشـکی ڕۆڵەکـانی نـەتەوەکـانی بندەسـیان، بە قـەوانـی سوواوی « برایەتیی » پڕکـەن، دەمـاری هەست و هۆشی نەتەوەییـان سڕکـەن. بۆئەوەی، بیر لە ڕزگاریی خـاک و سـەربەخۆیی نـەتـەوەکـەی خۆیان نەکەنەوە، تا ماون، هەر ژێردەستی ئەوان بن!

کەواتە، « برایەتیی » و « دۆستایەتیی » جیاوازییان هەیە. لە ئاساییترین شێوەی لێکدانەوەی ئـەو دوو زاراوەیەدا دەتوانین، بڵێین: « برایـەتیی » لە زاراوەی « برا »وە هاتووە، براش تەنیا لە یەک دایک و باوک دروسدەبێ. « دۆستـایەتیی »یەتیش، لە ووشـەی « دۆست »ەوە پەیدابووە. دۆسـتـیش لە دوو دایک و باوکی جـیـاواز دەکەوێتەوە.

« ترانتی هانا »، ژنە تێکۆشەرێکی « ڤێتنامیی » بوو. ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی « پارتی کـۆمـۆنیـسـتی ڤـێـتنـام »یش بوو. دەربارەی پـەروەردەکـردنی ڕۆڵەکـانی گەلەکەی، دژی داگیرکـەری « ئەمێریکا » گوتـبووی: (پێویستە ڕۆڵەکانی گەل فـێرکـەین، چۆن ڕقـیـان لـە دوژمن دەبێتـەوە. لەبەرئەوەی، ئەو کـەسـەی ڕقی لە دوژمنەکەی خۆی نەبێ، ناتوانێ، بەرەنگاریبێتەوە.) ئەمە، لای خۆی کۆمۆنیست بوو، باوەڕی بە برایەتیی و دۆستایەتیی نێوان گەلانی جیهان هەبووە! بەڵام، ئەوان هێندە زیرەک و وریابوون، دەوڵەتە داگیرکەرەکەیان، لە دەوڵەتەکانی دیکەی جیهان جیـادەکردەوە. نـەک وەک ئێمـە، چەپڵە بۆ دەوڵەتی داگیـرکـەری عێراق لێدەین،

هونەرەکانمان، هونراوەی بە سەردا هەڵدەن و خۆیان و رۆڵەکانی گەلەکەشمان بخەڵەتێنن!

(لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە، کاتێ داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »، پەلاماری دەوڵەتی « کوەیت »ی دا و داگیریکرد، هێزەکانی هاوپەیمانیش، لەشکری داگیرکەری « عێراق »یان گەمارۆدا و تێکیانشکان، کەسانێ هەبوون، هەر ئەوە بوو، قوریان بۆ « خاکی عێراق، بەغدای پێتەخت و لەشکری عێراق »ی تێشکاو نەدەپێوا! هەر ئەوەبوو، بەندی دڵیان بۆ « کارگە، ئێسگەی کارەبای وێرانکراو، پردە روخاو و سەربازگە کاولکراو »ەکان نەدەپسا! وەک ئەوەی خاکی « عێراق »، نیشتمانی مێژوویی گەلی باشووری کوردستان بێ! یا « بەغدا »ی پێتەخت، شاری « ئازادیی، دیموکراسیی، کەلتووریی، چەپکە گوڵ و کۆتری ئاشتیی » بێ! یا لەشکری « عێراق »، لەشکرێکی نیشتمانپەروەری ئاوەدانکەرەوە بێ! یا بەرووبوومی ئەو کارگانە، بۆ بەختەوەریی و چاککردنی باری ژیانی رەشوروتی گەلی کورد بەکاربێنرێ! یا داهاتی سالآنەی نەوتی « عێراق »، بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان خەرجکرێ!

ئەمە گەر نیشانەی هەستی خۆ بە عێراقیی زانین و نزامیی پلەی هەستی نەتەوەیی نەبێ، ئیدی دەبێ، نیشانەی چیدیکە بێ؟ ئایا « کەسێ، گەلێ، نەتەوەیە » هەبووە، « تێشکانی داگیرکەرەکەی، روخانی چوار دیواری گرتووخانەکانی وولاتەکەی، پچرانی کۆتوزنجیری دەس و پێی رۆڵەکانی گەلەکەی خۆی » پێ ناخۆشبێ؟ گەر وایە، کەواتە دەبووایە، کاتێ جەنگی دووەمی جیهان روویدا، « سوپای سوور »ی « یەکێتی سۆڤێت » و هێزەکانی هاوپەیمان، سوپای داگیرکەرە نازییەکانی ئەڵمانیایان تێکشکان و شاری « بەرلین »ی پێتەختیان گردا، جوولەکانی « ئەڵمانیا »، ئەوانەی لە کارگەکاندا سابوونیان لێ دروسدەکردن، قوریان بپێوایە، داکۆکییان لە « ئەڵمانیا » و رژێمەکەی بکردایە! یا کاتێ هێزەکانی هاوپەیمان، بۆ پاککردنەوە و لەنێوبردنی هێزەکانی « ئەڵمانیای نازیی » و رزگارکردنی خاکی « فرەنسا »، پەلاماری « فرەنسا »یان دا، دەبووایە، فرەنسایییەکان دژی ئەو هێرشکردنە بوونایە! یا گەر رۆژێ لە رۆژان، جەنگێکی گەورە، لە نێوان « ئیسرایل » و هەر دەوڵەتێکی دیکەی ئەم جیهانەدا روویدا، عەرەبە فەلەستینییەکانی بندەسی « ئیسرایل » دەبێ، وەک کەوا سووری بەر لەشکر، شانبەشانی جوولەکان داکۆکیی لە خاکی « ئیسرایل » بکەن! یا گەر کاتی خۆی، دەوڵەتە رەگەزپەرستەکەی « خوارووی ئەفریکا »، لە مەترسیدا بووایە،

تووشی کارەساتێکی گەورە بووایە، ڕەشبێستەکان بە هەموو تواناپانەوە، بەریان بەو مەترسییە بگرتایە و خۆیان لە پێناوی پاراستنی ئەو دەوڵەتە ڕەگەزپەرستەدا بەختکردایە!)«305-304،29».
بەشێکی ئەم تاوان و هەڵخەڵەتاندنەش، بۆ کوردەکانی نێو « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » دەگەڕێتەوە. چونکە، گەر ئەوان هەر لە سەرەتاوە، « پارتی کۆمۆنیستی کوردستان »یان دامەزراندایە، هەڵبەتە، لە دوای سییەکانەوە تا ئەورۆ، ئەم قوڕی بێگانەپەرستییە، چیدیکە بەو شێوەیە خەستتر نەدەبۆوە. وەک پەتایەک، بیر و هۆشی هێندێ لە « خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر و ڕامیار »ەکانی کوردی داگیر نەدەکرد. کەچیی، دوای ئەو هەموو ماڵوێرانییە، تازە خەبەریان بۆتەوە، چەندین ڕێکخراو و پارتی « مارکسیی ـ لینینیی »یان، بۆ هەڵگرانی فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای « مارکسیزم ـ لینینزم » دامەزراندووە!
لەبەرئەوەی نەتەوەی کورد، لە سەرانسەری کوردستاندا، لە مافە نەتەوەیییەکانی خۆی بێ بەشکراوە، نیشتمانەکەی خۆی دابەش و داگیرکراوە، هیچ جۆرە ئازادیی و سەربەخۆییەکی نەتەوەیی نییە و پێی ڕەوا نابینرێ، تا ئێستە، هیچ لە باری بندەستیی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی کورد، لەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی پێوەی بەستراونەتەوە، نەگۆڕاوە. هەرچی چەپڵەی هەلپەرستیی و کاسەلێسیی، بۆ یەک کەردیلەی چکۆلەی خاکی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە بکوتێ، هۆنراوە بۆ سەرکردەکانیان بڵێ، گۆرانیی بۆ « ئاڵا، جوگرافیا، سنوور، هاوردە و ناردە »یان بچڕێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆشی پشگوێخا، بە شیری زرکی بێگانەپەرستیی، منالانی کورد بەخێوکا، وەک ئەوە وایە، تولەمارەکەی « شێخ هۆمەر » بەخێوکا و لە کوردەکەی هەر دوو جێژنیش دەبێ! هەم لای داگیرکەرەکە، بە چاوی خۆفرۆش تەماشادەکرێ. هەم لای ڕۆڵەکانی کورد، بە چاوێکی سووک سەیردەکرێ.
لەوە دەچێ، « بەرزنجیی » هەر فێربووبێ، نەک هەر مێژووی ساختە بۆ « زێوەر » دروسکا، بەڵکوو، قسەی کۆچکردووەکانی دیکەش بشێوێنێ. چۆن بەرژەوەندیی خۆی پێویسکا، هەر بەو شێوەیە لێکیبداتەوە و دایڕێژێتەوە. « بێکەس »، لە هۆنراوەی « داری ئازادیی »دا، بە بیستودوو دێڕەهۆنراوە، وەک ڕامیارێکی کارامە و دەسڕەنگین، باسی قوربانیدان و سەربەخۆیی گەلانی « عێراق »ی کردووە ئەو باسەشی، بە خەبات دژی ئینگلیز و شۆڕشی چەکدارییەوە گرێداوە.
« بەرزنجیی » ویستوویتی، نموونەیە لە سەر « برایەتیی » بێنێتەوە. لەمەشدا، پەنای بۆ ئەو هۆنراوەیەی « بێکەس » بردووە، تا وەک بەڵگەیەکی بەهێز، بۆ

پاڵپشتی بۆچوونەکانی خۆی، کەڵکی لێ وەرگرێ. بۆیە، سەرەتا بە چەن ووشەیە نووسیوێتی: (بێ کەسی شاعیر زۆر بەپەرۆشی بۆ ئەم برایی یە دەڵێ:
دۆستی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تاریخ شاهیدە
ناحەزی روورەش باڵەداخا یەخەی خۆی دادڕێ )»31،3«
1. جگە لەوەی، ڕێنووسی ئەو چەن ووشە و ئەو دێڕە هۆنراوەیە هەڵەیە، ووشەی « دۆستایەتیی »ش لە هۆنراوەکەدا هاتووە، کەچی، ئەو لە نیوەدێڕەکەی خۆیدا، بە « برایەتیی » نووسیوە. « دۆستایەتیی »ش، هەرگیز « برایەتیی » ناگەیەنێ!
2. ووشەی « با » لە نیوە دێڕی دووەمی هۆنراوەکەدا، جێگەکەی گۆڕیوە و لە دیوانەکەیدا، ئەو ووشەیە، بە دوای ووشەی « داخا »دا هاتووە. واتە بەم شێوەیە: ناحەزی ڕوورەش لە داخا، با یەخەی خۆی دادڕێ.
ئەمە، نیشانەی ئەوەیە، « بەرزنجیی »، هۆنراوەکەی لەبەربووە، تەماشای سەرچاوەکەی نەکردووە. بۆیە، ناوی سەرچاوە و ژمارەی لاپەڕەکەشی نەنووسیوە، وەک لە جێگەکانی دیکەدا تۆماریکردوون. هەڵبەتە، یەکێکی وەک « بێکەس »ی هۆنەریش، زۆر باش زانیوێتی، زاراوەی گونجاو بۆ هۆنراوەکانی هەڵبژێرێ. زۆر بە چاکییش، جیاوازیی لە نێوان « برایەتیی و دۆستایەتیی »دا کردووە. بۆیە، لە هۆنراوەکەدا، هەروا بە خۆڕایی، زاراوەی « دۆستایەتیی » بەکار نەهێناوە و زاراوەی « برایەتیی »شی نەنووسیوە. چونکە هەر « بێکەس » خۆی بووە، لە خۆپیشاندان و ڕاپەڕینەکەی ڕۆژی ڕەشی « شەشی سێپتێمبەری/1931 »دا، خەڵکی لە خۆی کۆکردۆتەوە، خۆپیشاندانی سازکردووە، پێشیانکەوتووە و هاواریکردووە: « ئێمە کوردین، کوردمان ئەوێ، عەرەب حیزە و نامانەوێ! » ئەنجامی خۆپیشاندانەکەش دیارە و هەر لە سەر ئەوە، قوربانییەکی زۆر دراوە، هۆنەریش باجی خۆی داوە و تووشی سزابووە!
ئایا، هەر « بێکەس » خۆی نەبووە، ساڵی « 1944 » هۆنراوەی « چاوبەست »ی داناوە، وەک ڕووناکبیرێکی شۆڕشگێڕی سەردەمەی خۆی، جەماوەری گەلەکەی، لە درۆودەلەسەکانی داگیرکەران وشیارکردۆتەوە. وەک ڕامیارێکی شارەزا، لە بەر تیشکی تاقیکردنەوەکانی پێشوودا، بە هیچ جۆرێ باوەڕی بە پڕوپاگەندەکانی دوژمن نەبووە. چونکە، باشی زانیوە، ماف دەسێنرێ و نادرێ! بۆیە، بە دە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی :
دەنگ بڵاوە، خەڵق ئەڵێن: ئەم جارە کورد، سەربەست ئەبێ
چی ئەڵێن، بڵێن، لە لام وایە، درۆ و چاوبەست ئەبێ

سەد هەزار جارمان، سیاسەت تەجروبەکرد و کەچیی
ئێستەکەش زۆرمان، بە فیشاڵی وەها سەرمەست ئەبێ
بێتو بەیێ .... و .... ، زەرڕەیەک تێکچێ، ئیتر
مەسئەلەی کوردایەتیی، ئەوسا بە جارێ خەست ئەبێ
کەی حقووق ئەدرێ؟ ئەسەنرێ. عەیبە، ئیتر تێبگەن!
سەربەخۆیی چۆن نسیبی قەومی، وا بێ دەست ئەبێ
میللەتی جاهیل لە دنیادا، ئەبێ هەرە بەندە بێ
نۆکەریی هەر خشت بە باڵای، قەومی دیل و پەست ئەبێ «71،6»

هەروەها، هەر «بێکەس» خۆی نەبووە، بە دوازدە چوارخشتەکیی، لە هۆنراوەی «دەردی دەروون دا»، لە سەرەتادا گوتوویەتی:

وان وە بان غەیرە، ئەم قەومی خۆمە
مەحکوومی حیز و خەڕات و دۆمە
نامووس و ویجدان، غیرەت و شەرەف
لە ناو ئەشرافا باریکرد، ئەسەف «218،6»

ئیدی، «بەرزنجیی» بۆچی خوێنەر چەواشەدەکا؟ بۆچی، مێژووی پێوەندیی نێوان کوردی بندەس و عەرەبی سەردەس، بە دەسی ئانقەس دەشێوێنێ؟ بەرژەوەندیی لەوەدا چییە؟ لە بەر چاوی کاڵی کێ، ڕشتەی مرواریی، برایەتیی درۆزنانەی نێوان «کورد» و «عەرەب» مان بۆ دەهۆنێتەوە؟

خۆ گەر «بەرزنجیی» بتوانێ، ئەو هۆنراوەیە بشێوێنێ، تا خەڵکی پێ بخەڵەفێنێ، ئەدی چی لە هۆنراوەی هۆنەرێکی ناسراوی وەک «حەمدیی» دەکا، کە زۆر پێش «بێکەس»، دەردی دڵی خۆی، بەرانبەر بێکەسیی و کەساسیی نیشتمانەکەی دەربڕیوە، گاڵتەی بەو جۆرە «برایەتیی»یە هاتووە، کە ئەورۆ چەن کوردێکی بێ هۆش و گۆشی بیری نەتەوەیی، پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن و داکۆکیی لێ دەکەن. ئەوەتە، بە حەوت پێنجینە «سکاڵای نیشتمان»ی هۆنیوەتەوە و گوتوویەتی:

ئەی خاکی وەتەن، بێ فەرەح و زەوق و سەفا خۆت
پڕ حادیسە، مەحکوومی هەموو حوکمی قەزا خۆت
بازیچەیی سەرپەنجەی ئەربابی ڕیا خۆت
بێ ئۆردوو، بەبێ زەمزەمەی شاه و سەرا خۆت
سەد ئاه، کە بوویتە هەدەفی دەرد و بەڵا خۆت
ئەم کوردە ئەبێ، دائیمی هەر قوڕ بە سەراکەن
هەر جارە گونیە ئەبێ، بەرگی بە بەراکەن
وەک تەعزیە ئەلواحی ڕەش و شین بە دەراکەن

پێویستی چییە، دوژمنی خۆیان بە براکەن
عالەم کە بڵێن: ساحێبی ئەولاد و برا خۆت
گەر وابێ، تەمەددون من و وەزعییەتی وەحشەت
سەد خۆزگە بە زوڵمەت، ئەمەبێ حاڵی عەدالەت
دەوڵەت ئەمەبێ، ڕەحمەتی سەدبارە لە نەگبەت
دەرمانی نییە، عاجزە لەم عیللەتە حیکمەت
چ بکەم، چ بڵێم، ئێستەکە مەحکوومی فەنا خۆم
بێ دەربێ نەبینم، بوونە ساحێبی دەربێ
بێ جێ هەموو دیارن، بوونە ساحێبی ڕێ و جێ
ئاساری نەما، شوێنی کورد بوونەتە ژێر پێ
فەوتاوە نەزم ون بووە، من کێم و ئەتۆ کێ
بێ عالیم و بێ سانیع و بێ ئەهلی وەفا خۆت
وەسفت، کە نەگونجاوەتە ئەفکاری چ شاعیر
نەوعی نییە، ئەرزت نییە، شوبهەت بە مەنازیر
وک گەوهەرە بەرد و گڵەکەت، عەینی جەواهیر
بێ میسلە، موحەققەق چ لە باتین، چ لە زاهیر
پەم خەزنەیەوە مونتەزیری، لوتفی گەدا خۆت
کوا تاقمەکەو، وەلوولەی دەوری کەریم خان
کوا دوازدە سوارەی بەبە، مەشهووری مەریوان
کوا فیرقەیی بتلیسی، هەواخواهی بەدرخان
کوا میللەتەکەی مونتەفیقی، دەورەی تورکان
بێ پیاو و بە بێ کۆمەڵ و جێماو و جیا خۆت

لە کۆتاییشدا، کاتێ باسی داگیرکەرانی «کوردستان»ی کردووە، زۆر بە شێوەیەکی جوان، ئەوان وەک داڵ و کوردیشی وەک لاکی ئاژەڵێکی تۆپیو پیشانداوە، بە پێنجینەیەک گوتوویەتی :

هاوسێ، هەموو وەک داڵن و ئەم کوردە وەکوو لاک
چنگیان لە جگەر گاهی هەموو داوە، بەبێ باک
بێ خوێنە گوڵی زەرد و زەعیفە وەکوو خاشاک
«حەمدیی»، دە بپێوە قوڕ و سنگت بکە چاک چاک
بێ قەوم و وەتەن، پڕ ئەسەف دەرد و جەفا خۆت «16، 153-154»

لەگەڵ ئەوەشدا، مەرج نییە، ئەو پارت و ڕێکخراوانەی ئەو دروشمانەیان بەرزکردۆتەوە و بەرزدەکەنەوە، ڕاستیانکردبێ و ڕاستکەن. چونکە، ئەوان لە ڕیزەکانی خۆیاندا، شتێ بە ئەندامەکانیان دەڵێن و لە بەرنامەکانیشیاندا، شتێکی دیکە دەنووسن، ئەندام و پێشمەرگەکانیان، بە بیرێکی دیکە پەروەردەدەکەن! جگە

لەوەی، گەر دەمی زۆربەی زۆری رۆڵەکانی گەلەکەمان بکەینەوە، ئەوا ئەو دروشمانە رەتدەکەنەوە. جا، ئەو ڕێخراو و پارتانە، لە درزی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان و خەباتی نێوکۆیی پرۆلیتاریای عەرەب و کوردەوە، لەو پێوەندییانەیان ڕوانیوە و دەڕاونن. بۆیە، بەو چەشنە رەفتاریانکردووە.

## 34/3. زاراوەی ژاراویـــی :

کاتێ « بەرزنجیی مش نووسیوێتی: (بڕوابوون بەو برایەتیەو تێکۆشان لەپێناویدا بەرە بەرە بووە سەنگی مەحەکی هەر حیـزب و لایەنێ و پلەی راستگۆیی لەساحەی تێکۆشاندا، کام حیزب و گروپ زیاتر بڕوای پێی بوو بۆ ی تێدەکۆشا ئەوە زیاتر نیشتمانی و پێشکەوتوخوازو راست بوو.)»3، 31-32»

لەوە دەچێ، « بەرزنجیی »، گوێزی پووچی ئەو قسانەی خۆی، تەنیا لە هەمبانە دڕاوەکەی خۆی و بەرژەوەندیی ئەو جۆرە ڕێکخراوانەوە بژاردبێ، وا بەو شێوە رەهایە، بڕیاریداوە. یا هەر ئەویش، دوای زۆرینەوبۆرینە کەوتووە، گەر ڕاستییە نەتەوەیی و مێژوویییەکانیشی، پێشێلکردبێ!

بۆ ئەوەش، ئەو لایەنانە، پتر نیشتمانیی و پێشکەوتووخواز بوون، دەبێ بپرسین: لای کێ؟ بە سەنگ و تەرازووی کێ، ئەو خەسڵەتانە دەکێشران و وەک گوێزەبانەی جێژنی « لەدایکبوون »، بە سەر ئەو پارت و گروپانەدا دابەشدەکران؟ ئایا لای هەموو کورد، یا تەنیا هەر لای سەرانی ئەو پارتە « کوردستانیی، عێراقیی و عەرەبیی سیانەی، باوەڕیان بەو جۆرە بۆچوونانە هەبوو؟

پاشان نووسیوێتی: (ئەوەشی پڕ کێشی بکردایەو لێی لالوتبووایە، ئەوە دەیان تومەتی چڵکاوخۆرو بێگانەپەرست و کۆسمۆپۆلێت و بەکرێگیراو یان دەدایە پاڵی.)»3،32» جارێ، ئەو زاراوانەی ئەو ڕیزیکردوون، زۆر لەگەڵ یەکدیدا ناگونجێن. ئایا، چڵکاوخۆر ئەوانە بوون، تەنیا پیاوی کورد بوون و بۆ ڕزگاریی کوردستان تێدەکۆشان، یا ئەوانەی بۆ ژیانێکی تاهەتایی کۆیلەیی و بەندەسیی خەباتیاندەکرد؟!! چڵکاوخۆری کورد ئەوانە بوون، بە هەموو شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، بە نووسین و بە کردەوە، هەوڵیان بۆ بەردەوامبوونی لکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقەوە دەدا، لە ژێر هەر ناو و دروشمێکدا بووبێ، بانگاشەیان بۆ ئەو داگیرکردن و کۆیلەییە دەکرد.

ئایا، بێگانەپەرست ئەوانە بوون، کوردستانیان بە بەشێکی لێکدانەبڕاو و لێ جیانەبۆوەی عێراق دەزانی، یا ئەوانە بوون، داوای ڕزگاریی و سەربەخۆیی یەکجاریی و تەواویی کوردستانیان دەکرد؟!! هەڵبەتە، هەر لە خۆیانەوە، هەر

کوردێ، کوردپەروەرانە بیریکردبێتەوە، داوای سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی کردبێ، چڵکاوخۆرەکانی نێوخۆ، سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق و پارتە رامیارییە شۆڤێنییە عێراقییەکان، بە بێگانەپەرست نێوزەدیانکردوون. هەر وەک چۆن، هەر لە سەرەتاوە، هەموو شۆرشەکانی کوردیان، بە دەستی « تورکیا، ئێران، بریتانیا، ئەمێریکا و بەرەی رۆژاوا » تاوانبارکردووە، تا ئەوڕۆش، هەر بەو شێوە نارەوایە تاوانباریدەکەن!
ئەدی زاراوەی « کۆسمۆپۆلیت »، چ پێوەندییەکی بە سەر زاراوەکانی « چڵکاو خۆر و بێگانەپەرست »ەوە هەیە؟ یا « بەرزنجیی »، هەر لە خۆیەوە، لە فەرهەنگە رامیارییە تایبەتییەکەی خۆی وەریگرتووە، پێناسەیەکی نوێی بۆ ئەو زاراوەیە داناوە، تا ئێمەش بزانین و تێبیگەین!
بۆ بەکرێگیراویش، مەبەس لە بەکرێگیراویی کێیە؟ ئایا، ئەوانەی ئەو پروپاگەندانەیان، دژی کوردپەروەران کردووە، خۆیان بەکرێگیراوی دەوڵەتی عێراق نەبوون؟ ئەدی، گەر کوردێکی نیشتمانپەروەر، داگیرکردن و چەوساندنەوەی نەتەوەیی رەتکردبێتەوە، دژی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق وەستابێ، لە پێناوی رزگاریی نیشتمان و ئازادیی نەتەوەکەیدا خەباتیکردبێ، ئایا ئەو جۆرە خەباتکێرانە، بە بەکرێگیراو دادەنرێن؟
ئەمانە هەمووی قسە و پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستە سەرلێشێواوەکانی ئەو سەردەمانەی کورد بوون، کە خۆیان نەک هەر « چڵکاوخۆر، بێگانەپەرست، کۆسمۆپۆلیت، و بەکرێگیراو ی « مۆسکۆ » بوون، بەڵکوو، هەمیشە، زاراوەی ژاراوییشیان، لە نێو ریزەکانی گەلی کورددا بڵاودەکردەوە. دژی هەموو شتێکی پیرۆزی دیکەی کوردایەتییش بوون. چونکە، گەر لە « مۆسکۆ » باران بباریبایە، ئەوان لە هەموو وڵاتە گەرمە بێ بارانەکاندا، چەتریان هەڵدەدا! هێندەش سەرەڕۆ بوون، تەنانەت کوردیشیان بە نەتەوە دا نەدەنا! سەریشیان لە سەرانی « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » شێواندبوو، ئەو دید و بۆچوونە هیچوپووچانەی خۆیان پێ دەفرۆشتن، ئەوانیش بێ ئەوەی پێ بزانن، لە سەری دەرۆیشتن!
جا ئێستە، لە « بەرزنجیی » دەپرسم: ئایا بە چ یاسا و وێژدانێ رەوایە، دوای ئەو هەموو هەڵەیە، دوای هێندە ساڵ خەباتی بێ ئاکام، دوای هێندە تێشکانی کۆمۆنیستەکان، تازە ئەو قسە بۆش و ناوەرۆک پووچەڵانەی ئەوان، دژی کوردپەروەران کاوێژکاتەوە! ئایا، ئەو ناتۆرە ناشایستانە، شانی کوردپەروەران یا « عێراقچیی » و نۆکەرە زورناژەن و دەهۆڵکوتەکان دەگرێتەوە؟!!

## 35/3. توێژینەوە و کۆڕگرتن :

حەزدەکەم، گەر « بەرزنجیی »، هێندە شارەزای مێژووی نزیکی گەلەکەی خۆیەتی، پێمان بڵێ: جگە لەو کۆڕانەی، دەسەڵاتدارانی دەوڵەت و سیخوڕەکانی گرتوویانە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، نەک هەر بە دەیان کۆڕ، بەڵکوو، تەنانەت تەنیا یەک کۆڕیش، لە سەر « برایەتیی کورد و عەرەب »، لە کوێ گیراوە؟ وەک نووسیویەتی: (دروشمی « علی صخره الاخوه العربیه الکردیه تتحطم مؤامرات الاستعمار و اذنابه » هەتا هەشتاکانیش دەنگی دەدایەوەو لەسەر لاپەڕەی چاپەمەنیەکانیش ڕەش دەچۆڕەوە.. ئەم رووکارە بووە تەوەری دەیان توێژینەوەو کۆڕگرتن لەنێوەندە ئەدەبیەکانی حەفتاکان بەرەو ژور.)«32،3»

ئەو دروشمە لاواز و کاڵوکرچەی هەڵگێراوە: (لەسەر بەردی بناغەی برایەتیی کورد و عەرەب، پیلانەکانی ئیمپریالیزم و کلکەکانیان تێکدەشکێ.) گەر دروشمێکی باشبووایە، تا هەشتاکانیش دەنگیبدایەتەوە، هەڵبەتە، هەر لە پەنجاکانەوە، کۆمەڵانی خەڵکی کورد، بە شێوەیەکی گاڵتەجارئامێزانە، دایان ئەدەرشتەوە و دەیاندەگوت: « لە سەر بەردی بناغەی برایەتیی کورد و عەرەب، گوێز دەشکێنین! » جا، با « بەرزنجیی » و هەموو « عێراقچیی »یەکانی دیکەش بزانن، هەرچی لە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ڕەشچۆوە، وە نەبێ، ڕاستبێ. زۆر جار، درۆیەکی رووت، مەرایی یەکی سووک، خۆ پێدا هەڵواسینێکی چرووک نەبێ، هیچی دیکە نییە. هەمیشەش، هەر پەشیمانیی لە دوابووە. چونکە، هەر کەسێ بێگانەپەرستیی کردبێ، لە کۆتاییدا، هەر نووشوستی هێناوە!

جگە لەوەی، هەر لە هەمان جێگەدا فەرموویەتی: (بەدانسقە شاعیر هەیە کەئەسپە کحێلەی خۆی لەو مەیدانەدا تاو نەدابێ و چوار ناڵە ڕمبازێنی تیا نەکردبێ.) «32،3» خۆزگە، هێندە دەس و دڵ ئاواڵە و فراوان دەبوو، جگە لەو هۆنەرە مارکسیی و کۆمۆنیستە کوردانەی، لە ڕیزی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »دا کاریانکردووە، ناوی هێندێ لەو هۆنەرانەی بۆ دەنووسین، کە لەو جۆرە هۆنراوانەیان گوتووە، تا بزانین، چۆن بە دانسقە هۆنەر نەبووە، هۆنراوە بۆ بیری دەسکردی « عێراقچێتیی » نەگوتبێ! هەڵبەتە، لە پەنجەی دەس تێپەڕناکا و ئەو هەر لە خۆیەوە، قسە فڕێدەدا، بێ ئەوەی بزانێ، لە سەری دەکەوێ!

## 36/3. ویرد و سرووود :

باوەڕ ناکەم، گەر یەکێکی وەک « حەمەبۆر ـ هۆشەنگ »، خۆشی ئەو بیرەی نەبووایە، وەک هەموو « عێراقچیی »یەکی دیکە، ئەو کەللەشەکرانەی بشکاندایە و

بیگووتایە: (بێگومـان برایەتی کوردو عـەرەب بەردی بناغـەی گـەیشتن بەئاواتی تێکڕای گەلی عێراقەو هەر ئەو یەکیەتەشە مەحەکی بەختەوەری رۆڵەکانی ئایندەی ئەم خـاکە پیرۆزە، هـەر لەبـەرئەمـەشـە ویردی زمـانی پێشـوانمـان بووەو سـرودی ئێمەو بەرەی داهـاتویش دەبێت.)»11،31» جارێ با بزانین:
1. ئایا، کێ ڕێیداوە، بە ناوی هەموو خەڵکی « عێراق سوە بدوێ؟
2. هەموو « عێراقچیی » یەک، وەک عەرەبەکانی « عێراق » بیر دەکەنەوە. لە بری زاراوەی گەلانی « عێراق »، گەلی « عێراق » بەکاردێنن. هەڵبەتە، مەبەستەکەش روونە و بۆ چییە!
باوەڕ ناکەم، لە جیهاندا، لە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشـتمـاندا، تەنیا گەلێکی تێدا بژی! چونکە، کاتێ دەڵێین: گەلی « عێـراق »، واتە: لە یەک گەل پێکهاتووە. ئەویش لە جیهـانی عـەرەب و نێودەوڵەتیدا، تـەنیا گـەلی عـەرەب دەگرێتەوە. ئەدی، جێگەی گەلی کورد لەو بەهەشتەی برایەتیی کورد و عەرەبدا، لە کوێ دایە؟ بۆچی « عێراقـچیی »ەکان نالێن: گەلانی « عێراق »؟ چونکە، کاتێ گوتمان گەلانـــــی « عێراق »، یەکسـەر خەڵکی تێدەگەن، « عێراق » دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە، بەڵکوو دەوڵەتێکی تێریـتۆریاڵ پێکدێنێ. واتـە: لە دەوڵەتێکی فـرە نەتـەوە و نیـشـتـمـان پێکهاتووە. « ئەحـمـەد چەلەبیی »، یەکێ بوو، لەو عەرەبانەی ئەوڕۆ، خۆی بە دژی ڕژێمی « بەعس » و « سـەددام حـوسـێن » دادەنێ. کـەچیی، لە سیمـینارێکدا لە شاری « ستۆکهۆڵم »، دژی ئەم بۆچوونە وەسـتا و گوتی: ئەوە هەڵەیە و تەنیا گەلی « عێراق » راستە!)»27،81-92» ئەز، گلەیی لە هیچ عـەرەبێک ناکەم، گەر تەنیا هەر زاراوەی گەلی « عێراق » بەکاربێنن. چونکە، ئەوان باشووری کوردستانیش، بە پارچەیە لە خاکی « عێـراق » و نیشـتـمـانی عـەرەب دادەنێن. بەڵام، گـەر هەر کوردێکی « عێراقـچیی » خۆی، ژاری ئەو بیرە ژەهراوییە بڵاوکردەوە، هەوڵی نەدا، زاراوەی گەلانی « عێراق » بچەسپێنێ، ئیدی، بۆ گلەیی لە داگیرکەرەکە بکەم؟
بۆیە دەبێ، کورد داوای هەرچییە بکا « هەر لە مافی رووناکبیریی یەوە بیگرە، تا بە کۆنفیـدراڵیی دەگـا »، هەر دەبێ، زۆر بە کـولودڵەوە هەوڵدا، لە ئایندەدا و لە دەسـتووری کاتیی یا هـەمیشـەیی « عـێراق »دا، چەن خاڵێکی سـەرەکیی گرنگ بچەسپێنێ:
1. « عێراق » لە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان پێکهاتووە.
2. عـێراق لە هەر دوو گـەلی سـەرەکیی « عـەرەب و کـورد »، چەن کـەمینەیەکی دیکەی وەک « تورکمان، ئاسووریی و ئەرمەن » پێکهاتووە.

3. کۆماری عێراق، له نێوان ئەو گەل و کەمەنەتەوەییانەدا، بە کۆمارێکی هاوبەش دادەنرێ.
ئەگینا، گەر وا نەبێ، بمانەوێ و نەمانەوێ، کۆماری عێراق، لە نێوان دەوڵەتە عەرەبییەکان و جیهاندا، بە دەوڵەتێکی عەرەبیی رووت دەژمێررێ. چونکە، کاتێ دەڵێن: بیستودوو دەوڵەتی عەرەبیی هەیە، مەبەستیان لە عێراقیشە. ئیدی نازانم، ئەوانەی بەو بیرە قایلدەبن، ئەوە « چڵکاوخۆریی، بێگانەپەرستیی، بەکرێگیراویی و کۆسمۆپۆلێتیی » نییە؟!! ئایا، ئەوانەی ئەو بارە باش هەڵدەسەنگێن، بەپێی بارە نالەبارەکەی کورد، گرفتەکە لە رۆڵەکانی هەر دوو گەلی عەرەبی عێراق و گەلی کوردی باشووری کوردستان دەگەیەنن، پێشنیازی گونجاو دەکەن، تا کێشەکە لە بەر رۆشنایی یەکسانیی نەتەوەیی و رێزی بەرابەریی، لە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانی وەک عێراقدا، چارەسەر بکەن، نۆکەر و چڵکاوخۆرن؟!! ئاخر، ئەم گەلە بندەسە، لەگەڵ ئەو « عێراقچیی »یە کەللەپوتانەدا چی بکا؟ دیارە، هەر هێندە لە « کوردایەتیی » و « عێراقچێتیی » گەیشتوون!
زۆری ویست، تا چەن « عێراقچیی »یەکی کورد، فێری ئەوە بوون، دان بە زاراوەی « باکوور، خۆرهەلات، باشوور و خۆراوا »ی کوردستاندا بنێن. لە بری ئەوەی، زاراوەی کوردستانی « تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »، لە قسەکردن و نووسیندا بەکاربێنن. وا دیارە، هێشتا زووە و چەن ساڵێکی دیکەشی دەوێ، تا دان بەو راستییەی سەریشەوەدا بنێن، لە کەلی ئەمریمەنی بۆگەنی باوەڕی « عێراقچێتیی » بێنەخوارەوە و روو لە رووگەی بیری « کوردستانیزم » بکەن!
3. « حەمەبۆر » ساڵی « 1977 »، ئەمەی نووسیوە. ئێستە، ئەوا بیستوسێ ساڵ بە سەر ئەو قسانەدا تێپەڕبوە. نە یەکێتیی و برایەتیی کورد و عەرەب، رۆژێ لە رۆژان، لە عێراقدا هەبووە، وەک ئەو باسیکردووە، نە « بەختەوەریی رۆڵەکانی ئایندەی » گەلانی عێراقیش، بە درۆودەلەسە بەدیهاتووە و بەدیدێ!
4. خاکی « عێراق » هەرگیز، پیرۆز نەبووە و پیرۆزیش نییە. چونکە، هەموو نەتەوەیەک، تەنیا هەر خاکی خۆی لا خۆشەویست و پیرۆزە، تەنیا بێگانەپەرستان نەبێ، خۆیان بە خاکی گەلانی دیکەوە بادەدەن و هەڵدەکێشن! جا، با سەیرکەین، کۆنەکۆمۆنیست و نووسەرێکی ناوداری وەک « رەسووڵ هەمزەتۆف »، دەربارەی نیشتمانەکەی چی گوتووە؟ بە مەرجێ لەو سەردەمەدا، لە « یەکێتی سۆڤیەت » ژیاوە. (هەندێ باڵندەی کۆچەر هەن، بەپێی کەژ لە وڵاتێکەوە دەچنە وڵاتێکی تر، هەڵۆش هەیە، کە هەمیشە دڵسۆزی شاخی خۆیەتی.)«127،36»، دواتر، رووی

دەمی لە نیشتمانەکەی کردووە و گوتوویەتی: (عەشق و خۆشەویستییم گەورەبێ یا پچووک، دڵسۆزییم کەمبێ یا زۆر، هەستم کۆنبێ یا نوێ، من هەر لە بارەی تۆوە دەنووسم، ئەی داگستانەکەم)«146،36». دواتریش گوتوویەتی: (هەور نەبێ، باران لە کوێوە دێ؟ ئاسمان نەبێ، بەفر لە کوێوە دێ؟ ئاڤارستان و گەلی ئاڤار نەبن، رەسووڵ هەمزە لە کوێوە دێ؟) «224،36».

(وا بزانم، هێندە بەسە، بۆ کوێیەک راستیی ببیستێ! گەر ئەم دوڕ و مرواریییانە، هۆنەری بە ناوبانگ و پایەبەرزی « داگستان » هەڵی نەڕشتنایە، کوردێکی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەر بیگوتنایە، زۆر پێدەچوو، بە تاوانی شۆڤێنیزم مێشکیان ببردایە!)«64،19». بە دەیان ناتۆرەی وەک: « چڵکاوخۆر، بێگانەپەرست، بەکرێگیراو و کۆسمۆپۆلیتیی »یان، بە دواخستایە! جا، گەر ئەوە، ڤایرۆسی « ئیدس »ی ماڵوێرانیی و سەرلێشێوایی نەبێ، هێندێ کوردی نەگبەتی « عێراقچیی » تووشی بووبن، ئیدی دەبێ، چیدیکە بێ!

5. گەر « حەمەبۆر »، یەک تۆز ویژدان و زانیاریی هەبووایە، هەڵبەتە، هەرگیز نەیدەنووسی: (هەر لە بەر ئەمەشە، ویردی زمانی پێشووانمان بووە و سروودی ئێمە و بەرەی داهاتویش دەبێت.)«11،31».

ئایا، ئەو پیاوە هێندە شارەزایە، بە ناخی مێژووی کوردا شۆڕبۆتەوە، وا ئەو بڕیارەیداوە؟ ئایا، مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و پێوەلکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقی دەسکردی « بریتانیا »وە دەزانێ؟ جا، گەر هەموو ئەوانەی بزانیایە، چۆن هەر لە خۆیەوە، هەڕەمەکیی دەیگوت: ئەو برایەتییە « ویردی سەر زمانی پێشووانمان بووە! » ئەم درۆ گەورەیەی بە دەم پێشینانەوە بۆ کردووە؟ ئایا، لاپەڕە رەشەکانی مێژووی هەر دوو داگیرکەری کوردستان « بریتانیا و عێراق »، بۆ هەموو کوردێ ئاشکرا نین؟ گفتوگۆکانیان گەواهیی ئەوە نادەن، کە لە پێش هەموویانەوە، « شێخ مەحموود »ی نەمر، داوای سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی کردووە؟ چەن کەڵەپیاوێکی وەک: « حەمەی ئەورەحمان ئاغا، شێخ قادری حەفید، مەعرووف چیاوک ... تاد » بە هەموو توانایەکیانەوە، دژی ئەو پێکەوەلکاندنە وەستاون، ئەو یەکێتیی و برایەتییەیان رەتکردەوە! ئیدی چۆن، خەڵکی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، دژی ئەو پرۆسێسی پێکەوەلکاندنە نەبوون و بێزاریی خۆیان دەر نەبڕیوە؟ هەڵبەتە، گەر « حەمەبۆر » بینووسیایە: « سروودی هەموو " عێراقچیی " یەک بووە »، ئەوا ئەو کاتە، دەنگ لە بەردەوە بهاتایە، دەنگ لە منەوە نەدەهات! بەڵام، کاتێ نووسیویەتی: « سروودی ئێمە »یە، من لێرەدا لێی

دەپرسم: « ئێمە » واتای کێ دەگەیەنێ؟ گەر مەبەس لە هەموو کوردی باشووری کوردستان بێ، ئەوا کێ ڕێی پێ داوە، بە ناوی هەموو کوردەوە بدوێ؟ئینجا گوتوویەتی: سروودی « بەرەی داهاتووش دەبێت! » ئەمە لەوە دەچێ، « حەمەبۆر » جادوباز یا فاڵچیی بووبێ، وا هەر لە خۆیەوە ڕەملێلێداوە، هەر لەو کاتەوە، بە ناوی نەوەکانی پاشەڕۆژی کوردیشەوە بڕیاریداوە، وەک سەربازێکی دڵسۆز و بە ئەمەکی ناسیۆنالیستە عەرەبەکان، تامەتایە، برایەتیی عەرەب و کورد، یەکێتیی خاکی عێراق بپارێزرێ! هەڵبەتە، هەرگیز نیازی ئەوەی نەبووە و نییە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، مافی نەتەوەیی بە کورد ڕەواببینرێ، کە خۆی لە ڕزگاریی و سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەییدا دەبینێ! بەڵکوو، تامەتایە هەر دەبێ، گەلی کورد لە عێراقدا، لە بندەسی کەمینەی سوونەی عەرەبدا بێ، بچەوسێنرێتەوە و بناڵێنێ. چونکە، مافی چارەنووسی نەتەوەکان، وەک « لینین » نووسیویەتی: (مەبەس لە سەربەستیی نەتەوەکان، بۆ دیاریکردنی مافی چارەنووسی خۆیان، جیابوونەوەیانە وەک دەوڵەت لە کۆمەڵە نەتەوەکانی دیکە، بێ گومان، دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆیە.)«144،48»
سەیر ئەوەیە، « ئیسرایل » جۆرە « ئۆتۆنۆمیی » یەکی تایبەتیی و فراوانی نێودەوڵەتیی، بە « فەلەستین » داوە، کەچیی، خۆیان بەوە قایل نابن و نایانەوێ، هەر داوای دەوڵەتی سەربەخۆی جیا دەکەن، هەرگیز لە شایی برایەتیی « جوو » و « فەلەستین »دا، دەسی هەڵپەڕکێیان نەگرتووە و ناشیگرن، نەک وەک « باجی ڕەحمە »کانی کورد، سەرچۆپیی بێگانەپەرستیی، بە کەس نەدەن! ئەز، زۆر لەوە دڵنیام، ئەو « مانگی هەنگوین »ی گفتوگۆیەی لە نێوانیشیاندا، تا ئەوڕۆ هەر بەردەوامە، بەو زووانە تەواودەبێ و سەریشدەکەون!
هەروەها، گەلی « باسک » لە سنووری دەوڵەتی « سپان »دا، چەندین ساڵە جۆرە « ئۆتۆنۆمیی »یەکیان هەیە. کەچیی، ئەوان هەر داوای جیابوونەوە دەکەن!
جا، گەر « حەمەبۆر » و « بەرزنجیی »، ئارووی یەک بڕک و مێرووی یەک کونی گەورەی « عێراقچێتیی » نەبن، هەڵبەتە، لە لایەکەوە، « بەرزنجیی » قسە سوواوەکانی فاڵچییەکی « عێراقچیی »، بە نموونە ناهێنێتەوە! لە لایەکی دیکەشەوە، دوای ئەو هەموو ماوەیە، سەری زێرابی ئەرشیفی بیری بۆگەنی « عێراقچێتیی » هەڵ ناداتەوە، کە سەراپای جیهان و کوردستانیش گۆڕاوە!
با کەمێ سەرنجدەین، تا بزانین، « عێراقچیی »یەکی دڵسۆزی وەک « حەمەبۆر »، لە چ سەردەمێکی سەختی باشووری کوردستان و ڕۆژگارێکی ڕەشی کورددا، ئەو

تیورییە زڕکە پوتەی هەڵشتووە. کاتێ ئەو بڕیارەیداوە، گەلی کورد لە عێراقدا، لەو پەڕی بێ دەسەلاتیی و نەهامەتییدا بووە، دەوڵەتی عێراقیش، نەک هەر گوێی بۆ چەن وڕێنەیەکی لەو بابەتانە شل نەکردووە. بەڵکوو، بەو پەڕی توانایەوە، هەوڵی تۆوبڕکردنی کوردی داوە. بە هەموو شێوەیە ویستوویەتی، لەنێوبەرێ! هەروەها، « بەرزنجیی » ش، لە چ سەردەمێکی نوێ و ڕۆژگارێکی ڕووناکی کورددا، وەک تووتی، ئەو تیۆرییە ساختەیەی دووبارەکردۆتەوە! کاتێ، گەلی کورد، بەرەو ئازادیی و سەربەخۆیی نەتەوەیی هەنگاودەنێ، دەوڵەتی داگیرکەری عێراقیش، ڕۆژبەڕۆژ، پتر ڕیسوادەبێ و لە کوردستان دوور دەکەوێتەوە! ئەو تازە نووکی پێنووسە کولەکەی تیژکردۆتەوە، بە هەموو توانای خۆیەوە دەیەوێ، بیری داتەپیوی « عێراقچێتیی » ببوژێنێتەوە، تیۆری مێژوویی بۆ پێکەوە ژیانی زۆرەملیی داڕێژێ! تۆ بڵێی، ئەمە هەر وا کارێکی ساویلکانە و بێ مەبەستبێ؟
لێرەدا، خاڵێکی گرنگ هەیە، پێویستە، ئاماژەی بۆ بکەین. گەر، گەلی باشووری کوردستان، لە لایەن سەرانی « پارتیی و یەکێتیی »یەوە سەرکوت نەکرابێ، بانگاشەی ئەو برایەتییەی « بەرزنجیی و حەمەبۆر »، دەهۆڵی بۆ دەکوتن، با تەنیا بە یەک ڕیفراندۆمی ئازاد تاقیکەنەوە، ئەو کاتە، زۆر بە ڕوونیی، بۆ هەموو لایە دەردەکەوێ، ڕۆڵەکانی کورد لە باشووری کوردستاندا، دەنگ بۆ برایەتیی کورد ـ کورد و یەکێتیی خاکی کوردستان، یا بۆ برایەتیی کورد ـ عەرەب و یەکێتیی خاکی عێراق دەدەن! گومانی تێدا نییە، ئەو برایەتیی و یەکێتییە دەسکردە ڕەتدەکەنەوە، نەفرەتی لێ دەکەن و هەزار بەردیشی بە دوادا هەڵدەدەن. بەڵام، مامۆستا « بەرزنجیی »، چونکە هەر ووشە ڕیزدەکا، مەرایی بۆ پارتەکان دەکا، بە دەنگێ جۆی ئەوان دەژەنێ، بە کلکی دەخورێ، ئامانجی دوژمن دەپێکێ و بە خۆی نازانێ، بێ ئەوەی بزانێ، ئەو باوبژی «عێراقچێتیی »یەی لە سکی خۆی دەریدەکا، هێندەی دیکە، لە ناو و ناوبانگی کەمدەکاتەوە!

« بەرزنجیی » نووسیوێتی: (تا ئەم کاتەش کەئەم وشانەی تیادەنوسم هیچ حیزبێ لەسەرانسەری عێراقا « بەکوردستانەوە »، ئەوانەی نوێنەرایەتی ئەم گەلە دەکەن و لەناویا خەڵکی باوەڕیان پێیە، هیچیان لەو باسە لایاننەداوەو بانگەشەی برایەتیەکە هەر بەردەوامە. جا ئەگەر نووسەر یەخەی زێوەر بۆ ئەم باسانە بگرێ، بەڕای من ناحەقیەکی گەورە دەکات. سەبارەت بە « پیاهەڵدانی حوکمەکەی نەوسای عێراق و مەلیکەکانی.)«32،3»، پێشتر، هەڵەی زمانەوانیی ئەم چەن دێڕەمان ڕاسکردەوە. جارێ، ئەز بە هیچ شێوەیە، گوێ بۆ پارتە عێراقییەکان

ڕاناگرم، دەربارەی « عێراقچێتیی »، چی دەڵێن و چی ناڵێن. چونکە، تەنیا ئەو بیرە گەندەڵە، لە بەرژەوەندیی ئەوان دایە. بیری سەربەخۆیی و کوردایەتیی، بۆ ئەوان، وەک تەزووی کارەبا وایە، گیانیان لە بەردەبڕێ و ووشکیاندەکا! ئینجا، من چ کارێکم بە سەر ئەوەوەیە، نەک هەر پارتەکانی کوردستان، بەڵکوو، گەر زۆربەی زۆری کوردیش، هێندە بێگانەپەرستبن، « عێراقچێتیی » ویردی سەر زمان و برایەتیی « عەرەب و کورد » خۆراکی ڕۆژانەی ژیانیان بێ! من باسی ڕاستییەکی مێژوویی دەکەم. ئەوە هیچ
لەو ڕاستییە ناگۆڕێ، کوردستان داگیر و دابەشکراوە، گەلی کورد لە عێراقدا، لە هەموو مافێکی نەتەوەیی خۆی بێ بەشکراوە، بە خراپترین شێوە دەچەوسێندرێتەوە. عێراق دەوڵەتێکی داگیرکەری خاکەکەم نەبێ، هیچ شتێکی دیکە نییە! من هەرگیز، لە باسی ڕاستیی و ڕەوایی کێشەی کورددا، لەگەڵ زۆربۆری دەنگی هیچ عەرەبێکی « عێراق » و « عێراقچیی »ەکی کورددا نەبووم و نیم و نابم. چونکە دەزانم، ئەو دەستە و گروپانە، هەرگیز شتێ ناڵێن، لە بەرژەوەندیی گەلەکەمدا بێ!
پاشان، ئەز نە بە خۆڕایی پەخەی « زێوەر »م گرتووە. نە بە تەنیاش، پەخەم گرتووە. بەڵکوو، لە ڕێگەی ئەوەوە، گەر دەسەڵاتم هەبێ، نەک هەر پەخە، قوڕقوڕاگەی هەموو « عێراقچیی »ەکیش دەگرم، بە تایبەتیی دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی گەل، هەرچی دژی ڕزگاریی نیشتمانەکەم و سەربەخۆیی گەلەکەم بێ، دووکەڵی مێشی « عێراقچێتیی »، لە هەوای خاوێن و سازگاری کوردستاندا، دژی بیری کوردایەتیی و کوردستانیزم بڵاوکاتەوە، وەک کوردێکی ناسیۆنالیست، بە مافێکی ڕەوای خۆمی دەزانم، داکۆکیی لە « بیر و ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی، نەتەوە و نیشتمانەکەم » بکەم. بە هەموو شێوەیە، دژی بیری بەردەوامبوونی پێکەوەلکاندنی کوردستان بە عێراقەوە بوەستم. چونکە، خۆم بە قەرزارباری نەتەوە و نیشتمانەکەم دەزانم، لە دامێنی چیا سەرکەشەکانی کوردستاندا لەدایکبووم، لە ئاوی کوێستانەکانیم خواردۆتەوە، مەلاشووم بە بیری کوردایەتیی و دڵسۆزیی بۆ کێشەی نەتەوەیی و ڕامیاریی نەتەوەکەم هەڵدراوەتەوە. هێندە خۆم بە قەرزارباری دایکی نیشتمان دەزانم، لە تاوان و لە بێ دەسەڵاتیدا دەنووسم و هاواردەکەم. هەر چەندە، لە داخی کورد خۆی و سەرانی پارتەکانی کوردستان، لە دەس « عێراقچیی » و ناپاکەکانی کورد، دڵم پڕ، ڕەنگم زەرد و زمانم تووشی زەردوویی بووە. بەڵام، هەرگیز کۆڵ نادەم، هێشتا وڕەم بەرزە، بەرەنگاری هەموو جۆرە

بیرێکی نامۆ و نارەسەن دەبمەوە، کورد بە باوک، کوردستان بە دایک و بیری نەتەوەییش، بە قەڵایەکی قایم دەزانم. پاشەڕۆژیش، هەر بۆ ئازادیی کورد، سەربەخۆیی کوردستان و سەرکەوتنی بیری نەتەوەیی دەبێ. ئەمەکداریشم داوام لێ دەکا، گەر وەک « گالیلۆ »، لە سەر ڕاستییش بمسووتێنن، هەر ڕاستیی بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم روونکەمەوە، یەخەی سەرانی پارتەکانی کوردستان بگرم، دژی ناپاکەکانی کورد بوەستم، بەربینگی هەزاران مـــــــــــردووی زیندووی وەک « زێوەر » و زیندووی مردووی وەک « بەرزنجیی » بگرم! جا، سەردەمەکە بۆ من، هیچ جیاوازییەکی نییە، کام هۆنەری کورد، لە چ سەردەمێکی مێژوویدا، بە سەر داگیرکەرەکەم و ڕژێمەکەیدا هەڵیداوە. لەبەرئەوە، لە هەموو سەردەمێکدا، هەموو کوردێکی دڵسۆز بۆی هەیە، ئاوڕ لە مێژوو بداتەوە، ڕەخنە لە دەیان نووسەر و هۆنەری وەک « زێوەر » بگرێ. چونکە، ئێمە قسەمان لە سەر « بیر » و بەرژەوەندیی « کورد » کردووە، نەک لە سەر شتێ بووبێ، بایەخی نەمابێ و کۆتاییهاتبێ. کێشەی « بیر » و « فەلسەفە »ش، هەرگیز کۆتایی نایە و لە هەموو سەردەمێکیشدا، باسی لێوە دەکرێ و تاووتوێدەکرێ!

### 37/3. بەد و بەدخانە :

هەموو « عێراقچیی »یەکی بێگانەپەرست، تا چەن لەگەڵ یەکدیدا ناکۆک و جیاواز بن، هەر وەک یەک بیردەکەنەوە. لەو ڕووەوە، هیچ جیاوازییەکیان نییە. جا ئەو کەسە، داکۆکیی لە ڕابوردووی عێراق بکا، یا لە سەر ئێستە و ئایندەی عێراق، خۆی تووشی گێچەڵکا و سیپارەیەکی ناوەڕۆک پووچەڵ ڕەشکاتەوە، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ! گەر « زێوەر » پێرێ، هۆنراوەی بە سەر خاکی عێراق و شاکەیدا هەڵدابێ، گەر « حەمەبۆر » دوێنێ، سروودی بۆ عێراق گووتبێ. ئەوەتە ئەوڕۆش، یەکێکی وەک « بەرزنجیی » دەیەوێ، مێژوویەکی پڕ لە شانازیی، بۆ دەوڵەتی داگیرکەری عێراق و شاکەی داتاشێ. بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی، باسی ڕابوردووی عێراقی کردووە و نووسیویێتی: (گەر بێتو بەراوردێ بکەین لەنێوان ئەو حوکمەتەو ئەوانەی دوای 1958/7/14 یەک بەدوی یەکدا هاتن و تا حاڵی حازر لەڕووی رەفتارو مامەڵەکردنیانەوە لەگەڵ گەلی کورددا، لەهەمو روویەکەوە، وابزانم جێگای خۆیەتی کەحوکمی پاشایی بەهێدی ترین و واقیعی ترین حوکمێ دابنێین.

کورد دەڵێ: « تا بەد نەبینی بەدخانە بەیاننناکەی »، هەر کام لەئێمەش ئەگەر بەئینسافەوە چاو بەو ماوەی حوکمی پاشایی یەدا 1927-1958 لەکوردستاندا بگێڕیتەوە، لەهەموو ڕوویەکەوە دەبینێن بەحەوت ئاو شۆرابووەوە لەچاو ئەوانەی

کــەدوای 1958وە بەئاگـرو ئاسن و باروت و خــەردەل لەگــەڵمــاندا ژیان و حوکمیـان کردین. ئەو « دەسکەوتە گرنگانـە »ی ئەم حوکمەتانە ناوبەناوو لەگەڵ هەر « وتووێژێکیدا » بەکۆڵێ منەتەوە، لەگەڵ تەقەی دەهۆڵ و زوڕنادا بەئیفلیجی دەیاندا بەکورد، حوکمەتی ئەوسا لە1925 « لامرکزی بۆ کورد » پێشنیارکرد، لەسەر ئامۆژگاری لیژنەی سنوری سەر بەعوسبەی نەتەوەکان، لە1930دا یاسـای زمـانە ناوەچەیی یەکان « لغات محلیە »ی دەرکـرد، پیاوانی لێهـاتووو شارەزاو ئیداری وەک: سەعید قـزاز، رفیق حیلمی، ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی، مەعـروف جیـاوک، ئەحـمـەد مـوختـار و سـالح زەکی ودەیان دڵسـۆزی تر لەوەزارەتەکان و ناوچەکاندا کاربەدەست بوون.)«33،3»

لەوە دەچێ، کێشـەی کـورد وا ئاڵۆز و سەخت بووبێ، لە ناچاریدا، پەنا بۆ بەر پەندە کوردییەکە بەرین و بڵێین: « سـاڵ بە سـاڵ، خۆزگەم بە پار! » لەوانەیە، ئەمە تا ئەندازەیەکی زۆر بۆ باری کورد لە عێراقدا ڕاستبێ! بەلام، لە کاری ڕامیاریی و هەڵسەنگاندنی باری کۆن و نوێدا، ئەو جۆرە لێکدانەوانە، هیچ بایەخێکی نییە! چونکە، پێش هەموو شتێ، هەم ئەوەی ڕۆی، ناگەڕێتەوە و هیچ کەڵکێکی نییە! هەم لەو ڕۆژەوە دەوڵەتی عێراق دامەزراوە، ئەو حوکوومەتانەی یەک لە دوای یەک هاتوون، هەرگیز بەو شێوەیە بەراورد ناکرێن. لەبەرئەوەی، چ گەلی عەرەب و چ گەلی کورد، لە هەموو ڕوویەکەوە گۆڕاون. سەردەمەکان یەک نین، پاشایەتیی و کۆماریی، دوو سیستێمی جیاوازن.

پاشسان، گـەر « بەرزنجیی »، کـەمێ هۆشی بـە خـۆی بووایە، کـەمێ پەروەردەی نەتەوەیی هەبووایە، بە بیری ڕەسەنی کوردایەتیی گۆشکرایە، ڕقوکینە بەر چاوە بچووکەکانی تاریک نەکردایە، هەڵبەتە، بەو شێوە پڕ لە شەرمەزارییە، داکۆکیی لە مێژووی ڕەش و پڕ لە تاوانی دەوڵەتێکی داگیرکەری نیشتمانەکەی نەدەکرد! هەڵبـەتە، گەر نانێکی بەو ڕۆنەوە نەخـواردایە، لە هەر لایەکەوە با بهێنـایە، ئەو لەوێوە شـەنی نەدەکـرد. هـەر دەرلنگێکی لە مـاڵە بێگانەیەک نەپسـایە، زۆر بە ئاسانایی دەیزانی، حوکوومەتە عەرەبییەکەی نێوان سالانی «1927-1958» کێ دروسیکرد؟ کێ وەک بووکەشووشە، یاری پێ دەکرد و هەڵیدەپەڕان؟ ئایا، شـــا « فەیسەڵ » و حوکوومەتەکەی، هێندە سەربەخۆیی بڕیاری ڕامیارییان هەبوو، تا بێ قایلبوونی لێپرسراوانی « بریتانیا »، پەنجە بە ئاودا بکەن؟

کـاتێ، یەکێ ئەو جۆرە بڕیارانەدەدا، تا سـەر مۆخ و ئێسک، دژایەتیی ڕاستـیی دەکـا، دوای شەوەزەنگی بیری « عێراقچێتیی » دەکەوێ، هەر وەک « بەرزنجیی »

لێ بەسەردێ! چونکە، هەموو ئەو دەسکەوتانەی، بە خەباتی ڕەوای گەل و خوێنی شەهیدانی، ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی نێوان سالانی « 1919-1931 »، بە سەرکردایەتی « شێخ مەحموود »، لە عێراقدا گەلی باشووری کوردستان بە دەسیهێناوە، لە لایەکەوە، بە چاکە بۆ سەرانی ئەو کاتەی دەولەتی عێراقی تۆمار کردووە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەم ڕۆلی کوردی لە خەبات و بەدیهێنانی ئەو دەسکەوتانەدا پشکوێخستووە. هەم لە بایەخی ڕۆلی ئەو قارەمان و شەهیدانەی کەمکردۆتەوە. هەم هێندە پێ نەزان و بێ ئەمەکی نواندووە، بە هەرچی چۆنێبێ، هەر هەولیداوە و ویستوویەتی، بە چاکە باسی سەرانی کۆنی دەولەتی « عێراق » بکا، ڕۆلی ئینگلیزیش، لە دانپیانانی سەرانی « عێراق » بەو دەسکەوتانەدا بشارێتەوە و بشێوێنێ!

جا، گەر نوێنەرانی « بریتانیا » لە عێراق، خاوەنی دەسەلاتی یەکەم نەبوونایە، هەموو بڕیارێکی ڕامیاریی و ئابووریی، هەر بە دەس ئەوان نەبووایە، کێشەی نەتەوەیی کورد و پێوەلکاندنی باشووری کوردستانیش، هەر لە سەرەتاوە، ئەوان نەخشەیان بۆ نەکێشایە، ئێستە، بۆ ڕۆژمان بەم ڕۆژە ڕەشە دەکەیی؟ یەکێکی بێ ویژدانی وەک « بەرزنجیی »ش، ئەو قسە بێ تام و بۆیانەی، بۆ دەکرد؟ ئەو « لا مەرکەزیی یەی » بە کوردیشیان ڕەوابینیوە، لە بەر چاوی جوان و کەشی کورد، پێشنیازیان نەکردووە. بەلکوو، لە ئەنجامی خەباتێکی سەختی خوێناویی و بۆمبارانی گوند و شارەکانی کوردستانەوە هاتووە. بەری خەباتی هەولی ڕامیاریی و شۆڕشە چەکدارییەکانی « شێخ »ی نەمر بووە. بەرهەمی خوێنی شەهیدانی کورد و کوردستان بووە. نەک « حاتەم »ئاسا، شا « فەیسەل »ی ئامۆزای « بەرزنجیی »، بە کوردی بەخشیبێ! ئەو پیاوانەی ئەویش ناویبردوون و کاریان پێ سپێرراوە، ئەوانیش هەر لە سەر خوێنی شەهیدان، بەرەنگاربوونەوەی جەماوەری گەلی کورد بە گشتیی و شاری « سولەیمانیی » بە تایبەتیی، ئەو پۆستە گرنگانەیان وەرگرتووە. نەک دەسی ڕۆژگار بە ڕێککەوت، ئەو پلەوپایەی پێ دابن. یا هەر لەبەرئەوەی کورد بوون و کوردیش لە عێراق دەژین، دەبێ، چەن پیاوێکیان لە وەزارەت و بەڕێوەبەرێتییەکانی دەولەتدا هەبێ و کاربکەن. ئەگینا، گەر گەلی باشووری کوردستان، ئەو زنجیرە ڕاپەڕین و شۆڕشانەی بەرپا نەکردایە، داوای مافە نەتەوەییە ڕەواکانی خۆی نەکردایە، ئایا، ئەو حوکوومەتە عەرەبییە شۆڤێنییەی ئەوسا، ئەو شا « فەیسەل »ە لە دەرەوەهێنراوەی، « زێوەر » هۆنراوەی بۆ گوتووە و « بەرزنجیی » داکۆکیی لێ دەکا، نەک هەر ناوی

کوردیشیان، له خەوی شەویشدا بە بیردا نەدەهات، بەڵکوو، وەک « قیبتییەکانی ـ میسر » چۆن دەنگیان هەیە و ڕەنگیان نییە. وەک « بەربەرەکانی ـ جەزایر و مەغریب » چۆن هەر سرتە و بۆڵەیان دێ، ئاواشیان لە کورد و بگرە خراپشتریش دەکرد. ئەوسا « زێوەر » و ئێستەش « بەرزنجیی »، لە بری ئەوەی، بە کوردیی داکۆکیی لە عێراق بکەن، بیری ساختە و دەسکردی گەندەڵی « عێراقچێتیی » بڵاو کەنەوە، « زێوەر » هۆنراوەکانی و « بەرزنجیی » مش سیپارە و گوتارەکانی، بە عەرەبییەکی ڕەوان دەنووسییەوە!

ئەوە جگە لەوەی، ئەو پیاوانەی ئەو ناویبردوون، هەموویان کەڵەپیاوی ڕووناکبیری ئەو سەردەمەی کورد بوون. لە سەردەمێکیشدا، هێندێکیان لە « شێخ مەوە زۆر نزیکبوون و هاوکاریبوون. هێندێکی دیکەشیان، هێندەی لە دەوڵەتی « عێراق و بریتانیا » وە نزیکبوون، هێندە لە کێشەی کوردەوە نزیک نەبوون! زۆربەی ئەو فەرمانبەرانەی، حوکوومەتەکانیش لە « بەغدا » یا لە کوردستان دایەزراندبوون، گەر هەموویان پیاوی خۆیان یا لە خۆیانەوە نزیک نەبووبن، لابەڕەی تێکۆشانی رامیارییان، لای ئەوان پاک و سپی نەبووبێ، ئەوا هێندێکیان هەر بە تەواویی، لە بنەوە پیاوی خۆیان بوون، لە سەر خوێنی شەهیدان دانوستانیانکردووە و پێگەیشتوون، ئەو پۆستانەیان وەرگرتووە و بۆ خۆیان ژیاون. نموونەش، لە سەر ئەو جۆرە کەسانە، چ لە سەردەمی شا « فەیسەڵ » و چ لە سەردەمی حوکوومەتە یەک لە دوا یەکەکانی دیکەی عێراقدا زۆرن و پێویست بە ناوهێنانیان ناکا.

« بەرزنجیی »، جگە لەوەی ویستوویەتی، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، بە شان و بازووی حوکوومەتەکەی شا « فەیسەڵ » و سەردەمی پاشایەتییدا هەڵدا، کە ئەوەش تەنیا هەر بۆ ئەوەیە، پاساوی هۆنراوە چڵکنەکانی « زێوەر » ی پێ بدا. یەکێ شارەزای باری ئەو سەردەمەی کورد نەبێ، وا دەزانێ، کورد غەدری لە حوکوومەتی عێراق کردووە و میریی مافێکی زۆری بە کورد دابوو. کەچیی، کورد خۆی لە خۆی تێکداوە و بێ ئەمەک بووە! من سەیرم لێ دێ، کوردێ وڵاتەکەی داگیرکرابێ، نوزەیان لێ بڕیبێ، سەروەت و سامانی نیشتمانەکەیان دزیبێ و بە ئاشی قوڕگی ڕۆڵەکانی گەلی سەردەستیاندا کردبێ، وەک خێریان پێ کردبێن، هێشتا دەبێ، ئێمە سوپاس و ستاییشیان بکەین! هێشتا دەبێ، « بەرزنجیی »، بەو شێوەیە بیربکاتەوە، تازە باسی برایەتیی عەرەب و کوردمان بۆ بکا، لە چاکەکانی حوکوومەتەکەی شا « فەیسەڵ » و سەردەمی پاشایەتیی، چەپکێ گوڵمان بۆ بچنێ و مێژی مێژووی پێ برازێنێتەوە! ئەوە لە بری ئەوەی، دوای ئەو

هەموو ئەزموونە تاڵ و هەڵەیەی خۆی، پتر هەوڵدا، خۆشی و ڕۆڵەکانی گەلەکەی، بە بیری نەتەوەیی پەروەردەکا، بە تیشکی خۆری ڕاستیی، بەر پێیان ڕووناک کاتەوە و سەهۆڵبەندانی ئەو بیرە پوچ و نامۆیانە بتوێنێتەوە، کەچیی، تازە ئەو بیرە کرچوکاڵانەمان، بە نرخێکی زۆر هەرزان پێ دەفرۆشێ! چونکە، کورد وەک گەل، باشووری کوردستان وەک خاک، بەپێی هەموو یاسایەکی زەمینیی و ئاسمانیی بێ، مافێکی ڕەوای خۆیەتی، لە ماڵی خۆیدا چۆن دەیەوێ، هەر بەو شێوەیە بژی، ئازاد و سەربەخۆیی، دەوڵەتێکی یەکگرتووی ناسیۆنالی هەبێ!

لە هەمان کاتیشدا، هێندە ساکارانە باسەکەی خۆی نووسیوە، جیاوازیی لە نێوان سەردەمەکان و گۆڕانکارییە مێژووییەکاندا نەکردووە. بەراوردی، لە نێوان سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقی سالانی نێوان « 1927-1958 » و دوای کۆدەتاکەی سالی « 1958 » کردووە. سەردەمی پاشایەتیی، « بە هێدیترین و واقیعیترین حوکم » داناوە! لە دوای « 1958 »یشەوە، بە « ئاگر و ئاسن و باروت و خەردەل لە گەلماندا ژیاون حوکمیان کردووین. » پاشان نووسیویتی: (حوکمەتەکانی دوای ئەوانیش، دەبوو سەدان گوند وێرانو خاپوور بکرانایەو سەدان منال و ئافرەت و بێ تاوان ببوونایەتە قوربانی، ئەوسا وەزیرێک یا پارێزگارێکی کوردیان دادەنا.. خۆ هەر کە بارەکە وەردەگەڕا، ئەوەش نەدەما.) «33،3» ئایا، « بەرزنجیی » بیریچۆتەوە، لەو سەردەمانەی ئەو باسیکردوون، ڕژێمی پاشایەتیی « بەغدا »، بە چ شێوەیە، شۆڕشەکانی « شێخ » و « بارزان »ی کوژاندۆتەوە؟ چەن جار، بۆمبارانی گوند و شارەکانی کوردستانیان کردووە؟ هەر تەنیا چاوخشاندنێ، بەو ڕاپۆرتانەی لە سەر دامرکاندنەوەی شۆڕشەکانی کورد نووسراون و لە ئارشیفی هەر دوو شالیارگەی ناوخۆی « عێراق» و دەرەوەی «بریتانیا »دا هەڵگیراون، ئەوەمان بۆ ڕووندەکەنەوە، ئەو داگیرکەرە عەرەب و ئینگلیزانە، بە چ شێوەیەکی دڕندانە، ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانەیان، لە گۆمی خوێن و فرمێسکدا نقوومکردووە. ئەوە جگە لە بیرەوەرییەکانی، چەندین سەرکردەی سەربازیی عەرەبی عێراقی وەک « حەسەن ئەلنەقیب » و چەندین ئینگلیزی وەک « مس بێل »، کە هەموویان، لە دوژمنایەتیی کورد و کوردستاندا، لە زوخاوی دەروونی ڕەش و هەناوی بۆگەنیان هەڵکێشراون!

جگە لەوەی، هەر دوو سەردەمەکە، لە زۆر ڕوویەکەوە جیاوازبوون. چونکە، لە سەردەمی کۆندا، هەموو ئەو ڕاپەڕینانەی بەرپابوون، هەر لە سنووری ناوچەیەکی بەرتەسکی کوردستاندا بوون. زۆر زووش دامرکێنراونەتەوە. پارتێکی ڕامیاریی

سەربەرشتیی نەکردوون. بارە نێو دەوڵەتییەکەش بەو شێوەیە، لە قازانجی کورددا نەبووە. بەلام، گەر سەرنجێ لە شۆڕشی «11/ سێپتێمبەر» بدەین، هەر لە «خانەقین»ەوە تا «زاخۆ»ی تەنیبۆوە. ماوەی چواردە ساڵی ڕەبەقی خایاندووە. «پارتی دیمۆکراتی کوردستان ـ عێراق»، ئاڵا هەڵگری شۆڕشەکە بووە. بارە نێونەتەوەییەکەش، تا ئەندازەیەکی زۆر، لەگەڵ کۆندا جیاوازیی هەبووە. ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییەی لە نێوان عێراق و دەوڵەتەکانی پەیمانی «بەغدا»ی وەک «تورکیا و ئێران»یشدا هەبووە، بە قازانجی شۆڕشەکە شکاوەتەوە.
بۆیە، بەرفراوانترین و درێژترین شۆڕشێ، لە مێژووی کورددا بەرپابووبێ، شۆڕشەکەی «11/سێپتێمبەر» بووە. ئامانجە ستراتیژیی و تاکتیکییەکانیشی، لە شۆڕشەکانی پێشووی کورد جیاوازتربووە. گەلی باشووری کوردستانیش بە شێوەیەکی گشتیی، لە دەوری ئاڵای «پارتیی، شۆڕش و بارازانیی» کۆ بووبوونەوە. وەک شۆڕشەکانی پێشوو نەبووە، تەنیا چەن ڕووناکبیر و چەن تیرە و هۆزێ، بەشدارییان تێدا کردبێ. لە هەمان کاتیشدا، دوژمنەکە، ئەو دوژمنەی پێشوو نەبووە. ڕژێمەکە زۆر گۆڕاوە، «دەوڵەمەندتر، بە تواناتر، بەهێزتر، سەربەخۆتر...» بووە. تەنانەت، لای هێندێ «کورد، عەرەبی عێراق و دەوڵەتەکانی دەرەوە»ش، پێشکەوتووخوازتربووە! پێوەندیی لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبییەکاندا پتەوتر و باشتربووە. لە سەر ئاستی جیهان، دۆستی نوێ و پتری پەیداکردووە. خاوەنی سوپایەکی گەورەتر و سەربەخۆتر بووە. چەکێکی زۆر و مۆدێرنی مرۆ قرکەری کڕیوە. ڕێکخراو و پارتی ڕامیاریی عەرەبیی ناسیۆنالیستیان دامەزراندووە، بیری شۆڤێنیی و ڕەگەزپەرستانەیان، لە نێو ڕیزی ڕۆڵەکانی عەرەبدا بلاوکردۆتەوە. دژی کورد و کێشە ڕەواکەی، مێشکیان پڕکردوون و پەروەردەیانکردوون. بۆ دژایەتییکردنی کورد و پاکتاوکردنی هانیانداون. بۆیە، ئەو جەنگەی لەو سەردەمەدا، لە کوردستاندا بەرپایانکردووە، لەگەڵ ئەو جەنگانەی پێشوودا زۆر جیاوازبووە. ئەو پەلامار و هێرشانەی، سوپای داگیرکەری عێراق، لە کۆندا داویانە و کردوویانە، لە چاو ئەو پەلاماردان و هێرەشانەی، دوای ساڵی «1958» داویانە و کردوویانە، گەلێ جیاوازییان هەبووە.
بە کورتیی، هەموو شتەکان گۆڕاون. بەڵەنسی تەرازووی نێوان هێزەکانیش، هەر گۆڕاوە و لە قازانجی کورددا نەبووە. کوردیش، لەو سەردەمانەدا، دۆستی نەبووە، تا بە لانی کەمەوە، گەر یارمەتیی نەدا، ڕێگەی پێشاندا. جا گەر کورد، لە سەردەمی زنجیرە شۆڕشەکانی «شێخ مەحموود» و «بارزان»دا، بە زەبری

لوولەی تفەنگی « پێنجتیر و ماوزەر »، بەرانبەر هێزی « عێراق و بریتانیا » جەنگابێ، ئەوا لە سەردەمی شۆڕشەکەی « 1961-1975 »دا، بە « تفەنگی کلاشینکۆف، هاوەن، تۆپی گەورە و قورس،B10 و ڕاکێتی هۆک »، دژی « سوپا، تانک و فڕۆکە »کانی دەوڵەتی داگیرکەری دوای سالانی شەستەکان جەنگاوە!
لەبەرئەوە، شتێکی زۆر ئاشکرایە، هۆ و ئامرازە « ڕامیاریی، سەربازیی، پروپاگەندیی و مرۆیی »یەکان گۆڕاون. « کوشتنی بە کۆمەڵ، ڕاگوێزان، هۆردوگای زۆرەملیی، ئەنفال و ژاراباران‌کردن »ی هێندێ ناوچەی کوردستان، لە سەردەمی نوێدا پیادەکراوە و هەبووە. بەڵام، لە کۆندا نەک هەر بەوشێوەیە نەبووە، بەڵکوو، زۆر بە دەگمەن هێندێ لەو شتانە ڕوویانداوە!
ئەدی « بەرزنجیی »، کاتێ ئەو بەراوردەی لە نێوان حوکومەتەکانی کۆن و نوێدا کردووە، پاکانەی بۆ سەردەمی پاشایەتیی کردووە، هەموو خراپەکارییەکان و کارە درندەکانی سەرانی دەوڵەتی عێراقی دوای « 1958 »ی باسکردووە بۆ ئایەوێ، لە سەردەمی پاشایەتیشدا، دەوڵەتە داگیرکەرەکە، دژی کورد چەکی کیماویی بەکاربێنایە، کە ئەوا کاتە ڕەنگە، نەک هەر نەیبوویێ، بەڵکوو، بە چاوی خۆشیان نەیاندیبێ! بۆ ئایەوێ، داگیرکەر ئەنفالی کۆمەڵانی بێ دەسەڵاتی کوردستانیان بکردایە، وا نووسیویێتی: « بە ئاگر و ئاسن و باروت و خەردەل لەگەڵماندا ژیاون ! » خۆ ئاشێ، بڵێ: ئەوانەی پێشوو، ئەو کارانەیان نەکردووە و لە بری ئاگر و ئاسن و باروت، گوڵبارانیان کردووین، بە فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانیان، بووکەشووشە و نوقوڵی ترشوشیرینیان بۆ منالانی کوردستان هەڵداوە!
کەواتە، دوێنێ ئەوڕۆ نییە. هەر حوکوومەتەی، بەپێی قەبارە و مەترسیی داواکارییەکانی شۆڕشەکە، بەپێی توانا و سەردەمەکە، دژایەتییەکی تەواویی کورد و شۆڕشەکەیان کردووە. بە هەموو شێوەیە هەوڵیانداوە، لەنێویبەرن. گوند و شارۆچەکەکانی کوردستانیان بۆمبارانکردووە و سووتاندوویانە. دەرگەی گرتووخانەکانیان، لە سەر گازی پشتبووە و بە خەباتگێڕانی کورد ئاخنیویانە. تەنانەت، هەوڵی بەعەرەبکردن و تواندنەوەی کوردیشیان داوە. جا گەر وا نەبێ، گوندی « حەویجە » و دەشتی « کەرکووک »یان، لە ساڵەکانی سیدا بە عەرەب نەدەچێنا! تەنانەت، عەرەبیی دەشتەکیی و گامێشەوانەکانی خوارووی عێراقیشیان، بۆ شارۆکەیەکی وەک « سەیید سادق » و شاری « سولەیمانیی »ش هێناوە، لە گەڕەکی « جوولەکان » نیشتەجێ بوون و ژیاون. ئایا، هەر ئەو ڕژێمە هێندیی و شا « فەیسەڵ »ە نەبووە، هەموو کوردی بە عەرەب داناوە؟!! ئەمەش لەو

گفتوگۆیەدا، بە ڕوونیی دەردەکەوێ، کاتێ بە « شێخ مەحموود »ی گوتووە:
(ئامۆزا! تۆ سەییدیت و لە خێزانی ئێمەیت. تۆ چ دەکەیت لە کوردستان و دەخلت چییە بە سەر کوردەوە. تۆ وەک من لە بەرەبابی پەیامبەر و بەنی هاشمیت، بۆ واز لەم کوردایەتییە ناهێنیت و بێیتە بەغدا لای من؟)«16،12».
لە وەڵامدا، « شێخ »یش گوتبووی: (ئەوە ڕاستە کە خێزانی من و تۆ، لە نەوەی ئیمام هەسەن و ئیمام حسەینین. بەڵام، ئەوەبوو کاتێک کە حەسەن و حسەینی باپیرانمان ڕوویانکردە دەشتی کەربەلا و دەیانوویست، خەڵکی ڕازیبکەن، کە ڕێی هەق بگرن، هەر لە لایەن عەرەبەکان خۆیانەوە کوژران و هێندێک لەوانەی لەو خێزانە بوون و ڕزگاریانبوویوو، پەنایانبردە بەر چیاکانی کوردستان و گەلی ڕەشورووتی کورد نەک هەر باوویاپیرانی ئێمەیان نەکوشت و بەس، بەڵکوو باوەشی خۆشەویستییان کردەوە بۆیان و کردنیان بە بەشێک لە خۆیان و لەوەش زێتر بە گەورەی خۆیان. ئێمە سەدان ساڵ لە باوەشی کورددا گەورە بووین، تازە دڵ و دەروونمان بووەتە کورد. زۆر سوپاستدەکەم کەوا بە ئامۆزا بانگمدەکەیت و منیش تۆ بە ئامۆزای خۆم دەزانم، بەڵام وەک تۆ خۆم بە عەرەب نازانم و لە تۆش داوا ناکەم، هەر لە بەر خزمایەتیی من، خۆت بە کورد بزانیت.. ئامۆزایەک کورد و ئامۆزایەک عەرەب ... )«16،12».
جا، ئیدی دەبێ، ئەم حوکوومەتە داگیرکەرانەی کوردستان، چ لە کۆن و چ لە ئێستەدا، چ جۆرە جیاوازییەکیان لەگەڵ یەکدیدا هەبێ، گەر تەنیا لە سەردەمەکان و گۆڕانکارییە « ڕامیاریی، سەربازیی، ئابووریی، کەلتووریی، کۆمەڵایەتیی »یەکاندا، جیاواز نەبن؟!! مەگەر هەر لای « بەرزنجیی »، زۆر جیاوازبن و کۆنەکان لە نوێکان باشتربووبن، ئەگینا، داگیرکەر لە هەموو کات و سەردەمێکدا، هەر بە داگیرکەر دادەنرێ و خەسڵەتی داگیرکەرانەی خۆیان وون ناکەن!
بۆیە، دەڵێم: هەر سەردەمێ، ڕەوشی تایبەتیی خۆی هەیە و لە سەردەمەکەی دیکەی پێش خۆی جیادەکاتەوە. هەر سەردەمێ، جۆرە چەوسانەوەیکی نەتەوەیی و چینایەتیی تایبەتیی لە خۆی دەگرێ و جۆرە خەباتێکی دیارکیراوی دەوێ. ئەمەش، پتر بەپێی « بەڵەنسی تەرازووی هێزەکان، هاوکێشە ڕامیاریی و سەربازییەکان و باری نێوخۆ و جیهان » دەگۆڕێ، جگە لەوەی، نەک هەر « بەد » هەیە، بەڵکوو هەمیشە « بەد، بەدتر و بەدترین »یش هەیە. جا ئیدی نازانم، لە دواڕۆژدا، چ چارەنووسێکی نادیار، چاوەڕێی ڕۆڵەکانی ئەم گەلە هەژارە دەکا؟!!

## 38/3. فەتـــوا :

ئینجا، زۆر بە ڕاشکاویی و ڕووهەڵماڵراویی، داکۆکیی لە هەموو ئەو هۆنەرانە کردووە، کە لە سەردەمی کۆندا، هۆنراوەیان بۆ سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە گوتووە و نووسیویەتی: (جا قۆناغێکی حوکم لەسەر کورد ئاوابووبێ، هیچ جێگای نەنگی نیە کەشاعیرێ یا نوسەرێ شتێکیان بۆ بڵێ.)«33،3» بەڕاستیی، کاتێ ئەم چەن ووشەیەم خوێندەوە، ئینجا بە تەواویی تێگەیشتم، ئەستێرەی لە ئاسماندا نەماوە. بە هیچ شێوەیە، دەفی دەنگ نادا. بۆیە وا بەو شێوەیە، کەوتۆتە قەل و بەرد. داکۆکیی لەو هۆنەرانە کردووە، کە هۆنراوەیان بۆ ئەو ڕژێمانە نووسیوە. دووریش نییە، خۆشی لەو بابەتانەی نووسیبێ، بە ناوی خۆیەوە یا بە ناوی یەکێکی دیکەوە، لە ڕۆژنامەکانی عێراقدا بڵاویکردبنەوە. بۆیە، وا بەو شێوەیە نووسیویەتی! چونکە، ماوەی بیست ساڵێ دەبێ، لێی دوورم و ئاگاداری هەواڵەکانی نیم. لەوە ناگەم، دەیەوێ، چۆن باوەڕ بە خوێنەری کورد بێنێ، ئەو جۆرە ژارەی لە بیری هێندێ لە هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانی « زێوەر »دا هەیە و هۆنەرەکانی دیکەش ڕشتوویانە، پاشان، پارتە کوردستانییەکانیش پێیان تێخستووە، کارێکی ئاسایی بێ و جێگەی نەنگیی نەبێ؟!! بە لای منەوە، ئەو هۆنراوە پڕ لە بێگانەپەرستییانە، نەک هەر جێگەی نەنگییە، بەڵکوو، زۆر جێگەی نەنگییشە، گەر هۆنەرێ هۆنراوەیە بۆ خوێنەرێ و بکوژەکەی خۆی بهۆنێتەوە. گەر نووسەرێ، چەن دێرێکی جوان بۆ سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکەی بنووسێ و پێیاندا هەڵدا. چونکە، جگە لەوەی ئەوان بە دوژمن و داگیرکەر دادەنرێن، هێشتا، هیچیشیان بە کورد نەداوە، تا هۆنەرێ یا نووسەرێ، شتێکی لەو بابەتانەیان بۆ بنووسێ. بەڵام، هەر کوردێ، مەلاشووی بە بیری چەوت و ڕزیویی « عێراقچێتیی » هەڵدرابێتەوە، ماوەیە لە سنگەری ناپاکییدا گیرسابێتەوە، ئایا دەبێ، لەوە پتر چاوەڕوانی چی دیکەی لێ بکرێ؟ لەو ژار و زوخاوانە پتر، چی دیکە هەڵڕێژێ؟! بۆیە، کاتێ مرۆڤی کورد، باوەڕ و ویژدانی نەتەوەیی خۆی پێشێلکرد، هەموو شتێکی پیرۆزی، لە بیر خۆی بردەوە، ئامانجێکی دیاریکراوی نەبوو، لە پێناویدا بژی و بمرێ، زۆر زیاتر لەو « فەتوا »یانەی « بەرزنجیی »، خراپتریش دەدا!

## 39/3. ڕەخنە یا تاوانبارکردن :

پاشان نووسیویەتی: (دیارە ڕاوبۆچوونەکانمان بەکێش و ترازووی ئەمڕۆیە، چونکە نووسەری ئەو باسە، زێوەر بەوشێوەیە تاوانبار دەکات:)«34،3» لە ڕاستییدا، من « زێوەر »م تاوانبار نەکردووە و تاوانباریشی ناکەم. بەڵکوو، ڕەخنەم لە هێندێ لە

هۆنراوه « عێراقچێتیی »یەکانی گرتووه. چونکە، تاوانبارکردن و ڕەخنەلێگرتن، دوو شتی جیاوازن. بۆ نموونە: لەوانەیە، کەسێکی دیاریکراو، کارێکی خراپی نەکردبێ، بێ گوناح بێ، کەچیی، تاوانباریکەن. یا هەر بە کردەوە، ئەو کارە خراپەی کردووە و لە سەری سەلماوە. بەڵام، « زێوەر » خۆی ئەو هۆنراوانەی گوتووە، کارەکە کراوە و تەواوبووە. هەڵبەتە، کەسیش بە زۆر ئەو هۆنراوانەی پێ نەگوتووە. بەڵکوو، بە ئارەزوو و ویستی خۆی گوتوونی. ئەگینا، هەر لەو سەردەمەدا، هۆنەرێکی لاهوتیی وەک « بێخوود » ژیاوە. نەک هەر وەک ئەو، هۆنراوەی بۆ شا « فەیسەڵ »و « عێراق » نەگوتووە، بەڵکوو، کاتێ ساڵی « 1921 »یش، دەربارەی دیاریکردنی چارەنووسی عێراق، پرسیاریان لێ کردووە، زۆر بە ڕاشکاویی، بە دوو نیوەدێڕ هۆنراوەی تورکیی، پوختەی باوەڕی خۆی دەربڕیوە و گوتوویەتی:

پر توی رایم بودر « بیخود » قوی اولسن منجلی

عنصرم کورد اولدغیچن استمم بن فیصلی

واتە: (ئەمە پوختەی بیروباوەڕمە، با ئاشکرا و دیاری بێ ئەی « بێخود »! مادەم من ڕەگەزم کوردە، فەیسەڵم ناوێ. )« 160،5 »

## 40/3. ئازادیی یا سەرلێشێواویی؟

« بەرزنجیی »، هەر بەوەشەوە نەوەستاوە، بە ناوی ئازادیی نووسینەوە، بە هەڵە داکۆکیی کردووە، نموونەی هۆنەرێکی دۆستی فاشییەکانی هێناوەتەوو و نووسیوێتی: (جگە لەمەش، هەر نووسەرو شاعیرێ، لەهەر کاتێکابێ، سەربەستە لەو ڕوداو دیاردەیەی کاردەکاتە سەری و بەشێوەیە لەشێوەکانی « هونەر » دەیخاتەڕوو، « ئەزرا پاوند » شاعیری ئەمریکی هەواداری فاشیزمەکان، وای حەز لێبووە کە شیعر بۆ ئەوان بڵێ، ئەمەش نەبووە هۆی ئەوەی لە1948دا هەڵبژێرێ بۆ پاداشتی بۆ لینکتز لەولاتەکەیدا.)« 34،3 »

بەڵێ، ڕاستە، هەموو نووسەر و هۆنەرێ، تا ئەندازەیەکی زۆر ئازادە، لەوەی دەینووسێ. بەڵام، بە هیچ شێوەیەکیش نابێ، ڕێگە لە چاوی تیژی سانسۆری ڕۆڵە دڵسۆزەکانی گەلیش بگرێ، ڕەخنەی لێ بگرن. چونکە، ئەوانیش بۆیان هەیە، بەرهەمەکەی هەڵسەنگێنن و هەڵەکانی بۆ ڕاسکەنەوە. لەبەرئەوەی، نووسەر و هۆنەر، بە تەنیا بۆ خۆیان نانووسن، بەڵکوو، بۆ ڕۆڵەکانی گەل دەنووسن. گەر بەرهەمی خراپ بڵاوکەنەوە، لە بەرژەوەندیی باڵای گەلدا نەبێ، ئەوا زۆر پێویستە، نەک هەر ڕەخنەیان لێ بگرن، بەڵکوو، لەقاویشیاندەن، دەسەکانیان بۆ جەماوەر

ئاشكراكەن. چونكە، دوور نییە، هێندێ نووسەر و هونەر، بە دەستی لایەکی دیکە، ئەو بەرهەمانە بنووسن و بڵاویکەنەوە، یا لایەنێکی گومانلێکراوی لە دواوە بێ! بۆیە دەبێ، ئەو دەس و لایەنانە ئاشکرا و ئەو بەرهەمانەش پوچەڵکرینەوە.
نموونەی « ئەزرا پاوند »ی هونەری ئەمێریکایی هێناوەتەوە، کە حەزی لێ بووە، هونراوە بۆ « فاشیزم » بهۆنێتەوە. بە ڕاستیی، جێی پێکەنینە، لە لایەکەوە، لە نێوان « زێوەر » و ئەو هونەرە، لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێوان کوردستان و ئەمێریکادا، بەراوردبکرێ! کوردستانێ، تا ئەورۆ بندەستی دەوڵەتی عێراق بێ، بۆنی خوێن و بارووتی لێ بێ. ئەمێریکایەک، یەکێ لە دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهان بێ، نزیکەی دووسەد ساڵێ بێ، هالاوی ئازادیی و دێمۆکراسیی لێ هەڵسێ، ئایا، چۆن دەکرێ، بەراورد لە نێوان ئەو دوو وولات و سیستێمەدا بکرێ؟
تەنانەت، گەر یەکێکی وەک « ئەزرا »ش، هونراوەی بۆ « فاشیزم » دانابێ، خۆ بەو کارەی، زیانی بە سەربەستیی و سەروەریی نیشتمانەکەی نەگەیاندووە؟ فاشییەکان وولاتەکەیان داگیر نەکردووە؟ تالاوی داگیرکردن و چەوساندنەوەی نەچێشتووە؟ چونکە، تەنیا هەر لە دوورەوە، دوای بیری « فاشیزم » کەوتووە، گەر لە نزیکەوە بیناسینایە، کردەوە خراپەکانی ببینینایە، هەڵبەتە، ئەو هونراوانەی بۆ نەدەهۆنینەوە.
جگە لەوەی، گەر هەر هەمان « ئەزرا »ی هونەر، لەو سەردەمەدا، لە چەن وولاتێکی وەک « ئەورووپای ڕۆژهەلات » بژیایە، ئایا دەیتوانی، نەک هەر هونراوەیەک بۆ « فاشیزم » بلێ، بەڵکوو، سەریش هەڵبڕێ؟ کەواتە، پێویست ناکا، بەراوردێ بکەین، کە لە هەموو ڕوویەکەوە هەڵەبێ. بە هەڵەی هونەرێکی دیکە، ڕوخساری دژێوی هونراوە « عێراقچێتیی »یەکانی « زێوەر » ئارایشتکەین و برازێنینەوە! ئەمەش، وەک « بەرزنجیی » تێیگەیشتووە، نیشانەی ئازادیی نییە، بەڵکوو، بە سەرلێشێوایی دادەنرێ.

## 41/3. لێکۆڵینەوەی ئەکادێمیایی :

لێکۆڵینەوەی ئەکادێمیایی، لە هەر بوارێکی ژیاندا بێ، دوو شێوەی جیاواز بە خۆیەوە دەبینێ. یا وەک « بەرزنجیی » نووسیویێتی: (لەلێکۆڵینەوەماندا لەبەرهەمی هەر شاعیرو نووسەرێ دەبێ لەهەمو لایەنەکانی زاتی و مەوزوعی خاوەنەکەی بکۆڵینەوەو لەگەڵ بارو ڕەوشی سەردەمەکەدا لێکیان دەین.) «34،3»، یا، بابەتێکی پچووک وەردەگرین و لێی دەکۆڵینەوە. بۆ نموونە: دەتوانین، لێکۆڵینەوەیەکی وێژەیی ئەکادێمیاییانە، تەنیا لە سەر، ژن لە هونراوەی هونەرێکی دیاریکراودا

بکەین. ئیدی، ئەو کاتە هیچ پێویست ناکا، پەل بۆ هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیان و بەرهەمی ئەو هونەرە ڕاکێشین. ئەمە، لە توێژینەوەی زانستانەشدا هەر وایە. بۆ نموونە: بە سەدان خوێندکاری خوێندنی باڵای « ماجستێر و دوکتۆرا »، کار لە سەر یەکێ لە بەرهەمەکانی « شیر، پەنیر، ئاو، خۆڵ، میوەیەکی دیاریکراو، سەوزە، گەنم، ئاسن، شووشە ... تاد » دەکەن. بەڵام، هەر یەکەیان، لە یەکێ لە خەسڵەت و دیاردەکانی ئەو کەرەسە دیاریکراوە دەکۆڵنەوە، نەک هەموو لایەنەکانی باسکەن و لێی بتوێژنەوە. جاری وا هەیە، چەن خوێندکارێ، لە سەر یەک کەرەسە و بابەتی دیاریکراو کاردەکەن، بەڵام، هەر یەکەیان لە بەشێکی کەمی ئەو بابەتە دەکۆڵێتەوە. بۆ نموونە: لەو ئینستیتووتەی دەمخوێند، تەنیا هەر لە سەر کارتێکردنی کەرسەی کیمیایی، لە « گەنمەشامیی »، چوار خوێندکار کارماندەکرد و یەک مامۆستامان هەبوو. بەڵام، هەر یەکەمان، بەشێکی ئەو کارتێکردنەی وەرگرتبوو. وەک کارتێکردنی لە « گەورەبوونی خۆی، ڕووەکەکانی دەوروبەری، پەلەوەر، پیسکردنی ژینگە » ئیدی، چ پێویستدەکا، گەر تەنیا باسی لایەنی « عێراقچێتیی »، هێندێ هۆنراوەی « زێوەر » بکەم، پەل بۆ « لایەنەکانی خودیی و بابەتیی » هونەر ڕاکێشم؟!! یا باسی ئەوە بکەم، نووسەران و هونەرانی کورد، باری سەرنجیان بەرانبەر بەو چۆن بووە؟ یا هەڵەکانی هونەرانی دیکەش، بە هەڵەکانی هونەر بەراوردکەم؟ ئەوانە، نە بە کەرەسەی ئەو لێکۆڵینەوەیە دادەنرێن، نە بە کەڵکی ئەو جۆرە کارانەش دێن!

## 42/3. تایبەتیی و گشتیی :

نموونەیەکی نابەجێی دیکەشی هێناوەتەوە، گوایە: (« بشار بن برد »ی شاعیری سەردەمی عەبباسی، شیعری لە هەجوی « مەئموون »دا هەیە کەسوار پورەکانی خۆی دەبێ و باس لەرابواردنێکی فاحیشانەی خۆی دەکات لەگەڵ کچێکی جوانی ناو کۆشکدا.. ئەم شیعرانەی هەیەو ماوەو لێیشی کۆڵراوەتەوەو ئێستا شارەزایان و ڕەخنەگران « رد الاعتبار » بۆ ئەو شاعیرە بێننەوە.)«34،3» هەڵبەتە، هەر زوو فریای خۆی کەوتووە، لە نموونەکەی خۆی باش گەیشتووە. بۆیە هەر پاش ئەوە گوتوویەتی: (لەوانەیە نووسەر بڵێ: ـ جیاوازن،. ئەمە پەیوەندی بەکەسانێکەوە هەیەو ئەوە بەمیللەتێکەوە؟)«34،3»

جگە لەوەش، ئەوەی « بەشار » باسیکردووە، کارێکی بێ ڕەوشتیی بووە، کردەوەی یەکێکی وەک « مەئموون »ی لەقاوداوە. شتێ بووە، پێوەندیی بە باری تایبەتیی تاکە کەسێکەوە هەبووە. بەڵام، ئەو هۆنراوانەی « زێوەر » بە کێشە و باسی

پەروەردەکردنی نەوەیەک و بە شتێکێ گشتیی دەژمێررێ. وەک کەرەسەیەکی بیر و وێژە، نەوەکانی دوارۆژ، کەڵکی لێ وەردەگرن. ئەوەتە، یەکێکی وەک « بەرزنجیی »، داکۆکیی لە هەمان باوەڕی چەوتی « عێراقچێتیی » کردووە. چونکە، کاتی خۆی بە هەمان بیر پەروەردە و گۆشکراوە! ئەوە لە بری ئەوەی، زۆر ئازایانە بیگوتایە: ڕاستە، « زێوەر » بە هەڵەدا چووە. منداڵانی کورد، پێویستییان بەو جۆرە هۆنراوانە نییە. بۆیە، ئەو هۆنراوە زۆڵەکانەی گوتووە، ویستوویەتی، سەر لە ڕۆڵەکانی کورد بشێوێنێ، لە بری کوردستان، ناوی « شیمال » و « عێراق » یان فێرکا، شا « فەیسەڵ »یان لا خۆشەویستکا، « ئاڵا »کەیان لا پیرۆزکا، بیری چەوتی « عێراقچێتیی »یان، لە دڵ و دەروونددا بڕوێنێ!

### 43/3. ئەحمەد موختار جاف :

دەربارەی کارکردنی « ئەحمەد موختار جاف »، لە دەزگەکانی بەڕێوەبەرێتیی ئینگلیزەکاندا، نووسیوێتی: (ئەحمەد موختار جاف: هەڵوێست و مامەڵەی لەگەڵ دەسەڵاتی دوای شێخ ئاشکرابوو، میجەرسۆن کردیە قایمقام و دوایی قازی سلێمانی، شێخ لێی رەنجا، سزای دا، شیعرەکەیان خستەڕوو کەبۆشێخی ناردبوو، هەربە هۆی نێزیکی لەدەسەڵاتەوە کرایە ئەندامی پەرلەمانی عێراقی.) «35،3».

من هەرگیز، باسی پلەوپایەی هۆنەرانم نەکردووە، تا بڵێین: فڵان هۆنەر، یا نووسەر، چ کارێکی لە دەوڵەتی عێراقدا وەرگرتووە. چونکە، ئەوە بە کارێکی ئاسایی دادەنرێ. هەموو یەکێ لە سنووری دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانی داپڕیکراودا بژی، گومانی تێدا نییە، دەبێ، کاریکا. بەڵام، باسی ئەوەم کردووە، هۆنەر ئەو هەموو هۆنراوانەی بە خۆڕایی بۆ « عێراق، ئاڵا و شا »کەی داناوە! جا، هەر لەو ڕوانگەیەوە، با « ئەحمەد موختار»، بە « قایمقام »یدا تێپەڕبووبێ، تا بە ئەندامی « پەرلەمانی عێراق »یش گەیشتووە. گرنگ ئەوەیە، یەک هۆنراوەی لەو بابەتانەی نەگوتووە! جگە لەوەی، ئەو پێی وابووە، ئینگلیز لە تورک و عەرەب باشترە، بۆیە، هاوکاریی لەگەڵدا کردوون. بریا ئەو جۆرە بیرە، لای « شێخ »یش، چەکەرەی بکردایە! باوەڕ ناکەم، ئێستە ڕۆژمان بەم ڕۆژە بگەیشتایە!

جگە لەوەی نازانم، بۆ دەبێ، نەنگیی بێ، گەر یەکێکی وەک « جاف »، کاری لە دەسەڵاتەکەی دوای « شێخ »دا کردبێ؟! گەر خۆی هەر لە سەرەتاوە، باوەڕی بە « بریتانیا » بووبێ. خۆ تەنیا هەر ئەو، کاری لەگەڵ ئینگلیزەکاندا نەکردووە و پۆستی گرنگی وەر نەگرتووە. بەڵکوو، بە دەیان کوردی نیشتمانپەروەری دیکە، چ

له سەردەمی دەسەلاتی « شێخ » و چ لە سەردەمی دوای دەسەلاتی ئەویشدا، ئەو پۆستانەیان هەبووە. وەک خۆی بە دڵسۆز ناویبردوون و نووسیوێتی: (سەعید قزاز، رفیق حیلمی، ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی، مەعروف جیاوک، ئەحمەد موختار و سالح زەکی و دەیان دڵسۆزی تر لە وەزارەتەکان و ناوچەکاندا کاربەدەست بوون.) «33.3».

دیارە، قسەکەی خۆی بیرچۆتەوە، وا تەنیا باسی « جاف »ی کردووە و ناڕاستەوخۆ، تانووتی لێداوە. چونکە، ئەوەتەی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان دامەزراوە، کورد هەر لە بندەستی ئەواندا بووە و لە یەکێ لە بەڕێوەبەرێتییەکانی ئەو دەوڵەتانەشدا کاریکردووە. جا ئەو سەردەمە، سەردەمی دەسەلاتی شاکانی ئێران و سوڵتانەکانی عوسمانیی بووبێ، یا سەردەمی خەلیفەکانی عەرەب بووبێ، بۆ کورد هیچی لە باسەکە نەگۆڕیوە. چونکە، کورد خۆی خاوەنی دەوڵەتێکی تایبەتیی نەبووە، تا ڕۆڵەکانی کار لە دەوڵەتەکەی خۆیاندا بکەن!

## 44/3. بێ ئاگایی :

وەک « بەرزنجیی » نووسیوێتی: (نووسەر ناوی هەندێ لەو شاعیرانەمان بۆ دێنێ کەهاوچەرخی زێوەر بوون بەلام بەقسەی ئەو، تاکە یەک هۆنراوەیان بۆ عێراق و مەلیکەکەی نەوتووە! هەر چەندە ئەم ڕایە لەبێ ئاگایی یەوەیە، بەلام بەپێی توانا «وەک نمونە » باس و خواستێ لەهەندێ لەوانە دەکەین. بەبێ ئەوەی ئەم نمونانەی دەیهێنینەوە ببنە لەکەدارکردنی پایەو ئاستی ئەدەبی و کەسایەتیان، ئەوانە هەموو گوڵی ڕەنگاوڕەنگی دامێنی چیای بەرزی ئەدەبەکەمانن و جێگای شانازین.) «35.3».

حەزدەکەم، « بەرزنجیی » زۆر لەوە دڵنیابێ، ئەو زانیارییانەی لە سەر « زێوەر » و هێندێ هۆنراوەی « عێراقچێتیی » هۆنەرە کوردەکانی دیکە کۆمکردونەتەوە، هەر وا بە خۆڕایی دەسم نەکەوتوون و لە بێ ئاگاییەوە نییە. چونکە، پتر لە دوو ساڵ دەبێ، خۆم بەو باس و لێکۆڵینەوەیەوە خەریککردووە. گەلێ زانیاریی پڕ بایەخم، لە سەر کۆ کردوونەتەوە.

بەڵێ، زۆر باشیش دەزانم و ئاگاداریی ئەوەش هەم، هۆنەرەکانی کورد هەموو، وەک یەک بیریان نەکردۆتەوە. بەڵکوو، دید و بۆچوونی جیاوازیان هەبووە. هەڵوێستی جیاجیان وەرگرتووە. کردەوەی جۆراوجۆریان نواندووە. هەڵبەتە، پەنجەکانی دەسیش وەک یەک نین، ئیدی، بۆ گلەیی لەوان بکەین؟!!

هێندێ هۆنەر هەبوون، دوای ئەوەی شۆڕشەکانی « شێخ مەحموود » تەواوبووە، بە لای ئینگلیز و دەوڵەتی عێراقدا بایانداوەتەوە. یا هێندێکیان هەر لە سەرەتاوە، باوەڕیان بە ئینگلیز هەبووە. لەبەرئەوە، هێندێ هۆنراوەیان بۆ نوێنەرەکانی ئینگلیز و سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، چ پێش کۆدەتاکەی « 1958 » و چ پاش ئەوەش گوتووە. هەر یەکەش، ئەم کارەی، لە گۆشە نیگای باوەڕ و بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیەوە کردووە. وەک: « مەحویی، زێوەر، حەمدیی، پیرەمێرد، قانع، موفتیی، ا.ب. هەوریی، فەوزیی، ناریی، هێمن، برایم ئەحمەد، گۆران ... تاد » جگە لە « ناریی و هێمن »، هەموو هۆنەرەکانی دیکەی ناومان بردن، خەڵکی شاری « سولەیمانیی » و دەوروبەرەکەی بوون. هەر چەندە، ئەو شارە شیرینە، وەک مەڵبەندێکی « ڕووناکبیریی و شۆڕشگێڕیی » کورد، نەک هەر کورد، بەڵکوو، تەنانەت دوژمنانیش ناتوانن، نکوولیی لە ڕۆڵی گەورە و لەبەرچاوی بکەن. بەلام، لە ڕاستییدا، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆش، چەن خەسڵەتێکی خراپی وەک: « بادانەوە، چاولێکەریی، ئیرەیی و کەللەڕەقیی »یان هەیە. هۆنەرێکی ناسراوی وەک « حەمدیی »، خەڵکی شارەکەی خۆی باش ناسیوە، هەم بە باشە ناوی بردوون، هەم گللەیی لێ کردوون و لە دەسیان هاواری لێ هەستاوە. بۆیە، زۆر چاکی فەرمووە، کاتێ گوتوویەتی :

هەر ببێ ڕەبیی سلێمانی، بمێنێ قەومی کورد
وەرگەڕان، بادانەوە، ئیشی ئەوانە دەستوبرد
قەت نەترس و هیچ نەپرس و موستەقیم و موتتەفیق
زیرەک و چالاک و لێدەر، عادەتا ئەمسالی کورد
هەر بە « لام باشە » موحەققق بوو، کە باش و بێ غەشن
گەورەکانی تا ببێتە خاتری ئەصنافی کورد

لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:

« حەمدیی » لەککەی شانی ئەم قەومە لە دنیادا چییە
دوو سەگی پیسی ڕەزیلە، کاشکێ هەر دوو ئەمرد «243،16»

پاشان، بە تاکە دێڕێ هۆنراوە، بێزاریی خۆی دەربڕیوە و گوتوویەتی:

من لە ناو ئەم کوردەدا چونکە، ئەزاکەتیان نییە
حەزنەکەم، دەنگم بنووسێ بەڵکە، دەنگم دەر نەیە «187،16»

جا، هەر بە ڕاستیی، ئەو خەسڵەتە خراپانە، لە هەموو سەردەمێکدا، لە خەڵکی شارەکەدا هەبووە. بۆیە، شتێکی سەیر نییە، گەر زۆربەی ئەو هۆنەرانەی ناومان

بردن و هۆنراوەیان بۆ سەرانی داگیرکەرانی کوردستان گوتووە، خەڵکی ئەو شارە قارەمانە بووبن!

## 45/3. دوو بـــــــەرە :

« بەرزنجیی »، لە زمانی « محەمەدی مەلا کەریم »ەوە، کـۆمەڵێ لە خەسڵەتەکانی « قـانع »ی باسکردووە. خـۆشی باسی هـەژاریی و نـەبوونیی کـردووە. پاشـان نووسیوێتی: (لەناوەڕساتی چلەکاندا ئومێدی بەمام ئینگلیز پەیداکردو شیعری بۆ وت.)«40،3».

1. گەر« قانع »، هۆنراوەی بۆ ئینگلیز گوتبێ، بە هیچ شێوەیە، ئەوە ناگەیەنێ، ئەو خەسڵەتانەی خۆی لەدەسداوە. چونکە، ئەو بە ڕاستیی وا بوو. کوردێکی دڵسۆز و هۆنەرێکی خەمخواری کورد بوو!

2. کارێکی زۆر ئاساییە، نەک هەر « قانع »، بەڵکوو، هەر هۆنەرێکی کورد، گەر هۆنراوەی بۆ ئینگلیز گووتبێ. چونکە، مێژوو سەلماندی، ئەوان لە هیچ وڵاتێکی جیهاندا، تا سەر داگیرکەر نەبوون، بەڵکوو، ماوەیە ماونەتەوە. جا بە هەر شێوەیە بووبێ، پاشان گەڕاونەتەوە. دوای خۆشیان، کەلتوور و شارستانێتییان جێ هێشتووە. ئەوەی « قانع » لەو ڕۆژەدا گوتوویەتی، گوایە: « ئینگلیز» لە « هێتلەر » چاکترە، نەک هەر ئەو کاتە، بەڵکوو، ئێستەش و تا مرۆڤێ لە سەر ئەم ڕووی زەوییە بمێنێ، هەر ڕاستە. گەر، لە هەر سەردەمێکی مێژوویی دیکەشدا، جەنگێکی دیکە، لە نێوان هەر دوو بەرەی « فاشیزم » و « دێمۆکراسیی »دا ڕوویدا، هیچ گومانی تێدا نییە، بە هەموو شێوە، و توانایەکەوە دەبێ، پشگیریی بەرەی « دێمۆکراسیی » و دژایەتیی بەرەی « فاشیزم » بکرێ.

ئایا « بەرزنجیی » دەیویست، « قانع » وەک « ئەزرا پاوند »، هۆنراوەی بۆ بەرەی « فاشیزم » بگوتایە، پشگیریی « هێتلەر» و « مۆسۆلۆنیی » بکردایە؟ نازانم، چۆن ماوەیە هەوای « مارکسیزم ــ لینینزم »، دواتریش، « ماویزم » لە کەللەی مامۆستای دابوو، گەرمە گوتاری لە سەر « شەڕی چەتەگەریی » دەنووسی، گەر ئێستە، بەو شێوە ئاوەژووە بیریکاتەوە؟!! ئاخر، بۆیە چارەنووسی ئەو باوەڕ و فەلسەفەیەش، بەو ڕۆژە گەیی، چونکە، دوو مامۆستای ڕووناکبیر و شۆڕشگێڕیی وەک « بەرزنجیی » فەریکە کۆمۆنیست بوون!

جگە لەوەی « قانع »، بەو کەمە خوێندەوارییەی خۆیەوە، زۆر باش بۆ کێشە و گرفتەکان چوویوو. زۆر باشیش، لە ئینگلیز گەیشتوویوو. هەر چەندە، یەکێکی وەک « بەرزنجیی » پێی قاڵدەبێ، هۆنەر هۆنراوەی بۆ ئینگلیز گوتووە! ئایا، ئەو

کاتە، ئینگلیز بە تەنیا هەر کوردستان، یا هەموو عێراق و باشووری کوردستانیشی داگیرکردبوو؟ چونکە، ئەو کاتە، هێشتا عەرەبەکانیش، سەربەخۆیی تەواویان نەبوو، چاوی ئینگلیزیشیان لێ دیاربوو، ئینجا ئاواشیان بە کورد دەکرد. ئەدی، گەر هەر لە سەرەتاوە، « بریتانیا » نەبووایە، چییان بە سەر کورد دەهێنا؟ « قانع » لەو هۆنراوەیەدا، باسی « عێراقچێتیی » نەکردووە. وەک « بەرزنجیی » بە هەڵە تێیگەیشتووە! هۆنەر، باسی جەنگی دووەمی جیهانیی کردووە، کە چارەنووسی نەک هەر کورد، بەڵکوو، هەموو کۆمەڵگەی مرۆی پێوە بەسرابوو، لە بەر دەم هەڕەشەیەکی ترسناکدا بوو. گومانی تێدا نییە، « قانع » هەر دەبوو، پشتگیریی ئینگلیز بکا. بریا، ئەو سەردەمە هەموو کورد، وەک ئەو بیریان بکردایەتەوە! لەبەرئەوە، زۆر چاکی بۆ چووە، کاتێ گوتوویەتی:

خەنجەر راست ئەکەیت، ئەزانم وایە
سێبەری ئینگلیس، هەر وەک همایە
بەلام ئینگلیسیش، کەڵکی لێت ئەوێ
بێ کەڵک کوردن دەست ناکەوێ «41.3»

دەردی « جەلال تاڵەبانیی »، ڕۆژی « 1999/08/31 » لە « تاران »، پێی گوتم: ئێمە، جاران دژی ئینگلیزەکان خەباتماندەکرد. داوامان لێ دەکردن، لە « عێراق » دەرچن. کەچیی، ئێستە، خواخوامانە بگەڕێنەوە. خۆمان بە دوایاندا دەچین و داوایان لێ دەکەین، بگەڕێنەوە. ئایا ئەوە چی دەگەیەنێ؟ با جارێ لەوە گەڕێین، بڵێین: « قانع » و هەموو ئەوانەی باوەڕیان بە ئینگلیز هەبووە، زۆر باش بۆ کێشە و باسەکان چوون. بەلام، ئایا مێژوو ئەوەی نەسەلمان، کە ئینگلیز وەک نەتەوەیەکی ئەورووپایی پێشکەوتوو و دیمۆکراسیخواز، گەلێ لە نەتەوە دواکەوتووە کەللە ڕەقەکانی « تورک، فارس و عەرەب » باشترن؟

پاشان دەبێ، بزانین، « قانع » ئەو هۆنراوەیەی بۆ گوتووە؟ بۆ پشتگیریی ئینگلیزی کردووە؟ هەڵبەتە، ئینگلیزەکان ڕاستەوخۆ داگیرکەری عێراق و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش، داگیرکەری کوردستانیش بوون. بەلام، کاتێ « بریتانیا »، لە جەنگەکەدا هاوبەشی دەوڵەتێکی وەک « یەکێتی سۆڤێت » بووە، « قانع »ی هۆنەریش، لەو بیر و ئایدۆلۆژیایەوە نزیکبووە، شتێکی زۆر ئاساییە، گەر بەو گەرمییەوە، هۆنراوەی بۆ گوتبن، بە سەریدا هەڵدابن، ئەوەش، مافێکی سروشتیی خۆی بووە. هەروەها، کاتێ ئەو هۆنراوەیەشی گوتووە، دوور نییە، لە ژێر کارتێکردنی دیدەکانی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » بووبێ!

باشـە، گـەر هۆنراوەی بۆ ئەوان نەگـوتایە، کـە باوەڕی پێـیـان هـەبـووە، ئەدی بۆ لایەنەکەی دیکەی بگوتایە؟ گەر بەو شێوەیە، هەڵوێستی وەرگرتایە، ئێستە، چییان پێ دەگوت و چۆن ڕەخنەیان لێ دەگرت؟ هۆنەر، لە نێوان دوو بەرداشی جیاوازی بەرەی « فاشیزم و دیمۆکراسیی »دا بووە. ویستوویەتی، هەڵوێست وەرگرێ. گەر ئەو هەڵوێستە ڕاستەی وەر نەگرتایە، ئەدی لە نێوان ئەو دوو بەرەیەدا، وەک کەری جۆگەکە، لە هەر دوو بەری بخواردایە! باوەڕ ناکەم، ئەو کارە دزێوە، لە دەس هۆنەرێکی نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕێکی وەک ئەو بهاتایە. چونکە، ئەو لە پێناوی کێشەیەکی بەرز و پیرۆزدا، ژیاوە و مردووە! کەواتە دەبووایە، کام بەرەی هەڵبژاردایە؟

دوای ئەوەی، نموونەی هۆنراوەی چەن هۆنەرێکی کوردی هێناوەتەوە، نووسیوێتی: (هەڵچوون و دەمارگیری دەبێ وەلانرێ، هۆش و بیری کامڵانە وەگەڕخرێ، لەئاستی ئاوها بەرهەمێکی شاعیرێکی گوندنشینی نەدارای دڵ پڕ لە عەزرەتی ساتێکی خۆشی و حەواندنەوە بۆ ئەو قەومە داماوەی لەوڵاتێکی بریناری پەل و پۆ شکاوی بەستراو بەحوکمەتێکی داردەستی ئەو ئیمپریالیزمەی کە هەرچی فاک و فیکی خۆیەتی بۆ داشۆرینی هۆش و گۆشی خەڵکەکەی بەکاردەهێنا، تا بزانن هەر خۆی باشەو ئاقیبەت هەر خۆی بەدەستە.)«44-43،3»

جارێ دەتوانم، مژدە بە « بەرزنجیی » بدەم، بە هیچ شێوەیە، ئیرەیی بەو جۆرە دارشتن و ڕێنووســە نابەم! پاشــان، ڕەخنە لە بـەرهـەمـی هۆنەرێکی وا نـاگـرم. بەڵکوو، وەک ڕوونمکردەوە، دەســخــۆشــانەی لێ دەکــەم. تەنانـەت، ڕەخنەم لەو بەرهەمەی « زێوەر » یش نەگرتووە، کاتێ هۆنراوەی دژی « فاشیزم » نووسیوە و بە سەر « بریتانیا »شدا هەڵیداوە!

بەلام، « بەرزنجیی » ویستوویەتی، ئاستی هوشیاریی « قانع » بە نزم پیشاندا، گوایە: هۆنەرێکی گوندنشینی وەک ئەو، بە درۆی ئینگلیزەکان هەڵخەڵەتاوە، هۆشیان داشۆریوە. بۆیە، وای زانیوە، هەر ئەوان باشن و هۆنراوەی بۆ گوتوون! ئەم لێکدانەوە کێرە، زۆر لە ڕاستییەوە دوورە. چونکە، هۆنەر بە هەموو دڵێکەوە، ئەو هۆنراوەیەی بۆ بەرەی دیمۆکراسیی و ئازادیی گوتووە و باوەڕێکی تەواویی پێیان هەبووە. بەرەی فاشیزمی بە چاکی ناسیوە. نەک وەک « بەرزنجیی » دەیەوێ، پاکانەی بۆ بکا، خوێنەر وا تێبگەیەنێ، گوایە، هۆنەر گوندنشینێکی بێ ئاگابووە. هەست و سۆزی جوڵاوە و ئەو چەن دێرە هۆنراوەیەی بۆ هۆنیوەتەوە، بێ ئەوی، لە باوەڕەوە گوتبێتی! جا، گەر وا بووایە، خۆ چەن هۆنەرێکی ناسراوی

وەک « پیرەمێرد، حەمدیی ... تاد » خەڵکی شار بوون، زۆر ڕووناکبیریش بوون، ئەدی ئەوان بۆچی، هۆنراوەیان بۆ ئینگلیز گوتووە؟!!
ئینجا، ڕووی دەمی پرسیاری تێدەکەم و دەڵێم: ئایا، عەرەبەکانی عێراق زیانیان لەوە کرد، ئیمپریالیزمێکی وەک « بریتانیا »، خاکەکەی داگیرکردن، لە بندەسیی تورکەکان ڕزگاریکردن؟ ئایا، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە، دەوڵەتی بۆ دانەمەزراندن؟ جا خۆ گەر، ئەوان نەبوونایە، مەگەر هەر خوا بیزانیایە، کەی لە دەس ئەو تورکە خوێنڕێژانە قووتاریاندەبوو؟ کەی دەوڵەتی خۆیان دادەمەزران؟ ئەدی ئێمەی کورد، ساتێ بە ناوی ئایین و ساتێ بە ناوی کەللەڕەقیی و سەردانەنەواندن بۆ دوژمن، جگە لە ژێردەسیی و چەوساندنەوە، چیدیکەمان لە دژایەتیکردنی ئینگلیز و قازانجی دروشمی برایەتیی کورد و عەرەب دەسکەوت؟ بە ڕاستیی نازانم، مامۆستا « بەرزنجیی » چی گەرەکە؟
دوای ئەوەش، بە چەن دێڕێ، باسێکی کورتی باری ژیان و ڕەوشی کەلتووریی « قانع »ی کردووە و نووسیوێتی: (ئیتر لەحاڵەتێکی ئاوادا ئێمە دەبێ چی لەو پیاوە داوا بکەین؟ بۆچوون و تەحلیلاتەکانی چەرچڵ و ستالین و ماو؟ یا پرینسیپەکانی « بۆرە الثوریە » و شەڕی درێژخایەنی پارتیزانی؟! خۆ بەر لەوانە کوڕ لەسەرەتای بیستەکانەوە تەجرەبەی کردن و هەتا لە 1930دا بەربەرەکانی سەرجادەشی بەخۆوە بینی « شەشی ئەیلول ».)«44،3»
ئایا لێرەدا، ڕوی دەمی لە « قانع » کردووە و مەبەسی لەوە، یا هەر دەیەوێ، گوتارە کۆنەکانی خۆی، بیری خۆی و خوێنەر بێنێتەوە؟ چونکە، ئەو قسانە چ پێوەندییەکی بە سەر باسەکەمانەوە هەیە؟!!
جگەوە لەوەی نازانم، هۆنەر خۆی زۆر باش بۆ شتەکان چووە، بڕیاری خۆی داوە، هەڵوێستی مێژوویی خۆی وەرگرتووە. ئیدی، بۆ دەبێ، پەنا بۆ بەر شیکردنەوەی ئەو کەسانە بەرێ، کە ئەو ناویهێناون؟ دیارە، هەر لە ڕاستییدا دەیەوێ، سەر لە هۆنەریش تێکدا، ئەگینا، هەڵوێست وەرگرتن، لە ڕووداوێکی گەورەی لەو چەشنانە، وەک ڕۆژی ڕوون وایە و پێویستی بە تیوریی و ئامۆژگارییکردن نییە.

## 46/3. بیر یا پارت؟

دەربارەی بیری نەتەوەیی نووسیوێتی: (وەیان، بیرێکی نەتەوەیی تۆکمەو پاک، کە بەداخەوە هەر نەبوو و نیە..)«44،3»
بە ڕاستیی، ئەم قسە بێ سەرەوبەرانە، جێگەی پێکەنینە! چونکە، بیری نەتەوەیی هەر هەبووە، هەر هەشە و هەر دەشمێنێ! بەڵام، گەر بیگوتایە: پارتێکی نەتەوەیی

لەو سەردەمەدا نەبووە و ئێستەش نییە، ئەوا دەمانگوت: قسەکەی تەواوە. جگە لەوەی، ئایا، بیری نەتەوەیی، بۆ جۆرە کەسانێکە، داکۆکیی لە « عێراق » و بیری « عێراقچێتیی » بکەن؟!! یا بۆ جۆرە کەسانێکە، باوەڕیان پێی بێ و بە هەموو توانایانەوە، داکۆکیی لە بیری « کوردستانیزم » بکەن؟!! کەواتە، نە بیری نەتەوەیی، بە کەڵکی « عێراقچێتیی »یەکان دێ، نە وەک شیری بەرحی دایکی خۆشیان. پێیان حەلاڵ دەبێ!

## 47/3. جاش و ناپاک :

با بزانین، دواترچی نووسیوە: (جـا کـە « هەندێک » نیگەرانن لەباسکردن و خستنەڕووی ئەمانە، دیارە لە تێ ڕوانینی یەکلایی یانەوەیە بۆ شاعیرەکە، ئەوان دەیانەوێ قانیع هەر ئەوەبێ کەناسراوە، ئەمەش ئاواتە خواستنێکی ژیرانە نیە، چونکە قانیع کوڕو پیاوی ئەو بارو روکارو ژیانە سەختە تاریکە بووە کەتیا ژیاوە، ئیدی چۆن ئێمە هەر چاوەڕوانی قاقا کێشان و دەسڕ بادانی لی بکەین کورد دەڵێ: بەسکی برسی سەنگەر ناگیرێ. قانیعیش بەم شیعرانەی نەبووە بە «جاش» و نە بە « ناپاک »، ئەگەر ئەمڕۆش بیوتبان وابزان کۆمەڵانێکی هەر چنگ دەکەوت کەلەدەوری گرببینەوەو چەپڵەی بۆ بکوتن.)«45-44،3»

کورد دەڵێ: دەرزی لە چاوی خەڵکدا دەبینێ، بەلام، سوژن لە چاوی خۆیدا نابینێ! « بەرزنجیی » نووسیویتی: « ئەوان دەیانەوێ قانیع هەر ئەوەبێ کەناسراوە، ئەمەش ئاواتە خواستنێکی ژیرانە نیە » ئاخر منیش، هەر ئەو ڕەخنانەم لە یەکێکی وەک « زێوەر » گرتووە، ئیدی، بۆ ئەو دەیەوێ، هەر ئەو « زێوەر »ە بێ، کە ناسراوە و خۆی دەیەوێ؟ ئایا، ئەمە ژیرییە؟

پاشان، ئاوانی « جاش » و « ناپاکیی »، لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا، هێندە سووک و بێ بایەخ بووە، وەک پووش برنجی لێهاتووە. مرۆڤی کوردی ڕووناکبیر و بە ویژدان، کاتێ، گوێی لەو دوو زاراوە دزێوە ڕامیارییە دەبێ، قێزی لێ دێتەوە! چونکە، گەر کەمێ بە ئاخی مێژووی کورددا شۆڕبینەوە، هەر لە « ماد »ەکانەوە تا ئەوڕۆ، زۆر بە ئاشکرا دەبینین، « جاشایەتیی » و « ناپاکیی »، لە هەموو قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی کورددا، وەک کونی قۆڕ وابوون. بە تایبەتیی، لە سەرەتای دەسپێکردنی شۆڕشی « 11/سێپتێمبەر/1961 »ەوە تا ئەوڕۆ، زۆربەی زۆری کەسێتیی و ڕێکخراوەکانی باشووری کوردستان، بە ئاشکرا یا بە نهێنیی، هەر هیچیان نەکردبێ، گوژمێ جاشایەتییان کردووە. ناپاکییان لە نەتەوەی کورد و نیشتمانەکەیان کردووە. جا هەر لە تاکەتاکەی خەڵکەوە بیگرە، وەک سیخوڕ ج لە

ڕای خوا و چ لە پێناوی پارە و پلەوپایەدا بووبێ، تا بە سەرۆک تیرە و هۆز و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستانیش دەگا. بۆچی شتێ ماوە، ناوی کوردایەتیی و نیشتمانپەروەریی بێ؟!!

جا « جاشایەتیی » و « ناپاکیی »، هەر ئەوە نییە، مرۆڤ چەک هەڵگرێ و پێش سوپای داگیرکەری وڵاتەکەی خۆی کەوێ. بەڵکوو، گەلێ جۆری دیکەی هەیە. دەتوانم، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: هەموو ئەوانەی بە بیروباوەڕ، ڕاژەی نەخشە و پلانە گڵاوەکانی داگیرکەر دەکەن، لەوانە گەلێ تاوان و مەترسییان زیاترە، کە بە ئاشکرا چەک بۆ داگیرکەرەکە هەڵدەگرن. هەر هەمان زاراوەشیان بە سەردا دەچەسپێ. بۆیە، هەموو ئەو « ڕووناکبیر، نووسەر و هۆنەر »انەی، لە ڕاژەکردنی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقدا بوون، نازناوی « قەڵەمە خۆفرۆشەکان »یان بە سەردا بڕیبوون. وا بزانم، ئەوەش پڕ بە پێستی خۆیان بووە! چونکە، خواش هەڵ ناگرێ، دوو ڕووناکبیری نیشتمانپەروەر و جاش، دوو نووسەر و هۆنەری پاک و ناپاک، وەک یەک سەیرکرێن!

من هەرگیز نە گوتوومە و نە دەشیڵێم: یەکێکی وەک « زێوەر » یا « قانع » یا هەر هۆنەرێکی دیکەی کورد بێ، لەو سەردەمانەدا، ئەو جۆرە هۆنراوانەیان گوتووە، « جاش » بوون، یا « ناپاکیی »یان کردووە. چونکە، هەر دوو سەردەمەکە، زۆر جیاوازییان هەیە. ئەم « جاش قەڵەم »انەی ئەوڕۆش، لەگەڵ ئەو کەڵەپیاوانەی دوێندا، گەلێ جیاوازن. بەڵام، لە هەموو بار و ڕوویەکەوە، بەرهەمەکانیان، لە ڕێژکەی بەرژەوەندیی بیری « عێراقچێتیی » و دەوڵەتە داگیرکەرەکەی عێراق ڕژاوە. لە سەر خۆیان کەوتووە. زیانی بە ڕۆڵەکانی نەتەوەکامان گەیاندووە.

جا ئێستە، یەکێکی وەک « بەرزنجیی »، داکۆکیی لەو هەڵەوپەڵە چلکنانەی چەن هۆنەرێکی وەک « زێوەر » دەکا، ئەدی پێم ناڵێ، چۆن ئەو کەموکوڕییانە، لەگەڵ ناپاکییەکانی سەرانی کورددا بەراورددەکا؟ جگە لە « ئاودیوکردن، ژنکوشتن، داوێنپیسیی، تیرۆری ڕووناکبیر و هێندێ لە هێزە دژەکانی خۆیان، دزیی، وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان، جەنگی چەپەڵی نێوخۆ ... تاد » هەر ڕۆژە نا ڕۆژێکیش، لەشکری دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان، بۆ سەر یەکدی و بۆ سەر هێزە ڕامیارییەکانی دیکەی پارچەکانی کوردستان دێنن؟ خۆزگەم، « بەرزنجیی » هێندەی دەنگی دڵێرە، داکۆکیی لە هەڵەی کۆنی شەست هەفتا ساڵی مردووان دەکا، هێندە ئازایەتیی تێدا بووایە، هێندە کورد و نیشتمانپەروەر بووایە، بە ئاشکرا و بە ڕاشکاویی پێی دەگوتین: ئایا، چۆن ناکۆکییەکانی ساڵی

« 1964-1970 » هەڵدەسەنگێنێ، کاتێ، « پارتیی » دووڵەتبوو، وەک دووگۆڵیی، گۆڕەپانەکەیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکردبوو، لایەکیان لە سەر « عێراق » و لایەکەی دیکەشیان لە سەر « ئێران » بوو. هەمووشمان دەزانین، ئەنجامی گەمەکە، هیچ و هیچ دەرچوون. جگە، لە ماڵوێرانیی کورد و قازانجی دەوڵەتە داگیرکەرەکانیش، ڕۆڵەکانی کورد هیچیان دەس نەکەوت!

ئایا، چۆن جەنگی نێوخۆی دە ساڵەی نێوان ساڵانی « 1976-1986 » هەڵدەسەنگێنێ؟ لە لایەکەوە « بەعس » و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی دیکە دەیان کوشتین و لەنێویاندەبردین. لە لایەکی دیکەشەوە، سەرانی پارتەکانی باشوور، وەک پوازی کوردیی، یەکدییان دەبڕییەوە!

ئایا، هەڵوێستی نەتەوەیی، بەرانبەر بنەماڵەی « بارزانیی » و سەرانی « پارتیی » چی بوو؟ کاتێ، بە بیانووی چارمان نەبووەوە، هەر لە ساڵی « 1979 »وە تا ئەوڕۆ، سێ جار بە نۆرە، سێ سوپای جیاوازی سێ دەوڵەتی داگیرکەری « ئێران، عێراق و تورکیا »یان، بۆ سەر پێشمەرگە و بنکەکانی « دیمۆکراتی ئێران، یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، .P.K.K » هێنا!

ئایا، « یەکێتیی » چۆن توانی، لە شەو و ڕۆژێکدا، ئەو هێزە گەورەیەی « پارتیی » بە « کەرکووک »دا تا « هەولێر » ڕاونێ، گەر کۆمەک و یارمەتیی « ئێران » نەبووایە؟

ئایا، سوپای پاسدارانی « ئێران »، چۆن توانییان، لە بەر چاوی سەرکردایەتیی « یەکێتیی » و کورد، بە ناو شاری « سولەیمانیی »دا بڕۆن، خۆیان بگەیەننە نزیک شارۆچکەی « کۆیە » و تۆپبارانی بنکەکانی « دیمۆکراتی ئێران » بکەن؟

ئەدی پێمان ناڵێ: بۆچی دەبێ، « تاڵەبانیی و بارزانیی »، لە بستە خاکێکی کوردستاندا جێگەیان نەبێتەوە، لە خاکە وێرانەکەی خۆیاندا نەتوانن، پێکەوە هەڵکەن، پێکەوە دانیشن و گفتوگۆ بکەن؟! بەڵکوو، هەر جارەی لە پێتەخت و شاری دەوڵەتێ دانیشن، تا سەرانی داگیرکەر یا دۆستانی کورد، بە بەر چاوی هەموو جیهانەوە، ئاشتیانکەنەوە و بڵێن: کوردەکان تا دوێنێ بوو، « سەددام » قڕیدەکردن، ~~~~ ئەوەتە ئەوڕۆ، خۆیان لە یەکدی بەربوون و یەکدی دەکوژن!

ئەز، وەک ناسیۆنالیستێکی کورد، دژایەتیی هیچ جۆرە بیرێکی ڕەسەن و خاوەن فەلسەفە ناکەم. زۆر ڕێزی باوەڕ و ئایدۆلۆژیا جیاجیاکانی « ئیسلام، کۆمۆنیست، ناسیۆنالیست، دیمۆکرات، سۆسیال دیمۆکرات ... تاد » دەگرم. بەڵام، تا سەر مۆخ و ئێسک، دژایەتیی بیری گەندەڵی « تورکچێتیی، ئێرانچێتیی، عێراقچێتیی و سووریاچێتیی » دەکەم. دژی هەموو جۆرە، بێگانەپەرستییەک دەبمەوە. چونکە،

لە ڕووی بیر و ئایدۆلۆژیاوە، لەبەردەم ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم و ڕزگارکردنی کوردستاندا، بە یەکەم لەمپەر و بەربەستی دەسکردی دادەنێم. بە بیرێکی نامۆ و نارەسنی دەزانم. بیرێکە وەک گرتووخانەیەک وایە، هەڵگرانی دەیانەوێ، تاهەتایە، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمی تێدا بەندکەن. زۆر بە ڕاشکاوییش دەڵێم: بە هیچ شێوەیە، باوەڕم بە « برایەتیی » درۆزنانەی دەوڵەتی داگیرکەر و گەلی بندەس نییە. هەر کەسێکیش، بۆ هەر مەبەستێ بێ، لە ڕای خوادا بێ، یا بەرژەوەندییەکی تایبەتیی هەبێ، دەهەوڵ بۆ ئەو « برایەتیی »یە بکوتێ، پڕوپاگەندە بۆ ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە بکا، ئەو سنوورە دەسکردانەی کوردستان بە پیرۆز بزانێ، خۆیان چەن گەورەبن، لای من، لەو « جاش قەڵەم »انەی ئەوڕۆ گەورەتر نین! پێ بزانن یا نەزانن، بە شێوەیە لە شێوەکان، ناپاکییەکی گەورە لە ڕووی بیر و ئایدۆلۆژیاوە، لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیان دەکەن. جا ئەو کەسانەی ئەو بیرەیان هەیە و دەیانەوێ، لە کوردستاندا بیچەسپێنن، چ « ڕووناکبیر، نووسەر، هونەر و زانا »بن، چ ڕێکخراو و پارتە ڕامیارییەکانی وەک « ئیسلام، کۆمۆنیست، دیمۆکرات، سۆسیال دیمۆکرات ... تاد »بن، گرنگ نییە و هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ.

جا، گەر وا بووایە، کاتێ سوپای « ئەڵمانیای نازیی »، هەموو وڵاتەکانی «ڕۆژهەلاتی ئەورووپا » و بەشێکی زۆریان لە دەوڵەتە فیدرالییەکانی « یەکێتی سۆڤێت » داگیرکرد، بە هەموو شێوەیە، هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتانەیان لەنێودەبرد، دەبووایە، ڕێکخراوە ڕامیاریی و ڕۆڵەکانی ئەو گەلانە، باسی « برایەتیی و دۆستایەتیی » نێوان « ئەڵمان » و ئەو گەلانەیان بکردایە! بەڵام، ئەو گاڵتەجاڕییە، تەنیا هەر لە نێو کوردا هەیە، لە مێژووی کوردا ڕوویداوە، نووسەر و هونەرەکانی، کونوقوژبنی مێژووی نەتەوەکەیان، بە دوای بەڵگەی ئیفلیجدا بگەڕێن، تا بیسەلمێنن، « برایەتیی » عەرەبی داگیرکەر و کوردی داگیرکراو زۆر کۆنە، چەندین خاڵی وەک « ئایین، مێژووی هاوبەش، خووڕەوشت ... تاد » بێننەوە، تا هەر چۆنێ بێ، کارەساتی داگیرکردن، چەوساندنەوەی نەتەوەیی، زۆرداریی نەتەوە سەردەس و داگیرکەرەکانی کوردستان، لە بیر ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بەرنەوە. جا خۆ گەر « ڕووس »ەکان، لە سەر ئەو ڕێوشوێنە پڕ لە هەڵە و نەنگییەی کورد بڕۆشتنایە، ئێستە داری وڵاتەکەیان بە سەر بەردیانەوە نەمابوو! خۆ ئەوانیش، هەر دوو لایان هەر سەر بە یەک ئایینی فەلە بوون، لە یەک ماڵی گەورەی هاوبەشی « ئەورووپا »دا دەژیان، لە کوردیش پێشکەوتووتر و باری ژیانیشیان لە هەموو ڕوویەکەوە، باشتربوو. کەچیی، ئەوان ئەو هەڵە مێژووییەی کوردیان پێڕەو نەکرد. بەڵکوو،

هەر لە یەکەم رۆژەوە، چۆن ئیسلام دەڵێ: « چاو بە چاو، دان بە دان »، ئەوانیش دروشمی « خوێن بە خوێن » یان بەرزکردەوە. لە هەر کوێیەک بۆیان هەڵکەوتایە، راوە سەربازی « ئەڵمانی نازیی » یان دەکرد. لە هەر کوێیەک، دەنگێکی نارەسەن و ناپاک، لە نێو رۆڵەکانی گەلانی « یەکێتی سۆڤێت »دا بەرزبووایەتەوە، هەر زۆر زوو کپیاندەکرد و دەیانتاساند. تەنانەت، دوای ئەوەی جەنگیش تەواوبوو، تا سیستێمی دەوڵەتی سۆسیالیزم هەرەسیهێنا، هەر بە دوای تاوانبار و ناپاکەکانی نێوخۆدا دەگەڕان و بە سزای مەرگیان دەگەیاندن. بۆیە، ئەو گەلە ئازایانە، ئەو لەشکرە « سوور »ە نەبەزە، هێزەکانی « نازیی »یان، تا « بەرلین »ی پێتەختی « هێتللەر »ی خوای جەنگ و کاولکاریی راونا و تێکشکان!
بە لای منەوە، « قانع » و هەموو هۆنەرەکانی دیکەش، چۆن ژیان یا چۆن نەژیاون، هیچ پێوەندییەکی بە سەر ئەوەوە نییە، ئەورۆ رەخنەیان لێ بگرین یا نەگرین. بەپێی قسەکانی « بەرزنجیی» بێ، هەرچی هەژاربوو، کۆلکە خوێندەوارییەکی هەبوو، ئاگای لە هەواڵەکانی جیهان نەبوو، رۆژنامە و گۆڤارەکانی بە دەس نەگەیی، گەر « هەڵە، تاوان و ناپاکیی »ش بکا، ئیدی نابێ، رەخنەی لێ بگیرێ!
بە باوەڕی من، ئەو کەسەی چاو لە هەڵەوپەڵەی کەسانی دیکە بپۆشێ، تاوانەکانیان بۆ داپۆشێ، ناپاکییەکانیان لەقاو نەدا، ئەوانە خۆیان بە تاوانبار و ناپاک دادەنرێن! نەک وەک « بەرزنجیی » نووسیویەتی: (ئیدی تاوان و ناپاکی نیە ئێمە پاش ئەوەندە ساڵ بەدوی کەوین و لەتێری قسان بکەین: هۆ مامەی شاعیر بۆ وات وت؟ بۆ وات نەوت؟!)«45.3»
ئایا، مەبەسی لەم قسە هەڵبزرکاوانە چییە؟ کێ داوای، ئەو جۆرە شتانەی لە هۆنەر کردووە؟ جا گەر تاوان و ناپاکیی ئەوە نەبێ، کە خوێندەوار و رووناکبیرانی هەموو نەتەوەیەک، گۆڕی مێژووی نەتەوەیی و وێژەیی خۆیان، بۆ رۆڵەکانیان شەق نەکەن، لایەنە خراپ و چاکەکانی لە یەکدی جیا نەکەنەوە، ئیدی دەبێ، تاوان و ناپاکیی، لەوە پتر چی دیکە بێ؟ بەڵکوو، تاوان و ناپاکیی ئەوەیە، خوێندەوار و رووناکبیرەکان، هەر رۆژە لە ئاوازێ بخوێنن و سەریش لە رۆڵەکانی نەتەوەکەیان تێکدەن!
هەر کەسێ، شتێکی دیاریکراوی پێ نەبوو، بیڵێ و بینووسێ، هەڵبەتە هەر، پەنا بۆ بەر قسەی پڕوپوچ دەبا. ئەوەتە، چیرۆکی باوکی و « قانع »ی گێڕاوەتەوە. وەک کەس نەزانێ، بە چ دەردیسەرییەک ژیاوە! گەر هەر تەنیا، تەماشایەکی ئەو هۆنراوەیەی « مەدەدۆش » بکەین، کاتێ بۆ یەکەم جار، چاوی پێ کەوتووە، « هەژار

و رووت، چلکن و پلکن « ببــووه، چی له بارمیەوه نووســیـوه،، ئیـدی به تەواویی تێدەگەین، چۆن بووه و چۆن ژیاوه. « مەدهۆش »، دەربارەی پلەوپایەی هۆنەر لای کورد، گللەیی له کۆمەڵی کوردەواریی کردووه و گوتوویەتی:

ووتم: هەی هاوار ئەم پیاوه بەرزه
ئه! ئاوا ئەژی، له ڕووی ئەم ئەرزه
ئەم فکره بەرزه و ئەم هۆشه جوانه
ئەبێ بۆچ وابێ لەم کوردسانه
لای بێگانەکان شاعر زۆر جوانن
تەواو دڵخۆشن زۆر شادمانن
ئەی بۆچ لای ئێمه وا هێنده سووکن
کز و کەلەلا تەواو بێ تووکن
شاعر خزمەتی گەل و هۆز ئەکەن
خۆیان به قوربان بەرزیی کۆز ئەکەن

پاشان گوتوویەتی:

کەی شاعر لەمه چاکتر ژیاون
پاکیان به جەوری فەلەک خنکاون
نابینی هەر کەس خاوەن جەوهەره
لەمه خراپتر ئەو دەربەدەره

« قانع »یش وەڵامی داوەتەوه و گوتوویەتی:

هەتا شاعیری کوردستان بم
ئەبێ هەر شڕوشیتاڵ و لاتبم «49، 57-58».

هەرچەنده، کورد زۆر له مێژه گوتوویەتی: کای کۆن به با مەکه! بەڵام، ئەم پەنده، له هەر بوارێکدا بشێ و بە کەڵکبێ، له بواری مێـژوودا ناشێ و کەڵکی نییه. چونکه، گەر کای کـۆنی مـێـژوو بەبا نەکـەین، چۆن دەتوانین، کەڵک له پەند و ئەزموونەکانی وەرگرین؟ ئێمـه، گەر به شێوەیەکی بەردەوام، مێژوی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، وێژەیی و هونەریی »مان بژار نەکەین، لێی نەکۆڵینەوه، به چاوی ڕەخنەوه تەماشای نەکـەین، تا کوردێ مـابێ، هەر دەبێ، له جێگەی خۆی ڕاوەستێ و بمەیێ! دوای ئەوه، گــەر یەکێ بیــەوێ، ناپاکــیی له نەتەوه و نیشتمانەکەی خۆی بکا، دارابێ یا نەدارابێ، هەر بەو ڕێگه خراپەدا دەڕوا. ئیدی ئەم ڕاووڕتوییەی بۆ چییه؟

## 48/3. مووچەخــــۆر :

« بەرزنجیی » دەربارەی ژیانی هونەرانی کورد نووسیویتی: (سەرەرای ئەوەش ئەگەر بەهەزار چنگە کرکێ و خاترو زەحمەت کارێکی مامۆستایی یا چاودێری کرێکارانی رێگاوبان یا ... دەستکەوتبێ، ئێمە راستەوراست بەچاو قاپیمەو ناوی بەرین بە .. « مووچە خۆری دەوڵەتی داگیرکەری عێراق »!!)«46-45،3».

بەڵێ، لەو رۆژەوە دەوڵەتی عێراق دامەزراوە، هەموو ئەوانەی، کاریان لە بەڕێوەبەێتییەکانیدا کردووە، ئێستە و پاشەرۆژیش کار دەکەن، بە « مووچەخۆری دەوڵەتی داگیرکەری عێراق » دادەنرێن، ئەدی خۆ، فەرمانبەری دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان نەبوون و نین! ئەمە راستییەکی بەڵگە نەویستە. چونکە، لە مێژووی نوێی کورددا، کوردستان دەوڵەت نەبووە، تا هاوولاتیانی کورد، کار لەو دەوڵەتە سەربەخۆیەی کوردستاندا بکەن. هیچ کوردێکیش، لەم پاسایە بەدەر نەبووە و بەدەریش نییە! جا، گەر « بەرزنجیی »، بە پلارهاویشتنەوە، ئەوەی دووبارەکردۆتەوە، دەبووایە، یەکێکی وەک « گاندیی »، هانی رۆڵەکانی گەلەکەی خۆی بدایە، کرنووش بۆ ویست و ئارەزووەکانی ئیمپریالیزمی « بریتانیا » بەرن. کەچیی، ئەو بە پێچەوانەوە، هەموو شتێکی « بریتانیا »ی لێ قەدەغەکردن، داوای لێ دەکردن، تەنیا شتی خۆماڵیی بەکاربێنن!

سەرکردەیەکی گەورەی عەرەبی وەک « سەعد زەغلوول »ی ئەمر، کاتێ ویستی، بە هەموو توانایەوە و لە هەموو بەرەکانەوە، دژی « بریتانیا » راوەستێ، جگە لەوە ی، خەباتی رامیارییان دەکرد، لە نێو شارەکانی « میسر »دا راوە ئینگلیزیان دەکرد، بریاریشیدا، جەنگێکی نابوورییان بەرانبەر بکا. گەلەکەی بانگکرد، شتی خۆماڵیی بەکاربێنن، پرۆسیسی کرین و فرۆشتن، لەگەڵ بانک و هێزەکانی دەوڵەتی « بریتانیا »دا بوەستێنن. ئەوانەی لەگەڵ ئینگلیزەکان و شاه فاروق‌یشدا کاریاندەکرد، بە خۆفرۆش و ناپاک نێوزەدیانکردن. بەڵام، کاتێ « زەغلوول »، خۆی وەزارەتی دروسکرد، هەر هەمان دەوڵەت و شا « فاروق » بوو، کەچیی، ئەو بەندوباوە نەما. چونکە، باشترین نیشتمانپەروەری « میسر »، کاریان لە شالیارگەکەیدا دەکرد، فەرمانیان لە ئینگلیز و شاوە وەر نەدەگرت.

نموونەی هەر دوو ئیمپریالیزمی « فرەنسا و ئیتالیا » و هەر دوو گەلی قارەمانی « جەزایر و لیبیا »، دوو نموونەی دیکەی ئەو بۆچوونانەمانن و بەڵگەی راستیی بە دەستەوە دەدەن. هەرچی هاوکاریی لەگەڵ داگیرکەرەکانیاندا کردبێ، ئەوا ئەوان، بێ هیچ جۆرە لێبووردنێ، بە پیاوی بێگانە و ناپاکیان داناون!

بەلام، چونکە یەکێکی وەک « بەرزنجیی »، لە هەموو ژیانیدا، لە سەر کوردایەتیی تووشی کۆکەرەشەش نەبووە، نەک هەر ئەو جۆرە کردارە نەتەوەییانە، بە خۆی رەوا نابینێ و نامۆن، بەڵکوو، هەر دەیەوێ، بە هەر جۆرێ بێ، داکۆکیی لە کەسانێکی دیکەش بکا، کە لە هەموو کات و سەردەمێکدا، کەوا سووری بەر لەشکر بوون، لە هەموو کاسەیەکدا ئەسکوێ بوون. ئەوەش، هەمووی بۆ رابوردووی پەروەردەی نەتەوەیی و ئایدۆلۆژیای خۆی دەگەڕێتەوە. چونکە، ئەوەتەی هەیە، لەو بازنە داخراوە بۆشەدا دەخولێتەوە و لەگەڵ ئەو لایەنە کوردستانییانەدا بووە، کە وابەستەی دەسەلاتی « بەغدا » بوون!

## 49/3. ســـــۆسیال :

« بەرزنجیی »، لە دوورەوە تفەنگ بە تاریکەشەوەوە دەنێ. بێ ئەوەی، تەنیا رۆژێکیش، « سۆسیال »ی دیبێ، هەر لە خۆیەوە نووسیوێتی: (دەبیاشە وێرانەیەکی تر هەبوو ئەو کاری تیابکاو مووچەی لێ وەرگرێ؟ ئەی ئەگەر ئەوەی نەکردبا سندوقێکی باربوو و کۆمەکی ئەوانە هەبوو کە « کوردایەتی دەکەن و بێزیاننایە مووچەی دەوڵەت وەرگرن » مانگانە وەک « سۆشیال » لەبەر درگەکەیدا ریزبن و بەمل کەچی دەست پانکەنەوە؟)« 46،3 »

ئەمە یەکەم جار نییە، ئەو جۆرە خوێندەوار و نووسەرانە، ئەو جۆرە قسانە دەکەن. جا، لە ناشارەزاییەوە بێ یا لە بەر هەر هۆیەکی دیکەی تایبەتیی بێ، گرنگ ئەوەیە، زۆر بە هەڵەدا چوون. دووریش نییە، هێندێکیان لە داخدا ئەو جۆرە قسانە بکەن، هەر هەڵێکیان بۆ هەڵکەوێ و بۆیان بلوێ، یەک و دووی لێ نەکەن و ئەوانیش وەک « بەرزنجیی » نووسیوێتی، لە بەر دەرگەی سۆسیالدا ریزدەبن و بە ملکەچیی دەستپاندەکەنەوە!

بۆ نموونە: ئێمەی دەربەدەر و خوێنکاری کورد، کاتێ لە « یەکێتی سۆڤێت » دەمان خوێند، پاسۆرتەکانمان تەواوببوو، هیچ جۆرە پاسپۆرتێکمان نەبوو. بۆیە، نەماندەتوانی، بۆ هیچ وولاتێ کۆچبکەین. لە پڕ « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »، بڕیارێکیاندەرکرد، تا هاورێکانی خۆیان، سەردانی باڵوێزخانەکانی « عێراق » بکەن و پاسپۆرتەکانیان نوێکەنەوە. ئێمەی کورد، ئەو کارەمان رەتکردەوە و نەچووین. دوای ئەوەی، خوێندنمان تەواوکرد، « سۆڤێت » دەریانکردین. لە ناچاریدا رووماان لە « سوید » کرد. ئەو کاتە، کۆمۆنیستە کورد و عەرەبە کان دەیانگوت: ئێمە عێراقین، زۆر بە شانازییەوە سەر لە باڵوێزخانەی « عێراق » دەدەین و پاسپۆرتەکانمان نوێدەکەینەوە. گەلێ لەو باشترە، دەس لە وولاتێکی

سەرمایەداریی وەک « سوید » پانکەینەوە، پاسپۆرتی دەوڵەتێکی وا هەڵگرین و پارە لە « سۆسیال » وەرگرین!
کەچیی، کاتێ لە « سوید » ئاوڕماندایەوە، نەک هەر ئەو گەوجانەی ئەو وڕێنانەیان دەکرد، بەڵکوو تەنانەت « سکرتێر » و هێندێ لە ئەندامانی « کۆمیتەی ناوەندیی » پارتەکەشیان، لە پێش ئێمەوە لەوێ تۆزیاندەکرد، پاسپۆرتی « سویدیی »یان لە تەنکەی باخەڵ نابوو، مانگانە، پارەیەکی مفتومۆڵیان وەردەگرت، لە سەرحسێبی ئەو دەوڵەتە سەرمایەدارە چەپەڵەی « سوید »یش، ژیانێکی گەلێ باشتریان لەوەی « سۆڤێت »ی هاوڕێکانیان و « عێراق »ی دەوڵەتی باوویاپیریان ڕادەبوارد!
جا وەنەبێ، هەرچی لە دوورەوە، بە پلارهاویشتنەوە باسی « سۆسیال »ی کرد، ڕاستکا و وەک سەگەکەی « نیڤان پاڤلۆڤ »، دەمی بۆ « سۆسیال » خۆراییەکەی « سوید » لیکی نەکردبێ!
سەیر ئەوەیە، چەن ڕووناکبیر و نووسەرێکی وەک دوکتۆر « مارف خەزنەدار و شێرزاد حەسەن »یش، کە هەر دووکیان ئەم وڵاتانەیان دیوە و ماوەیەک لێی ژیاون، وەک « بەرزنجیی » پێیان وایە، هەموو پەنابەرێ، لەم هەندەرانە کار ناکا و هەر لە سەر « سۆسیال » دەژی!
د. « مارف » گوتوویەتی: (کوردی ئەورووپا، کار ناکەن، لە سەر دەوڵەت دەژین.)«74،55» هەروەها، « شێرزاد حەسەن »یش نووسیوێتی: (کوردی ئەورووپا، لە سەر سەدەقە دەژین.)«42»
پێشەکیی دەمەوێ، لێرەدا چەن خاڵێ ڕوونکەمەوە، کە بەر لە هەشت ساڵ لەمەوبەر، لە گۆڤاری « بەربانگ »دا نووسیومە. (سەرەتا پێویستە، بزانین، ئەو کوردانەی لە دەرەوەی کوردستان دەژین، کێن؟ پاشان تێدەگەین، بۆچی ئەوەندە کورد دەربەدەربوون و خاکی باوویاپیرانیان بەجێهێشتووە. بە کورتییەکەی، ئەو کوردانە لەم گرووپانەی خوارەوە پێکهاتوون :
1. کۆمەڵێ کورد هەن، هەر لە زۆر کۆنەوە، لە هەموو پارچەکانی کوردستانەوە، کۆچیانکردووە بۆ دەرەوەی وڵات. لە ئەنجامی بێ دەرەتانیی و نەبوونی ئازادیی و لە بەر خراپیی باری ژیانی ئابوورییان، کە ئەوانە بوونەتە نیشتەجێی تەواوی ئەو وڵاتانە و زۆربەی زۆری کورد پێکدێنن لە هەندەران. بەشی زۆری ئەو کوردانە، لە باکوور و خۆراوای کوردستانەوە هاتوون.
2. بەشی زۆری ئەو کوردانەی، لە باشووری کوردستانەوە، ڕوویان لە دەرەوەی کوردستان کردووە، لەم گرووپانە پێکدێن:

A. ئەو پێشمەرگە و کادیرانەی، لە ئەنجامی هەرەسی شۆڕشی سێپتێمبەردا، بۆ بندەستی داگیرکەری دەوڵەتی عێراق نەگەڕانەوە، بە خۆیان و خێزانیانەوە، خۆیان گەیاندە یەکێ لەو دەوڵەتانەی، ئەورۆ تێیدا نیشتەجێبوون. لە بەر بێ چاریی و لەبەرنەوەی حەزیان نەدەکرد، چی دی لە ژێر سایەی ڕژێمی ئەوسای « ئێران »دا بژین.

B. هەموو ئەو پێشمەرگە و قارەمانانەی گەلەکەمان، کە لە ئەنجامی جەنگی نێوخۆ و کوردکوژییدا، تووشی ڕەشبینیی و نائومێدیی بوون و گۆڕەپانەکەیان چۆڵکردووە و هاتوونەتە دەرەوە.

C. هەموو ئەو برا پێشمەرگە و ڕۆڵە جگەرسۆزانەی نەتەوەکەمان، کە لە ئەنجامی داگیرکردنی بەرفراوانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان، لە لایەن داگیرکەرەوە بە هۆی ئەو جەنگە نارەوا سەپێنراوە بە سەرماندا، لە شۆڕشی نوێماندا تووشی مالوێرانیی و برینداریی و پەککەوتوویی بوون. بە تایبەتیی، دوای بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی و گازی ژاراوی لە هەڵەبجەی شەهید و بادینانی بریندار، لە ئەنجامی کوشتنی بە کۆمەڵی خەڵکی کوردستان و هێرشی بەرفراوانی ئەنفالەکان و خاپوورکردنی تەوای گوند و شارۆچکەکانی کوردستان.

D. هەموو ئەو کوردانەی بە تایبەتیی لاوەکانمان، کە لە ئەنجامی جەنگی مالوێرانکەرانەی هەشت ساڵەی « عێراق و ئێران »، پاشان « عێراق و کوێت »دا لە سەربازیی هەلاتن و شانیان نەدایە بەر ئەو خزمەتە سەپێنراوە بە سەریاندا و نەیاندەویست، چی دی لەوە زیاتر ببنە چیلکەی سووتەمەنی ئەو دوو جەنگە کلاوانە و لە بەر بڕوا نەبوونیشیان بە شەڕی چەپەڵی براکوژیی. ناچار ملی ڕێگەی دەربەدەرییان گرتەبەر و پەنابەرییان بۆ خۆیان هەڵبژارد.

E. کۆمەڵێکی دیکەش هەن، دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکەی بەهاری «1991»، لە بەر بێ دەرەتانیی و لە بەر سەرما و لە تاو برسێتیی، بە هەر دەردیسەرییەک بوویێ، خۆیان گەیاندۆتە یەکێ لە وولاتەکانی دەرەوە و لە ناچاریدا جێگیربوون. بە داخەوە، ڕەووکۆچی ئەم دەستەیە، تا ئێستەش هەر بەردەوامە. « جا لە بەر هەر هۆیەک بێ » بۆ دەرەوەی کوردستان، کە ئەوە خۆی لە خۆیدا، دەرکەوتەیەکی خەتەرە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە و چارەسەرکردن هەیە.

3. کۆمەڵێکی دی کە بۆ خوێندن و خۆفێرکرین، لە هەموو کوردستانی مەزنەوە، ڕوویان لە هەندەران کردووە. لە بەر هەر هۆیەک بێ، دوای تەواوکردنی خوێندنەکەیان نەگەڕاونەتەوە بۆ کوردستان. جگە لە کەمەکێکی کەم نەبێ، کە

ئەمانەش زۆربەی هەر زۆریان ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان ناردبوونییە دەرەوە بۆ خوێندن لە بار و ڕەوشی جیاجیادا.
ئەمانەبوون«، ئەو دەستە و تاقمانەی کە لە بارودۆخی جیاوازدا کوردستانیان بەجێهێشتووە، ڕوویان لە دەربەدەریی و پەنابەریی کردووە، کە بەشێکی لەبن نەهاتووی نەتەوەکەمان پێکدێنن.)«50،17».
جا هیوادارم، هەموو کوردێ باش تێبگا، کێن ئەوانەی لە دەرەوەی وڵات دەژین؟ بۆ ئەو هەموو کوردە هەڵاتوون؟ ئاشکرێ، هەموویان بە یەک چاو سەیرکەین، چونکە، هەر کەسێ باری تایبەتیی و پۆزشی دیاریکراوی خۆی هەیە.
پێش ئەوەی، وەڵامی « بەرزنجیی » بدەمەوە، دەمەوێ بڵێم: دەرکەوتەی کۆچکردن بۆ دەرەوەی وڵات، شتێکی نوێ نییە، بەڵکوو، لە هەموو سەردەم و لە نێو هەموو نەتەوەیەکدا هەر هەبووە و هەر دەشمێنێ. بەڵام لەوانەیە، هێندێ کەس پێیان وابێ، ڕۆڵەکانی کورد، تازە وڵاتەکەی خۆیان جێدێڵن و ڕوو لە وڵاتانی دیکەی جیهان دەکەن، تا پارووییە نانی بێ ئازاریان دەسکەوێ، تاوێ بە هێمنیی و کامەرانیی بژین. نەخێر، ئەوەتە « بێکەس »، هۆنراوەی « عەیبە ... عەیبە »ی ساڵی « 1926 » بە هەژدە نیوەدێڕ هۆنیوەتەوە و لە کۆتاییەکەیدا گوتوویەتی:

سەیریکە، ئەم عەیبەعەیبە، چەندە تەئسیری هەیە
کوردی کردۆتە موهاجیر، ئیشی ناوشاران ئەکا
چونکە پێی عەیبە، لە جێی خۆی ئیشبکا، قەدری ئەبەێ
بۆیە وا ئەڕواتە غوربەت، تەرکی کوردستان ئەکا
بەسیەتی ئەم فکرە پیسە، غەفڵەت و نووستن بەسە
سەیری ئەقوامی غەرب کەن، کەشفی ناو ئاسمان ئەکا «88،6».

ئینجا، لە وەڵامی ئەم پلارهاویشتن و ناشارەزاییەی « بەرزنجیی »دا دەمەوێ، سەرەتا بڵێم: ئەم دەوڵەتە ئازاد و دێمۆکراسییانە، نە چوار دەوڵەتە داگیرکەرە سەرکوتکەرەکەی « بەرزنجیی » و نە دەوڵەتە سواڵکەرەکانی بەرەی سۆسیالیزمی کۆنن، تا خەڵکی بۆ قەراغە کولێرەیەک، ڕیزیبەسن و هێندێکیشیان، ئابڕووی خۆیان بۆ پلەوپایە بفرۆشن! جاشایەتیی بە شایەتیی و ناپاکیی بە پاکیی دابنێن!
« سۆسیال » وەک ئەو تێیگەیشتووە، بەڕێوەبەرێتییەکی تایبەتیی نییە، تەنیا بۆ خەڵکانی پەنابەری دەوڵەتەکانی جیهان دامەزرابێ. بەڵکوو، لە کۆنەوە هەیە، پێش ئەوەی، بەو شێوەیە لە هەموو جیهانەوە ڕەووکۆچ دەسبێکا. ئەو بەڕێوەبەرێتییە، بۆ ئەوانە دانراوە، کە بێکارن، تا کاردەدۆزنەوە یارمەتییان دەدەن. یا یارمەتیی

ئەوانە دەدەن، کە نەخۆشن، یا پەککەوتەن و کاریان پێ ناکرێ. یا منداڵ بێ و کەسی نەبێ، یا لە دایک و باوکی جیابووبێتەوە، بەخێوی دەکەن. جا ئەو پەنابەرانەی خۆیان لەم وولاتانە دەبیننەوە، ئەوا تا زمان فێردەبن و کاری دەدۆزنەوە، « سۆسیال » کۆمەکی ئابوورییان پێ دەکا. کە ئەمە لە زۆربەی دەوڵەتەکانی « خۆراوای ئەورووپا »دا هەیە.

بەڵام، لە لایەکەوە، هەم لەم سالانەی دواییدا، هێندە پانابەر زۆربووە و لە هەموو دەوڵەتەکانی « ئاسیا، ئەفریکا و هێندێ دەوڵەتی « ئەورووپا »وە هاتوون. هەم باری ئابووریی ئەو دەوڵەتانەش گۆڕاوە، نرخی پارەکانیان بەرانبەر دۆلار دابەزیوە، بێکاریی زۆر بووە. لە لایەکی دیکەشەوە، پەنابەرەکان خۆیان، هێندە کاری ناشیرین و ناڕەوایان کردووە، هەموو ئەو کارە باشانەی « سۆسیال » بۆ پەنابەرانی دەکرد، زۆر کزبووە و دوور نییە، لە ئایندەیەکی نزیکیشدا، هەر بە جارێ بیوەستێنن. ئەوەی جێگەی داخە، ئەوەیە، لەوانەیە، دوو کەسی وەک مامۆستا « بەرزنجیی »، فریای ئەو سواڵکردنە نەکەون!

جا، ئەوەی لە سەر « سۆسیال » دەژی و خۆی کار ناکا، مانگانە زۆر بە رێزەوە، پارەکەی بە پۆستدا بۆ دێتە ماڵەوە، پارمەتییدەدەن، تا کارێ دەدۆزێتەوە. نەک وەک « بەرزنجیی »، لە مێژە دەمی بۆ « سۆسیال » لیکی کردووە، لە داخا، لیسی کوێرانە و پەڵی ئیرەیی هاوێشتووە، گوایە، بە ملکەچیی دەسپاندەکەنەوە! وەک دەڵێن: پشیلە دەمی نەدەگەیشتە دووگ، دەیگوت: سوێرە!

جگە لەوەی، بۆ دەبێ، « سۆسیال » نەنگیی بێ؟ ئەوە بارێکی تایبەتیی نێوخۆی ئەم دەوڵەتانەیە، گرفتە ئابووریی و کۆمەلایەتییەکانی کۆمەلانی خەلک، بەو شێوەیە چارەسەردەکەن.

جا، هەر ئەوە ماوە، لە « بەرزنجیی » بپرسم: ئایا، پارەی « سۆسیال » جێی شانازییە و پاکە، یا پارەی « جاشێتیی » ئەو کوردانەی ناپاکییان لە خاک و گەلەکەی خۆیان کردووە؟ چونکە، زۆربەی ئەو کوردانەی لە کۆنەوە، لە دەس چەوساندنەوەی نەتەوەیی و هەر سێ جەنگی « کوردستان، کەنداوی یەک و دوو » رایانکردووە، بە پارەی « سۆسیال » ژیاون. ئایا، مووچەی چەکدارەکانی هەر دوو زلهێزەکەی کوردستان « پارتیی و یەکێتیی » باشتر و سەربەرزانەترە، یا پارە کەمەکەی « سۆسیال »؟ چونکە، ئەو چەکدارانە، بە پارە ڕاوەکورد دەکەن و کوڕی کورد دەکوژن. ئایا، پارەی « سۆسیال » خۆشتر و بێ منەتترە، یا مووچەی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، کە ئەوان، دان بە بوون و کەسێتیی تاکی کورددا

نائێن؟ دیارە، هەموو کەسێ لە جەفرەی پلارهاویشتن دەکا، دەزانێ، مشتووی ناو هەمانەکە، چەن ئازاری هەیە! هەموو کەسێکیش، لە فیکەی خۆی دەکا. چونکە، قسەی « خواروخێچ، ناشیرین و پلارهاویشتنی ناڕاستەوخۆ »، نیشانەی « ترسنۆکیی، پۆنگخواردنەوە، بوغزلەسکیی، ئیرەیی، دووڕوویی، هەلپەرستیی » خاوەنەکەی نەبێ، هیچی دیکە نییە. قسەی لە ڕوو و ڕاشکاوییش، وەک گزنگی خۆر وایە، بە هەموو درز و کەلەبەرێکی تاریکاییدا دەچێ و ڕووناکی دەکاتەوە.
لەوە دەچێ، « بەرزنجیی » پێی وابێ، ئەوەی لە یەکێ لەم دەوڵەتانەی دەرەوەی کوردستان بژی، ئیدی دەبێ، لە سەر « سۆسیال » بژی. ئەو نازانێ، تەنیا هەر ماوەیەکی کورتە و دەبێ، کار بکەن. من نە گوتوومە و نە هەرگیز دەشیڵێم: هیچ کوردێ نابێ، لە هیچ بەڕێوەبەرێتییەکی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستاندا کاربکا. بەڵام، ئەوە ڕاستییەکە و دووڵەت ناکرێ، هەر چوار دەوڵەتەکە، بە چوار دەوڵەتی داگیرکەری کوردستان دادەنرێن. چونکە، گەر ئیمپریالیزمی « بریتانیا »، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، داگیرکەری باشووری کوردستان بووبێ، ئەوا، دوای ئەوەی ئەوان گەڕاونەتەوە، لەو ڕۆژەوە دەوڵەتی عێراق دامەزراوە، تا باشووری کوردستان بە تەواویی ڕزگاریدەبێ و دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی دادەمەزرێنێ، بە جێگری ئەو ئیمپریالیزمە دەژمێررێ. ئەمڕۆش، عێراق دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان نەبێ، هیچی دیکە نییە. ئەو کوردەی، نکوولیی لەم ڕاستییەش بکا، یا پاکانە بۆ داگیرکردنی کوردستان بکا، ئەوا لای من، لەو جاش و ناپاکانەی کوردیان فرۆشتووە، گەلێ کەمتر و نزمترە! چونکە، (ئەوانەی داوا لە نەتەوەی کورد دەکەن، تاهەتایە بە دابەشکراویی، لە زیندانی تاریک و نووتەکی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستاندا بمێنێتەوە، ئەوانە هەرگیز، نە لە « بارە ڕیالیستەکەی کورد، نە لە گۆڕانکارییە گەورەکانی جیهان، نە لە کاری ڕامیاریی » دەگەن، نە بەرژەوەندیی کوردیان دەوێ، نە داوای « دۆستایەتیی، ئاشتیی، ئاسایشی ڕاستەقینە و تاهەتایی نێوان گەلانی ناوچەکە » ش دەکەن. باری سەرنج و باوەڕەکانیشیان، لەگەڵ « زانست، ژیربێژیی و ویژدانی زیندووی باوەڕی مرۆڤایەتیی »دا ناگونجێ.)«270،29»
لە کۆتایی ئەم گوتارەشدا، لەو بارەیەوە هیچ وەڵامێکی دیکەم نەماوە، جگە لەوەی، دەقی بەشێ لە نووسینەکەی « حەمە سەعید حەسەن » بگوێزمەوە، کە لە وەڵامی « د. مارف خەزنەدار و شێرزاد حەسەن »دا نووسیوێتی و بڵێم: (زۆربەی هەرە زۆری کوردی ئەورووپا، بە هێزی بیر و بازوو، خۆیان بەخێودەکەن، یارمەتی

کۆمەلایەتیی، شتێک نییە بۆ کورد داهێنرابێ. دەیان ساڵە هەر ئینسانێ لە ژێر ئاسمانی هەر یەکێ لەم وڵاتە ئەوروپاییانەدا هەناسەی دابێ بە چاوپۆشین لەوەی خەڵکی وڵاتەکەیە یان نا، ژیانی بۆ دابینکراوە.
پارەتی کۆمەلایەتی وەک د. « مارف » بۆی چووە، دەوڵەت نایدات. لەم وڵاتانە ئەوە خەڵکە دەوڵەتیش بەخێودەکات، ئەوە پەرلەمانە کە نوێنەری خەڵکە، مووچەی پاشا، سەرۆکی کۆمار، حیزب و وەزیران دیاریدەکات. لێرە ئەوەی کاربکات، سێیەکی داهاتەکەی لە شێوەی باجدا بەو کۆمۆنەی لێی دەژی، دەدات. ئەو پارەیە بۆ ئاوەدانکردنەوە، خوێندنگە، نەخۆشخانە، خزمەتکردنی منداڵ و پیر و یاریدەدانی ئەو کەسانەی کە هێشتا دەستیان لە کار گیر نەبووە، تەرخاندەکرێ، دەوڵەتیش بەو باجە بەڕێوەدەچێ کە خەڵکی دەیدەن، هەر بۆیەش کەی ئارەزوویان لێ بوو، دەیگۆڕن.
هەر کەسێ پێویستی بە پارەتی کۆمەلایەتیی هەبێ، وەریدەگرێ، بەلام هەر کە کەوتە بازاڕی کارەوە، ئیدی بە داهاتی خۆی، دەیان هێندەی ئەوە دەداتەوە کە وەریگرتووە. بە شێوەیەکی گشتیی خەڵکی پەنابەر نزیکەی ساڵێ پارەتیی وەردەگرن، ئیتر هەر کە ئیشێکیان دەستکەوت هەر لە ساڵی یەکەمی کارکردنیانەوە، لەوە زێتر دەدەنەوە، کە وەریانگرتووە.)«31،32»

## 50/3. پووڵێکی قەڵب :

پاشان « بەرزنجیی » بە پلارهاویشتنەوە نووسیوێتی: (زۆر بەداخەوە دەڵێم کەئەم قسانە بەپووڵێکی قەڵبیش ناکۆڕرێنەوە، چونکە بەقسەی نووسەربێ دەبێ هەرچی کارمەندو مووچە خۆری کوردی تروکیاو ئێران و سووریاو عێراقە لەبرسان بمردنایەو نەبوونایەتە مووچەخۆر، بەر لەهەموان خۆی کەهەر نەبێ لە 977-981 لەو دەوڵەتە داگیرکەرە مووچەی وەرگرتووە!... کاشکای دەرزیەکی بەخۆدا کرد با ئەوسا سوژنێ بەخەڵکی دا .)«46،3»
جا، یەکێکی وەک « بەرزنجیی »، گەر لە مەبەستەکەم نەگا، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی، بۆچوونەکانم ئاوەژووکاتەوە و سەر لە خوێنەر بشێوێنێ، دەبێ، من گوناهم چی بێ؟ دیارە، هەر دەبێ، قسەکانم بە پولێکی قەڵبیش لێ وەر نەگرێ! منیش، هەر هێندەم پێ دەکرێ، لە ئاستی هەموو ئەو قسە بێ سەروبەرانەدا، بێ دەنگ نەبم و مەبەستەکانم بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەم ڕوونکەمەوە.
گەر، هەر کوردێ بیری « عێراقچیتیی » هەبێ، کاری بۆ بکا، هەوڵ بۆ پێشخستن و سەرکەوتنی بدا، لەگەڵ ئەو کوردەدا جیاوازیی هەیە، کە هەمان بیری هەیە،

بەلام، نە کاری بۆ دەکا، نە هەولیش بۆ پێشخستن و سەرکەوتنی دەدا. هەر کوردێ ئەو بیرە چەوتەشی نەبێ، دژی باوەڕی « عێراقچێتیی » خەباتبکا، لە سنووری ئەو دەولەتەشدا، لە یەکێ لە دەزگەکانیدا کاربکا، ئەوا بە کارێکی زۆر ئاسایی دادەنرێ. چونکە، ئەو کوردە دژە و خۆی تووشی داوی ئەو بیرە نەکردووە. لە هەمان کاتیشدا، هەر دەبێ، کارێ بکا، تا ژیانی ڕۆژانەی خۆی و خێزانەکەی بەڕێوەبەرێ. ئەوە تەنیا گەوجیی نەبێ، هیچ شتێکی دیکە نییە، گەر مرۆ وا بیرکاتەوە، لە دەولەتە داگیرکەرەکەی نیشتمانەکەیدا کار نەکا! چونکە، ئەو کەسە لە خاکەکەی خۆیدا دەژی، لە نیشتمانەکەی خۆیدا کاردەکا، جا، با نیشتمانەکەشی داگیرکرابێ، ئازاد و سەربەخۆ نەبێ. بەلام، کاتێ « بەرزنجیی »، قسەکانی من هەلدەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی ڕاوی سەرنجی خوێنەر بکا، چی بلێم و چی بکەم! ئەگینا، شتێکی زۆر ئاشکرایە و هەرگیز پێویستی بە سەلماندن نییە، هیچ مرۆڤێ، لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانەدا، لە هیچ سەردەمێکدا، بێ کار ناتوانێ، بژی!

کاتێ نووسیومە: (« زێوەر »ی مووچەخۆری دەولەتی داگیرکەری عێراق... ) «60،24»، بە هیچ شێوەیە، مەبەسم ئەوە نەبووە، پلاری تێ گرم، یا ڕەخنەی لێ بگرم. بەلام، ئەوە ڕاستییەکە و هەرگیز دوولەت ناکرێ. نەک هەر ئەو، بەلکوو، هەموو « نووسەر، هونەر، ڕامیار، زانا و فەرمانبەر »ە کوردەکانی دیکەش، هەر مووچەخۆری دەولەتی داگیرکەری « عێراق » بوون. ئەوەش، ئەوە ناگەیەنێ، هەر کەسێ، مووچەخۆری دەولەتێکی داگیرکەری کوردستان بوو، ئیدی، ناپاکیی لە نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی کردووە، وەک « بەرزنجیی » تێیگەییوە و دەیەوێ، سەر لە خەلکیش بشێوێنێ. یا هەر لە بنەڕەتدا، باش لە مەبەسەکەی من گەیشتووە، بەلام دەیەوێ، بۆ مەبەسێکی تایبەتیی خۆی، مەبەسەکەم بشێوێنێ!

ئاشکرایە، کارکردن و بەڕێوەچوونی ژیان، لەگەل سیخوڕیی و ناپاکییدا، زۆر جیاوازییان هەیە و شتێکی دیکە دەگەیەنێ. چونکە، ژیان بێ کارکردن، بێ پارە، بەڕێوە ناچێ. بەلام، کارکردن تا کارکردن، جیاوازیی هەیە. گەر ئەو کارکردنە، بە شێوەیەکی ئاساییبێ، هەموو مرۆڤێ لەو چوار دەولەتەدا ژیا، مافی کارکردنی هەیە و دەبێ، کاربکا. تەنیا هێندە هەیە، دانوستان لە سەر کێشەی بیر و گرفتە ڕامیاریی و نەتەوەییەکەی خۆی نەکا، وەک بە هەزاران لە ڕۆلە بە جەرگەکانی گەلانی « عێراق »، لە پێناوی پلەوپایە و کورسییدا، لە سەردەمە جیاجیاکانی تەمەنی دەولەتی « عێراق »دا، سەریان بۆ داواکارییەکانی سەرانی دەولەت دا

نەواندووە، چییان ویستبێ، بۆیان نەکردوون. هێندێکیشیان، هەر بە تەواویی خۆیان فرۆشتووە.
بەڵام، نیشتمانپەروەرێکی وەک « زێوەر »، هەرگیز لەو جۆرە پیاوانە نەبووە، لە پێناوی پارە و کاردا، خۆی بە داگیرکەران بفرۆشێ. کەسێکیش، گوتارەکەم بە وردی بخوێنێتەوە، ئینجا بە تەواویی تێدەگا، بە هیچ شێوەیە، لە پلەوپایەم کەم نەکردۆتەوە، زۆر بە ڕێزەوە ناوەبردووە، بە شان و بازوویدا هەڵمداوە و نووسیومە: (« زێوەر » وەک هۆنەرێکی خاوەن بەهرە، بە هەموو لایەکدا پەلی هاوێشتووە. گەلێ هۆنراوەی ڕەنگاوڕەنگ و جۆربەجۆری گوتووە. لە هەر باخەی گوڵێکی چنیوە، تا لە ئەنجامدا، چەپکێ هۆنراوەی جوان و بۆنخۆشی ڕازاندۆتەوە. لە باخچەی بە هەشتی وێژەی کوردییدا، لە سەر تەختی مامۆستای هۆنەرانی سەردەمی خۆی دانیشتووە. تاجی هۆنەرێکی « هەست ناسک، بیر تیژ، واتای بەرز، ئەندێشەیەکی پڕ لە پیت و فەڕ »ی لە سەر ناوە. لە لایەکەوە، دیمەنە جوانەکانی کوردستان، لە نێو قووڵایی دڵ و شانەکانی مێشکیدا ژیاوە، بە خۆشەویستی کوردستانەکەی، خوێنە گەشەکەی قوڵپیداوە. لە لایەکی دیکەشەوە، جەور و زۆرداریی داگیرکەران، چەوساندنەوەی نەتەوەکەی، هێندەی دیکە چاوی کردۆتەوە و زۆری بۆ هێناوە، بۆ خەبات و کوردایەتیی بانگیکردووە و هانیداوە. جگە لەوەی، لەو سەردەمەدا دەنگی زەنگی بیری کوردایەتیی، لە هەموو سەردەمێ پتر دەنگیداوەتەوە، لە هەموو بستێکی کوردستاندا ڕەنگیداوەتەوە، بە تایبەتیی، هۆنەر خۆی یەکێ لە نزیکەکانی « شێخ مەحموود »ی قارەمان بووە، وەک کوردپەروەرێ، گەلێ « ساردیی و گەرمیی، تاڵ و سوێریی، برسێتیی و تینوێتیی، دەربەدەریی و نەبوونیی »، لە سەر کورد و بۆ کورد چێشتووە. دە دیارە، تا لە ژیاندا بووە، دڵی هەر بۆ کورد و کوردوستانەکەی لێیداوە. بۆیە، « بە ڕەنگێکی مات و زەردەوە، بە دەنگێکی پڕ لە غەم و کزۆڵەوە، بە زمانێکی ساکار و ڕەوان، بە کوردییەکی بێ گرێوگۆڵ و پەتیی »، گەوهەری بریقەداری ووشەی ساکار و خۆماڵیی ڕیزکردووە، مەلیرەی هۆراوەی کوردیی لێ هۆنیوەتەوە. تا توانیوێتی، هەرچی لە هەناوی ڕەشیدا هەبووە، دەری بڕیوە، هەرچی دەردە دڵی خۆی هەبووە، بۆی هەڵڕشتووین. پاشان هوشیاریکردوینەتەوە، هاواری لێ کردووین و ... تاد) «56-55،24»، دواتر نووسیومە:(لە خۆشەویستی نیشتمانەکەیدا تواوەتەوە، کوردستانەکەی بە بەهەشتی ڕازاوەی سەر ڕووی زەوی داناوە، داوای یەکێتیی و خوێندن، لە ڕۆڵەکانی گەلەکەی دەکا و ... تاد)«57،24»

ئەگینا، وەک « بەرزنجیی » دەفەرموێ: منیش، چوار ساڵ لە « زانکۆ » مامۆستا بووم، مووچەی ئەو دەوڵەتەم خواردووە. بەڵام، ئەوەتەی هەم، ڕۆژێ لە ڕۆژان، نەک هەر هیچم بۆ عێراق و سەرکردەکانی نەنووسیوە، نەک هەر خۆم بە « عێراق »ی نەزانیووە، بەڵکوو، تەنانەت چەپڵەیەکیشم بۆ بەعس و عێراق لێ نەداوە، لە هیچ خۆپیشاندان و ئاهەنگێکی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرەشدا بەشدار نەبووم، هیچ جۆرە دڵسۆزیی و پەرۆشییکم، بۆ ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە نەبووە و نابێ. مەگەر، چەن « عێراقچیی » و نۆکەرێکی دەوڵەت، « عێراق » بە لانە وماڵی خۆیان بزانن! ئەوانەی لە نزیکیشەوە منیان ناسیووە و دەمناسن، گەواهیی ئەوەم بۆ دەدەن. نەک وەک هێندێ « خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر و فەرمانبەر » بە نهێنیی یا بە ئاشکرا، لەگەڵ « بەعس » و دەزگەکانی بووین، تەنانەت، ئێستەش بنکە و بارەگەی پارتەکانی کوردستان، بەو جۆرە کوردە چڵکنانە ئاخنراون.

« بەرزنجیی »، هەروا لامسەرلایی، نموونەی لە سەر کارکردن هێناوەتەوە و نووسیوێتی: (ئەمە دەبێ چ مەنتیقێکی ئیفلیجانەبێ و چ بیر کردنەوەیەکی سەقەتبێ کە کارکردنی هەزاران کرێکاری فەلەستینی لەناو ئیسرائیل دا بەرامبەر بە مووچە بەتانەو تەشەر بزانێ، ئەو کرێکارانەی کەڕۆژانە لەشارەکانی فەلەستینەوە بەپێی کارت و پسوڵەی تایبەت « هەر سێ مانگ جارێ » دەچنە ئیسرائیل و ئێواران دەگەڕێنەوە. خۆ لە ڕوودانی هەر کارێکی توندوتیژیشدا کورج دەرگەو سنووریان بڕوودا دادەخرێ و جاری وا هەیە بەهەفتەو مانگ ڕێگایان پێ نادرێ و بێ کار دەمێننەوە.)«46،3»

من نە باسی « فەلەستین »م کردووە، نە کارکردنیش لە هیچ قوژبنێکی ئەم جیهانەدا، بە ئەنگیی دەزانم، نە تانە و تەشەریشم لە کەس داوە. هەموو مرۆڤێ بۆی هەیە، لە هەر دەوڵەتێکدا بژی، کاربکا، هەڵبەتە، فەلەستینییەکانیش، لەم دەستوورە بەدەر نین! بەڵام، لێرەدا جیاوازیی لە نێوان کرێکارێکی « فەلەستینیی » و چەن کەسێکی وەک « زێوەر » و « بەرزنجیی »دا ئەوەیە، ئەوان کاتێ کار لە دەوڵەتێکی داگیرکەری وەک « ئیسرایل »دا دەکەن، هەر بەو تێڕوانین و لۆژیکەوە، لێی دەڕوانن، کە هەموو کوردێکی نەتەوەپەروەر لە « عێراق » دەڕوانێ، نەک داکۆکیی لە دەوڵەتێکی داگیرکەری نیشتمانەکەیان بکەن!

## 51/2. چەم و چەقەڵ :

هەر هۆنەرێ، نیو دێڕە هۆنراوەی بۆ خاکی عێراق و سەرکردەکانی گوتبێ، مەبەسەکەیان هەرچییەک بووبێ، من بە هەڵەی دادەنێم، جا ئیدی هەر کەسێ

دەبێ، با ببێ. لەبەرئەوە، پێویستی نەدەکرد، « بەرزنجیی » خۆی ماندووکردایە، سەری خوێنەریشی بیەشانایە، لیستی ناوی ئەو هونەرانەی بۆ بنووسینایە، کە هۆنراوەیان بۆ عێراق و شاکانی گوتووە. بریا، چەن هونەرێکی وەک « حەمدیی، پیرەمێرد، قانع، ا. ب. هەوریی ... تاد » ئەو جۆرە هۆنراوانەیان نەگووتایە.
« بەرزنجیی »، ناوی هێندێ هونەر و نموونەی لە هۆنراوەکانیان هێناوەتەوە. ئایا، ئەو کارەی بۆ کردووە؟ چ پێوەندییەکی بە سەر گوتارەکەی منەوە هەیە؟ چونکە، ئەو گوتارە، تەنیا بۆ « زێوەر » تەرخانکرابوو، ئیدی چ پێویستدەکا، ناوی هونەرانی دیکەش بێنم، کە هۆنراوەی لەو چەشنەیان هۆنیوەتەوە؟ لە گوتارێکی واشدا ناکرێ، لە هەموو خەسلەت و تایبەتمەندییەکانی ژیانی هونەر بکۆڵمەوە.
بە باوەڕی من، لە بەر ئەم خاڵانەی خوارەوە، ئەو شتانەی نووسیوە :
1. ویستوویەتی، داکۆکیی لە « زێوەر » بکا. بەڵام، نەیزانیوە، ئەو کارە چۆن بکا. یا ویستوویەتی، جەماوەری خوێنەری کورد تێبگەیەنێ، گوایە، تەنیا « زێوەر » هۆنراوەی لەو بابەتانەی نەهۆنیوەتەوە، ئیدی بۆچی نووسەر، تەنیا یەخەی ئەوی گرتووە؟ ئایا، خوێنەری وریا و بە ئاگا نازانێ، کام هونەری دیکە، لەو چەشنە هۆنراوانەی نووسیوە، یا هەر دەبێ، یەکێکی وەک ئەو بۆیان باسکا؟!! ئەمە لەوە دەچێ، من باسی « گەنمی قەنەهاریی » بکەم، ئەو بڵێ: ئەدی بۆ باسی « گەنمی ئاراس » ناکەی! هەر چەندە، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکەی خۆم، تەنیا هەر لە سەر ئەو جۆرە « گەنم »ەش بێ!
2. بەو نموونانە ویستوویەتی، هەڵەی ئەو هۆنراوانەی « زێوەر »، بە هەڵەی هونەرانی دیکە بشواتەوە. باسەکە لە بیر خوێنەری کورد بباتەوە. بەڵام، بریا هەر دەستی لێ نەدایە، باشتربوو، چونکە، زەویی بەیار بە گای لەڕ ناکێڵرێ!
ئەو هۆنراوانەی « زێوەر » نووسیونی، لەگەڵ ئەو هۆنراوانەی « بەرزنجیی » بە نموونە هێناونێتییەوە، لە سەراسەر، لەگەڵ مەبەسەکەی مندا، جیاوازییان هەیە.
ئاشکرایە، هەموو نووسەر و هونەرێ، بەرهەمی « جوان، گەش و بەهێز »، بەرهەمی « ناشیرین، سیس و لاواز »ی هەیە. ئەو هونەرانەی، هێندێ لە هۆنراوەکانیان، بۆ پیاهەڵدانی داگیرکەران تەرخانکردووە، لای من، بە بەرهەمێکی « ناشیرین، سیس و لاواز » دادەنرێن، نەک جێگەی شانازیی بن و داکۆکیی لە نووسەر و هونەرەکانیان بکەم!
مامۆستا « ا. ب. هەوریی » سالانێ مامۆستا و بەڕێوەبەری خوێندنەکەم بووە، کارێکی باشی نەکردووە، سروودی « جێژنی دارودرەخت »ی لە جێگەی « نەورۆز »

داناوە، مێژووش بە باشە بۆی تۆمار نەکردووە! خۆ ناشبێ، هەر لەبەرئەوەی مامۆستامان بووە، هۆنراوەی باشی هۆنیوەتەوە، یا هەر لەبەرئەوەی، بە زمانی کوردیی هۆنراوەی داناوە، سروودی بۆ منالآنی کورد ڕێخکستووە، ئیدی، هۆنراوە خراپەکانیشی بە چاک بۆ بژمێرین. خۆ هەر کەسێ گوێزیش بژمێرێ، هەرگیز پووچەکانی بە ساغ دانانێ! بەپێی باوەڕی ئایینییش بێ، هەر دەبێ، چاکە لە خراپە جیاکەینەوە، نەک تەنیا یەک لایەنە، لە چاکە یا لە خراپەکان بڕوانین. ئەوانەی چاکن، دەبێ، بە خۆشیی و شانازییەوە وەریانگرین. ئەوانەی خراپیشن، دەبێ، ڕەخنەیان لێ بگرین و ڕەتیانکەینەوە. جا، با نووسەرەکە یا هۆنەرەکە، لە سەر کورد لە سێدارەش درابێ، نەک تەنیا کوردایەتیی کردبێ!

هەڵبەتە، ڕاستیان فەرمووە: چەم بێ چەقەڵ نابێ! نووسەرێکی وەک « ڕەشید یاسمیی »ش، ڕاژەی زمان و مێژووی کوردی کردووە. ئیدی، هەر لەبەرئەوە دەبێ، چاو لەو هەڵە گەورەیەی بپۆشین، کە لە سەر داواکاریی شالیارگەی ڕۆشنبیریی دەوڵەتی داگیرکەری شای « ئێران »، بەرهەمی « مێژووی نەژاد و پەیوستەکی کورد »ی نووسیوە، بە کارێکی چاک و بە ڕاژەکردنێکی گەورەی بژمێرین، لە کاتێکدا، مێژووەکەمانی شێواندووە؟!! با بزانین، لەو بارەیەوە، زانایەکی وەک پرۆفیسۆر « قەناتی کوردۆ »، چۆن سەرلەبەری هەڵەکانی نووسەری دەسنیشانکردووە، ڕەخنەی لێ گرتووە و چی نووسیوە؟

(... ئاشکرا دیارە، کە چۆن مێژوونووسانی نەتەوەیی بۆرژوازیی فارسیی لە ئێراندا بە ئارەزووی خۆیان ڕەوڕەوەی مێژووی کورد وەر دەچەرخێن و دەشێوێنن. « ڕەشید یاسمیی » لەم ڕێگەیەوە پاکانە بۆ ئەو سیاسەتە کۆنەپەرستەی ناوخۆی ئێران دەکات، کە بەرامبەر بە گەلی کورد لە ئێراندا پەیڕەودەکرێت. بۆ ئەم مەبەستە ئینکاری میللەتانی تری خاوەن کەلتوور و زمانی خۆ دەکات. نووسینی پەرتووکەکەی لە سەر بنچینەیەکی شۆڤێنیی فارسیی وای لێ کردووە، کە تەماشای مێژووی کورد، وەک مێژووی « نۆکەران و پارێزەرانی تاجی ئێران » بکا. « ڕەشید یاسمیی »، سیاسەتی داگیرکردنی خاکی بێگانە بڵاودەکاتەوە. پڕوپاگەندە دژی کورد دەکا، کە گوایا، سەرشۆڕ و نۆکەری حوکوومەتی شای کۆنەپەرست بوون.)«50، 67-68»

جا گەر یەکێکی وەک « فەوزیی » هۆنەریش، ئەو هۆنراوەیەی گوتبێ، ئەوڕۆ دەبێ، « بەرزنجیی » و هەموو ئەوانەی باوەڕیان بەو جۆرە بیر و بۆچوونانە هەیە، لە تەختی لاملی بۆ بدەن و دەسخۆشانەیان لێ بکەن؟ ئەدی، بۆ چەن هۆنەرێکی وەک:

« شێخ نووریی شێخ سالح، بێخود، بێکەس... تاد »، لەو جۆرە هۆنراوانەیان نەهۆنیەوەتەوە؟ هەڵبەتە، ئەمەش پێوەندیی بە باوەڕ و ورەی ئەو جۆرە کەسانەوە هەبووە، تا چەن لەگەڵ کێشەی گەلەکەیاندا ڕۆشتوون؟ لە کوێدا وازیانهێناوە و پچڕاون؟ کەی سەرەداوی پێوەندیی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان، بە دەزگەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە گرێداوە؟ خۆ ناشکرێ، چەن هۆنەرێکی ناسراوی وەک: « حەمدیی، شوکری فەزلیی، پیرەمێرد »، هەر لەبەرئەوەی دڵسۆز بوون، لە دڵسۆزییەوە ڕەخنەیان لە « شێخ » و دەسەڵاتدارێتییەکەی گرتووە، بە پیاوی ئینگلیزیان دانێین! کەچیی، لەو کاتانەدا، زۆر ڕوویان نەدراوەتێ، بەڵام، چەن هۆنەرێکی وەک « زێوەر، کەمالیی و بێخود ... تاد »، لەو سەردەمانەشدا ژیاون، ئاگاداری هەموو کەموکوڕیی و کارە هەڵەکانیش بوون، کەچیی، خەوی خۆشی بێ ئاگاییان لە خۆیان خستووە، هیچیان لەو بارەیەوە نەگوتووە. تەنانەت، « کەمالیی » تا دوا ڕۆژەکانی ژیانیشی، ئامادە نەبوو، باسی ئەو سەردەمانە بە خراپە بکا، ڕەخنە لە « شێخ » و دەسەڵاتەکەی بگرێ.
کەچیی، لە هەمان کاتیشدا، ڕووناکبیرێکی گەورەی وەک « رەفیق حیلمیی »، زۆر ئازایانە و بە ڕاشکاویی، لە هێندێ جێگەی یادداشتەکانی خۆیدا، دەسی بۆ لایەنی هەڵە و کەموکوڕییەکانی ئەو سەردەمە ڕاکێشاوە. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر جێگەی باوەڕی « شێخ » و پیاوێکی خوێنەوار و نیشتمانپەروەر بووە. هەڵبەتە، ئەو جۆرە ڕەخنە و باسانە، تا ئێستەش، لای زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان، بە شتێکی نامۆ و بقە دادەنرێ! چونکە، گوێیان هەر بە پیاهەڵدان و چەپڵەلێدان ڕاهاتووە! لەبەرئەوە، کاتێکی زۆری دەوێ، تا ئەم ڕێبازە کۆنە دەگۆڕدرێ، ڕێبازی ڕەخنەی ڕیالیزم، لە نێو جەرگەی کۆمەڵی کورددا، جێگەی خۆی دەکاتەوە.

ئاخر، بە چ ویژدان و ئایینێ ڕەوایە، نووسەر و هۆنەران، لە ژیانی وێژەیی خۆیاندا، هەڵە نەکەن؟ تەنیا هەر، قسە لە سەر لایەنە چاک و گەشەکانیان بکەین و لایەنە خراپ و سیسەکانیان، بە ژێر لێوەوە کەین. دیارە، هەر لە کۆنەوە وامان کردووە، بۆیە، ڕۆژمان بەم ڕۆژە گەیشتووە!(کاتێ، نووسەران و شارەزایانی کورد، لە مێژووی ژیان و کارەکانی هەر ڕەوانشادێ دەدوێن، یا ڕۆڵی سەرکردەیەکی کورد هەڵدەسەنگێنن، تەنیا لە لایەنە گەش و کردەوە باشەکانی دەدوێن، لایەنە سیس و خراپەکانی بۆ لێفەپۆشدەکەن. بە تایبەتیی، گەر ئەو کەسە، خزمێکی زۆری هەبێ، یا خاوەنی بنەماڵەیەکی گەورە و دەسەڵاتدار بێ، یا هێزێکی

چەکداری گەورەی لە پشتەوە بێ، ئیدی، جگە لە پیاهەڵدان و باسکردنی بە چاکە، هیــچی دیکە نالێن و نانووسن! ئەمــەش خــۆی لە خــۆیدا، بە هــەڵەیەکی گــەورە دەژمێررێ، زیانێکی گەورە، لە مێژووی ژیانی ئەو جۆرە پیاوە هەڵکەوتووانە دەدا.
واشی لێدێ، کــەس باوەڕ بە هیچ نــەکا! ئایا، بە پێی کــام باوەڕی زەمــینیی و ئاسمــانیی ڕەوایە، پیــاوێکی ئاســایی یا کــەسێکی خــاوەن دەســەڵات، لە ژیانی خۆیدا، هیچ جۆرە هــەڵەیە نەکا؟ زیان لە خۆی، دەوروبەر و نەتەوەکەشی نەدا؟ جا با ئەو کەسە، تەنانەت گەورەترین « هۆنەر، نووسەر، هونەرمەند، زانا، رامیار و سەرکردە »یەکی هەڵکەوتوو و سەرکەوتووش بێ! بە تایبەتیی، گەر ئەو پیاوە، سەرکردەی گەلێکی بندەس بێ، یا بەرپرسی پارتێکی رامیاریی گەورەی دیاریکراو بێ، یا بزووتنەوەیەکی چەکداریی مەزن بەڕێوەبەرێ، چۆن دەبێ، هەڵەی نەبێ؟ ئەمە، مەگەر هەر لە نێو کۆمەڵگە دواکەوتووەکانی، گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەندا، رووبدابێ و بەو شێوەیە، رۆڵی مێژوویی کەڵەپیاوان هەڵسەنگێنرێ.
من لەو نهێنییە گەورەیەی کورد تێ ناگەم، بۆچی دەبێ، هەموو کەسێکی زیندوو و مردوو، یەزدانی گەورە، چۆنی دروسکردوون، چۆن هەن، هەر بەو شێوەیە باس نەکرێن، چاکە و خراپەکانیان لێک جیا نەکرێنەوە؟!! ئایا، بەپێی ئایینە ئاسمانییەکانیش بێ، هەر کەسێ بە گوێرەی کردەوەکانی خۆی، نامەی کرداری چاکە و خراپەی بۆ ناخوێنرێتەوە؟ ئیدی بۆ دەبێ، تەنیا باسی کردەوە چاکەکان و چاوپۆشیش لە کارە خراپەکان بکرێ؟ باوەڕ ناکەم، هیچ کەسێ هەبێ، لە ژیاندا هەڵە نەکات.)«24،30».
ئەدی، بۆچی وامان بەسەرهاتووە؟ ئەوەتە، کارەساتێکی گەورەی وەک هەرەسی شۆرشی « 11/سێپتێمبەر ی سالی « 1975 »، خەریکە بە هەموو شێوەیە، پینە و پەرۆدەکرێ. بە خاڵێکی چاک بۆ « بارزانیی » دەژمێررێ، کە تا ئێستەش، گەلی باشووری کوردستان بە تایبەتیی و نەتەوەی کورد بە گشتیی، بە دەم ئازار و ژانەکانییەوە دەناڵێنێ و باجەکەی دەدا!

## 52/3. گــوورگ و مــەڕ :

جا تو خوا دەبێ، چ دێڕێ لەو دێڕە هۆنراوەیە جوانتر و پڕ واتاتر بێ، لە رووی رامیارییەوە، قووڵتر و بەرزتربێ، لەو کاتانەدا، « دۆستەکانی ئینگلیز » بە ئاشکرا هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە و گوتویانە:

ئێمە کوردین، دۆستی ئینگلیزین، ئەگەر قبوڵمانکا
ئیدیعای ئێمە ئەمەس: تەسلیمی گورگانمان نەکا «103،44».

من چۆن دەتوانم، ڕەخنە لە بیرۆکەی ڕامیاریی ئەو پیاوە هوشیارانە بگرم، کە لەو سەردەمانەدا، ئەو هەستە پیرۆزەیان هەبووە، هێندە وشیاربوون، ئەو دروشمە بەرزەیان هەڵگرتووە؟ ئایا، ئەو جۆرە هۆنراوە ڕاست و باشانە، لەگەڵ مەراییکردن و پێداهەڵدان بە سەر شا « فەیسەڵ » و خاکی « عێراق »دا بەراوردەکرێن؟ وەک یەک تەماشادەکرێن؟ ئەوە مەگەر، تەنیا هەر کێچی خواروخێچی بەراوردکردنی « بەرزنجیی »، ئەو جۆرە بەراوردکردنانە بە پێچەوانەوە بخوێنێتەوە! ئەگینا، زلهێزێکی وەک « بریتانیا »، سەروەر و سەرداری « عێراق » بێ، بیەوێ، زمان و کەلتووری کوردیی ببوژێنێتەوە، ڕۆژنامە و گۆڤار بۆ کورد دەرکا، پێشبڕکێی زمانەوانیی و کوردیی پەتیی، بۆ هۆنەرەکانی کورد سازکا، ئیدی دەبێ، کورد لەوە پتر چیدیکەی بووێ، دوای ئەوەی، لە سەردەمی تورکە عوسمانییەکاندا، بە هیچ شێوەیە، ڕێگەی ئەو جۆرە کارانەیان نەداوە؟ خۆ ڕێکخراوێکی وەک « .P.K.K »، ماوەی پازدە ساڵە خوێندەرێژێ، چوار هەزار گوندی باکووری کوردستانیان بە وێرانکردندا، بە هەزاران ڕۆڵەی کوردیان بە کوشتدا، کەچیی، ئێستە داوای ئەوەش ناکەن، کە « بریتانیا »، پێش سێ چارەکە سەدە، بە کوردی داوە! لەوانەیە « بەرزنجیی »، دەنگی زوڵاڵ و بڵندی چەن هۆنەرێکی وەک « موفتیی پێنجوێنیی » و « پیرەمێرد »ی لە بیرچووبێ، کە لە باس و ستایشی ئینگلیزەکاندا، هۆنراوەیان بۆ داناون؟ کەچیی، لە بری ئەو هەموو هوشیارییە، ئەو جۆرە کەسانەی ئەو هۆنراوانەیان گوتووە، ڕەخنەی لێ گرتوون و نووسیوێتی: (ئاخۆ کورگی ئەو کاتە لەئینگلیز خۆی زیاتر کێ بووبێ؟ ئای کە گەلێکی بێ ئاگاو سەرکەردانبووە.)«49،3»
به ڕاستیی، گەر « بەرزنجیی »وا لە گرفتەکە گەیشتبێ، تەڕی تێگەیشتووە! هێشتا، ئەو هۆنەرانەی لە کاتی خۆیدا، ئەو هۆنراوانەیان هۆنیوەتەوە، گەلێ لە چەن « عێراقچیی »یەکی وەک ئەو ڕووناکبیرتر و وشیارتربوون. چونکە، بە لانی کەمەوە، پێش حەفتا ساڵ ئەو دروشمەیان بەرزکردۆتەوە، کەچیی، ئێستەش لە ناوەرۆکەکەی ناگا و کورد بە « گەلێکی بێ ئاگا و سەرکەردان » دادەنێ! جا، کورد چی بکا، خۆ « بەرزنجیی » لەو سەردەمەدا نەژیاوە، تا دژی داگیرکەری ئینگلیز، وشیاریانکاتەوە، هێندەی دیکە « بێ ئاگاو سەرکەردانیان » کا!
کریمان، ئەو کاتە، ئینگلیز « گوورگ » بووە، ئەدی تورکە داگیرکەر و عەرەبە شۆڤێنییەکانی عێراق، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، چی بوون؟ تۆ بڵێی، هێندە بێ دەسەڵات و بەسەزمان بووبن، وەک « مەڕی پەیامبەر » وا بووبن، ئێمەومانان نەمان

زانیبێ! ئایا، کامیان لە گورگ خراپتر، کەڵبەی تیژ و ژاراوییان، لە جەستەی کورد و ئاسکەکێویی خاکی نیشتمانەکمان گیرکردبوو؟ یا لای « بەرزنجیی »، تەنیا ئینگلیز بە داگیرکەر و ئەوانیش بە برای گەورەی ئایینیی و لە نەوەی پەیامبەر دادەنرێن! ڕاستە، داگیرکەر هەر داگیرکەرە، گەر پەڕ و باڵیشی لە زێڕ بێ، گەر تا بن هەنگلیشی هەنگوین بێ و بە قورگی گەلە ژێر دەسەکانیشیدا بکا.
بەلام، داگیرکەران لە هەموو سەردەمێک و لە هەموو کۆلۆنیایەکدا، لە پلەی دڕندەیی، کاری چاکە و خراپەدا، جیاوازییان هەر هەبووە و هەر هەشە.
هەمووشمان بە چاوی خۆمان دیمان، هێندێ لەو وولاتانەی، لە بندەسی ئیمپریالیستی بەرەی ڕۆژاوادا بوون، چۆن ڕزگاریانبوو، وولاتەکانیشیان لە گەڵێ ڕووەوە، نەک هەر لە کوردستان، بەڵکوو، تەنانەت زۆر لە چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەش، پێشکەوتووتر و باشترن!
ئایا، هەر ئیمپریالیزمی « بریتانیا » نەبوو، دەوڵەتی بۆ عەرەبەکانی « عەرەبستانی سعوودیە، ئوردوون و عێراق » دامەزران؟ هەر ئیمپریالیزمی « فەرەنسا » نەبوو، دەوڵەتی بۆ عەرەبەکانی « سووریا » دروسکرد؟ کەچیی، ئێمە دوای ئەوەندە سەدەی بندەسیی « فارس و تورک »، و هێندە ساڵی ژێر دەسیی هەر دوو دەوڵەتی « عێراق و سووریا »، تازە خەریکە قڕمان دەکەن!
ئەز هەر زوو گوتوومە: (گەر خوارووی کوردستان، وەک کۆلۆنیایەک لە بندەسی «بریتانیا »دا بمایەتەود، خۆراوای کوردستانیش، لە ژێر دەسی « فەرەنسا »دا بووایە، بەشەکەی « یەکێتی سۆڤیێت »ی کۆنیش، هەر لە بندەسی ڕووس خۆیدا بووایە، یا کوردستان بە گشتیی، کۆلۆنیایەکی سەر بە یەکێ لەو دەوڵەتە دیمۆکراسییانەی ئەورووپا بووایە، بە بەراوردکردن لەگەڵ داگیرکەرانی ئەوڕۆی کوردستاندا، ئێستە کوردستان دەمێبوو، ڕزگاریبووبوو، نەتەوەی کوردیش، بە ئازادیی دەژیا و خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆی بوو. نەک وەک ئێستە، بە دەس گەلانی باڵادەسی « تورک، فارس، عەرەب و ئازەر »ەوە، لە گۆڕەپانی نیشتامانەکەی خۆیدا، وەک فوتبۆڵ شەقشەقێنی پێ بکەن. هەرگیز ڕۆژیشی بەم ڕۆژە تاریکە نەدەکەیی، هەرگیز کیمیاباران و ئەنفالیش نەدەکرا، دەسیان بۆ ئابڕووی کیژ و ژنانی کورد نەدەبرد.)«337،29»
ئەوەتە، یەکێکی وەک دوکتۆر« سمایل بێشکچیی »ش لە چەن جێیەکی نووسینەکەیدا، ئاماژەی بەوە کردووە. دەربارەی ئیمپریالیزمی تورک و گەلی باکووری کوردستان، نووسیوێتی: (گەر باکووری کوردستان، لە ژێر دەسی

داگیرکەرێکی دیکەدا بووایە، بۆ نموونە: وەک ئیمپریالیزمی ئینگلیزیی، ئەوا لە مێژە ڕزگاربیووبوو، هیچ هێزێکی ئیمپریالیزمی دیکە، بەو تێکدانە هەڵ ناسێ، کە دەزگەی تورکیی ئەنجامیداوە. چونکە، ئیمپریالیزمی تورکیی، هێرشیکردۆتە سەر هەموو نرخ و بنەمایەکی مرۆڤی کورد، کەرامەت و ئابرووی کوردیان خستۆتە ژێر پێی خۆیان. مرۆڤی کوردیان ڕوخان. هیچ هێزێکی ئیمپریالیزمی، لە هیچ شوێنێکی دیکەی جیهان وەک ئەوانیان نەکردووە.)«52،35»

هەروەها، دەربارەی کوردستان بە گشتیی نووسیوێتی: (کاتێ مرۆڤ لە مێژووی کوردەکان وردەبێتەوە، دەبینێ، چۆن ئادەمیزادی کورد و گەلی کورد، بە درێژایی مێژوو بوونەتە کوێلە و ئەم کوێلەیەتییەش، تا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوامە) «48،35». هەروەها نووسیوێتی: (کاتێ لە ئیمپریالیزم و ڕێکخراوی هاویەش دەدوێین، نابێ ئەوەمان لەیادچێ، کە کوردستان لە کۆلۆنیاشی تێپەڕاندووە. کوردستان وڵاتێکی دابەشکراو و لەتلەتکراوە لە نێوان چەن دەوڵەتێکدا. کوردستان کۆلۆنیایەکی نێو دەوڵەتانە)«67،35».

## 53/3. گۆشت و ئێسقان :

دوای ئەو کۆدەتا ڕەشەی بۆ کورد، هەر مایەی نەگبەتیی بوو، هونەرمەکانی کورد، زۆر بێ ئاگایانە، بە کۆدەتاکەیاندا هەڵداوە و گۆرانییان بۆ « عەبدولکەریم » گوتووە. هەر چەندە، « بەرزنجیی » سەردەمی کۆنی پێ باشترە، بەلام، دیسانەوە بە شانازییەوە نووسیوێتی:(لە هەمولایەکەوە شاعیران کەوتنە هۆنینەوەی شیعرو چامەی درێژ درێژ بە گەورەیی ڕووداوەکەو سەرکردەکانیا ...)«49،3»، هەڵداوە، بێ ئەوەی کەمێ چاوەڕوانکەن، تا بزانن، « کاکە کەریم » چی بۆ کورد پێیە! ئاخر، ئەو جۆرە هونەر و ڕامیارانە، بەو شێوەیە کاری ڕامیاریی و پارتایەتییان کردووە، بۆیە، تا ئەوڕۆش گەلەکەمان لە باشووردا، باجەکەی دەدا و دەناڵێنێ!

ئێمە نەتەوەیەکین، دوژمنی باوەکوشتەی خۆمان، بە برا و بڕبڕەی پشتی خۆمان دەزانین. لە مێژوودا، دوو نەتەوە هەیە، وەک کورد خاکیان داگیر و لەتوپەتکراوە ، هەر پارچەیەکیشی، بە سەر دەوڵەتێکدا بەخشراوەتەوە و تا ئەوڕۆش بە پارچە پارچەکراوی ماونەتەوە. ئەوانیش « باسک و مەکەدۆنیی »یەکانن. « باسک » لە نێوان « سپانیا و فەرەنسا »دا دابەشکراوە. « مەکدۆنیا »ش، لە نێوان هەر سێ دەوڵەتی « یۆگۆسلاڤیا، یۆنان و بولگاریا »دا، سێ کوتکراوە. بەلام، هەرگیزا و هەرگیز، هەستی نەتەوەیی هیچ کامێکیان، هێندەی هەستی نەتەوەیی کورد لاواز نەبووە و نییە. ئێمەی کورد، نەتەوەیەکی زۆر و بۆرین، تا بڵێی، دوژمنمان زۆر و

بۆستی ستراتیژییمان کەمە. کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، داگیرکەران بە برا و دەوڵەتەکانی دوور لە کوردستان، بە دوژمنی سەرەکیی خۆمان دەزانین! ئەم لێکدانەوە و بۆچوونانە، تەنیا هەر ئەوە دێنێ و هەڵدەگرێ، بڵێین: کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە!

ئایا، هەر « بریتانیا و ئەمێریکا » نین، ئێستەش لە دەس ڕژێمێکی فاشیی دەوڵەتێکی داگیرکەری وەک « عێراق »، پارێزگاریی گەلی باشووری کوردستان دەکەن؟ خۆ گەر چاوی ئەوانیان لێ دیار نەبێ، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، ئەم جارە « بەرزنجیی » لە چ ڕێستۆرانێکی هێندێ لە دەوڵەتە عەرەبییەکانی وەک: « سعوودیە، سۆدان یا یەمەن » قاپشۆریی دەسدەکەوێ! جا ئیدی چۆن، « سۆسیال »ی دەوڵەتێکی ئەورووپای دیمۆکراسیی دەسدەکەوێ! ئەوەتە، ئێستەش وەک کۆنە « عێراقچیی »یەک، بە دەمیدا نایە، بڵێ گەلانی « عێراق » هەر بە گەلی « عێراق » دەپەیڤێ و دەڵێ: (قۆناغی دوای چواردەی تەممووزی 1958، بەرزکاری و پسانی کۆتاو زنجیرەکان دانرا، بەرزۆکاری دەستخستنی مافە دیموکراتیەکانی گەلی عێراق، بەکوردو عەرەبیەوە، دانرا ..تاد)«49،3» ئاخر دیارە، هەر کەسێ، بە گەورەیی فێری پلاوخواردن بوو، دەس بۆ لووتی دەبا!

هەروەها، هۆنراوەیەکی بۆ بەهێزیی بۆچوونەکانی خۆی هێناوەتەوە، جگە لەوەی لە نێوەدێری سێیەمدا، لە بری « کارگەر» « کرێکار»ی نووسیوە. ناوی هۆنەرەکەشی نەهێناوە! کەچیی، سەرچاوەکەی دەسنیشانکردووە. هەڵبەتە، باشی زانیوە، کێ ئەو هۆنراوەیەی داناوە. بەڵام، دیارە وا پێویستیکردووە، ناوەکەی نەنووسێ! هۆنراوەکەش، « برایم ئەحمەد » بۆ « عەبدولکەریم قاسم »ی هۆنیوەتەوە. سەرەتا لە ڕۆژنامەی « خەبات »دا بڵاوکراوەتەوە، پاشان، لە ئاهەنگی « یانەی سەرکەوتن »دا خوێندوویەتیەوە و گوتوویەتی:

« کەریم » گۆشت و ئێسقان نییە
هەر تاقە یەک ئینسان نییە
« کەریم » خۆی بیر و باوەڕە
خەوی کارگەر و ڕەنجبەرە
ڕەمزی گەلی خەباتکەرە
ئاڵای نیشتمانپەروەرە
بۆ « کەریم » هەر نەمان نییە

* * *

« کەریم » لای گەل ئازادیە
ئاشتیی، ئاسایش، ئازادییە
مانای سەربەرزیی ژیانە
بۆ گەل، بۆ ئەم نیشتمانە
بۆیە هەرچی کە هەمانە
گەر ماڵ و حاڵ، گەر گیانە
ئەیکەینە قوربانی « کەریم »
ئەگینا « کەریم »ی تەنیا
وەک ئەو « کەریم »انەی دنیا
کەس نازانێ، مرد یا ژیا «85،61»

ئەز، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: نەک هەر ئەم هۆنراوەیە، بەڵکوو، هەمــوو ئەو هۆنراوە و شتانەی دیکەش، لە دوای کۆدەتا سەربازییەکەی « عەبدولکەریم »ی سالی « 1958 »وە گوتراون، ئیدی هەر کەسێ گوتبێتی، هەر لە هەمان خانەدا جێگەیان دەبێتەوە. هەمووی نیشانەی پەلەپلیی و هەڵەشەیی، خاوەنەکانیانی بە ئاشکرا پێوە دیارە. دوور نییە، نووسەرەکانیان، دواتر پەنجەی پەشیمانیی خۆیان گەستبێ. چونکە، ڕۆژگار سەلماندیی و بۆمان دەرکەوت، « کەریم » وەک هەموو مرۆڤێکی دیکە، « گۆشت و ئێسقان » دەرچوو، « هەر تاقە یەک مرۆڤ » بوو، هەرگیز « خۆی بیروباوەڕ » و « خەوی کارگەر و ڕەنجبەر » نەبوو، بە هیچ شێوەیە، « سوونبولی گەلی خەباتکەر » و « ئاڵای نیشتمانپەروەر » نەبوو. ئەو پیاوەش دەرنەچوو، وەک « برایم ئەحمەد » لە گوتارێکدا گوتوویەتی: (بێ گومان سەرۆک « عەبدولکەریم قاسم »، لە بەر چاوی گەلی کورد، تەنیا ڕزگارکەری گەلی « عێراق » نییە بە عەرەب و کورد و کەمە نەتەوایەتییە برادەرەکانی، بەڵکوو ڕزگارکەری نەتەوەی کوردیشە لە زوڵم و زۆری چەوسانەوەی نەتەوایەتی.) «83،61»

بەڵکوو، ئەو پیاوە کەللەڕەقە دیکتاتۆرە شەڕانگێزە دەرچوو، کە هەموو گەلانی « عێراق »ی بێزارکرد، کوردی لە خەوی خۆشیی و ئازادیی بێ بەشکرد. لەمەشدا، بە پلەی یەکەم، هەر دوو سەرکردایەتیی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » و بە پلەی دووەمیش « پارتی دیمۆکراتی کوردستان ـ عێراق » تاوانباربوون. چونکە، پەلەیان لە بڕیارەکانیاندا کردووە. ئەوە، لە بری ئەوەی چاوەڕوانیانکردایە، تا بزانن، سەرۆک « کەریم » بۆ گەلانی « عێراق » بە گشتیی و بۆ گەلی کورد بە

تایبەتیی، چی پێیە؟ یا داوای مافە ڕەواکانی کوردیان بکردایە، ئینجا دەسیان بە با بژی « کەریم »، بڕوخێ ڕژێمی پاشایەتیی و بمرێ ئیمپریالیزمی « بریتانیا » بکردایە! بەڵام، کاتێ خاوەن ماڵ، ڕێی ماڵەکەی خۆی بیرچووەوە، لە بری ئەوەی، ڕوو لە ماڵە کاولەکەی خۆی بکا، ڕووی لە مزگەوت کرد، تا ماڵیش وەستابێ، مزگەوت حەرامە، ئیدی دەبێ، چیدیکە لەو خاوەن ماڵە چاوەڕوانکرێ؟!!

هەڵبەتە، ئەو « نووسەر، هۆنەر و ڕامیار »انە، هەموو شتێکیان، تەنیا هەر بە ناوی « شۆڕش، شۆڕشگێڕیی و پێشکەوتنخوازیی »یەوە کردووە، لە پێناوی بەرژەوەندیی کۆمارە ساواکەی « عێراق »دا، چاوپۆشییان لە مافە ڕەواکانی گەلی کورد کردووە! بۆیە، لە کاتێکدا، زۆربەی زۆری گەلی کورد لە باشووردا، هەموو هیوایەکیان « بارزانیی » بوو، ئەویش خۆی، چەن جارێ ئەوەی دووپاتکردۆتەوە و گوتوویەتی: من سەرۆک و قارەمان نیم. بەڵکوو، من نۆکەری گەل و سەرۆکە تاقانەکەی « عەبدولکەریم قاسم »م.

کاتێکیش، بڕیاری گەڕانەوەی « بارزانیی »یەکان دەرچووە و گەڕاونەتەوە، لە سەرەتای شەستەکانیشدا، مۆڵەت بە « پارتیی » دراوە، بە ئاشکرا کاربکا، ئیدی سەرانی پارتیی وایانزانیوە، هەموو مافە ڕەواکانی گەلی کورد دراوە و جێبەجێش کراوە. جا هەر زۆر دوور نەڕۆین، لە «1961/09/11»ەوە، لە کوردستان جەنگ دەسپێکردووە، تا یەکەم گفتوگۆی ساڵی «1963»ی کۆنفرانسەکەی شارۆچکەی « کۆیە »، سەرانی پارتیی و « بارزانیی » خۆشیان نەیانزانیوە، داوای چی بکەن! تازە دوای دوو ساڵ کوشتن و وێرانکردنی کوردستان، کۆبوونەوەتەوە، تا بڕیار بدەن، داوای چی لە سەرانی ڕژێمی نوێ بکەن. (مانگی مارسی 1963 ـ کۆبوونەوەی پیاوماقوڵان و سەرانی شۆڕشی کورد، لە شاری « کۆیسنجەق » پێکهات، کە داوایان لە دەوڵەتی « بەعس » چی بێت؟ »)«855.41»

جا ئیدی نازانم، « بەرزنجیی »، بۆچی لەگەڵ مندا ڕێک ناکەوێ، کە یەکێ لە گرفتە هەرە گرنگەکانی گەلی کورد لە باشوور بە تایبەتیی و نەتەوەی کورد بە گشتیی، خۆی لە گرفتی سەرکردایەتیکردنی کورددا دەنوێنێ؟ ئایا، هەر ئەو سەرکردانە و ئەو پارتانە نەبوون، کوڕی کوردیان فێری بیری « عێراقچێتیی » کردووە؟ گۆرانییان بۆ برایەتیی درۆزنانە و خەباتی نێوکۆیی چینی پرۆلیتاریای عەرەب و کورد گوتووە؟ خەڵکیان هانداوە، بە سەرانی داگیرکەرەکەدا هەڵدەن، گەر یەکێ جنێوێکی بە سەرۆک کۆماریش دابێ، ئەوان لە پێش پۆلیس و سەربازەکانی دەوڵەتەوە، لێیان پرسیوەتەوە و سزایانداوە! ئیدی دەبێ، لەوە پتر چاوەڕێی

چیدیکە، لە هۆنەر و نووسەرەکانمان بکەین، گەر باری کورد و جۆری بیرکردنەوەی سەرکردەکانی بەو شێوەیە بووبێ؟
هەڵبەتە « بەرزنجیی » نازانێ، « نکوڵی!» چی دەگەیەنێ، ئەگینا، من « نکوولیی »م لەو شتانە نەکردووە و ناشیکەم. بەڵکوو، ڕەخنەم لێ گرتوون. بۆیە نووسیوێتی: (دیارە ئەمەش بەشێکە لەبەرهەمەکانی ئەو شاعیرەو نموونەی ڕۆژانێکە لەژیانی سیاسی گەلەکەمان، ئایا دەبێ، نکوڵی لێ بکرێ؟:)«50،3».
ڕاستە، بمانەوێ و نەمانەوێ، ئەوانە بەشێ لە مێژووی خەباتی ڕامیاریی و وێژەیی گەلەکەمان پێکدێنن. بەڵام، تەنیا گوزارە لە بیری ئەو هۆنەرە خۆی دەکا، نەک هەموو گەل، لەو سەردەمەدا بەو شێوەیە بیریکردبێتەوە یا ئێستە بەو شێوەیە بیر بکاتەوە! بۆیە، گەلێکیش دەبێ، بە شێوەیەکی بەردەوام، شەنوکەوی مێژووەکەی بکا، بە چاوی ڕەخنەوە تەماشایکا و لێی بکۆڵێتەوە، تا ئەو هەڵانەی کراوە، دووبارە نەبنەوە، پەند لە مێژوو وەرگرن. ئەگینا، بۆ ڕووداوەکان تۆماردەکەین؟ مێژوو چییە؟ کەڵکی چییە؟ گەر وانەبێ، کەی مێژوو بە ناوێنەیەکی بالانمای خاوێنی ڕووداو و کارەساتە مێژوویییەکانی سەردەمە جیاوازەکان دەژمێررێ؟
ڕاستە، کورد پێویستی بە هەڵسەنگاندنی دیاردەکان هەیە، بەڵام، ئەو هەڵسەنگاندنە، بە هەموو کەس ناکرێ، هەموو نووسەرێ ناتوانێ، ئەو کارە بکا، یا هەموو کەس ئەو ئازایەتیی و لەخۆبووردنەی تێدا نییە، بە چاک بڵێ چاک و بە خراپیش بڵێ خراپ! گەر واش نەبێ، ئەوا هەڵسەنگاندنەکە، هەڵسەنگاندنێکی لەنگ و کێر دەردەچێ.

### 54/3. سۆپەرمـــان :

گەر هەر نووسەرێ یا هۆنەرێکی کورد، شتی باشی بۆ نەگووترێ و بۆ نەنووسرێ، یا نەتوانێ، بیڵێ و بینووسێ، لەبەرئەوەی، لەو وڵاتانەی کوردستانی پێوە لکێنراوە، دیمۆکراسیی و ئازادیی تێدا نییە، با شتی خراپیش نەڵێ، ناو و ناوبانگی خۆی و گەلەکەشی لەکەدار نەکا! کەسیش داوای لە هونەرمەندی کورد نەکردووە، شتی خۆکوژیی بڵێ و ببێ بە « سۆپەرمان »، وەک « بەرزنجیی » نووسیوێتی: (لە هەڵسەنگاندنی مێژووی سیاسی هونەری کوردستاندا، لەجیاتی هەست و خەیاڵ و خۆشەویستی ساکار پشت بەڕاستەقینەی ڕوداوەکان ببەستن و هونەرمەندی کورد لەدنیای خەیاڵاتدا نەکەن بەسوپەرمەن ـ کورد، دوای ئەو هەمو نوشوست و تێکشکانە پێویستمان بەهەڵسەنگاندنی وردی دیاردەکانە، نەک پێچانەوەو شاردنەوەی ڕاستیەکان.)«50،3».

هەموو نووسەر و هۆنەرێ دەبێ، سنووری توانا و لێهاتوویی خۆی، زۆر باش بزانێ، ئینجا تاوی پێنووسەکەی بدا و دەس بە نووسین بکا. چونکە، وەک گوتوویانە: بەردی زل، نیشانەی نەهاویشتنێتی!
هۆنەر و بلیمەتێکی وەک « هۆراس65-08 » پ. ز. کە پتر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ژیاوە، دەربارەی بیرکردنەوە و بەرپرسیاریی گوتوویەتی: (بە وردیی بیر لەوە بکەنەوە، کە ئەستۆتان لە ژێر باری چ شتێکدا دەناڵێنێ و دەتوانێ، چ شتێک هەڵگرێ. ئەگەر پیاوێ زیرەکانە، بابەتەکانی خۆی هەڵبژارد، ئاسانیی و روونیی دەربڕین، لێی یاخی نابن. جوانیی و رەونەقی ڕێکخستن، ـ ئەگەر بۆچوونەکەم ڕاستبێ ـ لەوەدایە، پێویستە لە سەر هۆنەری ئەو چامە نایابەی، هەموو خەڵک بێ ئارامانە چاوەڕوانێتی، ئەو شتە بڵێ، کە پێویستە بوترێ و زۆر شت دوابخات، تا وەکوو کاتی خۆی دێ. با ئەمەیانی خۆشبوێ و قێز لەوی تریان بکاتەوە.) «17،60». ئەگینا، گەر وا نەبێ، بەرهەمێکی هیچ و کاڵوکرچ پێشکەشدەکا و هیچ جۆرە چێژ و رەونەقێکی وێژەیی نابێ!
## 55/3. هێمن و هــــەژار :
ســوپاس بۆ خــوا، ئەوا « بەرزنجـیی »، وردەوردە و بە خـشکەیی، لە سنووری باشووری کوردستان و « عێراق »یش پەڕییەوە، پەنای بۆ بەر بەشەکەی رۆژهەڵات و « ئێران »یش برد، یەخەی « هێمن »یشی گرت و نووسیوێتی: (« هێمن »ی شاعیر، بەبۆنەی لەدایک بوونی رەزا پەهلەوی کورە گەورەی حەمە رەزا شاوە « بەهاری بێ خــەزان » لەژمـارە 93ی 26 رێبەندانی1933 » 961/2/15 »ی رۆژنامەی « کوردستان » چاپی تاران بڵاو دەکاتەوە: ... )«50،3».
وەک ئەو خەڵکە خوێندەوارە نەزانێ، « هێمن »یش ئەو هەڵە گەورەیەی کردووە! بەڵام، « بەرزنجیی» ویستوویەتی، لە لایەکەوە، دید و هەڵوێستی خۆی پێ بەهێزکا، لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو هۆنراوانەی « زێوەر »یشی پێ داپۆشێ. بۆیە بە هەڵەی نەزانیوە. بەڵکوو، بە دیاردەیەکی ئاسایی داناوە. چونکە، باری ئەو کاتەی هۆنەر وابووە! ئایا، کــەس زۆری لێ کــردبوو، ئەو هۆنراوەیە بڵێ؟ یا لە بەر لاوازیی هەستی نەتەوەیی و هوشیاریی رامیاریی ئەو سەردەمەی گوتوویەتی؟ دووریش نییە، نائومێدبووبێ و وەرەی ڕوخابێ، بـۆیە، ئەو هەڵەیەی کردووە.
ئەگینا، لە ڕاستییدا، کەم کەس هەیە، هێندەی من « هێمنیست » بێ! بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەرگیز ئەو هۆنراوە قرخنەی لێ وەرناگرم، بیانووەکەی هەرچییە بێ، پێی قایل نابم و بە چاوی رەخنەوە لێی دەڕوانم. لە هەمان کاتیشدا، هەرگیز

هێڵێکی ڕاست و چەپ، نەک هەر بە سەر هۆنراوەکانی دیکەی « هێمن »، بەڵکوو بە سەر هۆنراوەی هونەرەکانی دیکەی کوردیشدا ناهێنم. بە پێچەوانەشەوە، هۆنراوە ڕۆمانسیی و نیشتمانییەکانی، وەک کۆڕپەیەکی ساوای ئێسکسووک و شیرین، زۆر بە گەرمییەوە لە ئامێزدەگرم.
دە دیارە، هەستی نەتەوەیی و هوشیاریی ڕامیاریی « هەژاری موکریانیی »، لەو کاتەدا گەلێ بەهێزتر و گەشەدارتربووە. بۆیە، وەک هاوڕێیەکی دڵسۆز، بە هۆنراوەیە گلەیی لە « هێمن » کردووە، بە هۆش خۆی هێناوەتەوە و ڕێگەی ڕاستی پیشانداوە! هەڵبەتە، ئەوە خەسڵەتی مرۆڤە و یەزدان وای دروسکردووە، هەمیشە لە « هەڵبەز و دابەز، هەڵکشان و داکشان، پەلەکردن و پەشیمانیی، دڵەڕاوکە و نیگەرانیی، گومان و خۆخواردنەوە »دایە. لەبەرئەوە، کەم مرۆڤ هەیە، لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوبێ، زۆر بەهێزبێ، وەک ئاووهەوای زەریای « سپی ناوەڕاست »، زووزوو نەگۆڕێ، لە کوێوە بای هات، لەوێوە شەنوکەوی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی نەکا، هەر کە بارانیش بوو، ئاشی خۆی نەگێڕێ! ئەگینا، گەر وا نەبووایە، ئەو کۆمەڵە « نووسەر، هونەر و ڕووناکبیر »انە، بۆچی ئەو هەڵە زەقانەیان دەکرد؟ بەرژەوەندییان لەوەدا چی بووە؟ خۆ ناشێ، بڵێین: لە پێناوی مشتێ پوڵدا، ئەو هۆنراوانەیان هۆنیوەتەوە و خۆیان فرۆشتووە! یا بڵێین: پیاوی داگیرکەر بوون! یا بڵێین: هەر حەزیانکردووە، ڕۆڵەکانی گەل ڕەخنەیان لێ بگرێ!
جا بەس نییە، یەکێکی وەک « هێمن »، هێندە ئازابووە، دانی بە هەڵەکەی خۆیدا ناوە، لەو هۆنراوەیە پەشیمانبۆتەوە و گوتوویەتی: (مەگەر ژانی ئەمشەوم بەقەد ژانی شیعرێکی زۆڵەکم بووبێ کە لەسەر دەمانێکەوەیە ئازارم دەدا.)«53،3»
هەر چەندە « هێمن خۆی، ئەوە بیر و بۆچوونی بووە، کەچیی، « بەرزنجیی » نەک هەر دانی بە هەڵەکانی خۆیدا نەناوە، بەڵکوو، داکۆکییشی لە هەڵەی خەڵکی دیکە کردووە. بە ڕاستیی، ئەو قسانەی ئەو کردوونی، زۆر لە مێژە کۆنبوون و باویان نەماوە. دەمێکە، هێلی ئاسنینی قسەکانی، شەمەندەفەری ڕاستیی پێدا تێپەڕ نابێ و وەک ئێسکەیەکی داخراو وایە!

## 56/3. باخچەی گـــولان :

بەرهەمی هونەران وەک باخچەی گولان وایە، هەموو جۆرە گوڵێکی ڕەنگاوڕەنگی لێ دەڕوێ، هەموو جۆرە بۆنوبەرامەیەکی خۆشی لێ هەڵدەستێ. بەڵام، لە نێو هەموو گوڵەکاندا، گوڵێ لە هەموو گوڵەکان، « گەشتر، جوانتر، تەڕتر و دڵفڕێنتر »

دەردەکەوێ. بۆنوبەرامەی لە هەموویان پتر، کار لە مێشک دەکا. جگە لەوەی، هەر کوڵێکیش، جوانیی و بۆنی تایبەتیی خۆی هەیە. هۆنەریش، هەر چەندە هۆنراوەی جۆراوجۆر دانێ، هەر لە بوارێکی دیاریکراودا دەتوانێ، زۆر سەرکەوتووبێ. بەلام، لە بوارەکانی دیکەدا، هۆنراوەکانی کەمێ یا زۆر لاوازتر خۆیان دەنوێنن. بۆیە، هیچ هۆنەرێ، لە هەموو بوارەکانی هۆنراوەهۆنینەوەدا ناتوانێ، بە هەورازی سەختی هۆنراوەدا سەرکەوێ و بە لووتکەی بەرزی نەمریی بگا. بەڵکوو، تەنیا لە یەکێ لەو بوارانەدا دەتوانێ، بە تەواویی پەیامەکەی خۆی بەجێگەبەنێ و تاجی شای هۆنەران لە سەرنێ. ئەمە ڕاستییەکی تەواوە و بەڵگەی ناوێ، پێویستە، هەموو هۆنەرێ دانییپێدابنێ!

لە هەمان کاتیشدا، هەموو هۆنەرێ، چەن گەورە و بە توانابێ، چەن بەرهەمی جۆراجۆری زۆری هەبێ، چەن خاوەنی ئەزموونی مێژوویی و وێژەیی تایبەتیی خۆی بێ، چەن ڕووناکبیر و وریابێ، هەر هۆنراوەی لاوازی هەیە و هەڵەشدەکا. بەلام، گرنگ ئەوەیە، خۆی دان بەوەدا بنێ، هەوڵ بۆ بژارکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی هونەریی و وێژەیی خۆی بدا. خۆی پتر ڕۆشنبیرکا. کەڵک لە ئەزموونی هۆنەرانی دیکەی کورد و بیانییش وەرگرێ. چونکە، جگە لەوەی، هەر تەنیا هۆنراوەهۆنینەوە بەس نییە، بەڵکوو، باشتر وایە، هۆنەر ڕووناکبیریش بێ. لەگەڵ ئەوەشدا، هێندێ هۆنەر هەن، هەست بە لاوازیی و هەڵەکانی خۆیان دەکەن، بەلام، لە بەر هەر هۆیە بێ، خۆیانی لێ بێ دەنگدەکەن. دەردی «هۆراس» یش گوتوویەتی: (هەندێ هەڵە هەن، پێمان خۆشە، پشتگوێیانخەین. ژێ ئەو ئاوازە نادات، کە دەست و ئەقڵ لێیان دەوێ و زۆر جار کە تۆ ئاوازێکی قورست لێ دەوێ، ئەو ئاوازێکی تیژت دەداتێ. هەروەها، کەوان هەمیشە نیشانە ناپێکێ، کە خەریکبوو، بیپێکێ.)«31،60».

هەروەها، «هۆراس» دەربارەی هۆنراوەی لاواز و بەهێز، نووسەری بە توانا و دەسڕەنگین گوتوویەتی: (پیاوی دەسپاک و زیرەک، پەردە لە سەر هۆنراوەی لاواز لادەبات و ڕەخنە لە هۆنراوەی ڕەزاقورس دەگرێ و نیشانە لە سەر هۆنراوەی خراپ دادەنێ و خۆی لە باقوبریقی بێ سوود دووردەگرێ و داوات لێ دەکات، گوزارە تەمومژاوییەکان، ڕوونکەیەوە و ئاماژە بۆ ئەوانە دەکات، کە پێویستە بگۆڕدرێن.)«36،60» من پێم وایە، هەر وەک چۆن، مریشک هێلکەی پاک و ڕیقنەی بۆگەنیش دەکا، هەر بە هەمان شێوەیەش، هەموو هۆنەرێ، هێلکەی زێڕین و ڕیقنەی بۆگەنی هۆنراوەی هەیە!

## 56/3. نووســـــەر و هۆنـــەر :

هەڵبـەتە، وەک « بەرزنجیی » نووسـیویّتی: (هـەرچۆنێ بێ شـاعیـر مرۆڤـەو بارو ساتەوەختـی واش دێت بەسـەردا کـەلەناچاریدا مـشت لەئاوی سـەربە قـەوزەو مەگەزی ناو گۆلیش دەگریّتەوەو سەرەو ژوور بۆ دەمی دەبا.)«54،3»

بەلام، ئەو هۆنەرانەی، بەو شێوەیە ڕەفتاردەکەن، تا چاو لێکدەنێن، نە خۆیان و ویژدانی نەتەوەیی و ویژەییان، لە ئارامییدا نۆقرەدەگرن، نە لە دەس چاوی زیت و نەخـەوتووی، ڕەخنەگرانەی ڕۆڵەکـانی نەتەوەکـەیان قـووتاردەبن! جـا، گـەر هەر نووسـەرێ یا هۆنەرێ، بەو شـێوەیە بوو، ئیـدی ئەوە کـەی بـە نووسـەر و هۆنەر دادەنرێ؟ چونکە، گەر هەر نووسەرێ یا هۆنەرێ، هەڵوێستی نەبوو، کەلێ باشترە، دەمی خۆی داخا. وەک شتی باشیشی بۆ ناگوترێ، قسەی هەلەقومەلەقیش نەکا، شانی خۆی ئاردایی نەکا و هیچ نەڵێ!

« ا. ب. هـەوریی، گـــۆران و کـــاردۆخـــیـی ... »، بە سـێ هۆنراوەی درێژ، لە خەسڵەتەکانی نووسەر دواون. بۆ نموونە: « ا. ب. هەوریی » گوتوویەتی :

نووسەر نووسینی، داو بۆ هەژاربێ
دەسخەڕۆکەری، لادێیی و شاربێ
بۆ دەستی دوژمن، کوتەک و داربێ
دەک ئەو نووسەرە، لای بە دەواربێ
سوودی بەرهەمی، بۆی ژەهری ماربێ

* * *

نووسەر نووسینی، بۆ خۆ لەوەڕبێ
هەموو ژیانی، شەیتانی کەڕبێ
شایی لەگەڵ گورگ، شین لە تەک مەڕبێ
دەک ئەو نووسەرە، لای بەدەواربێ
سوودی بەرهەمی، بۆی ژەهری ماربێ

* * *

نووسەرێک، لەگەڵ هەژار نەناڵێ
بە نووسین، چقڵی بەر پێی نەماڵێ
خێرکی ڕێی ژینی، نەکاتە چاڵێ
دەک ئەو نووسەرە، لای بەدەواربێ
سوودی بەرهەمی، بۆی ژەهری ماربێ

نووسەرێک وەک شێر، بەرەورووی ناحەق
توورە ئەوەستێ و چاوی ئەکا زەق
هەر بۆ وەرگرتن، سەرکزبێ گۆی لەق
دەک ئەو نووسەرە، لای بەدەواربێ
سوودی بەرهەمی، بۆی ژەهری ماربێ
* * *
نووسەرێک زۆردار، شەو ئەکات لە خەو
بە بازاڕی هەق، قەت ئەدات برەو
هەر کۆن و نوێی بێ، نە بەم بێ و نە بەو
دەک ئەو نووسەرە، لای بەدەواربێ
سوودی بەرهەمی بۆی ژەهری ماربێ
* * *
نووسینێک، کە سوود نەبەخشێ بە گەل
ڕێنوێن نەبێ، وەک بروسکەی کەل
ئاکۆکیی دەربێ و کۆمەڵ کات پەلپەل
دەک ئەو نووسەرە، لای بەدەواربێ
سوودی بەرهەمی، بۆی ژەهری ماربێ
* * *
هەرچی نووسینێک، وەکوو کڵپەی کڵ
سووڕنەکاتەوە، جەرگ و سی و سپڵ
جۆشێک نەدات، بە مێشک و بە دڵ
دەک ئەو نووسەرە، لای بەدەواربێ
سوودی بەرهەمی، بۆی ژەهری ماربێ «58، 264-266»
* * *

### 58/3. دەســــپاکیی :

ئەز، لەگەڵ یەکێکی وەک « بەرزنجیی »دا چی بکەم، ئەو خۆی، نووسینەکەی منی، لە چەن جێیەکدا قرتاندووە، بە دەسپاکییەوە نەیگواسۆتەوە. بەڵکوو، بەرژەوەندیی خۆی چۆن پێویستیکردووە، هەر بەو شێوەیە گواستویەتییەوە. جگە لەوەی، ئەو کۆپلەیەی لە نووسینەکەی « نەجمەدین مەلا » وەرمگرتووە، هەر پشگوێیخستووە. هەڵبەتە، ئەو بۆچوونەی منیش، هەر لە بەر ڕۆشنایی قسەکانی ئەودا هاتووە.

چونکە، من لەو سەردەمەدا نەژیاوم، تا ئاگاداری ئەو رووداوانە بوویم و ئێستە بۆ خوێنەرانی بگێڕمەوە. لە بەرئەوە، بە پێویستم زانی، هەر دوو نووسینەکە تۆمار کەم، تا خوێنەر بزانێ، هەم جیاوازییان چییە، هەم نابێ، هەر دوو بۆچوونەکەی من و « نەجمەدین مەلا »، لە یەکدی جیاکرێنەوە. لە گوتارەکەی خۆمدا، ئەو کۆپلەیە بەم شێوەیە نووسراوە: ( "زێوەر "، لە رۆژهەڵاتی کوردستانیشەوە، لە سەر هۆنراوەکوتنی خۆی بەردەوام بووە. هۆنراوەی گوتووە و بۆ سولەیمانیی ناردووە. کارێکی کردووە، هۆنراوەکانی دەس " مێجەر سۆن " کەون. ئەو کاتە، " سۆن " لە شاری " سولەیمانیی " ، یەکەم پیاوی دەســــەڵاتداری ئینگلیز بووە. " زێوەر " بەو هۆنراوانە ویستوویەتی، " سۆن " هێورکاتەوە، دڵی باتەوە و ملی خۆی لە پەتی سێدارە رزگارکا. بەرژەوەندیی ئینگلیزیش وا دەبێ، خەڵک لە کوردایەتیی و شۆڕش دوورخەنەوە، بۆیە، " سۆن " لێی خۆشدەبێ. پاشان " زێوەر " دەگەڕێتەوە، لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا دادەنیشێ. دیارە، وەگ مامۆستا " نەجمەدین مەلا " دەڵێ: (مامۆستا زێوەر ساڵی " 1919 ز. " لەبەرئەوەی هاوکاری شۆڕشی "شێخ مەحموود " بووە، هەڵاتووە چۆتە کوردوستانی خۆرهەڵات لە گوندی " زەنبیل " ئەم هەڵبەستەی وتووە و ناردوویەتی بۆ حاکمی سیاسی " مێجەر سۆن ". بەمە خۆی لە تاوانی سیاسەت پەراندۆتەوە. مێجەر سۆنیش لێی خۆشبووە و هەڵبەستەکەی لە رۆژنامەی "پێشکەوتن "دا چاپکردووە وە کردووشیەتی بە مامۆستا لە قوتابخانەی « نموونەی سەعادەت »دا .)«57،24»

بەڵام، هەر چەندە گۆڤاری « ئایندە »، رێنووس و هێندێ لە نیشانەکانی خاڵبەندیی گوتارەکەمی گۆڕیوە و لابردووە. بە هەمان شێوەش، « بەرزنجیی » جگە لەوەی، دەسکاریی رێزمان و رێنووسی دەقەکەی کردووە، نیشانەکانی خاڵبەندیی لابردووە، چەن ووشە و کۆپلەیەکیشی لێ دابڕیوە و نووسیوێتی: (زێوەر لەرۆژهەڵاتی کردوستانیشەوە، لەسەر هۆنراوەکوتنی خۆی بەردەوامبووە. هۆنراوەی گوتووەو بۆ سلێمانیی ناردووە، کارێکی کردووە، دەست مێجەر سۆن کەون.. بەو هۆنراوانە ویستوویە، « سۆن » هێورکاتەوەو دڵی باتەوەو ملی خۆی لەپەتی سێدارە رزگارکا.. بۆیە لێی خۆشدەبێ پاشان دەگەڕێتەوەو لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا دادەنیشێ.)«54،3»

### 59/3. دوای گەڕانــــەوە :

کاتێ، لە جەنگی « دەربەدی بازیان »، هێزەکانی « شێخ « شکا، پاشان، خۆی بە برینداریی گیرا، ئەوە بوو، دادگاییکرا و بۆ « هیندستان « دوورخـــرایەوە. ئیدی

« زێوەر » و هاوڕێکانی، جگە لەوەی، شاریان جێهێشت و ڕایانکرد، هیچی دیکەیان نەکردووە. هەر چەندە، باری ژیانیان کەمێ خراپبوو. بەڵام، بەو شێوەیە نەبووە، « بەرزنجیی » باسیکردووە. دوور نییە، « زێوەر » زۆر پەشیمانبووبێتەوە، لەوەی هەڵاتبێ، ڕاڕابوویێ، ڕوخابێ و ترسابێ. جا، ئەوە هەر بە دەم نابێ، بەڵکوو، بەڵگەی دەوێ. من لام وایە، تەنیا ئەو دوو هۆنراوەیە بەسبێ، کە بڵاوی کردۆتەوە، تا بنچینەی بەڵگەکانی خۆمانی پێ داڕێژین.

جگە لەوەی، دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە، بە هیچ شێوەیە، بە لای کاری ڕامیاریی و کوردایەتییدا نەچووە، دەستی بە کڵاو و مێزەرەکەی خۆیەوە گرتووە، تا ڕەشەبای خەبات نەیبا! ئەگینا، لە لایەکەوە، لە سەردەمی دوای « شێخ مەحموود »دا چی کردووە؟ لە کاتێکدا، بە دەیان پیاوی « هۆنەر، نووسەر و ڕووناکبیر »ی ئەو ڕۆژە، لە پێناوی کێشەی کورددا هەوڵیانداوە، خۆیان ڕێخکستووە، کاریانکردووە، داوای مافە ڕەواکانی گەلی کوردیان کردووە، تووشی ئەشکەنجە و ناخۆشیی بوون. بەڵام، شوێنپەنجەی ئەو بە هیچ شێوەیەک و لە هیچ کونوقوژبنێکی مێژووی کورددا دیار نەبووە و نییە. « زێوەر » نەک هەر دژی ئینگلیز و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، هیچی نەگوتووە و نەکردووە، بەڵکوو، وەک هۆنەرانی دیکەش، ڕەخنەی لە هەڵە و کەموکوڕییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی « شێخ »یش نەگرتووە!

بۆ نموونە: « حەمدیی » ساڵی « 1923 »، پەنجەی ڕەخنەی ئاراستەی « شێخ » و دەوروبەرەکەی کردووە. لە هۆنراوەیەکی درێژی « تەرجیع بەندی نیشتمانی »دا، زۆر بە ڕاشکاویی، باسی سەردەمی فەرمانڕەوایی دووەمی دەسەڵاتی « شێخ »ی کردووە. هەموو کەموکوڕییەکانی دەستنیشانکردووە، بە شێوەیەکی گاڵتەجارانە. ناوی شالیارەکانی هێناوە و بە چلوپێنج نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

باسی تەشکیلاتی ئانی هەر ئەکەم بۆ پێکەنین
کەمترین بوو گەورەتر، هەم گەورەتر بوو کەمترین
نا عیلاجم، ئیسم و شوهرەت باسئەکەم، عاجز مەبن
تا ببینن، شکڵی وەضعییەت، بە چاوی قارئین

پاشان گوتوویەتی :

ئەمری یەومییە، هەموو هەر حەپس و زنجیر و جەزا
فیکری لەیلییە، هەموو هەر کوشتن و یەغما و دزین
حاکمی شەرع و عەدل مەحکوومی عالەم مارفە شەل
موخبیری صادق بوو، کانیب، سوئی ظەن « علم ئەلیەقین » «127،16»

ئینجا، با بزانین، ڕەوشی ڕامیاریی باشووری کوردستان، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، چۆن بووە؟ ئەو بەشەی کوردستان، بە چەن قۆناغێکی گرنگدا تێپەڕبووە:
1. کاتێ جەنگ تەواوبووە، بەشێزۆری باشووری کوردستان نیمچە سەربەخۆ بووە. چونکە، « شێخ مەحموود » هێزەکانی تورکی دەرکردووە، بەڕێوەبەرێتییەکی سەربەخۆی دامەزرادووە.
2. سالانی « 1918-1922 » لە بندەستی ئینگلیزەکاندا بووە.
3. سالانی « 1923-1927 » زنجیرە شۆڕشەکانی « شێخ » بەرپابوون.
4. سالانی « 1928-1931 » سەردەمی « قەلەم و موراجەعە » بووە.
« زێوەر »، جگە لەو سەردەمەی « شێخ » دەسەلاتی هەبووە، پاشان تێکشکاوە و گیراوە، واتە: لە دوای سالی « 1919 »وە و لە هەموو سەردەمەکانی دیکەدا، هیچ ڕۆلێکی نەبووە. چۆن؟
لەو ڕۆژەوە دەولەتی عێراق دامەزراوە، لە هەموو ڕوویەکەوە، بۆ کورد باش نەبووە چونکە، ڕەوشی باشووری کوردستان، لە هەموو ڕووەکانی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەلایەتیی، ئابووریی، کەلتووریی، بەڕێوەبەرایەتیی »یەوە خراپبووە. با لێرەدا، تەنیا هەر لە باری خوێندن و پەروەردە بدوێین، چونکە، « زێوەر » خۆی مامۆستا بووە و پتر ئاگای لەو بارە خراپە بووە، ئینجا، هیچی نەگوتووە و نەکردووە!
کاتێ چەن نوێنەرێکی کورد، سالی « 1929 »، یادداشتێکیان ئاراستەی ئەنجوومەنی وەزیران و نوێنەری « بریتانیا » لە عێراق کردووە، هێندێ داواکاریی ئاسایی وەک: « دامەزراندنی دوو شاری نوێ، چاککردنی باری خوێندن ... »یان پێش چاو خستووە. کەچیی، شا« فەیسەل » گوتوویەتی: (ئەگەر بە دەستم بووایە، ئەوانەی ئەمەیان نووسیوە، هەلم ئەواسین!)«20،59». لە کاتێکدا، ئەوە باوەڕی ئەو پیاوە بووە، کەچیی، یەکێکی وەک زێوەر « هۆنراوەی بۆ گوتووە!
هەروەها، چەندین جار، نوێنەرانی کورد، لە بارەی ڕەوشی خوێندن لە کوردستاندا، سکالانامەیان ئاراستەی سەرانی دەولەتی عێراق و نوێنەرانی «بریتانیا » کردووە، بەلام، چ ئەو لایەنانە و چ خوێنەوارە عەرەبە شۆڤێنییەکان، نەک هەر داواکارییەکانیان پشگوێخستوون، بەلکوو، هەڕەشەشیان لێ کردوون. بۆ نموونە: لە «1929/04/09»دا ڕۆژنامەی « العراق » نووسیوێتی: (کوردەکان تەلەبی وا بکەن وەکوو ئیدیعای ئەرمەنییەکانی لێ دێت کە موقابیل بە « تورکیا » کردیان و نەتیجە بەم حالە کەیشتن.)«32،59». ئەوە ئەو برا عەرەبە هاوئایینانە بوون، کە « زێوەر » هۆنراوەی بە شان و باڵوویاندا هەلداوە!

دوا جاریش یەکێکی وەک « تۆفیق وەهبیی »، لای خۆی کاربەدەستی میریی و ئینگلیز بووە. کەچیی، زۆر مەردانە و جەسوورانە، وەک دەمڕاستێکی گەلی باشووری کوردستان، ڕاپۆرتێکی بۆ ئینگلیزەکان بەرزکردۆتەوە، لە هەموو کەموکورییەکانی کۆمەڵگەی کورد دواوە. باری خوێندنی لە کوردستاندا دەرخستووە، ڕاستیی نەشاردۆتەوە و نووسیویتی: (لە کوردستانی خوارووودا 79 قوتابخانە هەیە. لە 27 یاندا، ڕێگە بە زمانی کوردیی دراوە، لەوانی تردا عەرەبیی ئیجبارییە، جگە لە چەند قوتابخانەیەکی کەم، کە تورکیی تێدا ئەوترێتەوە. لەو 27 قوتابخانەیەی باسکران 16یان تەنیا 1 پۆلی تێدایە. ئەوانی تری سەرەتایی و ئامادەیین. لە ناوچە کوردییەکاندا، قوتابخانەی ناوەندی نییە، جگە لە 2 متەوەسیتە لە سلێمانیی و هەولێر، ئەوانیش تەواو نین. لە سەرانسەری کوردستانی خوارووودا8 قوتابخانەی کچان هەیە، تەنیا لە 1 قوتابخانەیاندا بە کوردیی ئەخوێنرێ. دانیشتووانی کوردستانی خواروو بەرەو ژووری 800,000 کەسە بەراوردی لەگەڵ 528 قوتابخانەی ئەلبانیا و 432 قوتابخانە لە فەلەستین لەگەڵ کوردستانی خواروو و ژمارەی زۆری دانیشتووانی و تەنیا 79 قوتابخانە.
بۆ بەراوردی سیاسەتی حوکوومەتی عەرەب، لە بواری پەروەردەدا لە پێوەندییدا لەگەڵ کورد، ئەم نموونەیەی خوارەوە بەسە بۆ پیشاندانی سیاسەتی بە ئەنقەستی حوکوومەتی عەرەب بۆ لەناوبردنی شێنەیی ڕەگەزی کورد. لە دەسکەوتی لیوای بەغداد38٪ سالانە تەرخانئەکرێ بۆ پەروەردەی عەرەب لە لیوای بەغداد، کەچیی لە سلێمانیی تەنیا 1٪ی داهاتی لیوا تەرخانکراوە بۆ پەروەردە لەو لیوا کوردییەدا. بۆ پیشاندانی ئەقلی پچووک و زۆردارانە، تەنانەت لە مەسەلە پچووکەکانیشدا، حوکوومەتی عەرەب کەلوپەلە کۆن و بێکەڵکەکانی خۆی ئەدا بە قوتابخانە ناعەرەبییەکان و کەلوپەلە نوێکانی بۆ خۆی ئەبا. ئەم کارە منالانەیە بە ناوی حوکوومەتێکەوە کە بۆ سەربەخۆیی ئەگری بە بێ ... جێگەی پێکەنینە ئەگەر جێگەی داخ نەبێ. پەروەردە بە گرنگترین بەشی ژیانی نەتەوەیی دانراوە، لەوەی سەرەوەدا بە ئاشکرا دیارە کە تەنیا مەسەلەی کاتە، ئەگەر کورد لە ژێر زاڵێتی عەرەبدا بەجێبهێڵرێ، کاتێ سەربەخۆیی تەواویی خۆیان بە دەس بهێنن، زمان و فەرهەنگی کوردیی لە مان ئەکەوێ.)«255،59»
ئەوە ڕەوشی خوێندن بووە لە کوردستاندا، کەچیی، « زێوەر » لە بری ئەوەی نارەزایی خۆی دەربڕێ، هۆنراوەی « عێراقچێتیی » هۆنیوەتەوە، منالانی کوردی، فێری سنوور و جوگرافیای عێراق کردووە!

له لایەکی دیکەشەوە، کاتێ هێندێ کاربەدەسانی عێراق و نوێنەری ئینگلیز له عێراق، سەردانی کوردستانیان کردووە، تا ڕەوشی ڕامیاریی ناوچەکە ئارام کەنەوە، نوێنەرانی کورد، له شارەکانی « کەرکووک، هەولێر و سولەیمانیی »، زۆر به ڕاشکاویی گوتبوویان: (نایانەوێ لەگەڵ عەرەب پێکەوە بژین. بەڵکوو ئەمانیش ئەیانەوێ: حوکوومەتێکی کوردیی سەربەخۆ، له ژێر ئینتیدابی دەوڵەتێکدا کە کۆمەڵەی گەلان دیاریبکا، دابمەزرێنرێ. بۆ ئەمەیش ئەو بەڵێنانەیان ئەکرد به بیانوو، کە کۆمەڵەی گەلان کاتی خۆی به کوردی دابوو.)« 58،59 »، ئەدی ئەو کاتانە، « زێوەر » له کوێ بوو؟

هەروەها، کاتێ دەوڵەتی عێراق، دژی خواستەکانی کورد ڕاوەستا، هەڵبژاردنێکی ساختەی سازکرد و ویستی، فێڵ له کورد بکا. بەلام، « هەیئەی وەتەنیی » بڕیاریاندا، بەشداریی لەو هەڵبژاردنەدا نەکەن. هەر چەندە، ئەو کۆمەڵە باوەڕیان به بەکارهێنانی توندوتیـژی نەبوو، بەلام ئەوە بوو، له ڕۆژی « شەشی ڕەشی سێپتێمبەر »دا، به تەواویی تەقییەوە، شەڕێکی خوێناویی نابەرابەر، له نێوان کوردە خۆپیشاندەرەکانی شار و سەرباز و چڵکاوخۆرەکانی داگیرکەرانی ئینگلیز و هێزەکانی دەوڵەتی عێراقدا دروسبوو. له ئەنجامدا، خەڵکێکی زۆر بریندارکران و کوژران. « زێوەر »، نەک هەر وەک « بێکەس » بەشداریی لەو خۆپیشاندانەدا نەکردووە، له هیچ لایەکەوە دیار نەبووە و ناوی نییە، بەڵکوو، له بری ئەوەی کەرمەشینیش بۆ ئەو شەهیدانە بکا، هۆنراوەی بۆ ئەو « عێراق » و « فەیسەڵ »ە گوتووە، کە له بەر دەرکی سەرای « سولەیمانیی »دا، تەنیا له یەک ڕۆژ و چەن کاژێرێکدا، پتر له سەد کوڕی کوردی نیشتمانپەروەریان، له خوێنی گەشی خۆیاندا شەلالکردووە. ئا لەو کاتانەدا، « زێوەر » متەقی له خۆی بڕیوە، هیچی نەگوتووە، بێ هەڵوێستبووە، وەک هەر کوردیش نەبووبێ و خەڵکی ئەو شارەش نەبووبێ، وا بووە! کەچیی، چەندین هۆنەری به ناوبانگی کوردی نیشتمانپەروەری ئەو سەردەمەی وەک: « پیرەمێرد، حەمدیی، بێکەس، ئەحۆڵ، گۆران، دڵزار ... » نەیانتوانیوە، چاو لەو تاوانەی ئیمپریالیزمی « بریتانیا » و دەوڵەتی داگیرکەری عێراق بنوقێنن، دەس به کڵاوەکانی خۆیانەوە بگرن، تا بای ڕاونان و گرتن نەیانبا. بەڵکوو، بەشدارییانکردووە، خەڵکیان هانداوە، هۆنراوەی ئاگرین و جوانیان ڕازاندۆتەوە، کەرمەشینیان بۆ شەهیدانی ئەو ڕۆژەڕەشە کردووە! ئیدی گەر « زێوەر »، لەو تاوان و کارەساتە جەرگبڕە نەتەوەییە، بێ دەنگبووبێ، کامەیە ئەو هەڵوێستە نەتەوەیی و نیشتمانییەی هەیبووە؟!!

دواییش، چەن کەسێ بە ناوی نوێنەری کوردەوە، بەرەو « بەغدا » ڕۆشتوون، بۆ ئەوەی بەخێرهاتنەوەی شا « فەیسەڵ » بکەن، دڵسۆزیی خۆیان بۆ یەکێتی خاک و دەوڵەتی عێراق پیشاندەن، کەچیی، لە مێژووی کورددا، ناویان بە ناپاک ڕۆشتووە. خۆ، ئەو نوێنەرانەش هەر هێندەی « زێوەر »یان گوتووە، وا بەو شێوەیە، هەر دوو هۆنەر، « پیرەمێرد و بێکەس » هۆنراوەی « وەفدی کوردستان »یان بۆ گوتوون و بە ناپاکیان داناون!

جگە لەوەی، ئایا، « زێوەر » چی بۆ چەن خەباتگێڕ و شەهیدێکی وەک: « شێخ سەعیدی پیران، دوکتۆر فوواد، سمایلاغای سمکۆ، سەید ڕەزای دەرسیمیی، چوار ئەفسەرەکە ... » و هەموو ئەوانەی، بە دەس کوردایەتییەوە ناڵاندوویانە، تووشی زیان بوون، لە ڕێی کورد و کوردستاندا، گیانی خۆیان بەختکردووە، گوتووە و نووسیوە؟ چ هۆنراوەیەکی بۆ ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی « شێخ مەحموود و بارزان » داناوە؟ چ هۆنراوەیەکی بۆ کۆماری کوردستان لە « مەهاباد » هۆنیوەتەوە؟ ئەدی، چ گەرمەشینێکی بۆ « قازی محەمەد » و هاوەڵەکانی کردووە؟ « زێوەر » نەک هەر هیچی نەکردووە و نەگوتووە، بەڵکوو، تەنانەت لە شینی کۆچیدوایی هاوڕێ هۆنەرەکانیشیدا، هیچی نەنووسیوە.

گەر بڵێین: « زێوەر »، زانایایەکی ئایینیی بووە، سەری لە کاری ڕامیاریی دەرنەچووە، ئەدی خۆی یەکێکی وەک « مەلای گەورە »، هەر لە سەردەمی ئەودا ژیاوە، لەویش پتر ناسراو و خواپەرستبووە، بۆچی بەو شێوەیە، لە هەموو دەردەکانی کورد دواوە. دوژمنی ڕاستەقینەی، بە کورد ناساندووە، داوای لێ کردوون، منداڵەکانیان بە شیری پاکیی کوردایەتیی پەروەردەکەن؟! ئەوەتە، لە هۆنراوەی « ئەم خاکە »دا، بە سی دێڕە هۆنراوە، لە گەلێ باسی گرنگ دواوە. لەوانە، داگیرکردنی کوردستان و بەعەرەبکردن. سەرەتا گوتوویەتی:

ئەم خاکە، دایکی تۆیە، کەوتە دەستی ئەجنەبی
ئەی کوردی ساحێب غیرەت! تۆ چلۆن ڕازی دەبی
بۆ خۆت ئەوا دەبینی، دوژمن ئەرزت دەکێڵێ
پاش چەند ساڵێکی دی، هیچت بە دەست ناهێڵێ

دوایی، باسی هێندێ سەرکردەی گەلانی دراوسێیی کردووە، چۆن دەسیان بە سەر کاری دەوڵەتدا گرتووە. کوردیش، لە کاروان بەجێماوە و گوتوویەتی:

ئێوەش ئەگەر پیاو بان، چشتەکو لە دەست دەهات
کەسێ غیرەت بنوێنێ، خودا تەوفیقی دەدات

ئێوە « ئەحقەر ئەلناس »ن، ئیمرۆ لە بەینی ئومەم
قسمێ بەندی تورکن، هێندێ خادمی عەجەم
ئێوەن بێ قەدر و قیمەت، بێ عەسکەر و بێ عەلەم
بێ تاج و تەخت و دەوڵەت، ژێردەستی کوللی عالەم
چونکە نانخۆری خەڵکی، لە سەر موڵک و ماڵی خۆت
خاکت هەموو مەعدەنە، خۆت فەقیر و ڕووتوقووت
تا کەی وەکوو گا، جووتی لە ژێر نیری زیللەتی
سەد حەیف و سەد مخابن، لای خۆت ئەتۆش میللەتی

دوای ئەوەش، باسی داگیرکەری ئینگلیزی کردووە، داوای لە ڕۆڵەکانی کورد کردووە، هەر هیچ نەبێ، منداڵەکانیان بە شیری کوردایەتیی بەخێوکەن و بە هەستی نیشتمانپەروەریی پەروەردەیانکەن. بۆیە گوتوویەتی:

دەماغی منداڵەکان پڕکەن، لە حوبی وەتەن
تەربیەتیان باش بدەن، میللییەتیان فێربکەن
«145-142،45»

« مەلای گەورە »، ساڵی «1926 »، هۆنراوەی « من بەخەی خۆم، لە بۆیە دانەدرێم » بۆ « شێخ سەعیدی پیران » و هاوەڵەکانی گوتووە. ساڵی « 1930 »یش، بە هۆنراوەی « ژیانی وا بە ئالام »، باسی لەشکرکێشیی سوپای « عێراق »ی، بۆ سەر ناوچەی « بارزان » کردووە و بە نۆزدە دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

بەڵێ، ئەم شینە، شینی قەومی کوردە
قیامەت ڕابووە، لەم دار و بەردە
ئەوا، یابەش لە هەق کوردان بەخۆکەوت
تفو لەم میللەتەی بەدبەخت و دەم چەوت
لە مانگێ زێترە، جەیشی عێراقیی
بە ئەسبابی جیدال و تەمتراقیی
هجومی کردە سەر بارزانی مسکین
بە تەیارە و بە شەستیر و بە ژیلین
لە جێی لالە و گوڵۆکی سووری نیسان
لە سەر کێوان، ڕژاندی خوێنی کوردان
ئەوی دەستیانکەوێ، منداڵە یا ژن
لە خاکیدا سەروینیان دەنێژن
ئەوانەی پیر و پشت کوڕ و زەعیفن

لە ئەشکەوتان دەڵێی « ئەسحابی کەهفن »
ئەوانەی مەردی جەنگین میسلی کێوی
بزربوون لە درز و قەڵشی کێوی
هەزار منداڵ و ژنیان سەربڕیوە
هەزار کیژی عەفیفیان زگ دڕیوە
بە بۆمبا خان و مانیان بوو بە وێران
مەڕ و ماڵیان هەموو ڕۆیی بە تالان «141-140،45»

هەر لە دوای شەڕی بەردەرکی سەراشەوە، وردەوردە، ناوی کوردستان نەما. ووشەی « شیمال »یان، لە گفتوگۆ و نووسینەکانیاندا بەکاردەهێنا. دە دیارە، بۆیە یەکێکی وەک « زێوەر »یش، لە هۆنراوە « عێراقچێتیی »یەکانیدا، لە بری کوردستان، زاراوەی « شیمال »ی نووسیوە!

لە کۆتایی ئەم دەمەتەوێیەشدا دەڵێم: ئایا، « زێوەر » تا بۆ دوا جار، چاوی لێکناوە، بە تەواویی ماڵاوایی لە کورد و کوردستان کردووە، چ جۆرە بەرهەمێکی نەتەوەیی هەبووە، جگە لەوەی، لە خەڵکی شارەکەی زۆر بێزاربووە، گلەییەکی زۆری لێ کردوون و لە هۆنراوەی « کێیە تا سەر؟ »دا، ساڵی « 1921 »، بە حەوت دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

کێیە تا سەر؟ لە فەزای دەرد و غەمابێ، مابێ
ئەوە هەر کوردە، کە چاوی لە هەوابێ، وابێ
هەر « سولەیمانیی »یە، عیفریتی « حەسەن » سواری بووە
هودهودی خۆشخەبەرم، گەر لە سەبابێ، بابێ
ڕاستی ڕێگەی ڕاستت، « ئەدەب » و « ئەخلاق »ە
ئەمەی هەرگیز لە کەسێ، ڕووی لە کەچا، بێ، چابێ
مارە بۆ گەردن و ماڵت، چە خومار و چە قومار
گەرچی باوە، ئەوە پیاوە، بە شەرابێ، ڕابێ
ئەی وەتەنپەروەری، تەنپەروەری پڕ لافوگەزاف
ئەسەری خزمەتی تۆ چین؟ بە حیسابی، سابێ
چە زەمانێکە؟ زمانی تەروپاراوی ئەوێ
« غایە و فیکری »، لە هەر کەس کە مەلابێ، لابێ
وەرە مەیدانی هونەر، گەر ئەتەوێ بەرزیی « وەتەن »
وەسڵی مەحبووبە، بەبێ ڕەنج و عیتابێ، نابێ «16،39»

جا، ئێستـه « بەرزنجـیی » پێمـان نالێ: چۆن « زێوەر » وازی لە هەمـوو شت نەهێناوە؟ هەوڵی نەداوە، سەری خۆی کزکا و بژی؟
با بڵـێین: گللەیی لە « زێوەر » ناکـرێ، گـەر هۆنراوەی بۆ ئەو خـەباتگێـڕ و شـەهیدانەی کورد نەنووسیبێ. بەڵام، ئەدی چی بۆ « شێخ مـەحموود » نووسیوە، کاتێ بریندار بووە و دوورخراوەتەوە، خۆ ئەو هاورێ و سـەرۆکیشـی بووە؟!! لە کاتێکدا، چەندین هۆنەری وەک، « بێخوود، حەمدیی، شێخ نووریی شێخ ساڵح، کـەمـالیی، مـینە جـاف ... تاد » چەن هۆنراوەیەکیـان بۆ هۆنیـوەتەوە. لەگـەڵ ئەوەشدا، هێندێ لەوانە، لەگەڵ « شێخ »دا ناکۆکبوون، رەخنەشیان لێ گرتووە، کەچیی، لە کاتـی تەنگانە و دوورکەوتنەوەی « شێخ »دا، هێندە « مەرد، ئازا و بە ئەمەک » بوون، هـەرگیز پشتیـان بەر نەداوە، بێ دەنگ نەبوون، هەست و سۆزی خاوێنی پەژارەیی خۆیان، بە هۆنراوە دەربڕیوە. لێرەدا دەتوانین، چەن نموونەیەک بێنینەوە. هـەر چەندە، « حەمدیی » هۆنەر، لە گەڵ « شێخ مـەحمـوود »دا، ناکۆک بووە و رەخنەی لێ گرتووە، بەڵام، کاتێ « شێخ » گیراوە و بۆ « هیندستان » دوور خراوەتەوە، هـەموو جۆرە ناکۆکیی و کینەیەکی تایبـەتیی وەلاناوە، وەک مـەردێکی کورد، بە هۆنراوە یادی « شێخ »ی کردۆتەوە و بە دوو چوارینە گوتوویەتی:

وەک « مەدینە »، بێ « نەبی » بێ، یا « نەجەف » بێ، بێ « عەلی »
شاری « خەزنە »ش ئێستە، بێ « مەحموود » وەک « داریکەلی »
حەیفە ئەوجی ئاسمان، بێ زینەتی خورشید و ماە
سا خوا بیکەی، وەکوو خورشیدی دەرەخشان مونجەلی «182،16»

کە رۆیشتی، بە جارێ من دڵ و جەرگ و هەناوم کەوت
کە چوویتە « تانە »، تانە سەر گلێنەی هـەردوو چاوم کەوت
ئەڵێن: هاتوویتە « کوێت » قوربان، بڵێ: قوربانی کوێتی کەم
کە نۆبەت بەر سەری ئەحسی شکاوی بێ کڵاوم کەوت «182،16»

هەر وەک چۆن « حەمدیی »، رەخنـەی لە هەڵەکانی « شێخ » و کەموکوڕییەکانی دەوڵەتەکەی گرتووە، هەر بەو شێوەیەش، ناخۆشی و پەژارەی خۆی، لە ئاو دووریی شـێخ دەربڕیوە و هۆنراوەی بۆ هۆنیـوەتەوە. لە هـەمـان کـاتیـشـدا، کـاتێ بیستـوویەتی، « شێخ » لە دەربەدەریی و دوورخراوەیی دەگەڕێتەوە، پڕ بە دڵ پێی خۆشبووە. بۆیە بەو بۆنەیەوە، بە چواردە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

مژدەبێ یاران، ئەڵێن: تەشریفی جانان دێتەوە
وەک هیلالە قامەتم، تا بەدری تابان دێتەوە

ڕۆژ کە گیرا، شەمشەمەکوێرە، عەجەب کەوتە سەما
سا، دەبا، کوێربێ، ببینێ ڕۆژی ڕەخشان دێتەوە
موژدەتێکە موڵکی دڵ وێرانە، شاگەردانییە
ساحێبی سواری هەوایە، وەک سولەیمان دێتەوە
وەک شەوی لێ کردووە، زوڵمەت دڵی ئیسلامەکان
ڕۆژە جا « ئەلحەمدوللیلا »، نووری ئیمان دێتەوە
بلبلی شەیدا، لە ئەترافی چەمەن بۆ ناڵەتە
گوڵ بە خەندانی، وەکوو سەرووی خەرمان دێتەوە
بۆ حەیاتی تازە، بیداتە شەهیدانی وەفا
هەر وەکوو دەریایی « عوممان »، ئابی حەیوان دێتەوە
مەسکەنی کێوانە « حەمدیی »، هەمدەمی دێوانەکان
تا بەخێرێت، ئەو ڕەئیسەی ڕەندان دێتەوە «360-359،16»

« شێخ » ی ئەمر، ساڵی « 1935 »، لە « بەغدا » دەستبەسەربووە. « کەمالیی » بە بۆنەی جێژنی قوربانەوە، ئەم چوارینەی بۆ ناردووە.

جەژنی کەسێک موبارەکە، سەربەست و حور بژی
پابەندی دەستی غەیرە نەبێت، چەشنی کور بژی
کوردی هەژار! ئەسیری دەستی غەیرەیت، جەژنی چی!
کەی جەژنی تۆیە، بگری، برۆ سەر بە قوڕ بژی «139،53»

کاتێ « شێخ » لە « کوێت » بووە، « بێخود »، هۆنراوەیەکی بیستوهەشت نیوە دێڕیی بۆ هۆنیوەتەوە. باسی دڵگرانیی خۆی لە دووریی کردووە و گوتوویەتی:

کەی بێ کە لە ئوفقی عەرەبوستانەوە ڕۆژێ
هەڵبێ گوڵی خورشیدی دەرەخشانی کووەیتم؟
وا تێ مەگە دوورم لە تۆ ئەی صاحیبی خانەم
هەر هوردهوردەکەی بەزمی « سولەیمانیی » کووەیتم
خەڵکینە لە بەر گەوهەری تاجی سەری کوردە
قوربانی موحیطی عەرەبوستانی کووەیتم
هەر چەندە لە زیندانی فیراقام وەکوو « بێژەن »
بیللا بە تەمای « ڕۆستەم » ی داستانی کووەیتم
عاجز مەبە « بێخود » کە ئیشەڵڵا وەکوو یەعقووب
ئەزنێکە ویصاڵی مەهی کەنعانی کووەیتم «45،5»

ئەم دوو هۆنراوەیەشی، هەر بۆ « شێخ مەحموود » گوتووە:

کەی بێ تۆ بەهار بی و تۆ نیگار بیت و ویصال بیت
ببینێ رەقیب رۆحی لە داخا دەرچێت «157،5»

ئەی گوڵی گولستانی کوردستان
وەک مەلی نەشئەبەخشی پیر و جەوان «157،5»

کەچیی، وەک « بەرزنجیی » ش نووسیویّتی:(هەر ئەو پیاوە زاناو بەویقارو ئاغرو لەسەرخۆیە بوو کە بۆی هەبوو بەبێ پرس بچێتە خزمەتی شێخ و حەرەمسەرای شـێـخـان.)«10،3» ئینجـا، یەک تاکـە نێـوەدێڕ هۆنراوەشی بۆ ئەو هاوڕێ خۆشەویست و سەرکردە قارەمانە نەنووسیوە! لەوانەیە، گەر « بەرزنجیی» لە جێی « شێخ » بووایە، دە سیپارەی « شەســـتوشەش » لاپەڕەیی، لە سەر « زێوەر » دەرکردایە!

من هـەر وای بۆ دەچم، لەبەرئەوەی، « زێوەر » گـەڕابۆوە، لە کـارەکـەی خـۆی دامـەزرابۆوە، بڕیاری داوە، خـۆی لە هـیچ کـارێکی نەتەوەیی و رامـیـاریی هەڵ نەقورتێنێ و بۆ خۆی بژی. مەگەر، هەر خواش بۆ خۆی بزانێ، کاتێ گەڕاوەتەوە، « سـۆن » لێی خـۆشـبـووە، چ بەڵێنێکی پێ داوە! بۆیە، لەو رۆژەوە گـەڕاوەتەوە تا مردووە، جگە لە هێندێ هۆنراوەی « ئایینیی، کۆمەڵایەتیی و چەن سروودێ » بە لای هیچ بابەتێکی دیکەدا نەچووە. جا گەر وا نییە، فەرموو، کێ زانیاریی پتری لەو بارەیەوە لا چنگدەکەوێ، با بۆمان روونکاتەوە، کۆڵێ سوپاسیشی دەکەین!

بۆ ئەوەی پتر مەبەسەکەمان روونکەینەوە، پەنا بۆ بەر هۆنراوەیەکی دیکەی هۆنەر دەبەین، تا بزانین، بۆچی بەو چەشنە لە کارەسات و رووداوەکانی کوردستانی روانیوە!

« زێوەر »، سالّی « 1935 »، هۆنراوەیەکی هۆنیوەتەوە. لە هۆنراوەکەدا، بە سەر رەوشی باشووری کـوردسـتـاندا بازیداوە. زۆر دوورتر رۆشـتـووە. سـواری باڵی سـیـمـرخی ئەندێشـەی بیری خۆی بووە. فـڕیوە، فـڕیوە، تا لە هێندێ لە دەوڵەتی کیشوەرەکانی « ئەورووپا، ئەفریکا و ئاسیا » نیشتۆتەوە. لەوێ، گەلێ مـەراقی بۆ « موسـوڵمانەکان » خواردووە، خەم و پەژارەی بۆ مێژووی ئیسلام بەباکردووە، وەک ئەوەی کورد، ئیسـلام نەبێ و غەدری لێ نەکرابێ! پاش ئەم گەشتە دوورە، هەر چەندە بڕیاریداوە، باسـی « سیاسەت » نەکا، بەڵام، زۆرداریی « تورک »ەکان وای لێ کردووە، سەرێ لە « تورکیا »ش بدا. ئینجا، نەیویستووە، باسی « ئێران » بکا، چونکە، تەمەنی کورتە و زوو لەنێودەچێ! هەڵبەتە، هۆنەر لێرەدا، « تورکیا و

ئێران ى، بە دوو دەوڵەتی خراپ داناوە. بەڵام، بۆچی بە هیچ شێوەیە، خۆی لە قەرەی هەر دوو دەوڵەتی « عێراق و سووریا » نەداوە. با، ئەو کاتە ئەو دوو دەوڵەتە، سەربەخۆش نەبووبن و لە ژێر چاودێریی « بریتانیا و فەرەنسا » شدا بووبن. خۆ ناکرێ، بە هیچ شێوەیە بڵێین: ئەوان لەو دوو دەوڵەتە داگیرکەرەی دیکە باشتربوون!!! نەخێر، باوەڕ ناکەم، هۆنەر بەو شێوەیە بیریکردبێتەوە. بەڵکوو، وەک خۆی نووسیوویەتی، باوەڕێکی تەواویی بە « قەومی عەرەب » هەبووە، داوای لە ڕۆڵەکانی گەلی باشووور کردووە، « دەس لە ملیان کەن » و « موتەحیدبن دوو بە دوو ». بیری ئەم هۆنراوەیە، گەر شتێ بگەیەنێ، تەنیا ئەوەیە، لە لایەکەوە، هۆنەر تا بناگوێی لە بیری « عێراقچێتیی »دا نقوومبووە. لە لایەکی دیکەشەوە، خۆی لە باری ڕامیاریی باشووری کوردستان دزیوەتەوە، نەبا، تووشی گێچەڵ بێ! بۆیە، بە چوارده نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

تێکڕژاوون خۆبەخۆ، سووربوو بە خوێن دەشت و چیا
« ئینتیقامی ئەهلی ئیسلامە »، لە ناو « ئەسپانیا »
گەر « هیلاسیلاسی »، موسوڵمانانی خستە ناو کەمەند
« حەق تەعالا » دەستبەجێ، بۆی نارد شەقی « ئیتالیا »
چونکە، ئەووەڵ: خزمەتی « ئیسلامە »کانی کرد حەبەش
ناوی چاکەی باقییە، لای « ئەورووپا و ئاسیا »
هەر ئەڵێم: باسی « سیاسەت » ناکەم و لێی دوورئەبم
« عاقیبەت » ئەمخاتە نووسین، زوڵمەکانی « تورکیا »
باسی « ئێران »، بۆیە ناکەم، چونکە عومری کورت ئەبێ
« موددەتێکی » تر، ئەچێتە حاڵەتی « داڵماچیا »
با « سەنەلمان » یش نەبێ، نوتقێ بدا بۆ کوردەکان
خاک و ئاو و جێگەمان، دوای خستوون « فینلندیا »
دەست لە مل « قەومی عەرەب » کەن، « موتەحید » بن دوویەدوو
« شوهرەت » و ئاوازەتان ئەڕوا، هەتا « ژاپۆنیا » «29،39»

60/3. سێدارە :

باشان، ڕووی دەمی پرسیاری تێکردووم و نووسیوێتی: (بەگەڕانەوەی ئینگلیزو داگیرکردنی سلێمانی دوای شەڕەکەی دەربەند، ئاخۆ چەند سێدارە لەشاردا ڕیزکراو ملی چەند کەسی پێوەکرا؟)«55،3» ڕاستە، ئەو ئینگلیزەی « بەرزنجیی » بە داگیرکەری کوردستانی دادەنێ، کەسی بەو شێوەیە هەڵ نەواسیوە. بەڵام، ئەوە

وەک گوزارەیەکی وێژەیی وایە، تەنیا مەبەس لە قسەکەی « نەجمەدین مەلا » بووە، کە نووسیوێتی: (خۆی لە تاوانی سیاسەت پەڕاندۆتەوە.)«30،38» ئەگینا، گەلێ لە هۆنەر تاوانبارتر هەبوون، ئینگلیزیش نەک هەر لە سێدارەی نەداون، بەڵکوو، زۆر ئازاریشی نەداون! نەک هەر لەو عێراقەی « زێوەر و بەرزنجیی » داکۆکییان لێ کردووە، بە هەزاران کەس، ملیان بە پەتدا کراوە و دەکرێ!
بریا، زێوەر « وەک هۆنەرەکانی دیکەی کورد، هۆنراوەی بۆ ئینگلیز بگوتایە، نەک بۆ « عێراق، فەیسەڵ و ئالا »کەی بگوتایە. جا بزانە، دەنگ لە کەسەوە دەهات!
ئەوەش، کە « بەرزنجیی » دەیەوێ، خوێنەر چەواشەکا، ئەوەیە، ئەو قسەیەی من، هێشتا لەوەی « نەجمەدین مەلا »، ئاسانتر و سووکترە. چونکە، ئەو گوتوویەتی: (ناردوویەتی بۆ بۆ حاکمی سیاسی "مێجەر سۆن ".)«30،39» بەڵام، کە هەر دوو کـۆڵەکـەی منیش و ئەویشی، لە یەکـدی دابڕیوە، وەک ئەوە وایە، باڵی چۆلەکەیەکی بڕیبێ، ئیدی توانای فڕینی نەمابێ!

## 61/3. مێژووی نزیک و دوور :

دواتر نووسیوێتی: (ئەمە هیچ نەگەیەنێ، ئەوە دەگەیەنێ کەنووسەر هەر زۆر بێ ئاگایە لەمێژووی نزیکی گەلەکەی.)«55،3»
هەڵبەتە، ئەو خۆی زۆر بە « خوێنەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، شارەزا، بەئاگا، وریا و زیرەک » دەزانێ، زۆر ئاگـای لە مـێـژووی دوور و نزیکی کـورد هەیە. وەک لە مێژووی کورددا، هەزار پەلی بە پشتی چەن مێژوونووسێکی وەک: « شەرەفخانی بەدلیسی، مەلا مەحمـوودی بایەزیدیی، ئەمین زەکیی »دا دابێ. لە وشیاریی و بە ئاگـاییـدا، گرێوی لە ئەهریمەن بردبێتـەوە، لە هەزار ئاوی دابێ و قوولەپێی تەڕ نەبووبێ! بۆیە، وا بەو شـێوەیە، یەکێکی وەک منی تاوانبـارکـردووە و بڕیارێکی بنجبڕی داوە، گوایە: لە مـێژووی گەلەکەم، زۆر بێ ئاگام. بەڵام، ئەمە پتر لەوە دەچێ، کـەسێ یا لایەنێ، بە دەمـیدا ڕشـابنەوە، بۆیە، بەو جـۆرە و بێ باکـانە، لە گیرفانی ئەهریمەدا هەڵپەڕیوە و لە توورەکەی جنۆکەدا سەمایکردووە!
سەیر ئەوەیە، « بەرزنجیی» خۆی کۆسەیە و بە بێ ڕیشیش پێدەکەنێ! من لێرەدا هیچ جـۆرە داکـۆکـییـەک لە خـۆم ناکـەم. بەڵکوو دەمـەوێ، ڕۆڵە خـوێنەوارە دڵسـۆزەکـانی نـەتەوەکـەم، ئەو بڕیارەبدەن و مـافی خـۆم بدەنێ. بڕیارەکـەشـیـان هەرچی چۆنێبێ، مـایەی شـانازیی و بەخـتـەوەرییم دەبێ. چونکە دیارە، لەوە پتر نەمـتوانیوە، وەک ئـەو، بیری خـۆم ڕووناک و فراوانترکـەم، تا ئاگاداری هـەموو کەلێنێکی مێژووی دوور و نزیکی نەتەوەکەم بم!

## 62/3. نسکۆ یا هەرەس :

پاشـان ، باسی گـەڕانەوەی « زێومر » ی کـردووە، کـارەکەی خـۆی وەرگـرتۆتەوە و وەک مـامۆسـتایەک دامـەزراوەتەوە. ئـینجا، ئەمەی بە هـەرەسـی سـاڵی «1975» ی شۆڕشـەکەی « بارزانیی » یەوە بەستۆتەوە و نووسیویەتی: (هەروەک چۆن 75 ساڵ « دوای نسکۆکـەی 1975 « خـەڵکەکە هەریەکە چۆوە سـەر نیشـەکەی خـۆی .. مـامۆسـتا بەمـامۆسـتایی، قـوتـابیش بۆ قوتابخـانەو کۆلێجەکەی « جگە لەوانەی دورخرانەوە بۆ ناوەڕست و باشـور. « ئیتر ئەمە دەبێ جێگای چ خەوش و تانەیە بێ کە لەو پیاوەی پێ بدرێ؟)«55.3»

« بەرزنجیی »، چونکە وەک گوریسـی گای گێرەی لێهاتووە، هەر خەریکی بوختـان و شێواندنی ڕاستیییـەکانە. خۆی لە وەڵامی گوتارەکە دەپارێزێ و خوێنەر بە تولە ڕێیەکی دیکەدا دەبا، تا لە ئامانجـە سـەرەکیییـەکە دووریانخـاتەوە. ئەگینا، کێ گوتوویەتی: گەڕانەوەی « زێومر « هەڵەبووە، یا خراپ و ناپاکیی بووە. چونکە:

1. هیچ شتێ لە ئارادا نەمابوو، تا ئەو لە هاوڕێکانی و شۆڕشـەکە جیابووێتەوە و پاکانەی بۆ داگیرکەرەکە کردبێ و گەڕابێتەوە.

2. هەر لەگـەڵ ئـەویشـدا، زۆربەی یا هـەمـوو ئەوانەی ڕاشـیـانکردبوو، گـەڕانەوە.

ئیدی نازانم « بەرزنجی « بۆ ئەو شتەی هێندە دووبارەکردۆتەوە؟

جگە لەوەی، بە شـێوەیەکی ناڕاستـەوخۆ، پلاریشی لەو کەسـانە گرتووە، کە دوای هەرەسـەکـەی سـاڵی « 1975 « گـەڕاونەتـەوە. گـوایە. منیش یەکێ لەوانە بووم. بەڵێ، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: خۆم بە سـەربەرز دەزانم، کە ئەو سـاڵە بەشداریی خـەباتی ڕەوای گـەلەکەمم کردووە، وەک هەمـوو پێشـمـەرگەیەکی ئاسـایی، چەکم هەڵگرتووە و دژی داگیرکەرانی وڵاتەکەمم جەنگیوم. هەرگیز، لێیشی پەشیمان نیم. کـاتێ کـارەسـاتی هـەرەسـیش ڕوویدا، بە باوەڕێکی تەواو و بە وزەیەکی بەرزەوە، لەگەڵ کۆمـەڵێ هاوبیردا بڕیارمانداوە، بگەڕێینەوە و لە ناوەوە دەس بە خەبات بکەینەوە. هەر چەندە، « بەرزنجیی « هـەرگیز ئەو « شـەرەف « گەورەیەی پێ نەبڕاوە، لە نزیکەوە بەشـداریی لە شـۆڕشی گـەلەکـەیدا بکا، تەنانەت بۆ ڕۆژێکیش بێ، وەک پێشـمـەرگەیەک، لە پێناوی کوردا دژی داگیـرکەر بجەنگێ. کەچیی، لەگەڵ ئەوشدا تانە لە خەڵکی دیکە دەدا.

« بەرزنجیی نووسـیوێتی: « جگە لەوانەی دورخـرانەوە بۆ ناوەڕست و باشـور. « لێرەدا، گەر کەمێ سـەرنج بدەین، دەبینین: ناوی « عێراق « ی نەنووسـیوە. ئاخر کام « ناوەڕست و باشـور «، سـەر بە کام وڵاتە؟ هەڵبەتە، چونکە « عێراق « بە

وولاتی خۆی و باوباپیری دەزانێ، پێویستی بەوە نەکردووە، ناوەکەی تۆمارکا، واشیزانیوە، هەموو کەسێ وەک خۆی بیردەکاتەوە!
ئەوانەی، دوای هەرەسەکەش گەڕانەوە، جگە لە کەمەکێکی کەم نەبێ، سەرەتا خۆیان فرۆشت و پشتیان لە گەلەکەیان و روویان لە دوژمن کرد، یا « زێوەر » ئاسا دانیشتن و وازیانهێنا، زۆربەی زۆری ئەوانی دیکە، نەک هەر سەریان بۆ « بەعس » شۆڕ نەکرد، بەڵکوو، بە باوەڕێکی پۆڵایین و بە وورەیەکی زۆر بەرزەوە، سەرلەنوێ دژی داگیرکەرەکە تێهەڵچوونەوە. خوێنی گەشی چەن شێرەپیاوێکی وەک « شێخ شەهاب » و هاوەڵەکانی، گرتنی هەزران کورد، لە سێدارەدانی سەدان کادێر و پێشمەرگەی کوردستان، قەرەباڵغیی نێو گرتووخانەی شارەکانی « سولەیمانیی، کەرکووک، موسڵ و بەغدا »، هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێش، گەواهیی قسەکانم دەدەن! نەک وەک چەن کوردێکی « زۆر بە ئاگا و وشیاری وەک بەرزنجیی » دەسیان بە مووچەکەی خۆیانەوە گرتبێ، نەبا لە برسانا بمرن، بەربدبن، داربن، کەربن، لاڵ بن، داگیرکەر چۆنیان لێ خوڕێ، نەڵێن: نە«!
هەڵبەتە، ئەو کاتە، « بەرزنجیی » نەک هەر بەشداریی جەنگی کوردستانی نێوان ساڵی « 1974-1975 » ی نەکرد، بەڵکوو، هەر باوەڕیشی پێی نەبوو. دوای هەرەسەکەش، گەلێ قسەی زلزلی دەکرد و رەخنەی لە سەرانی شۆڕشەکە دەگرت. کەچیی، ئێستەش چونکە، وەک کوڵەبەڕۆژە رووی لە ڕۆژە، تەنانەت لە بری ووشەی « ئاشبەتاڵ و هەرەس » یش، زاراوەی « نسکۆ » بەکاردێنێ، کە لە لایەن هەوادارانی « پارتیی »یەوە دانراوە و خەتوکەی بەزەیی و سۆزی ئەوانی پێ دەدا!
جا گەر لە شۆڕشەکەدا بەشداربووایە و وەک ئێمە بە تێشکاویی و سەرشۆڕیی بگەڕایەتەوە، مەگەر هەر خوا بیزانیایە، ئەو کاتە چی لێ بەسەردەهات و چی لێ دەردەچوو! چونکە، ئەو کاتانە، هەمو پیاوێ بەرگەی خۆڕاگریی و دانبەخۆداگرتنی نەدەگرت!

### 63/3.. ئاسایشەکەی « زێوەر » :

ئینجا، دوای ئەو زێدەڕۆیی و درێژدادڕییە، بە سەر ملی ناوەڕۆکی گوتارەکەدا کەوتووە و نوسیویتی: (مەبەستی نووسەرو تەوەری قسەکەی ئەو شیعرەیە کە باس لە « ئاسایشەکەی سلێمانیێ » دەکات.)«56-55،3»، پاشان نووسیویتی: (ئەگەر زێوەر لەم شیعرەیدا راستی نەپێکاوەو سەددەرسەد وێنەیەکی واقیعی نەکێشاوە، ئەی پێچەوانەکەی چییە؟)«56،3»، کاتێ « زێوەر »، ئەو هۆنراوەیەی نووسیوە، هێشتا لە ئینگلیز قاچاغبووە. هێشتا نەگەڕاوەتەوە. گەر ئەو

هۆنراوەیەی، تەنیا بۆ دڵدانەوەی ئینگلیزەکان نەنووسیوە، بۆ لە شاخ نووسیوێتی؟ ئایا دەبێ، کێ لە دوژمن یاخیبێ، حەز نەکا، باری ناوخۆی ناوچەکانی بندەستی شێواوتربێ و هەمیشە ئاژاوەی تێدابێ؟ گەر ئەو هۆنراوەیەی، لە سەردەمی دەسەلاتدارێتی « شێخ »دا بنووسیایە، ڕەخنەی لەو سەردەمە بگرتایە، وەک هێندێ لە هۆنەرەکانی دیکە کردوویانە، ئەوا ئەو کاتە، لە مێژوودا، بە خاڵێکی گەلێ بەهێز، بۆی تۆماردەکرا. یا، گەر دوای گەڕانەوەی بیگوتایە، کە هیچ لە ئارادا نەمابوو، هەڵبەتە دەمانگوت: تەنیا ویستوویەتی، دژی ئەو پیاوخراپ و جەردانە، هەڵوێست وەرگرێ! ئەگینا، نکوولیی لەوە ناکرێ، بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان، بەپێی ئەوانەی لەو سەردەمانەدا ژیان و بۆیان گێڕاوینەوەتەوە، وێنەیەکی ڕیالیزمیی باری ئەو سەردەمەی کێشاوە. بەڵام، ئەو وێنەگرتن و هۆنراوەهۆنینەوەیە، تەنیا لە ڕای خوا و ڕاستیی ڕووتدا نەبووە، بەڵکوو، لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیدا بووە!

## 64/3. پەراوێزەکەی « مەلا ئەجەدین » :

بە لای منەوە، گرنگترین بەشی نووسیەنەکەی « بەرزنجیی »، لەم چەن دێڕەدا خۆی دەبینێ: (پەراوێزەکەی مەلا ئەجمەدینیش لەلاپەڕە « 30 »ی دیوانی زێوەر «بەشی یەکەم » زۆر جێگای گومانەو بەئەندازەیە لاوازەکە ناشێ جێگای متمانەبێ و بکرێتە سەرچاوە، لەکێ ی بیستووە؟! لە چ سەرچاوەیە وەریگرتووە؟ ئەو کەدەڵێ لە دێی « زەبینل »ەوە ناردوویەتی .. بەچ بەڵگەیە؟)«56،3»

بۆچی دەبێ، ئەو پەراوێزە جێگەی گومان بێ؟ بۆ بە ئەندازەیە لاوازبێ و نەشێ، وەک سەرچاوەیەک پشتی پێ ببەسرێ؟ ئەدی سەرچاوە چییە و لە کوێوە دێ؟ ئایا، سەرچاوە هەر بەو شێوەیە دروس نابێ؟

هەڵبەتە، کاتێ یەکێ « ڕووداوێ، بەسەرهاتێ یا کارەساتێ »ێکی دیارکراو، بە چاوی خۆی دەبینێ، یا هەواڵێکی تایبەتیی دەبیسێ، پاشان، تۆماریاندەکا، گەر کات و شوێنی هەواڵەکانیشی تۆمارکرد، ئیدی ئەو کاتە، وەک سەرچاوەی لێدێ. خۆ ناچێ، قورعانە گورگتۆپێنەکەی « بەرزنجە »ی بۆ بێنێ، هەزارویەک جار، دەستی پێدادا و سوێندی بۆ بخوا، کە درۆ ناکا! زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوە مێژوویی و وێژەییەکانی گەلانی جیهانیش، هەر بەو شێوە نووسراونەتەوە و خەڵکی باوەڕیشیان پێ دەکەن! ئایا، قسەی یەکێکی وەک مامۆستا « ئەجمەدین »، بۆ دەبێ، جێگەی گومانبێ، لە کاتێکدا خۆی ئەو پەراوێزەی بۆ دیوانەکەی نووسیوە و چاپیکردووە؟! یا هەر کاتێ، هەر قسەیە لەگەڵ مەبەسەکەی خۆیدا

ئەگونجا، ئەو قسە بۆشانە دەكا! ئەدی بۆ تا ئەورۆ، هۆنەرێ یا نووسەرێکی کورد، یەک دێڕی لە سەر ئەو پەراوێزە نەنووسیوە و مامۆستا بە درۆخاتەوە؟ ئەدی بۆچی دەبێ، ئەو هۆنراوە دەمییانەی « عومەر مارف بەرزنجیی » و قسەکانی خۆی و باوکی، دەربارەی « قانع » وەک سەرچاوە وابن؟ یا بۆ دەبێ، ئەو سەرگوزشتەیەی، لە بارەی ئێوچەوان بسریندابوونەکەی « هێمن » وە نووسیوێتی، ڕاستبێ و ئێمە باوەڕی پێ بکەین؟ وا دیارە، هەر کاتێ « بەرزنجیی » تەنگەتاو بوو، پەنا بۆ بەر پرسیارکردن و گومانکردن دەبا؟ ئەوەش، نیشانەی ئەوەیە، هیچی پێ نییە و هەر تەنیا دەیەوێ، بە هەر شێوەیە بێ، وەلامداتەوە و داکۆکیی لە « زێوەر » بکا!

## 65/3. درۆیەکی بێ ئابــــڕوو :

لەوەش سەیرتر ئەوەیە، نووسیوێتی: (لەئاوارەیی یەکەیدا زێوەر نەگەیشتە ئەم گوندە، تەنیا لەدوو شوێندا ناوی ئەم گوندە دێنێ کەهەندێ لەئاوارەکانی لێبوون «بڕوانە گەنجینەی مەردان ـ ل184 و 192 » هەروەها جەنابی شێخ لەتیفی شێخ مەحمودیش لە یادداشتەکانیدا باسی لێوەناکات « بڕوانە یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید ـ چ « 1 » 1955 راگەیاندنی ناوەندی پ. د. ک.)«56،3»

بە ڕاستیی، زۆر ناشیرینە، هەر کەسێ لەو تەمەنەی « بەرزنجیی »دا بێ، هەر لە خۆیەوە درۆبکا! دەکۆمێنتی ساختە دروسکا. سەرچاوە مێژووییەکان بشێوێنێ. هەر بۆ ئەوەی، بەرانبەرەکەی ببەزێنێ. ئاخر، خۆ گەر « زێوەر » خۆی نەمــــاوە، « گەنجینەی مەردان »ەکەی ماوە و تاهەتاشە، وەک سەرچاوەیەک هەر دەمێنێ! « بەرزنجیی » یا خۆی گێلکردووە، یا وای زانیوە، هەمو کەس وەک خۆی گێلەپیاوە و ئاگاداری مێژوو نین! یا کاتێ شتێکی نووسی، ئیدی خەڵکی لە هاڕەی چەپڵەی بۆ دەدەن و بە دوای شتەکەدا ناچن. پەنا بۆ بەر ئەو سەرچاوەیە نابەن، کە خۆی بەکاریهێناوە و ئاماژەی بە ژمارەی لاپەڕەکانی کردووە! وا دیارە، یەکێ پێی گوتووە، « زێوەر » کاتێ دەربەدەربووە، سەری بە گوندی « زەنبیل »دا نەکردووە، هەر لە دووریشەوە نەیدیوە. « نەجمەدین مەلا » ڕقی لێی بووە و پڕوپاگەندەی بۆ کردووە! یا هەرگیز ئەو سەرچاوەیەی نەخوێندۆتەوە، یا خوێندویەتییەوە، بەلام، لە بیریچۆتەوە، کاتێ ئەو چەن دێڕەشی نووسیوە، هەر لە خۆیەوە نووسیوێتی، بێ ئەوەی جارێکی دیکە، تەماشای سەرچاوەکە بکاتەوە. ئێستە، زۆر بە ڕوونیی، بۆم دەرکەوت، مامۆستا « نەجمەدین مەلا » هەرچییەکی نووسیوە، ڕاستی فەرمووە. چونکە، جگە لەوەی، پیــاوی درۆ نەبوو، هۆنراوە و هۆنەرانی کــوردیشی، زۆر خۆشویستووە. تا بڵێی، کوردێکی پاک و ڕاسگۆشبوو!

« بەرزنجیی » نووسیوێتی: (لەناوارەیی یەکەیدا زێوەر نەگەیشتە ئەم گوندە،) ئێمە مەوڵ نادەین، بە دوای گەواهدا بگەڕێین، چونکە، « زێوەر » خۆی، زۆر بە ئاشکرا گەواهیی ئەومان بۆ دەدا و زۆر بە ڕوونییش نووسیوێتی: (شێخ قادر بە غار هاتە پێشەوە، ماندوونەبوونیمان کرد، موجمەلی ئەحواڵی موکریانی بەیانکرد، وتی: « زەنبیل » مەئمووری ئێرانی تێدایە، بە ئیحتیات بڕۆن. خۆشی دوعاخوازیی کردو گەڕایەوە بۆ « بانە ». ئێمەش ڕوومانکردە « زەنبیل ». لە پێشەوە پیاوێ چوو خەبەر بۆ « سەیید » ببا. خۆشمان لە خوار « زەنیبل »ەوە کانی گەڕاوێ هەبوو ڕوومان تێ کرد، نەچووینە ناو دێ هەتا شەوتاریک دەبێ.* ئەو دوو سێ سەعاتە هەتا ڕۆژمان لێ ئاوابوو هەزار مەرارەتمان دی. لە تینوا زوبانمان وشکبووبوو. ئەگەرچی دوو دەقیقە ڕێگا ئاومان لێ دووربوو نەماندەزانی لەو نزیکانە چەشمە هەیە و لەولاش جەنابی « سەیید »، « سەیید موحەممەدی کوڕ » بە چەند سوارەوە بۆ ئیستیقبال ناردبوو.« سەیید موحەممەد » ڕاست ڕێگای « تورجان »ی گرتبوو نەیزانیبوو لە کەناری « زەنبیل »ین، هەتا سەعات یەکی شەو تەعقیبی کردبوو. وە ئێمەش لە « سەیید » هەم مەئیووسیمان پەیداکرد کە قوبووڵمان نەکا. لە پڕ خرمەی سوار پەیدابوو، « سەیید موحەممەد » هات، دەستبەجێ سوارەکانی دابەزاند، باریان بۆ بارکردین، مندالانی « شێخ »ی سوارکرد، چووینە خانەقاە، ئەوی لازیمەی میوانداری بوو بە ئەمری « سەیید » ئیجراکرا و بە خۆشی دامەزراین. لە پاش دوو سێ ڕۆژ ئیسراحەت ئاغایانی « ئەسکی بەغدا » جەنابی « حاجی مونمین خان و قۆچ بەگ » بۆ زیارەت هاتنە « زەنبیل ». کە چاویان بە من کەوت بە واسیتەی موعارەفەی پێشوو تەکلیفیان کرد من بچمە خدمەتی ئەوان. منیش ئیجابەتم کرد. کە تەشریفیان ڕۆیەوە ئولاغیان بۆ ناردم، چوومە ناو ئەو بەگزادانە، ئەو عالی هیممەتانە.)»40،190-191،

---

* لێرەدا، چ « زێوەر » و چ « محەممەدی مەلا کەریم » لە ڕووی زمانەوانییەوە، بە هەڵەدا چوون. جا نازانم، هەڵەکە کامیان کردوویەتی؟ چونکە، کە گوتی: نەچووینە ناودێ، دەبێ، کردارەکانی دیکەی نێو ڕستەکە، هەر بە ڕابردوو بێ. نەک بنووسێ: هەتا شەو تاریک دەبێ. بەڵکوو، تا شەو تاریک بوو، چونکە ئەو شتێکی کۆنی گێڕاوەتەوە. بڵێین: ویستوویەتی، بە شێوەیەکی دیکە ئەو ڕستەیە دابڕێژێ و هەمان کرداری « دەبێ » دوای « تاریک »کە بەکاربێنێ، دەبووایە، بەم شێوەیە بینووسیایە: بڕیارماندا، نەچینە ناو دێ، هەتا تاریک دەبێ!

ئینجا نووسیویتی: (تەنیا لەدوو شوێندا ناوی ئەم گوندە دێنێ کەمەندی لەئاوارەکانی لێبوون « بڕوانە گەنجینەی مەردان ـ ل184و 192 »)
هەڵبەتە، یەکسەر پەلاماری « گەنجینەی مەردان »ەکەم دا و کردمەوە، بە پەلە، لاپەڕەکانی « 184 و 192 »م هەڵدایەوە. دێڕبەدێڕی گەڕام. کەچی، گەر ناوی « زەنبیل »، لە کولەکەی تریشدا هاتبێ، لەو دوو لاپەڕەیەدا، بە هیچ شێوەیە نەهاتبوو. بەڵکوو، لەو دوو لاپەڕەیەدا، « زێوەر » بەسەرهاتێ دەگێڕێتەوە!
دوایی، لە خۆم بە گومانبووم، گوتم: تۆ بڵێی، بەرهەمەکە دوو جار یا چەن جارێ چاپکرابێ و من نەمزانیبێ، ئەویش، مەبەسی لە یەکێ لەو چاپانە بێ! بەلام، کاتێ تەماشامکرد، هەموو بۆچوونەکانی هەڵە دەرچوون، ئیدی لە گومان کەوتم.
هەڵبەتە، « بەرزنجیی » هەر لە خۆیەوە، ژمارەی ئەو دوو لاپەڕەیەی لە « گەنجینەی مەردان » نووسیوە، وایزانیوە، کەس هەستی پێ ناکا! ئیدی، لە داخا، بۆی دانیشتم، لە بەرگەوە بۆ بەرگ، جارێکی دیکەشم خوێندەوە. تەماشامکرد، نەک لەو لاپەڕانەی ئەو دەستنیشانیکردووە، « **دوو** » جار ناوی گوندی « زەنبیل » هاتووە و تێشیدا نەبوو، بەڵکوو لەم لاپەڕانەدا « 191 ,190 ,189 » تەنیا « **حەوت** » جار ناوی « زەنبیل » هاتووە. لە دڵی خۆمدا گوتم: دەک ماڵت نەشێوێ، مامۆستا خوێنەوارە بە ئاگا مێژووزانە گەورەکەی کورد، ئەمە لە ماتماتیکیشدا هەر کۆڵی، من وامزانی، هەر لە زمانی کوردییدا خراپی و لای من دەر نەچووی! جا، ئیدی ناهەقمە، باوەڕ بە بەڵگە و نووسینەکانی دەسبڕێکی وەک « بەرزنجیی » نەکەم! سەیر ئەوەیە، هێشا ئەم کڵڵەیی هەیە، باوەڕ بە پیاوێکی گەورە و ناودارێ وەک مامۆستا « نەجمەدین مەلا » ناکا. چونکە، لە دز وایە، هەموو کەس دزە!
بە ڕاستیی، وای لێ کردم، ئارەزووی ئەوەم نەبێ، تەماشای یادداشتەکانی « شێخ لەتیفی حەفید »یش بکەم. چونکە، من ئەو درۆ بێ ئابڕووەم ئاشکراکرد و بۆم سەلمان، « زێوەر » لە گوندی « زەنبیل » بووە، ئیدی چ پێویستدەکا، پەنا بۆ ئەو یادداشتەی ئەویش بەرم. من دەزانم، ئەویشی نەخوێندۆتەوە و هەر لە خۆیەوە نووسیویتی، تا خوێنەر باوەڕی پێ بکا. بەلام، خەڵکی هەر جارێ باوەڕ بە درۆ دەکەن و بە قسەی درۆ، چەن جارێ هەڵ ناخەڵەتێن!

## 66/3. ڕاپۆرتە هەواڵ :

هیچ مرۆڤێکی ژیر، باوەڕ بەوە ناکا، « زێوەر »ی بەشداریی شۆڕشی کردبێ، لە هەرە نزیکەکانی « شێخ » بووبێ، ڕووناکبیر و هۆنەرێکی ناسراوی سەردەمەکەی خۆی بووبێ، لە ئینگلیز یاخیبووبێ، هەروا بێ پێشەکیی و پێوەندییکردن بە

ئینگلیزەکانەوە، بێ ئەوەی پرسی پێ کردبن، یەکسەر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بۆ « سولەیمانیی » گەڕابێتەوە، وەک « بەرزنجیی » نووسیویتی: (زێوەر ڕاپۆرتە هەواڵ و مەحزەری کۆبوونەوەی نەپێچاوەتەوەو بەنهێنی بۆ سۆنی ناردبێ تا خۆی پێ نێزیک بکاتەوە و لە « خنکاندن! » ڕزگاری ببێ، ئەو تەنیاو تەنیا گەڕاوەتەوە شارو سا هەر بەرهەمێکی شیعری بوویێ ناویەناو لە « پێشکەوتن »دا بڵاوی کردونەوە، خۆ لەبەردەستدایەو ئاشکرایە، هەر کەس بیەوێ دەتوانێ لێیان وردبێتەوەو بزانێ تا چ رادەیە ئەم پیاوە تاوانبارە.)«57-56.3»
جگە لە هەڵەی ڕێزمان، کە دەمێ بە تاک و دەمێ بە کۆ نووسیویتی، ئاخر دەبێ، « راپۆرتە هەواڵ و مەحزەری کۆبوونەوە »، چ جۆرە پێوەندییەکی بە باسەکەمانەوە هەبێ؟ خۆ خوانەخواستە، من نەمنووسیوە، « زێوەر » سیخوڕی ئینگلیزەکان بووە، تا ئەو، ئەو جۆرە ڕاپۆرتانە بنێرێ! بەڵام، هەر مرۆڤێ ویژدانی نەبوو، بێ ویژدانییش لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکا! لە هەمان کاتیشدا، ئەم قسەیەی ئەو، ئەوە دەگەیەنێ، « زێوەر » تەنیا هەر هۆنراوەی نووسیوە و ناردوویەتی، نەک « راپۆرتە هەواڵ و مەحزەری کۆبوونەوە »ی ناردبێ. واتە: ئەو هۆنراوەیەی ناردووە. بەڵام، ئەم لە بەر هەر هۆیەبێ، هەر دەبێ، نکوولیی لێ بکا و داکۆکیی کوێرانە بکا!
کومانیشی تێدا نییە، وەک مامۆستا « نەجمەدین مەلا » ئاماژەی بۆ کردووە، ئەو هۆنراوەیەشی، هەر لە گوندی « زەنبیل »ەوە ناردووە، نەک کاتێ گەڕابێتەوە، نووسیبێتی! من خۆم، پتر، باوەڕم بە قسەکانی مامۆستا هەیە، گەر چیی مامۆستا « بەرزنجیی » باوەڕی پێ ناکا!

## 67/3. ڕۆشنبیریی و وشیاریی :

هەروەها، لە سەر بوختانەکانی خۆی ڕۆشتووە و نووسیویتی: (نووسەر زێوەر بەڕۆشنبیرێکی گەلێ لاواز دادەنێ، چونکە گۆرانی بۆ خاکی عێراق وتووە، بە کوڵ و دڵ باسی سەروەت و سامانی ی کردووە.) «57.3»
من هەرگیز نەمنووسیوە، « زێوەر » ڕۆشنبیریکی گەلێ لاوازبووە. ئەم قسەیەی هەڵبەستووە. بە پێچەوانەوە، تا بڵێی، « ڕۆشنبیرێکی گەورە، هۆنەرێکی ناسراو و زانایەکی باش ی سەردەمەکەی خۆی بووە، وەک لە کوتارەکەشدا باسمکردووە. ئیدی، « بەرزنجیی » مەگەر ئەم قسەیەی، لە گیرفانی خۆی دەرێنابێ! بەڵام، گەر ڕاستییم گوتبێ و نووسیبێتم: (هوشیاریی ڕامیاریی « زێوەر » وەک ڕووناکبیرێکی سەردەمەکەی خۆی، گەلێ لاوازبوو.)«58.24» ئیدی ئەمە، ئەوە

ناگەیەنێ، ڕووناببیرێکی لاوازبووە. هەڵبەتە، وەک لە گوتارەکەی منەوە، کۆیلەی وەر نەگرتووە و بە ئارەزووی خۆی، بە ناوی منەوە نووسیویەتی، دیارە، جیاوازییشی لە نێوان هەر دوو زاراوەی « ڕۆشنبیریی و هوشیاریی »دا نەکردووە. چونکە، ئەو دوو زاراوەیە، دوو واتای جیاوازیان هەیە. مەرج نییە، هەموو ڕۆشنبیرێ، هوشیاریی رامیاریی یا نەتەوەیی بەهێزبێ. هێندێ کەس هەن، هەر باوەڕیان بە هوشیاریی نەتەوەیی نییە و ڕۆشنبیریشن! بەڵام، خۆ ئەوە، ئەوە ناگەیەنێ، لە سەردەمێکی دیاریکراودا، « نووسەر، هۆنەر، ڕووناکبیر و رامیار »، چەن ناسراو و گەورەش بووبن، هەڵەیان نەکردبێ و لێی بە دووربووبن! یا تاوانیان نەکردبێ. تەنانەت، پێیان لە هێڵی سووریش ڕەت نەکردبێ و ناپاکییان بەرانبەر نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیان نەکردبێ!

لە مێژووی هەموو نەتەوەیەکدا، گەلێ « نووسەر، هۆنەر، ڕووناکبیر و رامیار »ی ناپاکیی تێدا هەبووە و هەیە. هەروەها، لە مێژووی نەتەوەی کوردیشدا، بە دەیانی وەک « مەلای خەتێ »ی تێدابووە، کە زانایەکی گەورە و ناسراوی ئایینیی سەردەمەکەی خۆی بووە، ناپاکیی لە کورد کردووە و خۆی بە عوسمانییەکان فرۆشتووە. هەر زۆر دوور نەڕۆین، « محێدین مەعروف »، ڕووناکبیرێکی کورد بووە، کورەکەشی « تەها »، هەر بە هەمان شێوە، ڕووناکبیر و رامیارێکی ناسراوی کوردە، یەکێ لە دامەزرێنەرانی « پ. د. ک. ـ عێراق »یش بووە، کەچیی، باوک و کوڕ هەر دووکیان، لە دوو سەردەمی جیاوازدا، ناپاکییان لە نەتەوەکەی خۆیان کردووە. « محێدین مەعروف »، کاتێ خۆپیشاندان و شەڕی بەر دەرکی سەرای « سولەیمانیی » ڕوویداوە، ئەو نەک هەر بەشداریی نەکردووە، بەڵکوو، بازی بە سەر خوێنی شەهیدانیشدا داوە، چەپکە گوڵی پیرۆزبایی، پێشکەش بە سەرانی دەوڵەتی عێراق و پەرلەمانەکەی کردووە! بۆیە، چەندین هۆنەری کورد، هۆنراوەیان بۆ ئەو ڕۆژە ڕەشە هۆنیوەتەوە، یادیانکردۆتەوە.

« پیرەمێرد » وەک کوردپەروەرێکی ڕاستەقینە، هەرگیز لە ناپاکەکانی کورد بێ دەنگ نەبووە. زۆر بە جوانیی، بە ڕۆڵەکانی گەلی ناساندوون و لە قاویداون. ڕووداوەکانی بۆ ڕوونکردوونەتەوە. دوای ئەوەی، کارەساتە گەورە نەتەوەییەکە قەوماوە، کاربەدەسانی میریی، کۆمەڵێ خۆفرۆشی وەک « محێدین مەعرووف » و خەڵکی شارەکەیان کۆکردۆتەوە، وەک هیچ ڕووی نەدابێ، بەرەو « بەغدا » ناردوویانن، تا داوای لێبووردن لە میریی بکەن. « پیرەمێرد »یش، ئەو نوێنەرانەی بە ناپاک داناوە و ئەم هۆنراوەیەی بە هەشت دێڕ بۆ گوتوون :

وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی، شاری خامۆشان!!
چەپکێ لە گوڵەکەی، باغەکەی سەرا
کە بە خوێناوی، لاوان ئاودرا
ببیەنە خزمەت، عەرشی عراقی
بڵێن: یار باقی و هەم سوحبەت باقی
پەردە و تارای سوور، بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن: پاش کوشتار، هێشتا تۆی دڵگیر
دەک خەجاڵەتبن، لە رووی مەحشەرا !!
ئێمە خاکی غەم، ئەکەین بە سەرا
ئێوەش ئەو عەرشەی، بە خوێن گوڵڕەنگە
سوجدەی بۆ ئەبەن، هیچ ناڵێن ئەنگە
کورد نەمردووە، خەیاڵتان خاوە
بەراتی ئەجات بە خوێن نووسراوە
من ڕەنگی سوورم، بۆیە خۆش ئەوێ
مژدەی شەفەقی، لێ دەس ئەکەوێ

«102،8»

هەر وەک، لە باسەکانی پێشووشدا، ئاماژەم بۆ کرد، هۆنەوڕێکی نیشتمانپەروەری وەک « بێکەس »یش، پەنجەی تاوانی، ئاراستەی ڕووناکبیرانی کورد کردووە، ڕەخنەی لێ گرتوون. گوایە، هەر خەمی گیرفان و ورگی خۆیانن، نیشتمانەکەیان پشگوێخستووە، تەنانەت بۆ پارە، بیروباوەڕی خۆشیان فرۆشتووە.
ئەو کارەساتە، نزیکەی حەفتا ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە، بەو شێوەیە « پیرەمێرد » تاوانباریکردوون. « بێکەس »ش پێش شەستوپێنج ساڵ، بە هۆنراوە ڕەخنەی لە رۆشنبیران گرتووە. بە هەموو یاسا و ڕێسایەک بووایە، دەبووایە، ناپاک لە نێو کورددا نەمایە، کەچیی، بە هەزاران جار پتربووە! ئەدی، بۆ نابێ، رۆشنبیر لاوازبێ؟ هەڵە بکا و ناپاکییش لە نەتەوەکەی خۆی بکا؟ بۆچی هەر لە سەرەتای شۆڕشی « 11/سێپتێمبەری 1961 »وە، بیگرین، چەن کەڵەپیاوی ڕووناکبیر و رامیاری گەلەکەمان، ناپاکییان بەرانبەر کورد و کوردستان کردووە؟ چەن کەس لە سەر خوێنی شەهیدان، کورسیی سەرکردایەتیی پارتەکان و شالیارگەکانیان بۆ خۆیان پچڕیوە؟ چەن کەس لە دانیشتووی شار و گوندەکان، لە بنەوە پێوەندییان بە دەزگە سیخوڕییەکانی دەوڵەت و « لەشکری میللیی » بەعسەوە

هەبووە؟ هەر هێندێ لەو ناپاکانە نین، ئەوڕۆ، بە نیشتمانپەروەر و کوردپەروەر دادەنرێن، پەنا حەجەکەشیان لێ گرتووین، ئاغای « بەرزنجیی »ش خۆی لێ بێ دەنگ کردووە، بە کێردە کولەکەی دەسیشی، گۆڕی مێژوو هەڵدەکۆڵێ!

## 68/3. ڕا و بۆچـــوون :

ئینجا، پرسیوێتی و نووسیوێتی: (ئایا لەم دوا ڕۆژانەی سەدەی بیستەدا کەسێ هەیە نکوڵی لەو ڕاو بۆچوونانەی ئەوسەردەمەی زێوەر بکات کەبەر لەشەست ساڵ وتونی؟)«57،3».

بە ڕاستیی دەبێ، بڵێین: « بەرزنجیی »، تەڕی تێگەیشتووە! ئێستەش وا دەزانێ، شا « فەیسەڵ » ماوە! دیارە، زۆر ئاگای لە باری بیری نەتەوەیی و باوەڕی کوردستانیزم هەیە، بۆیە، ئەو پرسیارە سەرسوڕمێنەرەی کردووە! بۆ ئەوەی دڵنیابێ، نەک هەر کەسێ هەیە، بەڵکوو، زۆربەی زۆری گەلی باشووری کوردستان، تەنانەت پارتە کوردستانییەکانیش، ئێستە کوردستانیانە بیر دەکەنەوە، دژی بیری « عێراقچێتیی » کاردەکەن. ڕۆژبەڕۆژیش، ئەو بیرە لە نێو ڕیزەکانی گەلی کورددا پەرەدەسێنێ، لە گەشەکردن و پێشکەوتندایە.

سەیر ئەوەیە، پارتە مارکسیی و چەپەکانیش، بەرنامەکانی خۆیان، لە بەر ڕۆشنایی بیری کوردستانیزمدا دارشتووە، وەک « پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان و پارتی زەحمەتکێشانی کوردستان » تەنانەت « پارتی دیمۆکراتی کوردستان »یش وازی لە ووشەی « عێراق »کە هێناوە، کە چەندین ساڵە، وەک کلک بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشێ! مەگەر چەن کەسێکی وەک « بەرزنجیی »، تا ئێستە، شانازیی بە بیری « عێراقچێتیی »یەوە بکەن، ئەگینا، کوڕی کوردی نیشتمانپەروەر، شانازیی بە « بەغدا »ی تاوان و « عێراق »ی چەکی کیمیاویی و ئەنفالەکانەوە ناکا!

جا، ئەو کوتەیە، پێش ئەوەندە ساڵ « زێوەر » گوتبێتی یا هەر کەسێکی دیکە گوتبێتی و بیڵێ، هەموو « عێراقچیی »یەک پێ بزانن یا نەزانن، پێیان خۆشبێ یا پێیان ناخۆشبێ، هەر هەموویان لە ڕاژەکردنی باوەڕەکانی « بەعس » و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دان. چونکە، ئەوانیش هەر ئەوەیان، لە هەموو کوردێکی بێگانەپەرستی « عێراقچیی » دەوێ، تا ڕۆڵەکانی کورد، بیر لە کورد و کوردستانەکەی خۆیان نەکەنەوە، بەڵکوو، خۆیان بە « عێراقیی » بزانن، وەک لە سەردەمی پاشایەتییدا، چەن جارێ لە سەر زاری شا « فەیسەڵ » و لە سەردەمی کۆمارییشدا، هەموو سەرۆکەکانی عێراق، ئەمەیان دووبارەکردۆتەوە و جەختیان

له سـەر کـردووە. بە تـایبـەتیی « سـەددام حـوسـێن » لە چەن چاوپێکەوتن و گوتەیکیدا، باسی « عێراقچێتیی » و « کوردستانچێتیی » کردووە. ئەوەتە، کاتی خۆی، سـەرکـردایەتی ڕێکخـراوی « کـۆمـەڵەی ڕەنجـدەرانی کـوردسـتـان »یش، هەستیان بەو مەترسییە گەورەیەی بیری دەسکردی « عێراقچێتیی »، بۆ سەر بیر و هۆشی ڕۆڵەکانی کورد کردووە. بۆیە، ساڵی « 1983 » نووسیویانە: (ماوەیەکە، لە جـاران گـەرمـتـر نوێنەرانـی بۆرجـوازی عـەرەبی « عـێـراق »، دژی بیـری کوردستانییبوون ئەدوێن و بیری « عێراقچێتیی » بڵاوئەکەنەوە، تەنانەت « سەددام حوسێن » ڕێبەری شۆڤێنیـترین توێژی بۆرجوازی ناسیۆنالیستی عەرەبیی و سەرکردەی حیزبی بەعسی عەرەبی هەرێمی «عێراق » چەند کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی تەرخانکرد بۆ باسکردنی « عـێـراقـچـێـتـیی » و پێویستـی تواندنەوەی هەسـتی کـوردسـتـاییـبـوونی کـورد لە بۆتەی « عـێـراقـچـێـتـیی »دا، وە زۆر بە بێزارییی و نارەزاییەوە باسی کوردستانییبوونی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی « عێراق »ی ئەکرد و گللەیی ئەوەی لێ ئەکردن کە گوایە خۆیان بە « عێراق »یی نازانن، و لە جەنگی « عێراق ـ ئێران »دا، خۆیان لە سەر خاکی « عێراق » بە کوشت نادەن و خۆیان لە جەنگی پاراستنی « عێراق » ئەدزنەوە.

ڕاستە کە کۆمەلانی خەڵکی کوردستان خۆیان بە « عێراق »یی نازانن، « عێراق » بە نیشـتـمـانی ڕاسـتـەقـینەی خۆیان نازانن، ئەگەر دەرفـەتیان ببێ و بۆیان بلوێ خۆیان لە سـەر دەوڵەتی « عێراق » بە کوشت نادەن و بیری « عێراقچێتیی » ڕەت ئەکـەنەوە. چونکە، کـورد لە بە « عێـراقـییکردن »یدا، جگە لە پارچەپارچەکـردنی نەتەوە و نیـشـتـمـانەکـەی لە مـەینەتی چەوسـانەوە و زۆرلێکردنی نەتەوایەتیی و چینایەتیی بەو لاوە هیچی تری دەست نەکەوتووە.

کورد لە بە « عێراقـییکردن »یدا، بۆتە نەتەوەیەکی ژێردەسـتـە و هـاووڵاتی پلەی دووەم و زۆرلێکراو لە هـەمـوو مافێکی مرۆیی و نـەتەوایەتیی خۆی بێ بەریبووە. لە فەرمانڕەوایی « عێراق » و بەڕێوەبردنیدا هیچ دەسـەڵاتێکی نییە، لە دیاریکردنی نێسـتـە و پاشـەڕۆژی « عـێـراق »دا مـافی بەشـداریکردنی نیـیـە ... دەسـەڵاتی ڕامیاریی، وە خێر و سامـانی « عێراق »یش لە بریتی ئەوەی گوزەرانی خۆش و پێشکەوتنی گرانتر و توند و تیژتر ئەکەن و هەڕەشە لە بوونی نـەتەوایـەتیی خۆی و لە ڕوخسـاری نەتـەوایەتیی کوردسـتـان ئەکەن. ئیـتـر چۆن خۆی بە « عێراق »یی بزانێ و خۆی لە سـەر « عێراق » بە کوشـتبدا؟ ... چۆن بیری « عێـراقـچـێـتی » قبوڵبکا و بیری کوردستانییبوون فەرامۆشبکا؟)«54، 1-2».

## 69/3. ئەزمـــوون :

دیارە، کـورد کـەڵکی لە ئەزمـوونی دەوڵەمـەندی نەتەوەکـانی دیکەی جـیـهـان وەر نەگرتووە و وەریشی ناگرێ. بە تایبەتیی، زۆربەی کوردە « عێراقـچیی »یەکان، بە چوار لای خـۆیاندا ناڕوانن و ئاوڕ بۆ پاشـەوە نادەنەوە. بەڵکوو، وەک ئەسـپی عـەرەبانە، هەر تەمـاشای پێشـەوە دەکەن! سـەیر ئەوەیە، حـەفـتا سـاڵ دەوڵەتی کۆمـۆنیسـتی « یەکێتی سۆڤێت »ژیا، جگە لە کۆمۆنیستەکان، تا ئەندازەیەکی زۆر، هـەسـتـی نەتەوەیی خـۆیان مـــراندبوو، کـاتێ، یەکێ لەگـەڵ خـەڵکە ناکۆمـۆنیسـتـەکـاندا تێکەڵدەبوو، زاری دەکـردنەوە، زۆر بە ڕاشکاویی، باوەڕی خۆیان، دژی ئەو پارت و دەوڵەتە داگیرکـەرە دەردەبڕی. هـەستی نەتەوەیی خۆیان نەدەشـاردەوە. زۆر داکـۆکـیـیـان لە دەوڵەتـی « سـۆڤـێت » نەدەکـرد. ئاواتیـان دەخـواست، ڕۆژێ زووتر « ڕووس »ەکـان لە کـۆڵیانبنەوە، ڕزگـاریانبێ و دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان دامـەزرێنن. تا گـۆڕانکارییـیە گـەورەکـانی سـیـسـتـێـمی نوێی جـیـهـانیی ڕوویاندا، دەوڵەتی « سۆڤـێت » تێکچـوو، ئەو ئاواتە مـەزنە دێرینـەیان بەدیهات، لەو دەوڵەتە دیکتـاتۆرییـیە هەڵتۆقیوەی کۆمۆنیستەکان، پازدە دەوڵەتی ناسیۆنالی لێکەوتەوە. کەچیی، تازە هێندێ لە ڕۆڵەکانی کورد، داکۆکیی لە هەڵەی نووسـەر و هۆنەرەکانی کورد دەکەن، ئەوانەی پێش شەست ساڵ لەمەوبەر. ژاراوی بیری گەندەڵی بێگانەپەرستیی و باوەڕی نامۆی « عێراقچێتیی »یان، بە هۆنراوە بۆ ڕازاندووینەتەوە، وەک تێکەیەکی گەورە و سارد، بە گەرووی منالانی خوێندنگە سـەرەتاییـیەکانیادا کردووە. « بەرزنجیی »ش زۆر بە ڕاشکاویی، داکۆکـیی لێ کردوون، وەک « حەلیمە »ی کوردیی، بۆ سـەر خووڕەوشتە کۆنەکەی پێشووی خۆی گەڕاوەتەوە!

## 70/3. منالانی کــــورد :

پاشان نووسیویێتی: (چەند شیعرێکی بەنمونە هێناوەتەوە کەگوایە زێوەر بەجارێ باشوری کوردستانی تەسلیم بەعێراق کردووەو منالان فێردەکات کەعێراق بەوڵاتی خۆیان بزانن!!)«57،3»

جارێ، ئەوەی بەرهەمی منی خوێندبێتەوە، یەکسـەر دەزانێ، ئەو شێوە دەربڕین و داڕشتنـە، نەک هـەر لە هی من ناچێ، « بەرزنجیی » خۆی دایتاشیـوە و بە ناوی منەوە نووسیویێتی! بەڵکوو، من هـەرگیز نەشمنووسیوە، « باشووری کوردستانی تەسلیم بە عێـراق کـردووە » چونکە، « زێوەر » خـۆی هـیچ نەبووە، تا باشـووری کوردسـتان ببەخشێ! بەڵام، بۆ هـۆنراوەکانی، گەر وا نییـە و هەر لە ساوایـیەوە،

منالآنی کورد، فێری بیری گەندەڵی « عێراقچێتیی » ناکا، لەوە زیاتر نازانم، چۆن باوەڕ بە « بەرزنجیی » بێنم! چونکە، هۆنراوەکان خۆیان هاواردەکەن و هیچ بەڵگەیەکی دیکەی ناوێ.

### 71/3. دەستە گوڵی لاوان :

جا، من ئاگاداری ئەو کارانەی هۆنەربم یا نەبم، چی لە باسەکەمان دەگۆڕێ؟ چونکە، « زێوەر » لە سەردەمی خۆیدا، مامۆستا بووە، نەیتوانیوە یا ترساوە، بە هۆنراوە باسی جوگرافیای باشووری کوردستان یا هەموو کوردستان، بۆ منالانی کورد بهۆنێتەوە، کێ داوای لێ کردووە و زۆری لێ کردووە، تا هۆنراوەی بیری ژاراویی « عێراقچێتیی » بهۆنێتەوە؟ منالآنی کورد، بەو بیرە پووچە گۆشکا؟ خۆی ماندووکا و ئەم پێشەکییە بنووسێ: (عمرم لەخزمەتی پی خوێندنی جگەر گوشەکانمانا بردەسەر، بوم معلوم بو، کەمندالْ هرچی بەشعرو مقام بیخوینی هەوەسی لەوە زیاترو ئەوەی لەلا خۆشە، لەبەرئەمە هاتم هەندێ معلوماتی کە بۆ مندالآن پێویستە نظمم کرد بابەسەهلی پێیان لەبەربکرێ. ئەم خزمەتەیش سەرباری بێ.)«57،3»

لە کاتێکدا، هۆنەرە کوردستانییەکان، پتر بیریان لەوە کردبۆوە، هەرچی پێوەندیی بە خەڵکی کورد و خاکی کوردستانەوە هەیە، بە هۆنراوە بۆیان بهۆننەوە، تا پتر بە خاکی نیشتمانەکەی خۆیانەوە بلکێن!

### 72/3. گەنمی ژاراویـــــی :

نازانم، « بەرزنجیی » بۆ دەبێ، داکۆکیی لەو کارە خراپەی هۆنەر بکا؟ چ جۆرە بەرژەوەندییەک، لەگەڵ ئەو بیرە گەندەڵەدا کۆیدەکاتەوە؟

لەوە دەچێ، ویستبێتی، ختووکەی هەستی خەڵکی بدا، جەماوەرم بە خۆرایی لێ ماندا. چونکە، من « زێوەر »م بە تاوانبار و ناپاک دا نەناوە، تا ئەو بەو شێوەیە بنووسێ: (نازانم ئەمە چ تاوان و چ ناپاکیەکە شاعیر بەرامبەر نەتەوەکەی کردونی؟ ئاخۆ ئەم تاوانەی زێوەر مەترسیەکەی لەچ ئاستێکدابێ لەچاو ئەو دەیان کتێب و بەرنامەی وانەکانی « کۆمەلایەتی و پەروەردەی نیشتمانی و ڕۆشنبیری نەتەوەیی ـ الثقافە القومیە » بۆ گشت قۆناغەکانی خوێندن، کە لەهەشتاکانەوە بەرە ژور لەلایەن دەیان نووسەرو شارەزاوە بەوپەڕی ئەمانەتەوە دەکرانە کوردی و وەک گەنمی ژاراوی لەبەردەم نەوەکانماندا ڕۆدەکران و ئەوانیش « پاداشت ـ مکافئە »ی چەورو نەرمە قوتیان لەبەرامبەردا وەردەگرت. نازانم ئەو بەڕێزانەی ئەو کاری وەرگێڕانانەیان ئەنجامدەدا، ئێستا لەکوێ بن؟ کەس دەیداتە ڕوویان؟

پلەو پایەیان لەم کۆمەڵەدا لەچیدایە؟) پاشان، درێژەیپێداوە و نووسیوێتی:
(پرسیارەکە ئەمەیە: ئەو تاوانەی زێوەر کە « جاشایەتی و ناپاکی»یە ئاخۆ هی ئەمانە چی بن و نووسەر لە فەرهەنگی قسەی ساردو سووکی زمانەدا زاراوەیەکی گونجاوی بۆ دۆزیوتەوە، چ ناتۆرەیەکی سوکایەتیان بەبالادەبڕێ؟) «58،3» پاشاتریش نووسیوێتی: (ئەو کارە نیازپاکە پیرۆزەی زێوەر لە کوێ و ئەمەی ئەوان لە کوێ کە لەسەردەمی باروت و خەردەلدا دەکران) «59،3»
پێش هەموو شتێ، مۆری تاوانی « ناپاکیی » و « جاشایەتیی »م، بە « زێوەر »ەوە نەناوە. بەڵکوو، نووسیومە: (ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیەی « زێوەر »، لەو سەردەمەدا بۆ عێراقی گوتووە، هەر هۆنەرێکی دیکە لەم سەردەمەدا بیگوتایە، بە دەیان ناو و ناتۆرەی خراپیان لێوادەخست، مۆری ناپاکیی و جاشایەتییان پێوە دەنا!) «61،24» ئایا، ئەو گەوهەرانەی ئەو بە ناوی منەوە هەڵیرشتوون، لەگەڵ ئەم قسانەی مندا، یەک واتایان هەیە؟!! جا با لێرەدا، هەر هیچ نەڵێم و بێ دەنگبم. باشتر وایە، تەنیا بەرەو رووی ویژدان و رەوشتی خۆی کەمەوە!
جگە لەوەی، بە هیچ جۆرێ ناکرێ، ئەو هۆنراوە « عێراقچێتیی »یانەی هۆنەر گوتوونی، لەگەڵ کاری وەرگێڕانی ئەوانەدا بەراوردبکرێ. چونکە ، سەردەمەکان زۆر جیاوازییان هەیە. کارەکان خۆی لە خۆیاندا جیاوازن. مەبەسەکانیش یەک نین. بەلام، من پێم وایە، دەتوانین، ئەو کارانە بە سەر سێ دەستەدا دابەشکەین:
1. ئەوانەی « بەعسیی » بوون، هەر خۆیان ناپاک بوون. جا، ئەو کارەیان کردبێ یا نەیانکردبێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ. دیارە، داوایان لێ کردوون و بە ئارەزووی خۆیان، ئەو بابەتانەیان وەرگێڕاوە.
2. ئەوانەی خۆیان « بەعسیی » نەبوون، بە زۆر ئەو کارانەیان پێ کردوون، ئەوەیان بڕیارێکی دیکەی دەوێ، مەگەر هەر « بەرزنجیی » بتوانێ، دەریکا!
3. ئەوانەی « بەعسیی » نەبوون، تەنیا بۆ پارە، ئەو کارەیان کردووە، ئەوەش هەر بە کارێکی خراپ و تاوانێکی گەورە دادەنرێ!
بەلام، لە هەمان کاتدا، وەرگێڕانی هەر بابەتێ بێ، لەگەڵ هۆنراوە هۆنینەوە و پیاهەڵدان، بە سەر داگیرکەران و خاکەکەیاندا، جیاوازیی هەیە. چونکە، بابەتی وەرگێڕانەکە، هی وەرگێڕەکان خۆیان نییە. بەلام، هۆنراوەکە زادەی بیری هۆنەرەکە خۆیەتی و دەیەوێ، ئەو بیرە بلاوکاتەوە. لەبەرئەوە، لای من ئەو وەرگێڕانانە، هەر چەن پێویست نەبوو، خوێندکاری کورد بیخوێنێ، بەلام، هیچ مەترسییەکی نەبووە و نییە. چونکە، زۆربەی خوێندکاران دەزانن، ئەو « گەنمە

ژاراویی مه چییه و بۆ بۆیان ڕۆکراوه. جگه لەوەی، ئەو بابەتانه، با، بابەت و بەرنامەکانی « بەعس »یش بێ، کاتێ خوێندکاران خوێندنیان تەواوکردووه، هەر وەک وانەکانی دیکه، له بیریانچۆتەوه! ئەو بەڕێزانەی هەواڵیشیان دەپرسێ، دوور نییه، هێندێکیان هەر هاوڕێی « بەرزنجیی » خۆی بووبن، لەبەرئەوه، خۆی باشتر دەزانێ، ئێستــه له کوێن! هەر چەنده، هێندێکیـان هەر له نێـو پارتەکانی کوردستاندا کاردەکەن، لەوانەشه، له هەر دوو حوکوومەتەکەی « سلێمانیی و هەولێـر »دا، سەره کورسیێکیـان به دەسـبێ! چونکه، ئەوانه کوڕی ڕۆژن، کێ دەسی بڕوا، دوای ئەو لایه دەکەون و کاری لەگەڵ دەکەن، له « بەرزنجیی »ش له پێشترن و دەسیان پتر دەڕوا!

له هـەر وولاتێکدا، گـەر هیچ جـۆره پرینسـیپێ نەمـا، هیچ جـۆره سـەنگ و تەرازوویەکی نەتەوەیی و دادپەروەرانه نەمـا، « نیشتمانپەروەریی، پاکیی و دڵسـۆزیی »، ڕۆڵەکـانی ئەو نەتەوەیەی پێ بکێشـرێ، کێ یەخەی ئەو ناپاکانه بگرێ؟!! کەواته، یەکێکی وەک « عەونی یوسف » ناهەقی نەبووه و به خۆڕایی نەیگوتووه: « جەناب! مەقاییس نەماوه. »

ئەوه جگه لەوەی، ئەو کارەی « زێوەر » کردوویەتی، « بەرزنجیی » بـه « کارێکی نیـازپاکی پیـرۆزی » داناوه. لای من، نه هەرگیـز بـه نیـازپاکیی گوتوویەتی و نه هەرگیـزیش پیـرۆز بووه! چونکه، لەگەڵ باوەڕەکـەمدا ناگونجێ! دیاریشـه، بۆ چ مەبەسێ داینـاون! ئەو کارەش، به کردەوەی خەڵکی ئەم سەردەمه بەراورد ناکرێ، وەک ئەو کردوویەتی. چونکه، هەموو سەردەمێ، خەسڵەتی تایبەتیی خۆی هەیه. له سـەردەمی « زێوەر »دا، « باروت و خـەردەل » نەبووه، ئینجـا ئەو هۆنراوانەی گوتووه، ئاخۆ، گەر هەبووایه، یا وەک کوردێ له گرتووخـانەکانـی ئەم سەردەمەی دەوڵەتی عێراقدا، ئازاریان بدایه، چی دیکەی بگوتایه؟!!

له لایەکی دیکەشـەوه، بۆ دەبێ، ئەو کـاره خـراپەی « زێوەر »، لەو سـەردەمەدا کـردوویەتی، به کـارێکی خـراپتری ناپاکـەکـانی کوردی ئەو سـەردەمه یا ئەم سـەردەمه بەراوردکرێ؟ ئەدی بۆ ئەو کارەی ئەو، به کارێکی باشی، چەن نووسەر و هۆنەرێکی دیکەی سەردەمەکەی خۆی بەراورد نەکەین؟ بۆ لەگەڵ « بێکەس »ی هۆنەردا بەراوردی نەکـەین، کـه هـەر لەو سـەردەمـانەدا ژیاوه، جگه لەوەی، هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانیی هۆنیوەتەوه، پێشڕەوایەتیی خۆپیشاندانەکەی شەڕی بەردەرکی سەرای « سولەیمانیی » کردووه، چەندین جار، نانبڕاوکراوه، دوورخراوەتەوه و گیراوه. بەڵام، « زێوەر » دوای ئـــەوەی گەڕاوەتەوه، له ساڵی

« 1921 ەوە تا ساڵی « 1984 » مردووە، ڕەنگی نەماوە، دەنگی براوە، وەک لە کۆمەڵی کوردەوارییشدا نەبووبێ، یا هیچ ڕووی نەدابێ، کوردستان بەهەشتی سەر زەمین و ڕەوشی نەتەوەیی و ڕامیاریی کوردیش، ماستی مەیو بێ، وا بووە!
من دەڵێم: ئەو هۆنراوانەی « بەرزنجیی » داکۆکیی لێ کردوون و بە هۆنراوەی فێرکردنی داناون، ئایا، چی فێری خوێندکارانی کورد کردووە؟ باسی بێگانەپەرستیی و خۆ بە عێراقییزانین، یا کوردایەتیی و خۆ بە کوردستانییزانینی فێرکردوون؟ ئەدی، بۆچی ئەو هۆنراوە نامۆ « عێراقچێتیی مانە، بە چەن هۆنراوەیەکی چەن هۆنەرێکی وەک « مەلای گەورە، ئەسیریی، بێکەس، موفتیی، قانع، ... تاد » بەراورد نەکەین، تا بزانین، ئەوان بە چ شێوەیە ویستوویانە، منالانی کورد پەروەردەکەن، کاتێ زۆر بە ڕوونیی و ڕاشکاویی، بێ ترس و سڵەمینەوە، بە دڵ و دەروونێکی پاکەوە، هەموو ڕاستییەکانیان بۆ هۆنیونەتەوە.
لە ڕاستییدا، من حەزم نەدەکرد، چاکە و خراپەی هیچ هۆنەرێکی کورد، بە باڵای یەک بگرم. چونکە، هەر هۆنەرێ خۆی بە تەنیا، لە ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی خۆی بەرپرسیارە. جگە لەوەی، هۆنەر ئازادە، چۆن بیرەکاتەوە و چی دەنووسێ. بەڵام، بە مەرجێ لە سنووری بەرژەوەندیی نەتەوەکەی خۆی دەر نەچێ. ئەگینا، وەک چۆن هۆنەر، ئەو مافەی هەیە، بە ئارەزووی خۆی هۆنراوە دارێژێ، ڕۆڵەکانی کوردیش بۆیان هەیە، ڕەخنەی لێ بگرن، دید و بۆچوونە هەڵەکانی ڕاسکەنەوە و ڕەتیکەنەوە. من لێرەدا، دادگەم نە بۆ « زێوەر » و نە بۆ هیچ هۆنەرێکی دیکەی کورد داناوە، تا لە قەفەزی تاوان و ناپاکییدا ڕایانگرم و دادگاییان بکەم! بەڵکوو، ئەوەی دەمەوێ، لەم نووسینەدا لێی بدوێم و ڕوونیکەمەوە، تەنیا خۆی، لە باوەڕی هێندێ لەو هۆنەرانەی کورددا دەبینێ، تا بزانین، لە ڕووی وشیاریی نەتەوەیی و ڕامیارییەوە، چییان گوتووە و چییان نووسیوە. بۆیە، ئەو مافە بە خۆم نادەم، هۆنراوە خراپەکانی هۆنەرەکانی کورد، بە یەکدی بەراوردکەم، تا پاساوی هەموویان بدەمەوە. بەڵکوو، بە یەک چاو لە بەرهەمی هەموویان دەڕوانم، بەرنامەیەکی « نەتەوەیی، ڕامیاریی و وێژەیی » ئەکادیمیایانەی ڕەخنەگرانەم، لە بەر دەمی خۆمدا داناوە، لە بەر تیشکی ئەو بەرنامەیەدا، لە هۆنراوەکان دەکۆڵمەوە، لایەنە سیس و کەشەکانی، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم دەردەخەم. بێ ئەوەی، سوکایەتیی بەم هۆنەر یا بەو هۆنەری دیکەی کورد بکەم!
بەڵام، کاتێ « بەرزنجیی »، ئەو بەراوردە نابەجێ و ناشایستانەیەی کردووە، پاساوی هۆنراوە خراپەکانی « زێوەر »ی، بە هۆنراوە سیس و خراپەکانی،

هۆنەرەکـانی دیکەی کـورد داوە، ناچارمــدەکـا، لە بواری هـۆنراوەی نەتـەوەیی و نیشتمانییدا، بەراوردێ لە نێوان هۆنراوە و بۆچوونەکانی « زێوەر » و هۆنەرەکانی کورددا بکەم. هەر بۆ نموونە: لـەو سـەردەمەی « زێوەر »، هۆنراوەی بۆ « سنووری عـێـراق » داناوە، هۆنەرێکی کوردی نیـشـتـمـانپـەروەری وەک « ئەسـیـریی » هەوڵیـداوە، سنووری کـوردسـتـانـەکـەی، بۆ رۆڵەکـانی نەتەوەکـەی بە هـۆنراوە بهۆنێتەوە. لەوانەیە، « ئەسیریی » یەکێ لەو هۆنەرە بەدەگمەنانەی کورد بووبێ، سـاڵی « 1925 »، زۆر بە وردیی و دڵسـۆزییـیەوە، سنووری کـوردسـتـانـەکـەی دەستنیـشـانکردبێ، لە خـاکی نەتەوە دراوسـێکانی دیکەی کـوردسـتـانی جـیـا کردبێتەوە، بە بیست نیوەدێر، هۆنراوەی « سنوور »ی هۆنیبێتەوە و گوتبێتی:

کوردە! دەزانی لە کوێ ساکینە خزمانی تۆ
گوێگرە، تا پێت بڵێم: مەسکەنی قەومانی تۆ
کێوی تۆرۆس و عومقی حەوزەکەی ئەسکەندەروون
غەربییە تا بەحری رەش، سەرحەدی مەیدانی تۆ
بەحری رەش و ئەردەهان، ئاوی ئاراسە بزان
حەددی شیمالە ئەمە، بۆ کۆچ و جەولانی تۆ
ئەڵوەند و کۆلی ورمێ، تا سەری ئاوی ئاراس
سەرحەدی رۆژهەڵاتە، جۆگە و کێوانی تۆ
ئەهواز و کێوی حەمرین، ژەنگار و رێی نسەیبین
بۆ تەرەفی جنووبە، رەوزەی ریزوانی تۆ
داخیلی ئەم حدودە، دوازدە ویلایەت هەیە
دەڵێن: دوازدە میلیۆنە، نفووسی کوردانی تۆ
حاشا درۆیە، ئەسڵا نفووسیان نەنووسراوە
دەکاتە بیست میلیۆنان، بنووسرێ قەومانی تۆ
لە دەری ئەم سنوورە، لە ئەنقەرە و خۆراسان
بلووچ و ئازربایجان، لەوێشە خزمانی تۆ
ئەی وەتەنی خۆشەویست! ئاوتم ئەوجا کە بیست
منداڵێکی ساوا بووم، دەبوومە قوربانی تۆ
وتەی وولاتی کوردە، لە لای تۆ هەروەک ویردە
« ئەسیریی »، ئەم حاڵەتە دەلیلی ئیمانی تۆ «4، 45-46»

جـا، ئـەم هۆنراوەیە، جـێگەی شـانازیی و بایەخـێکی زۆر و بێ ئەندازەیە، یا ئەو

هۆنراوەیەی « زێوەر » کە باسی سنووری « عێراق »ی کردووە؟ ئایا، لە ڕووی پەروەردەی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە، کامیان باشتر و کاریگەرترن؟ ئەو لەو سەردەمەدا، هۆنراوەی « سنوور »ی کوردستانی هۆنیوەتەوە، نەک وەک « زێوەر »، سنووری « عێراق »ی بۆ منالانی کورد دانابێ! زۆربەی هۆنەرەکانی کورد بە گشتیی، هۆنراوەیان بۆ « سەروەت و سامانی کوردستان، ئالا، سەرکردەکانی کورد، گەورە پیاوان و شەهیدان ... تاد » گوتووە، نەک بە سەر شایەکی لە دەرەوەهێنراوی وەک « فەیسەل »یاندا هەڵدابێ!

بۆ نموونە: « مەلای گەورە »، لە هۆنراوەی « ئەگەر عیزت دەوێ »دا، سەرەتا باسی یەکێتیی ڕیزەکانی کوردی کردووە. پاشان، لە سامانی نیشتمانەکەی دواوە، ڕێی پیشانداون، ئامۆژگارییکردوون و بە پەنجا دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

وولاتێکتان هەیە، پڕ کان و مەعدەن
بە بێل و پێمەڕە، دوو قوڵتی لێدەن
دەزانن، ناوی ئەرزی چی تێدایە
وەلێ، مەوقوفی عیلمی کیمیایە
هەتا ئەو عیلمە، زۆر چاک نەخوێنن
دەبێ، هەر پاقلە و سلقێ بچێنن
مەلای نادان، بە عینوانی شەریعەت
حەرامیکرد لە تۆ، عیلمی تەبیعەت
لە بۆیە، هەرچی لەو خاکە بە دەرکەوێ
لە ڕادیۆم و لە زێڕ و باقر و نەوت
هەمووی کەوتۆتە ژێردەستی فەرەنگان
چیا و چۆڵان دەنۆڕن، وەک پڵینگان
تەماشاکەن، چیایان چۆن دەکۆڵن
هەتا کەی ئێوە، هەر بەرماڵ بە کۆڵن
خوریی و مازیی و کەتیرە و چەوت و گروان
وەکوو سیچکە و گلێخە و ڕۆنی قەزوان
دەخیلویم، نەکەن، بیدەن لە دەست خۆ
وە ئیللا وا بزانن، ڕۆح و دەرچوو
هەتاکوو نەبنە خاوەندی سەنائیع
هەموو ئینعامی خوا دەڕوا بە ضایع «107،45-112».

« ئەسیریی »، لە هۆنراوەی « تێنواڕی »دا، بە سیودوو نیوەدێڕ، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، لە خەسڵەتە باشەکانی کوردستان دواوە. باسێکی تێروتەسەلی جوانیی و سامانی کوردستانی بۆ کردووین. باشووری کوردستانی، لەگەڵ عێراقی عەرەبدا بەراوردکردووە و گوتوویەتی: لێرە، ئاسمان شین و لەوێ، لێڵە. لێرە، گەزۆ و لەوێ، قەتران دەبارێ. لێرە، چیای بەرز و لەوێ، بیابانی تەخت هەیە. لێرە، کانیی ڕوون و لەوێ، زۆنگاوی بۆگەن هەیە. لێرە، ئاوی سارد و لەوێ، سوێرە. لێرە، هەوای سازگار و فێنک، لەوێ، گڕە و گەرمایە. لێرە، بەهاری تەڕ و ڕەنگین، لەوێ، وشک و برینگە. لێرە، دەشتی سەوز و گوڵاڵە و نێرگس، لەوێ، بیابانی وشک و بێ درەختە. لێرە، باخی ڕازاوە و پڕ لە میوەی بەتام، لەوێ، بەرماوە و بە ئاوی کورد دەپارێ. لێرە، ئاوەدان و لەوێ، چۆڵەوانییە. لێرە، خاکی بە پیت و پتەوی بە کەڵک، لەوێ، زەوی زیخ و فشوفۆڵی بێ کەڵکە. لێرە، شنەبای بەرەبەیان، لەوێ خۆڵ ئەبارێ. ئەمانە هەمووی، لێرە مردوو زیندووەکەنەوە، لەوێش، گڕەی گەرم گیاندەکێشێ. بەلام، هەر چەندە، ئەم هەموو خەسڵەتە چاکانە، لە کوردستاندا کۆبوونەتەوە:

کەچی لات و هەژارە، خەڵکی لاژوور
هەموویان دەوڵەمەندن، خەڵکی خوارێ
هەموو کۆمەڵ ئەکەن، هۆکرئەبن « تات »
هەرچی کوردە، لە یەک لالووت و لاڕێ
ئەوان خۆیان دیاریکرد لە عالەم
کەلی کوردیش، لە دووی عالەم ئەکا، ڕێ
سەرم تاسیوە لەم کارە، براکەل
ئەدیبێکم دەوێ، هۆشەنگی یارێ
جوابێکم بدا، چی بێ ئەسەل وا
ئەمان وان و ئەوان وا، تێنواڕێ
« ئەسیریی » تێکچووە، لەم کارە هۆشی
ئەما بیری، بدا داکوو قەرارێ

« 61،4»

هەروەها، « قانع »ی هۆنەر، لە زمانی دایکی « کوتەک »ی کوڕییەوە، بە هۆنراوە « لایەلایە ... »ی بۆ جگەرگۆشەکەی کردووە و ژیرییکردووە. لەڕێی ئەوەوە، ئامۆژگاریی منالانی کوردی کردووە، بە هۆنراوەیەکی چلوهەشت نیوەدێڕیی و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

هەی لایەلایە، ڕۆڵە لای لایە
لە کزی کوردان، دەنگم دەرنایە
پاشان دەڵێ:
ڕۆڵە! ئەم شیرە، شیری شێرانە
شیری نیعمەتی، خاکی کوردانە
ڕۆڵە! بێشکەکەت داری قەزوانە
ئەمامی مەندەی، باخی بابانە
دواتریش دەڵێ:
شیرە ڕاستەکەم، نەخۆی بە درۆ
سەرسەریی نەبی، ئەمکەی ڕەنجەڕۆ
هەرگیز ناموست بە پارە نەدەی
ئاوەڵ کوردی خۆت، ئاوارە نەکەی

***

ڕۆڵە! من بۆیە تۆ بەخێونەکەم
ڕەنجی داماویت، لەگەڵا ئەدەم
تۆش خزمەتکاریی، بۆ گەل و هۆزت
قەت قسوور نەکەی، بۆ بەرزیی کۆزت
هەی لایەلایە، ڕۆڵە لایلایە
میللەتی بێ خێو، ڕۆڵە بەلایە
ڕۆڵە! خایەن بی بە ئاو و خاک
دەک ئەجەل بگرێ، داوێن و چاکت
تۆ بەخێو ناکەم، بۆ خەو و خواردن
یا وەک هێندێ کەس، بۆ چاو شۆڕکردن
کورم نەتبیستووە، مەشهورتر لە گشت؟
« سەر بۆ سەربڕین، نەک بۆ سەرزەنشت؟ »
ڕۆڵە! هەر کاتێ خوێنت بڕژێ
بە گوللەی دوژمن، مێشکت بپژێ
ڕەنجم حەڵاڵت، شیرم نۆشت بێ
کزی کوردستان، فەرامۆشت بێ
هەی لایەلایە، ڕۆڵە لایلایە
کۆمەڵی کوردان، وەک کاو بایە

.315-313،49،

« بێکەس »، گەلێ هۆنراوە و سروودی بەرز و جوانی، بۆ منالانی کورد داناوە، کە هەر یەکەیان وەک چیرۆکێکی پەند و ئامۆژگاریی وایە و منالان بە شێوەیەکی باش و کوردانە پەروەردەدەکا. بۆ نموونە: لە هۆنراوەی « تۆ چیت؟ من کوردم! »دا، بە شازدە دێرەهۆنراوە گوتوویەتی:

| | |
|---|---|
| تۆ چیت؟ من کوردم | نەتەوەی کوردم |
| خۆ ترسنۆک نیت؟ | حاشا نەبەردم |
| چی تۆی لەناوبرد؟ | دوودڵیی و نیفاق |
| چۆن ڕزگارئەبی؟ | هەر بە ئیتیفاق |
| بڵێ: چیت ئەوێ؟ | بەرزیی وەتەنم |
| بە خۆڕایی نا | بە گیان و تەمەنم |
| چیت لە بارایە؟ | خۆ فیداکردن |
| بۆچی؟ لە ڕێگای | میللەتا مردن |
| کوا؟ چەکت چییە؟ | سەودای وڵاتم |
| ئەی پشتیوانت؟ | عەزم و سەباتم |
| ڕاستت پێ بڵێم؟ | فەرموو، گوێم لێتە |
| بە قسەم ئەکەی؟ | سەرم لە ڕێتە |
| بە ڕاستیی و پاکیی | هەوڵ و تێکۆشین |
| لە کورسیی و کینە و | درۆ چاوپۆشین |
| ئەمانەت نەبێ | کارت زۆر لەقە |
| بەشت هەمیشە | نەگبەتیی و شەقە |

«185.6»

خۆ پێویستیش ناکا، « بەرزنجیی » سەری بناوسێ و ملی بماسێ، چاوی زەق و گوێی لەق بێ، کەف بچەێنێ و خۆی تورەکا و بڵێ: خۆ « زێوەر »یش، سروود و هۆنراوەی نیشتمانیی، بۆ منالانی کورد گوتووە. چونکە، جگە لەوەی، هەمووشمان وەڵامی ئەو پرسیارەی ئەو دەزانین، من لەو گوتارەدا، تەنیا باسی ئەو هۆنراوە خراپانەم کردووە. ئەگینا دەمتوانی، نموونەش لەسەر سروودەکانی ئەویش بێنمەوە!

### 73/3. ڕووداو و کارەسات :

ئینجا، دوای ئەوەی « بەرزنجیی »، هیچ لە هەگبە بۆشەکەیدا نەماوە، هەر لە خۆیەوە، چەن ڕووداوێکی مێژوویی و کارەساتێکی نەتەوەیی، تێکەڵاو بە باسەکەی « زێوەر » کردووە، وەک پسپۆڕێکی زانا و شارەزایەکی بە توانا، ناوی چەن

سەرکردەیەکی کوردی ڕیزکردووە، گوایە (« نەزمی نوێی جیهانی لەو سەردەمەدا » وای دەخواست کەروداوەکان بەپێچەوانەی خواستەکانی زێوەرو شێخ مەحمودو سمکۆو شێخ عەبدول سەلامی بارزانی و شێخی نەهری و ئیحسان نوری و ... دەیان سەرکردەو پیاوانی دڵسۆزی تری بەئاکام نەگەیشتووی ئەم نەتەوە بێ چارەیە بێ، هەروەک چۆن دەلاڵ و جرت و فرتی هەموو لایەنەکانی دنیای 1975 ئەوەی سەپاندو خواست کەببێ و هەزاران پەرەی شیعرو نووسینی ئاواتەخواستنی سەرفرازی کورد دران بەدەم ئەو گێژەڵووکەیەوە کە لەولاتی «ملیۆنێ شەهید »وە هەڵیکرد.. ئەوساش هەر ئاوابوو، ئیتر بۆ لەخۆرا زێوەر بەرۆشنبیرێکی لاواز دانێین.)»59.3«

لە ڕاستیدا، ئەو ڕووداوە مێژوویی و کارەساتە نەتەوەییانە، بەو شێوەیە هەڵ ناسەنگێنرێن. چونکە، هەر یەکەیان ڕەوشی تایبەتیی خۆیان هەبووە. هەر یەکەیان هۆی سەرنەکەوتنی دیاریکراوی خۆی هەبووە. بۆیە، بە تەواویی تێکشکاون و لەنێوچوون. جا هەر لە « شێخ مەحموود »وە بییگرە، تا بە هەرەسی شۆڕشەکەی « بارزانیی » دەگا.

وەنەبێ، هەموو نوچدان و مالۆێرانییەکانیش، هەمووی هەر خەتای داگیرکەر بوو بێ، هەر « نەزمی نوێی جیهانی لەو سەردەمەدا » وای خواستبێ، وەک ئەو نووسیوێتی. کوردیش خۆی، دەستێکی زۆری لە هەڵە و تاوانەکاندا هەبووە و هەیە. هەروەها، لە هاوکێشە « نێوخۆیی، ناوچەیی و جیهانیی »یەکانیشدا، هیچ نەبووە و هیچی پێ نەکراوە. بەلام، لێرەدا ماوەی ئەوەمان نییە، لە هەموو قوژبن و کەلێنێکی ئەو گرفتە نەتەوەیی و ڕامیارییانە بکۆڵینەوە.*

74/3. **فاکــــوفیک** :

« بەرزنجیی » جارێکی دیکەش، « هێڵی سوور و ڕامیاریی » بەسەرکردۆتەوە و نووسیوێتی: (ناچارین، لەمەشدا هەر بێینەوە سەرئەو باسەی کە سیاسەت ئەو هێڵە سورە دیاریکراوە نیە کەنابێ لێی لابدرێ و تەجاوزی بکرێ، لەم ڕۆژگارەی کەسەدان نمونەی بادانەوەی سیاسی و سەوداو مامەڵەکردن و کڕین و فرۆشتنی تیادێتەدی .. ئەم دێت یەخەی شاعیرێک دەگرێ کەهەرگیز ئەم فاکو فیکەی دنیای ئەمڕۆی نەدەزانی و پەیی پێ نەدەبرد.)»59.3«

---

* هێندێ لەو باسانەم، لە بەرهەمی « کورد و شۆڕش و هەڵی مێژوویی »دا باسکردووە. چاپی دووەمی « 2000 » لە « سولەیمانیی » کراوەتەوە.

هەر چەندە، لە کاتی خۆیدا و لە باسەکانی پێشوودا، زۆر بە درێژیی، لەم باسە دواوم. بەڵام، زۆرم حەزدەکرد، « بەرزنجیی » هێندە ئازابووایە، « هێڵی سوور »ی لە نێوان « ناپاکیی » و ڕەخنەلێگرتندا بۆ جیاکردنایەتەوە. وەک من بە خۆڕایی، لە گۆڕی مێژوو بەر نەدەبوو، پەلاماری سەرانی پارتەکانی کوردستانی بدایە، کە ڕۆژانە چەندین « هەڵە، تاوان و ناپاکیی »، بەرانبەر نەتەوەی کورد و خاکی کوردستان دەکەن. ئەدی، « بەرزنجیی » بۆ متەقی لە خۆی بڕیوە؟!! ڕاستە، کاری ڕامیاریی ئەو هێڵە سوورە دیاریکراوە نییە، وەک ئەو نووسیویێتی. بەڵام، ناپاکییکردن لە نەتەوە و نیشتمان، هەموو کات و هەموو سەردەمێ، تەنیاوتەنیا هەر ئەو هێڵە سوورەی بۆ دانراوە و بۆ هەموو کەسێکیش دادەنرێ. جا هەر لە جووتیارێکی نەخوێنەوارەوە تا دەرەبەگێ، لە کرێکارێکەوە تا بۆرژوایەک، لە گەداوە تا دەوڵەمەند، لە خوێندکارێکەوە تا مامۆستایەک، لە ئەندامێکی بچووکی پارتەکانەوە تا سەرۆک و سکرتێرەکانیان، لە شالیارێکەوە تا شایەک بیگرە، گەر ناپاکیی بکا، هەر بە ناپاکیی دادەنرێ. چونکە، ناپاکیی هەر ناپاکییەو یەک ناوی هەیە، بە حەرامزادەی کوڕی داگیرکەران دەژمێررێ و چەندین ناوی دیکەی نییە!

من ڕەخنەشم بەپێی ئەو بابەت و سەردەمە گرتووە، کە هۆنەر تێیدا ژیاوە و بەرهەمەکانی خۆی تێدا نووسیون. جا ئیدی، با چەن کەسێکی وەک « زێوەر »یش، لەم « فاکوفیکەی دنیای ئەمڕۆی نەزانیبێ و پەی پێ نەبردبێ ! » ئایا دەکرێ، چەن خۆفرۆشێکی وەک « مەلای خەتێ و موشیری حەمەی سولەیمان »مان بیرچێتەوە و بشکۆێخرێن، هەر لەبەرئەوەی، لەم فاکوفیکەی ئەوڕۆیان نەزانیوە؟!! مەگەرنەو کارە، هەر لە دەس دوو نووسەری وەک « مەسعوود محەمەد » و دوکتۆر « کەمال مەزهەر » هاتبێ، هەوڵیاندابێ، بەڵگە و بروبیانووی بۆ بدۆزنەوە، پاک و پیسیش لە مێژوودا دابێن، وەک چۆن لە کەمەی « شێر و خەت »دا هەیە، تا هەر هیچ نەبێ، بە مایەی خۆیانەوە هەڵیانسێن و بە « پاک »یان دابنێن!

**75/3 . ژن :**

« بەرزنجیی »، لە نێو ئەو هۆنراوانەی بە نموونە هێناونێتیەوە، بۆ ئەوەی پاساوی هۆنراوە « هێراڵچیتیی »یەکانی « زێوەر »ی پێ بدا، هۆنراوەیەکی دەربارەی ژن تێهەڵکێشکردووە، گوایە « پیرەمێرد » لە ژن تووڕەبووە و گوتوویەتی:

| | |
|---|---|
| خوا ژنی بە ژن دروستکردووە | ماڵ و زاووزێی پێ سپاردووە |
| لەزبان درێژە و عەقڵیان کورتە | نیتر چیانە لەم جرت و فرتە «39.3» |

ئەم هۆنراوەیە، جگە لەوەی بە هیچ جۆرێک، پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە نییە. لە دیوانەکەشیدا نییە. کۆتەی ژمارە «5» بۆ داتاوە، ئەو ژمارەیەش لە یەک کاتدا، لە پەراوێز و سەرچاوەکانیشدا هەیە. لەبەرئەوە، بۆم ساغ نەبووەوە کامیانە؟ گەر پەراوێز بێ، ئەوا دیسانەوە، ئەم هۆنراوەیەشی، هەر بە دەستیی لە «عومەر مارف بەرزنجیی» وەرگرتووە. بەڵام گەر لە سەرچاوەکاندا بێ، ئەوا لە «رۆژی کوردستان»ەوە وەریگرتووە. خۆ ناشکرێ، شێر و خەتی بۆ بکەم تا بزانم سەرچاوە راستەکەی کامەیە، لەبەرئەوە، هەر وازی لێ بێنین باشترە.
بەڵام، ئەوەی پتر سەرنجی منی راکێشا، ئەوە بوو، ئایا، چیرۆکنووسێکی گەورە و ناسراوی «سێکس»و «ئاڵۆشدامرکاندنەوە»ی وەک «بەرزنجیی» بۆ ئەو هۆنراوەیەی لە سەر ژن هێناوەتەوە؟ ئایا، خۆی بۆچوونی بەرانبەر ژن چییە؟ تۆ بڵێی، بە تەوسەوە لە «پیرەمێرد»ی روانیبێ، گەر ئەو هۆنراوەیە هی ئەو بێ، چونکە، سووکایەتیی بە ژن کردووە؟! باوەڕ ناکەم، لەبەرئەوەی، ئەوەی چیرۆکەکانی مامۆستای خوێندبێتەوە، ئەو کاتە بە تەواویی تێدەگا، بە چ شێوەیە لە ژن دەڕوانێ!
«بەرزنجیی»، لە هەموو چیرۆکە «سێکس»یەکانیدا، ژنی وەک کەرەسەیەکی رابواردن و «سێکس» تەماشاکردووە. لە هیچ چیرۆکێکیدا، ژنەکان بێ مەلامەت دەر نەچوون. جا یا ژنەکە خۆی، هاواری لێ هەستاوە و داوای سێکسی کردووە، یا پیاوەکە پەلاماریداوە و بە زۆر، ئەندامی مێینەی داگیرکردووە، ئارەزووی دڕندانەی چەپەڵی خۆی پێ دامرکاندۆتەوە.
کاتێ خوێنەر، ئەو جۆرە چیرۆکە «سێکسیی»یانەی مامۆستا دەخوێنێتەوە، وا دەزانێ، کۆمەڵی کوردەواریی، لە رووی بەرەڵایی «سێکس»ەوە، گەلێ لە جادەکانی «هاڤانا»ی جاران، کۆڕەپانەکانی «چین»ی پێش شۆڕشەکەی «ماو تسی تۆنگ»و ماڵە کاولێکانی خوارووی «عێراق»ی تێپەڕاندووە! ئەو نموونە سەیرانەی، لەو چیرۆکانەدا هەن، باوەڕ ناکەم، نەک هەر لە کوردستان، بەڵکوو، لەو کۆمەڵانەی «سێکس»یش تێیدا ئازادە، هیچ ژنێ بەو شێوەیە، شەرم نەکا و رەفتاربکا. هیچ ژنێ بەو جۆرە، سڵ نەکا و ئالای بەرەڵایی لێ هەڵکا، هیچ ژنێ بەو رەنگە، گوێ نەداتێ و شۆڵی لێ هەڵکێشێ، بێ پەردە، بە تێلیفۆن بە مێردەکەی بڵێ: («ئەگەر تا نیو سەعاتی تر نەهێیتەوە، ئەچمە بەر دەرگا و هەر کەسێکم دی، ئەیهێنمە ژوورێ». ژنەکە پەیمانەکەی بەجێدێنێ و کچەکەشی هەندێ لەو لاترەوە، مەمکەکانی زەلالەتیانە بە دەست کوڕێکەوە.)92،32،

لەوە دەچێ، « بەرزنجیی » ئەوەی بیرچوبێتەوە، کوردیش بە یەکێ لە گەلە موسوڵمان و ڕۆژهەڵاتییەکان دادەنرێ، خوورەوشتی تایبەتیی خۆی هەیە. وەک ئەو تێیگەیشتووە، (کۆمەڵگەی کوردەواریی لە سۆزانیی و هەوەسباز پێک نەهاتووە.)«94،32» ئێستەش، لە زۆربەی زۆری ناوچەکانی کوردستاندا، گەر ژنێ ناپاکیی لە مێردەکەی بکا و خەریکی داوێنپیسیی بێ، گەر نەیکوژن، ئەوا یەک و دووی لێ ناکەن، نەفرەتی لێ دەکەن و دەریدەکەن. خۆ گەر کچ بێ و شوو بکا، لە بەر هەر هۆیەک بێ، ئابڕووی خۆی دۆڕاندبێ و بێ بن بێ، گەر سەری لە جەستەی جیا نەکەنەوە، ئەوا مێردەکەی دەریدەکا و تا ماوە، بە چاوێکی زۆر سووک تەماشادەکرێ. جا بە ڕاستیی، ئەوەیە ماڵوێرانیی، کاتێ نووسەرێکی وەک « بەرزنجیی »، کۆمەڵەکەی دەوروبەری خۆی بیردەچێتەوە، سواری پشتی گای هاری ئارەزووەکانی خۆی دەبێ، هەر تەنیا لە ڕوانگەی بەرەڵایی « سێکس »ەوە، لە ژن دەڕوانێ، تووشی ئەو هەڵە گەورانە دەبێ!

## 4. باسێکی تایبەتیی :

« بەرزنجیی »، هەر بەوەشەوە نەوەستاوە، بۆچوونەکانی نێو گوتارەکەی « زێوەر » بشێوێنێ، لە دەرگەی بوختان و درۆ بدا، خەڵکیم لێ هاندا و ئاوێزانیان کا. بەڵکوو، زۆر ناشارەزایانە و کاڵفامانە، پەنای بۆ بەر گوتارێکی دیکەی من بردووە، کە بە هیچ جۆرێ، هیچ جۆرە پێوەندییەکی بە سەر باسەکەی « زێوەر »ەوە نییە. ئەوەشی بۆیە کردووە، تەنیا لەبەرئەوەی بیسەلمێنێ، ئەز ڕیالیبین نیم و بەردی زل دەهاوێژم و لە ئەندێشەیەکی قووڵ و سەیردا دەژیم.

### 1/4. عـــــــەریزە :

« بەرزنجیی » نووسیوێتی: (ئەگەر بڵێم نووسەر تەنیا ویستوویە حیسابێ لەگەڵ زێوەردا ڕاست کاتەوە، ڕاست ناکەم.. بەوەدا کە ئەو هەتا لەجێیەکی تریشدا هەر وەک نەشارەزاو بێ ئاگایە ڕاوبۆچوون دەردەبڕێ:

« ... ئێمە بۆ مافی کەلتووری یا ئۆتۆنۆمی ـ 15 ـ ساڵ خەباتی چەکداری دەکەین، ڕاست نیە، خۆ ئەوە کۆمەڵگای ئەورووپی نیە ئۆتۆنۆمی بەعەریزەیەک وەرگیرێ)»3، 59-60».

ئەز نامەوێ و نەشمەویستووە، « حیساب! » لەگەڵ « زێوەر » و کەسی دیکەشدا ڕاسکەمەوە. چونکە، من هیچم لەگەڵ ئەو هونەرانە و وەچەکانیاندا نەبووە و نییە. هەموو خۆماندووکردن و ڕازەکردنێکیشیانم لەبەرچاوگرتووە. بەڵام، هەرگیز لەو هونراوە زۆڵەکە « عێراقچێتیی عیانەی هونەرانی کورد بێ دەنگ نابم، بەپێی سەردەمەکەش ڕەخنەیان لێ دەگرم، بە بەرهەمی هونەرە نیشتمانیپەروەرەکانی دیکەی کوردیان بەراوردەکەم. کاتێ یەکێکی وەک « بەرزنجیی »ش دەیەوێ، لە پێناوی نیازە گڵاو و مەبەسە چەپەڵەکانی خۆیدا، دەردی دڵ و زوخاوی ڕەشی هەناوی پڕ لە کینە و ئیرەیی خۆی دەربڕێ، خوێنەری کورد چەواشەکا، هەڵبەتە دەبێ، پەنا بۆ بەر باسێکی دیکە و گوتارێکی دیکەی من بەرێ، کە نە لە نزیکەوە و نە لە دوورەوە، هیچ جۆرە پێوەندییەکی بە سەر « زێوەر » و گوتارەکەی پێشووەوە نییە. بەڵکوو، هەر تەنیا، پێوەندیشی بە کورد و کوردستانیشەوە نییە، تەنیا ئەوەیە، منی بە « ناشارەزا و بێ ئاگا » تاوانبارکردووە، « ڕاو و بۆچوون دەردەبڕم ». با بزانین وایە، یا نا؟!! ئەز زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: کاتێ ئەو دەقەم خوێندەوە، زۆر سەرم سوڕما. چونکە :

1. ئەو کۆپلەیەی ئەو وەریگرتووە، من نەمنووسیوە. بەڵکوو، لە مێزگردێکی ڕۆژی

،1999/07/19 ی کارمەندانی ڕۆژنامەی « کوردستانی نوێ »ی وەرگرتووە، واتە: ئەو کۆپلەیە ڕۆژنامەنووسێ نووسیویەتی. جا، ئیدی چۆن لە قسەکانی من گەیشتووە و چی نووسیوە، ئەوەیان من لێی بەرپرسیار نیم. بۆ ئەوەی ڕاستیی ئەم قسەیەشم بسەلمێنم، کاتێ مێژگردەکەیان بڵاوکردەوە، بە تێلێفۆن قسەم لەگەڵ « کاوە محەمەد »، سەرنووسەری « کوردستانی نوێ »دا کرد، نارەزایی خۆمم دەربڕی و گوتم: باسەکە زۆر بە کەموکوڕیی تۆمارکراوە. لە زۆر شوێندا، قسەکان پچڕاون و لەگەڵ یەکدیدا پێوەندییان نییە، بیرەکە بە گشتیی ڕوون نییە، خەڵکی لەو قسانە تێ ناگەن! ئەوە بوو، داوای لێبووردنیکرد. منیش گوتم: دەبێ، ئەو مێژگردە خۆم بینووسمەوە و بە شێوەی گوتارێ بڵاویکەنەوە. ئەویش، یەکسەر قایلبوو. دواتر، گوتارەکەم نووسی، لە ژمارە « 1928 »ی ڕۆژی چوارشەممەی ڕێککەوتی « 1999/08/18 »، لاپەڕەی « 9 »، بەشی لێکۆڵینەوە، لە ژێر ناوی «بیروڕای سەربەست ـ شێوازی خەبات و مافی چارەنووسی نەتەوەکان »دا بڵاو کرایەوە. ئێستە دەتوانم، بڵێم: هەرچی لەو گوتارەدا هاتووە، بە دید و بۆچوونی خۆمی دەزانم، لێی پەشیمانیم و هەموو جۆرە بەرپرسیارییەکی لە ئەستۆ دەگرم. جا، باشبوو، هەر دوو ژمارەی ڕۆژنامەکەم لابوو، بەراوردی هەموو قسەکانی خۆم و ئەوم کرد، ئینجا بۆم دەرکەوت، چی نووسیوە! گەر « بەرزنجیی »، کەمێ ویژدانی هەبووایە، زۆر بە هۆش و گۆش بووایە، شارەزا و بە ئاگا بووایە، هەڵبەتە، ئەو گوتارەی دەخوێندەوە، لەگەڵ مێژگردەکەدا بەراوردیدەکرد، ئەو کاتە ئەو قسە سارد و هەرزانانەی بەردایەتەوە! ئەز، بێ سڵەمینەوە دەڵێم: ئامادەم، پەنجە بە چاوی « بەرزنجیی » و هەزاران « هێرالجیی » فالچیی و دەسپێسدا بکەم، گەر یەک ووشەیان لەو بابەتە، لە گوتارەکەمدا دۆزییەوە،

2. « بەرزنجیی »، هەر بەوەشەوە نەوەستاوە، سەر لە خوێنەری کورد بشێوێنێ، قسەی مێژگردێ لە بری بۆچوونەکانی گوتارەکەی من بڵاوکاتەوە. بەڵکوو، زۆر بێ شەرمانە، بە ئارەزووی دڵی خۆی، دەسکاریی ئەو دەقەشی کردووە. ڕێنووسەکەی گۆڕیوە، بەپێی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی، لێی قرتاندووە و لێی وەرگرتووە. با بزانین، چۆن؟ ئەوەی ئەو برایانە لە مێژگردەکەدا بڵاویانکردۆتەوە، دەقەکەی ئەمەیە: (ئێمە بۆ مافی کەلتووری یان ئۆتۆنۆمی « 15 » ساڵ خەباتی چەکداری دەکەین، ڕاست نی یە، تۆ خەبات بکەیت خوێن بڕێژیت ئەنفال بکرێ ی لە پێناوی چی لە پێناوی ئۆتۆنۆمی یان فیدرالی کە ئەو شێوە خەباتە تەنها لەگەڵ سەربەخۆییدا دەگونجێ و لەگەڵ ئۆتۆنۆمی ناگونجێ خۆ ئەوە کۆمەڵگای ئەورووپی

نی بە ئۆتۆنۆمی بەعەریزەیەک وەرگری.)«9،25» جا، تکام لە هەموو خوێنەرانی کورد هەیە، بەراوردێ لە نێوان ئەو دوو کۆپلەیەدا بکەن، تا بزانن، « بەرزنجیی » چۆن، بە قەیچیی دەسبیسیی خۆی، ووشە و کۆپلەکەی لە یەکدی دابڕیوە، بۆ ئەوەی، تەنانەت نیشانەکانی خاڵبەندیش دابنێ، واتە: لەو شوێنانەی نووسینەکەدا، وەک « عەبەشەکەنە » بازی بە سەر ووشەکاندا داوە، چەن خاڵێکی نیشانەی خاڵبەندیی وەک « ..... »ی دا بەناوە.

ئینجا، با دەمەتەقێیەک، لە سەر هێندێ لەو بیر و بۆچوونە هەلانەی بکەین، بزانین، تا چەن ئاگای لە مێژووی خەباتی گەلانی جیاواز هەیە! چۆن لە بابەتەکان نەگەیشتووە و هەر لە خۆیەوە، کوێرانە هەڵی سەنگاندوون. خۆ گەر تەنیا، گوتارەکەی « شێوازی خەبات و مافی چارەنووسی نەتەوەکان »ی بخوێندایەتەوە، هەڵبەتە، ئەو پرسیارە دزێو و ناقۆڵایانەی نەدەکرد و نەیدەنووسی: (حەزدەکەم خوێنەری هێژا بەڕستەی دوایی قسەکەدا بچێتەوەو لەسەری بوەستێ، تا رادەی ماقوڵیەتی ئەم قسەیە دەرکەوێ و ئەوسا بەرەو رووی کەناڵە تەلەفزیۆنیە ناوخۆو جیهانیەکانی دەکەمەوە.. ئەوسا بەرێزدانی سوێندی دەدەم کە: چاوایە؟!)«60،3».

بە ڕاستیی، کەسێ هەر لە خۆیەوە، هەرمەکیی قسەبکا و هیچ ڕێزێ بۆ بۆچوونەکانی خۆی دا نەنێ، هەر وەک « بەرزنجیی » لێ بەسەردێ، ورێنەدەکا و دەڵێی بە دەم خەوەوە، قسە دەبزرکێنێ! کەسێ زمانە نەتەوەییەکەی خۆی بە باشی نەزانی، هەر وەک ئەو کۆڵ و ئەشارەزادەبێ. هەڵبەتە، لە ئیدیۆمەکانی زمانی کوردییش ناگا! هەر چەندە، وەک ڕوونمکردەوە، ئەو قسەیەی نووسراوە: (خۆ ئەوە کۆمەڵگای ئەورووپی نیە ئۆتۆنۆمی بەعەریزەیەک وەرگیرێ)، قسەی من نییە، وا داوای لە خوێنەر کردووە، بەو ڕستەیەدا بچێتەوە و لە سەری بوەستێ. ئینجا، سوێندی منی داوە و نووسیوێتی: « چاوایە؟! ».

## 2/4. ئیدیـــۆم :

بۆ وەلامی ئەم قسە هەلەقومەلەقانەی، لێرەدا نامەوێ، دەوەن با ناشی لەگەڵ بکەم. بەڵکوو، تەنیا بەرەو ڕووی گوتەیەکی « زێوەر »ی دەکەمەوە، کە نووسیوێتی: (شەوی دوایی ئەو نازدارانە، ئەو خانمانە بە پێ یان بە شەوی تاریک ڕێگای « کانی گۆمە » دەگرن، هەتا دەچنە ئەوێ لە سەد ڕۆح ئەوەونۆی لە ترسا زایع ئەکەن.)«39،187-188».

کاتێ، ئەم دەقە دەخوێنمەوە، یەکسەر تێدەگەم، « زێوەر » مەبەستی چی بووە، واتە: زۆر ترساون. ئیدی، چ پێویستیدەکا، سەری خۆم و خوێنەریش بیەشێنم، هاوار

بکەم و سوێندی خەڵکی بدەم، تا بزانن، « زێوەر » چی گوتووە و چۆن زیادەڕۆیی کردووە؟ چونکە، هەموو کەسێ دەزانێ، هەموو مرۆڤێ، تەنیا یەک گیانی هەیە و وەک ئەو نووسیویێتی: سەد گیانی نییە، تا نەوەدونۆی لەدەسبا!
لێرەدا، چەن ئیدیۆمێکی دیکەی زمانی کوردیی بۆ دێنمەوە، تا بزانێ، مەبەس لەو « هەڕیزە » یە چی بووە!
کاتێ یەکێ، چاوەڕوانی یەکێکی دیکە دەکا، پاشان، کەسی دووەم دێ. کەسی یەکەم ئارامی لێ براوە و بە تووڕەییەوە پێی دەڵێ: سەعاتێکە چاوەڕێتدەکەم. لەوانەیە، هەمووشی چارەکێ نەبێ! بەڵام، لێرەدا مەبەسەکە روونە، هێندە چاوەڕێیکردووە، بێ تاقەتبووە، ئەگینا، هیچ کەسێ، سەعاتێ چاوەڕێی کەس ناکا!
یا کاتێ، یەکێ قسە بۆ یەکێکی دیکە دەکا، کەسی دووەم باش گوێ ناگرێ، یا تێی ناگا، دەڵێ: چۆن؟ کەسی یەکەمیش بە دڵگرانییەوە پێی دەڵێ: سەعاتێکە چەنەو بۆ دەدەم، تازە دەڵێی: چۆن؟ لەوانەیە، هەمووی چەن خولەکەیەکیش بێ، قسەی بۆ کردووە! لێرەدا، تەنیا هەر مەبەس لەوە نییە، ماوەیەکی زۆرە قسەی بۆ کردووە، بەڵکوو، پتر مەبەس لەوەیە، کەسی دووەم گوێی بۆ قسەکانی شل نەکردووە و بایەخی پێ نەداوە. بۆیە، کەسی یەکەم تووڕە و دڵگران بووە و وای گوتووە!
یا کورد دەڵێ: هەتاوێکی ئەوەندە گەرمە، سەری کەچەڵ دەسووتێنێ. جا بەو پێیە بوایە، دەبووایە، لە هاوین و لە کاتی ئەو هەتاوە گەرمەدا، هیچ کەچەڵێ لە ماڵ دەر نەچووایە، هەر لە بەر سێبەر بووایە و هەتاوی نەدیایە. بەڵام، تەنیا مەبەسەکە ئەوەیە، کە زۆر گەرمە.
هەروەها، دووکەڵ لە ماڵی هەڵ ناسێ، واتە: زۆر ڕژدە یا هەژارە. مل لە چەقۆ دەسوێ. واتە: بە دەسی خۆی، خۆی تووشی مەترسییدەکا. دنیای لێ بوو، بە چەرمی چۆلەکە. واتە: تووشی نائومێدیی بووە. زۆر ترسا. بە گیای بەهاردا ناتوڕێنێ. واتە: بە نەخۆشێ یا پیرێ دەگوترێ، کە باهار نابینێ و دەمرێ.
کەواتە، ئیدیۆم چییە؟ (ئیدیۆم لە دوو ووشەی وەک یەک، یا جیاواز، یا لە کۆمەڵێ ووشەی پێکەوە گونجاو، یا ڕستەیەک یا پتر پێکدێ، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، هەموویان یەک واتا دەبەخشن.)«5،23»*

---

* لەم بارەیەوە، بە درێژیی لە سەر « ئیدیۆمەکانی زمانی کوردیی » نووسیومە و لێی کۆڵیومەتەوە. گەر خوێنەر دەیەوێ، پتر بزانێ، دەتوانێ، تەماشای هەر دوو سەرچاوەی ژمارە «5،23» و «28، 449-467» بکا.

ئەم ئیدیۆمانە، لە ژێر خانەی « ئیدیۆمی تێکئالاو »دا، پۆلێندەکرێن. هەر چەندە، شێوەی زیادەڕۆیی و پێوەنانیان پێوە دیارە، بەڵام، بۆ مەبەستێ بەکاردێنرێن، کە لەو واتایانەوە نزیکبن. ئەو ئیدیۆمانەش، لە هەموو زمانێکی کەلانی جیهاندا هەن.
جا، گەر گورنەتەڵەی « ئەستێرە »ی منالان و ئەسپە بێ سوارەکەی « شەڕی چەتەگەریی »، لە جیهانی وێژەدا لە واتای « ئیدیۆم » نەگا، ئیدی دەبێ، گللەیی چی لێ بکەم! هەڵبەتە، هەموو خوێنەوار و ڕووناکبیرێکی بە هۆش تێدەگا، مەبەس لەو « عەریزە »یە چییە؟ چونکە، گەر داواکارییەکە، لەگەڵ سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەییدا بەراوردکەین، هێندە قورس و گەورە نییە، ئەو هەموو خوێنەی بۆ بڕێژرێ، شێوازی بەدیهێنانەکەی، هێندە سەخت و گران نییە، تا ئەو هەموو خەباتە دووروودرێژەی لە پێناودا بکرێ. بەڵکوو، بە ئاسانیی ئەو مافە وەردەگیرێ، نەک وەک کورد، نزیکەی حەفتا ساڵە بۆی تێدەکۆشێ.
من لەوە دڵنیام، « بەرزنجیی »ش ئەوە چاک دەزانێ و لە مەبەستەکەم گەیشتووە. بەڵام، کە یەکێ ویستی، یاری بە ئاگر بکا، تەپڵی بێ عاریی بکوتێ، قسەکانی تەڕەتۆڵەکەی نەگاتێ، دەهۆڵی دڕابێ و دەنگی بڕابێ، هەر دەبێ، بەو شێوەیە ڕەفتارکا، کە ئەو کردوویەتی. چونکە، بە چاویلکەیەکی تەڵخ و تەماویی پڕ لە داخ و قینەوە، تەماشای بەرهەمەکەی کردووە! چەن نموونەیەکیشی هێناوەتەوە، بە تەواویی لەگەڵ ئاستی زانیاریی وڕۆشنبیریی خۆیدا دەگونجێ، هێندە ناوشیارانە، ئەو نموونانەی باسکردووە، دەڵێی: بە بێژنگ، ئاو لە کانی دێنێ!

## 3/4. مافی نەتەوەیـــــــــی :

پاشان نووسیویەتی: (وا دیاره ئەلبانی نەژادەکانی کۆسۆڤۆ خەڵکی بۆسنەو هەرسک و باسکی ئیسپان.. بێ ئاگان لەم ڕێگاو شێوازە سوک و ئاسان و بێ سەر ئێشەیەی نووسەر دەیزانێ، ئەگین لەپای چی خۆیان تووشی ئەو هەموو ماڵوێرانی و خوێنڕشتن و ئەتککردنی شەرەف و نامووسە دەکەن لەلایەن ڕژێمێکی ئەورووپی خاوەن لوتکەی شارستانیەتەوە.
ئەو سەدان قەبرە بەکۆمەڵ و سوکایەتی و کچ و ژن و منال ئەتککردنە کەرژێمی « وەحشی گەری » میلۆسۆڤیچ بەنەتەوە غەیرە سربییەکانی کرد، دانی بەشێکە لەو « عەریز »یەی کەبەرز دەکرێتەوە بۆ وەرگرتنی حوکمی زاتی!) «60،3».
سەرەتا دەڵێم: « بەرزنجیی » نەک هەر لە سەرچاوە مێژوویی و ڕامیارییەکان کەڵکی وەر نەگرتووە، بەڵکوو، هەواڵەکانیش بە ئاوەژوو تێگەیشتووە! جا، گەر وا نەبووایە، هەڵبەتە دەیزانی، ئەو کەمینە و گەلانە، بۆچی خەباتیانکردووە و لە

پێناوی جیدا خوێنیان ڕەواکردبوون! دیارە، ئەو کەمینە و کەلانەی، ئەو بە « نەتەوە غەیرە سربییەکان! » ناوی بردبوون،* ئایا، بۆ ئۆتۆنۆمیی خۆیان بە کوشتداوە؟ یا ڕژێمە خوێنڕێژە درندەکەی کۆنە کۆمۆنیستەکان ویستوویانە و دەیانەوێ، بە لەنێویانبەرن و وەک ڕەگەز پاکتاویانکەن؟ چۆن « بەعس و سەددام » دەیانویست و دەیانەوێ، کورد جینۆسایدکەن، ناوی کوردستان، لە بیر خەڵکی بەرنەوە!
ئەو نموونانەی هێناویشمتییەوە، لەگەڵ یەکدیدا جیاوازییان هەیە. چونکە، لە چەن دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانیدا ڕوویانداوە. لە سەردەمی جیاجیادا سەریانهەڵداوە. ئەو کەمینە و کەلانە، هەر یەکەیان داواکاریی جیا و هۆی تایبەتیی خۆیان هەیە. کێشە و باسەکانیشیان، لە ڕووی « مێژوویی، نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئاشتایی و مافەکانیانەوە جیاوازییان هەیە.

## 4/4. دوو بەرەی جیاواز :

نازانم، مەبەس لە « کۆمەڵگەی ئەورووپایی » چییە و کێیە؟ چونکە، لە دوای جەنگی یەکەم بە گشتیی و جەنگی دووەمی جیهان بە تایبەتیی، دەوڵەتەکانی ئەورووپا، لە ڕووی جوگرافیاوە، بە سەر دوو بەرەی جیاوازی خۆرهەڵات و خۆراوا، لە ڕووی سیستێمی ئابوورییەوە، سۆسیالیست و سەرمایەدار، لە ڕووی دەسەڵاتی ڕامیارییەوە، دیکتاتۆر و دیمۆکراسیی، لە ڕووی گەلەکۆمەکیی سەربازییەوە، بە سەر دوو بلۆکی « وارشۆ » و « ناتۆ »دا دابەشکرابوون. ئایا مەبەسی لە ئەورووپای « خۆرهەڵات، سۆسیالیست، دیکتاتۆر و بلۆکی وارشۆ » یا ئەورووپای « خۆراوا، سەرمایەدار، دیمۆکراسیی و بلۆکی ناتۆ »یە؟ چونکە، هەر یەکێ لەو کەمپانە، باری تایبەتیی و ڕەوشێکی کاریگیراوی خۆیان هەیە. هەموو ئەو کەمینە و گەل و نەتەوانەی، کە بن دەستیشیاندان، لە هەموو ڕوویەکەوە جیاوازییان هەیە. بۆیە، جۆری گرفتەکان لە یەکدی ناچن، جۆری چارەسەرکردنەکانیشیان، لە یەکدییەوە دوورن. دوژمنەکانیشیان خەسڵەت و ڕەوشتی « مرۆیی، ڕامیاریی، سەربازیی و دیپلۆماسیی »یان جیاوازیان هەیە.
بۆ ئاگاداریی « بەرزنجیی » و خوێنەوارانیش، لە سەر ئەو باسانە، چارەکی یەکەمی سالی « 1996 » چاپی یەکەمی « فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ »م لە « سوید » چاپ و بڵاوکردەوە. چاپی دووەمیشی، لە مانگی « یون »ی هەمان ساڵدا،

---

* ئەوە نیشانەی نەشارەزایی « بەرزنجیی » دەردەخا. چونکە، جیاوازیی لە نێوان هێندێ زاراوەی ئێتنیی وەک « کەمینەی نەتەوەیی، گەل و نەتەوە »دا نەکردووە.

له کوردستان له لایەن « دەزگای دیموکراسیی »ەوە چاپ و بلاوکرایەوە، بەرهەمەکەش، لە دڵ و دەروونی خوێنەرانی کورددا، جێی شیاوی خۆی کردەوە. تەنانەت، گۆڤاری « ئاڵا »ی « پارتی سەربەخۆیی کوردستان »یش، دوای ئەوەی مۆڵەتیان لە خۆم وەرگرت، پێشەکییەکەی بەشی یەکەمیان، لە ژمارە « 30 »دا بلاوکردەوە.« 7.21 » ئەو نموونانەی « بەرزنجیی » هێناویەتییەوە، بەشی زۆری لە دووتوێی ئەو بەرهەمەدا باسکراون لە هەموو ئەو باسانە دواوم، کە ئەو پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە. جا ، گەر ئەو دوای باسەکان بکەوتایە، ئەو بەرهەمەی بخوێندایەتەوە، ئاستی « ڕووناکبیریی، بە ئاگایی و هۆشیاریی »، تەنانەت لە بالای خۆشی کورتر نەبووایە، هەڵبەتە، هەر لە خۆیەوە ئەو قسانەی نەدەکرد! بەلام، وا دیارە، ئەو ئاگای لە زۆر شت نییە، ئەوەشیان گوناهی من نییە! لێرەدا ، هەوڵدەدەم، لە بەر ڕووناکایی ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو سەردەمانەدا ، بەپێی کۆن و نوێیی سەردەمی کێشەکان، هێندێ لەو باسانە ڕوونکەمەوە.

5/4. « باسک » :

لێرەدا ، لەچاو کێشەی کەمینە و گەلانی دیکەدا ، پلەیەکی تایبەتیی بە کێشەی نەتەوەیی نەتەوەی « باسک » دەدەین و کەمێ بە درێژیی لێی دەدوێین.

کرفتی نەتەوەیی « باسک »، گرفتێکی کەلێ کۆنە. زۆر لە مێژە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی « باسک »، لە پێناوی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەییدا خەبات دەکەن. بۆیە، سەرتاسەری مێژووی نەتەوەییان، لە خوێن هەلکێشراوە. بەلام، ئەوان هەرگیز کۆڵیان نەداوە، هەمیشە لە سەر تێکۆشانی خۆیان بەردەوامبوون.

« باسک »ەکان، بە زمانی نەتەوەیی خۆیان، بە وولاتەکەیان دەڵێن: « ئۆسکادیی ». ئەم وولاتە، لە دوو ناوچە و حەوت هەرێمی جیاواز پێکهاتووە. « ئۆسکادیی سەروو » سێ هەرێمە و لە بندەستی داگیرکەری « فەرەنسا »و « ئۆسکادیی خواروو » چوار هەرێمە و لە ژێردەستی داگیرکەری « سپان »دان. واتە: نیشتمانەکەیان لە نێوان هەر دوو دەوڵەتی ئەورووپایی داگیرکەری « فەرەنسا و سپان »دا دابەشکراوە.

ژمارەی دانیشتووانیان، دەوروبەری پێنج ملیۆن دەبێ. هەموو مەرجەکانی نەتەوەیان تێدا هەیە. نەتەوەیەکی سەربەخۆ و دیاریکراوی ئەوتۆن، بە ئاسانیی لە هەر دوو نەتەوەی « فەرەنسا و سپان » جیادەکرێنەوە. چەن جارێ، دەوڵەتۆچکەی سەربەخۆیان دامەزراندووە. بەلام، هەموو جارەکان، لە لایەن داگیرکەرانەوە ڕووخێنراونەتەوە. دوای شۆڕشی « فەرەنسا »ی ساڵی « 1789 »ە، وولاتی « ئۆسکادیی » دووپارچەکرا و هەر پارچەیەکیشیان، بە یەکێ لەو دوو دەوڵەتە

بەستەوە. ئیدی لەو کاتەوە، داگیرکەران بە هەموو شێوەیە هەوڵیانداوە، رۆڵەکانی نەتەوەی « باسک »، لە بۆتەی نەتەوەکەی خۆیاندا بتوێننەوە. بە تایبەتیی، کاتێ جەنگی نێوخۆ سالی « 1872-1879 » لە « سپان » هەڵگیرسا، رەوشی نەتەوەیی و رامیاریی « باسک » ەکان زۆر خراپتربوو.
پێش هەموو شتێ دەبێ، ئەوە بزانین، (« سپان » دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانە، لە گەلانی « کەستیلان، باسک، کەتەلۆن ... تاد » پێکهاتووە. دەسەلاتی رامیاریی، بە دەس گەلی « کەستیلان »ی بالادەسەوەیە و پێتەختەکەشیان «مەدرید »ە.)«29، 61-62 » واتە: ئەو گەلانەی دیکەی، لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتی « سپان »دا دەژین، لە مافە نەتەوەییە سەرەکییەکانی خۆیان بێ بەشکراون. گەلی بالادەس، لە « ئۆتۆنۆمیی» پتری، پێ رەوا نەبینیوون. چونکە، (لە بەندی دووی دەستووری « سپان »دا دەڵێ: « نەتەوەی سپان نابێ، پارچەپارچەکرێ. »)«20،46»
کێشەی « باسک »ەکان لە دەوڵەتی « سپان »، کێشەیەکی گرگرتووی سەردەمە و لە گەلێ رووەوە، لە کێشەی کورد دەچێ. « باسک »ەکان، زۆر لە مێژە، داوای سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی ناسیۆنال دەکەن. چەن جارێ ئەو کێشەیە، لە لایەن دەوڵەتەکانی جیهانەوە باسکراوە. بەلام، فەرمانرەوایانی دەوڵەتی « سپان »، بۆ ئەوەی لە بایەخی کێشەکەیان کەمکەنەوە، هەموو ولاتی «سپان »یان، بە سەر چەن ناوچەیەکی « ئۆتۆنۆمیی » تایبەتییدا دابەشکردووە.
سەرەتای بزووتنەوەی نوێی رامیاریی و چەکداریی « باسک »، بۆ سالی « 1895 » دەگەرێتەوە. ئەو سەردەمە لە خەباتی رەوای نەتەوەی « باسک »دا، بە قۆناغێکی نوێی بوژانەوەی نەتەوەیی دادەنرێ. چونکە، (« سابینۆ دی ئارانا گویری » باوکی بزووتنەوەی رزگاریخوازی « باسک »، بیناى فەلسەفەی نەتەواویەتی « باسک »ی کرد و چەمکی نەتەوایەتی « باسک » و ولاتی یەکپارچەی « باسک » و ئارم و نیشانە و ئالای « ئۆسکادیی» یەککرتووی دانا. ئەمە بووە هۆی بزووتنەوەیەکی رۆشنبیریی و بەئاگاهاتنەوەیەکی میللیی لە سەرتاسەری « ئۆسکادیی »دا و بە تایبەتیی لە باشووری « ئۆسکادیی»دا کە بە پێکهێنانی « پارتی نەتەوایەتی باسک ـ P.N.V. »، خەباتی گەلی « باسک » بووە، خەباتێکی رامیاریی کۆمەلایەتیی. شەهیدبوونی رابەر و پێشەوای بزووتنەوەکە، لە تەمەنی «37 » سالاندا، بە دەسی ئیسپانییە داگیرکەرەکان و لە یەکێ لە بەندیخانەکانیدا، ئەوەندەی دیکە تاوی بە کڵپە و گڕی ئەو خەباتە رزگاریخوازانەیە سەند.)«26،7»

سالی « 1931 »، رژێمی پاشایەتیی لە « سپان » ڕووخا. کۆماری دیمۆکراسیی دامەزرا. « باسک »ەکان لە ڕێی پارتەکەیانەوە، لەو پڕۆسێسە شۆڕشگێڕییەدا بەشدارییانکرد. ئاواتی سەربەخۆیی تەواو، لە دڵ و دەروونی ڕۆڵە دڵسۆزەکانی نەتەوەی « باسک »دا چەکەرەیکرد. هەر هەمان ساڵ، ریفراندۆمێکی ئازادیان بۆ ئەو مەبەستە، لە ناوچەکانی « ئۆسکادیی »دا سازکرد. (لە 85٪ی خەڵکەکە دەنگیان بۆ جیابوونەوە و سەربەخۆیی میللیی خۆیان دا.)«26،7».

بەڵام، ئەم ئازادیی و خۆشییە، زۆری نەخایان، تا جارێکی دیکە، ئاگری جەنگی ناوخۆ، بە دەستی هێزە کۆنەپەرست و دەوڵەتەکانی دەرەوە خۆشکرایەوە. جەنگەکە بەردەوامبوو، هەموو « سپان »ی گرتەوە. ڕۆڵەکانی نەتەوەی « باسک »، زۆر بە شێوەیەکی قارەمانانە، داکۆکییان لە ئازادیی و سەربەخۆیی خۆیان دەکرد.

لە « 1936/08/18 »دا، ژەنەڕاڵ « فرانکۆ »، لە لایەکەوە، بە پشتیوانی هەموو هێزە کۆنەپەرست و دەرەبەگەکانی ناوخۆ، لە لایەکی دیکەشەوە، بە یارمەتیی و کۆمەکی هێزەکانی « مۆسۆلۆنیی » فاشیی و « هیتلەر »ی نازیزیی توانی، هێزەکانی دیمۆکراسیخواز و شۆڕشگێڕەکان بشکێنێ، پەلاماری کۆمارەکە بدا و بیڕوخێنێ. بەڵام، « باسک »ە شۆڕشگێڕ و پارتەکەیان، کۆڵیان نەدا و داکۆکییان لە خۆیان و کۆمارە سەربەخۆکەیان کرد. لە « 1936/10/07 » سەرۆکی میریی ئۆسکادیی »، « جۆزێ ئەنتۆنیۆ دی ئەگیر »، دەوڵەتێکی یەککگرتووی لە ناسیۆنالیست، کۆمۆنیست، سۆسیالیست و کۆمارخواز ەکان، بە ناوی دەوڵەتی « یەکێتی نیشتمانیی »یەوە دامەزران. (بەمە کۆماری باسکی سەربەخۆ دروستبوو.) «27،7» بەڵام، دوای جەنگێکی سەختی خوێناویی، هێزەکانی « فرانکۆ »، بە یارمەتیی « ئیتالیا و ئەڵمانیا » توانیان، لە « 1937/04/26 »دا، شاری «گێرنیکا »ی خۆڕاکر و لە «06/19» ی هەمان ساڵیشدا، هەموو شارەکانی دیکە داگیرکەنەوە و کۆتایی بە تەمەنی کورتی کۆمارە ساواکەیان بێنن. جگە لەوانەی، لە بەرەکانی جەنگ و بە بۆمبای فڕۆکە جەنگییەکانی دوژمنان و داگیرکەران کوژران، کاتێ وڵاتەکەشیان بە تەواویی کۆنترۆڵکرد، (پەنجا هەزار باسکییان لە سێدارەدا و نزیکەی دووسەد هەزار کەس لە تاو گیانی خۆیان هەلاتنە دیوی ئەو دیوی « ئۆسکادیی ــ ئۆسکادیی سەروو بە زۆر بەسراو بە فەرەنساوە. »)«28،7».

ئەو کارەساتە نەتەوەییانەی، بە سەر گەلی « باسک »ی خواروو هات، ویژدانی نەتەوەیی زۆربەی « باسک »ەکانی سەرووی دروژان. لە ئەنجامدا، بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی گەرم سەریهەڵدا. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، ناکۆکیی لە نێوان ڕیزەکانی

« پارتی نەتەوایەتیی باسک »دا پەیدابـــوو. (لە سالّی « 1956 »دا، ڕێکخراوەی « ئیتا ـــ E.T.A. » لە « پارتی نەتەوەیی ئۆسکادیی » جیابۆوە و دوا جاریش خۆیان بوونە دوو باڵ « E.T.A.-V. » و « E.T.A.-VI » کە ئەوەی دواییـیان «مارکسیی ـ لینینیی »یە. ئەم ڕێکخراوە ڕێکخـراوێکی سـەربازییـەو ناوی «ئازادیی ئۆسکادیی »یە.) «46،7»

ڕێکخراوی « ئیتا »، بە هەمـوو درێژایی داگیرکردنی نیشتمانەکەیان و دەسەلاّتی «فرانکۆ »، لە خەباتکردندا بووە. بە سـەدان نەبەردیی و کاری سـەربازییان، دژی هێزە داگیرکەر و سەرکوتکەرەکانی دەوڵەتی « سپان » ئەنجامداوە. لە نێو گـەلی « باسک »ەکانی « فەرەنسـا »شدا، چەندین ڕێکخراوی « کەلتووریی، ڕامیاریی و کۆمـەلایەتیی » دروسـتبـووە، ڕۆڵێکی گـەلێ مـەزنیـان، لە بوژاندنەوەی هەسـتی نەتەوەیی و گیانی بەرەنگاریبوونەوەدا وازیکردووە.

ئەوە بوو، ژەنەڕاڵ « فـرانکۆ »، دوای نزیکەی سـیوهەشـت سـاڵ فـەرمـانڕەوایی و دیکتاتۆریی، خوێنڕشتن و مـاڵوێرانیی، لە « 1975 »دا مـرد. دوای ئەو مێژووەش، ڕەوشی « سپـان » بە گشتیی و « باسک » بە تایبـەتیی، کـەمێ گۆڕا. وردەوردە، بەرەو باشتر ڕۆیشت. تا لە سـالّی « 1982 »دا، پارتی « سۆسیـال دیمۆکرات »، دەسـەلاتیـان وەرگـرت. پـرۆژەیەکی « ئۆتۆنۆمـیی »یان پێشـنیـازکـرد. بەلاّم، ئەو پرۆژەیە نەیتوانی، کێشـەی ڕەوای « باسک »ەکان چارسـەرکـا. ئەو گرفتە، هەروا بێ چارسـەرکـردن مـایەوە. چونکە، ئەوان لە سـەر داوای سـەربەخۆیی خـۆیان سووربوون و ئێستەش، هەر خەبات بۆ سەربەخۆیی و ئازادیی دەکەن.

بە کورتیی، زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی نەتەوەی « باسک » و ڕێکخـراوە ڕامیاریی و سـەربازییـەکانی، تا ئەوڕۆش، پێیان لە سـەر « سـەربەخۆیی تەواو، یەککرتنەوەی هەر دوو بەشـەکەی نیشـتمـان و دامـەزراندنی دەوڵەتێکی سـەربەخۆ » داگرتووە و خەباتی بۆ دەکەن. ئەو « ئۆتۆنۆمیی »یە کارتۆنییەی هەشیانە، بە هەمـوو شێوەیە ڕەتیدەکەنەوە! جا، با « بەرزنجیی »، باش لە داسـتـانی خوێناویی و قارەمـانانەی نەتەوەی « باسک » تێبگا، بزانێ، چییان دەوێ، هەر تەنیا بە « عەریزەیەک » قایل نابن، « ئۆتۆنۆمیی »یەکی هیچ لەبارانەبوویان بدەنێ! گەر تا ئێستەش پێی وابێ، « باسک »ەکـان داوای « ئۆتۆنۆمـیی » دەکـەن، ئەوا زۆر « یاغنیـشـە »!. چونکە، دەنگوباسی « تەقاندنەوە، دەسوەشاندن، گیانبازیی، گرتن و ڕاونان »ی ڕۆڵەکانی « باسک »، لە ڕێی « ڕۆژنامە، گۆڤار، وێزگەی ڕادیۆ و کەناڵەکانی تێلیڤیزیۆن »ەوە، جگە لە گوێی « بەرزنجیی »، گوێی گەلانی جیهانی کەڕکردووە!

6/4. « یۆگۆسلافیا »:
کێشەی نەتەوەیی « بۆسنە و هەرسک » و « ئەلبانەکانی کۆسۆڤۆ »، گەلێ لە کێشەی « باسکەکانی « سپان » جیاوازترە. چونکە، لێرەدا جیاوازیی ئایینیی، ڕۆڵێکی سەرەکیی و کاریگەریی، لە قووڵبوونەوەی گرفتەکەدا بینیوە. جگە لەوەی، هەر دوو دەوڵەتی « سپان و یۆگۆسلافیا »، لە هەموو ڕوویەکەوە جیاوازییان هەیە. چونکە، یەکەم بە دوڵەتێکی دیمۆکراسیی دادەنرێ، مێژوویەکی دێرینی هەیە، دەوڵەتێکی ڕەسەنە و لە مێژوودا، ڕۆڵی داگیرکەرانە و ئیمپریالیزمانەی خۆی بینیوە. تەنانەت سەردەمێ « ئەمێریکا »، بەشێکی زۆری « ئەمێریکای لاتین » و وولاتانی جیهانیشیان داگیرکردووە. لە ڕووی جوگرافیاوە، لە « خۆرئاوای ئەورووپا »دا هەڵکەوتووە. ئابووری وولات، لە سەر سیستێمی سەرمایەداریی دامەزراوە. ئەندامێکی کارای بلۆکی « ناتۆ »یە.
بەلام، « یۆگۆسلافیا » دەوڵەتێکی ڕەسەن نییە، وەک « عێراق » دەوڵەتێکی هەڵتۆقیوە و دوای جەنگی دووەمی جیهان دامەزراوە. لە ڕووی دەسەلاتی رامیارییەوە، بە دەوڵەتێکی تۆتالیتێریی و دیکتاتۆریی دادەنرێ. جێگەی جوگرافیای لە « ڕۆژهەلاتی ئەورووپا »دایە. ئابووری دەوڵەت، لە سەر بنچینەی سیستێمی سۆسیالیزم دارێژراوە. ماوەیەک ئەندامی بلۆکی« وارشۆ » بوو، پاشان لەو بلۆکە دەرچوو، لەگەڵ « میسر و هیندستان »دا، کۆمەڵی « دەوڵەتە بێ لایەنەکانیان » دروسکرد.
پێش گۆڕانکارییەکانی جیهان، سەرانی « یۆگۆسلافیا »، کێشەی نەتەوەییان، لە بەر ڕۆشنایی فەلسەفەی « مارکسیزم ـ لێنینزم »دا چارەسەرکردبوو. ئەویش، لە مافی دیاریکردنی چارەنووسدا خۆی دەنوێنێ. لەبەرئەوە، هەموو ئەو گەل و نیشتمانە جیاوازانەی، لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتێکی فیدراڵییدا کۆکردبۆوە و « یۆگۆسلافیای فیدراڵیی »یان پێکهێنابوو. واتە: « بۆسنە و هەرسک »، یەکێ لەو هەرێمە فیدراڵییانە بوو. « پارتی کۆمۆنیستی یۆگۆسلافیا »، تاکە پارت و سەرکردەی هەموو گەلانی دەوڵەتە فیدراڵەکە بوو. تا ئەو کاتەی گۆڕانکارییە گەورە و گرنگەکانی سیستێمی جیهان ڕوویدا، بلۆکی « وارشۆ » هەڵوەشایەوە، دەوڵەتە سۆسیالیستەکان، یەک لە دوای یەک تێکچوون. ئیدی، پشکۆی بن کای کۆنی هەستی نەتەوەیی، گەلانی جیاوازی نێو ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانانە گەشایەوە، ناکۆکییەکان بە تەواویی تەقینەوە. فەرمانڕەوا جیاجیاکانی هەرێمە فیدراڵییەکان، لەگەڵ دەسەلاتی دیکتاتۆریی « بلگراد »دا

تێکچــوون. ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، ڕەوشــی « نەتەوەیی، ڕامــیــاریی، ئابووریی، کۆمەلایەتیی، کەلتووریی و ئایینیی » بەرەو خراپتر دەڕۆی، تا وای لێهات، وەک بەرمیلێ باروت وا بوو، تەنیا دەنکە شقارتەیەکی دەویست، بۆ ئەوەی گڕگرێ و بە تەواویی بتەقێتەوە.
بەڵێ، کێشەی گەلانی « یۆگۆسلافیا »، پێش هەموو شتێ، بە کێشەیەکی نەتەوەیی و ڕامـیـاریی دادەنرێ. کێشـەیەکە، هەر لە بنچـینەوە، بە شـێـوەیەکی نیـوەناچڵ چارەسەرکراوە. چونکە، وەک چەن جارێکی دیکەش نووسیوەمە: « ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی » ناتوانێ، چارەسەرێکی بنەبڕیی کێشەی نەتەوەیی گەلانی بندەس بکا. بەڵکوو، چارەسەری بنەبڕیی، تەنیا خۆی لە سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەییدا دەبینێ و بە تاکە ڕێگەش دادەنرێ. (تاقیکردنەوە مێژووییە سەرکەوتووەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی، لە دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانەکاندا، ئەوەمان بۆ ڕووندەکەنەوە، کە سەرانی ئەو دەوڵەتانەی کێشەی نەتەوایەتییان، لە بەر ڕووناکایی بیروباوەڕێکی ڕەگەزپەرستانە و ئایدۆلۆژیایەکی ناسیۆنالیزمانەی شۆڤێنیستانە و ڕەفتارفاشییانە و جیاوازیی ئایین و ئایینزادا چارەسەرکردووە، هەمیشە دووچاری کارەساتێکی نەتەوەیی گەورەی ماڵوێرانکەرانە و جەنگی نێوخۆ و کوشتن و بڕین بوون. لە پەشیمانیی و سەرکەردانییش زیاتر، هیچی دیکەیان بۆ نەماوەتەوە و دەس نەکەوتووە. وەک هەموو تاقیکردنەوە تفتوتاڵەکانی « ئەڵمانیای نازیی، ئیتالیای فاشیی، ئیمپریالیزمی یابانی، ئێرانی سەردەمی شا و مەلا فەناتیکەکانی ئەمڕۆ، عیراقی سەددام، تورکیای کەمالیی، یۆگۆسلافیای کۆمۆنیست و فیلیپین ... هتد »)«73،20».
چونکە، (تاقیکردنەوەکانی دەوڵەتی فیدراڵ لە جیهاندا، ئەوەمان بۆ ڕووندەکەنەوە، کە سیستێمی فیدراڵیزم، بە هەموو جۆرەکانییەوە، دۆست و دوژمنان جۆنی لێ تێدەگەن و جۆنی لێکدەدەنەوە، تەنیا بۆ ئەو دەوڵەتە گەورانە بەکەڵکدێ و سەرکەوتنی بەدەسهێناوە، بە ژمارەی دانیشتووان زۆرن و بە پانتایی خاک گەورەن، تا کارە بەڕێوەبەرێتییەکانی نێوخۆی ناوچە و هەرێمە جیاوازەکانی دەوڵەتەکە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و یەکسان، لە نێوان خۆیاندا دابەشکەن، کاریگەرانە و چالاکانە بەڕێوەبەرن، بە ئاسانترین شێوە بۆین، بیرۆکراتییەت کەمکەنەوە، ژیانی کۆمەلانی خەڵکی لە ڕووەکانی « ئابووریی، کۆمەلایەتیی و فەرهەنگیی »یەوە چاکترکەن. وەک تاقیکردنەوە سەرکەوتووەکانی « ئەمێریکا، ئەڵمانیا ... هتد » کە ئەو دەوڵەتانە، هەموویان لە یەک نەتەوە و لە یەک نیشتمان

پێکهاتوون، خاوەنی یەک دەوڵەتی یەکگرتووی ناسیۆنالی خۆشیانن. بەڵام، لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە، سیستێمی فیدراڵیی پێڕەودەکەن.
لە هەمان کاتیشدا، تاقیکردنەوەکانی یەکێتی فیدراسیۆن لە دەوڵەتە تێریتۆریاڵەکاندا، ئەوەمان نیشاندەدەن، تا ئێستە، لە هیچ یەکێ لەو دەوڵەتە تێریتۆریاڵانەی، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتیی گەلانی جیاوازی نێو چوارچێوەی دەوڵەتە فیدراڵەکە، سیستێمی فیدراڵیی تێدا پیادەکراوە، سەرکەوتنی بە دەس نەهێناوە، لە « گێرمەوکێشە، هەراوناژاوەی نێوخۆ، جەنگی نێوان گەلانی نێو دەوڵەتە فیدراڵەکە » زیاتر، هیچ جۆرە « خێروبێر، خۆشیی، ئازدیی و سەرفرازیی »ەکی بەو گەلانە نەبەخشیوە. گەر لە یەکێ لە وڵاتەکانی جیهانیشدا، سەرکەوتنێکی بەدەسهێنابێ، ئەوا وەک چارەسەرێکی نیوەوناچڵ، شتێکی ئەوتۆ نەبووە و نییە، تا باسکرێ. چونکە، تەنیا بۆ ماوەیەکی کاتیی بووە و تا سەر بڕێ نەکردووە و هەڵوەشاونەتەوە، ناو و نێوبانگیشیان، تەنیا وەک یادگارێ لە لاپەڕەکانی مێژوودا ماونەتەوە، چونکە، سیستێمی فیدراڵیزم، بۆ ئەو دەوڵەتانەی لە چەن نەتەوە و نیشتمانێکی جیاواز پێکدێن، وەک شرینقەیەکی بەنج وایە، هەر کە بەنجەکە خاو بۆوە و ماوەکەی تەواو بوو، هەموو گیروگرفتەکانی نێوان گەلە جیاوازەکانی دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانەکە، سەرلەنوێ هەڵدەدەنەوە. بۆیە، بیروباوەڕی فیدراڵیزم چارەسەرێکی تەواوی بنەبڕیی هەموو تەنگوچەڵەمەکانی نێوان گەلە جیاوازەکان ناکا، لە هەموو ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانانەی تێشیدا بەکارهێنراوە، تا ئێستە سەرکەوتوو نەبووە و هەرگیزا و هەرگیزیش سەرکەوتوو نابێ، وەک « تاقیکردنەوەکانی یەکێتی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە، چیکۆسلۆڤاکیای پێشوو، یۆگۆسلاڤیای کۆن، گیروگرفتی چیچێن لە ڕووسیای فیدراڵ، کێشەی کوبیک لە کەنەدا، ناکۆکی نێوان ڤالۆن و ڤلامۆنەکان لە بەلچیکا ».
جگە لەوەی، گەر یەکێتی فیدراسیۆن، لە چەن وڵاتێکی وەک « هیندستان و سویسرا »دا، تا ئێستە، جۆرە سەرکەوتنێکیشی بەدیهێنابێ، ئەوا تا سەر هیچ جۆرە گەرەنتییەک، بۆ مانەوە و بەردەوامبوون و گەشەکردنی نییە. بۆ نموونە :
«سویسرا »کە بە سەرچاوەی ئازادیی و دیموکراسییەکی ڕاستەقینە دادەنرێ، کێشەی نەتەوایەتیی تێدا بە شێوەیەکی دیموکراسییانە و شارستانییانە چارەسەرکراوە، لە سالی « 1798 »ەوە دەوڵەتی کۆنفیدراڵیی و لە « 1848 »ەوە دەوڵەتی فیدراسیۆنی تێدا دامەزراوە. دوای ئەو هەموو تێکۆشان و پێکەوە ژیانی

هاوبەشـەش، تازە خـەریکە چەن بزووتنەوەیەکی نەتـەوایەتی، لێـرە و لەوێ دروس دەبێ، تازە خەریکە ناوچەی « بزراکە » داوای جیابوونەوە لە « سویسرا » دەکەن، تازە خەریکە بزووتنەوەی « ژنێڤی ئازاد »، لە لایەن کۆمەڵێ « خەڵک، نووسەر و ڕۆشنبیر »ەوە، لە « ژنێڤ »ی پایتەختی « سویسرا »ی بەهەشتی دیموکراسیی و ئازادییدا سەر هەڵدەدا و داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە « ژنێڤ »دا دەکـەن. تازە خـەریکە دوای یەک سـەدە خـەباتی هـاوبەش، سـەربەسـتیی و سەربەخۆیی، ناوچەی « کۆبیک » ریفراندۆم لە «کەنەدا » دەکەن، داوای « ئازادیی، سـەربەخـۆیی تەواو و دامـەزراندنی دەوڵەتی ناسیـۆنال » دەکـەن. تازە خـەریکە، دوای پتـر لە یەک سـەدە پێکەوە ژیانی هـاوبەش، لە چوارچێـوەی یەک دەوڵەتی فیدراڵدا، گیروگرفتە داپۆشراوەکەی نێوان هــەر دوو گەلی « فالۆن و فلامۆن » لە « بەلجیکا »، سـەرهەڵدەداتەوە و داوای « یەکسـانیی، دابەروەریی و ئازادیی » تەواو دەکەن.)«20،75-76»

هەروەها، کێشـەی نەتەوەیی گەلی عەرەبی « فەلەستین » و چیرۆکی « ئۆتۆنۆمیی »، لە چوارچێـوەی دەوڵەتی داگیـرکـەری « ئیسـرائیل »دا، نموونـەیەکی زیندوو و مۆدێرنی دیکەی، لاوازیی و بێ کـەڵکی سیستێمی « ئۆتۆنۆمیی » پیشاندەدا. ماوەی حەوت ساڵێ پتردەبێ، گەلی « فەلەستین » دەسـەڵاتێکی « ئۆتۆنۆمیی » فراوانیان لە نێو سنووری دەوڵەتی « ئیسرائیل »دا هەیە، کەچیی، ڕۆژ نییە، چەن کـەسێ لە هەر دوو گـەل نەکـوژرێ! وا تازەش خــەریکە، ڕاپەڕینێکی نوێی جەماوەریی بەرپادەبێ و شەڕەبەرد دەسپێدەکاتەوە!

بەڵام، لەگەڵ هـەموو ئەوانەشدا، کێشـەی ئەو گەلانە، هەر تەنیا کێشـەیەکی ڕووتی نەتەوەیی و ڕامیاریی نەبووە و نییە. بەڵکوو، کێشـەی « ئایین »یشی تێکەڵبووە. چونکە، ئەو ناکۆکییانە، مێژوویەکی گەلێ کۆنی هەیە.

کاتێ، ئیمپراتۆریای « عوسمانیی »، بە ناوی ئیسـلامەوە، بەشێکی زۆری وڵاتانی « ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا »یان داگیرکرد، ئایینی ئیسلامیان، بەزۆر و بە زەبری ئاگر و ئاسن، بە سەر ئەو گەلانەدا سەپان. دوای ئەوەی، ماوەیەکی مێژوویی زۆر، بە سەر ئەو داگیرکردنەشدا تێپەڕبوو، زۆربەی زۆریان ئایینی ئیسلامیان وەرگرت، ئیدی وەک دیاردەیەکی سروشتیی لێهات. ئێستە، ئەو گەلانە خۆیان بە موسوڵمان دەزانن و شانازییشی پێوە دەکەن.

ئەوەی مـێژوو بۆمـان دەگێـڕێتـەوە، ئەوەیە، سـوڵتـان « مـوراد »ی عـوسـمـانیی، لەشکرێکی زۆری کۆکردۆتەوە و پەلاماری « یۆگۆسلاڤیا »ی داوە. جەنگێکی

سەختی خوێناویی، لە « 1389/06/28-15 »دا، لە نێوان هێزەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانیی و سوپای فەلەکانی ئەو ناوچەیەدا روویداوە. گۆرەپانی جەنگەکەش، « کۆسۆسڤۆ »ی ئێستە بووە. لە ئەنجامدا، هەر دوو سوڵتانی عوسمانیی « موراد » و میری سرب « لازار » کوژران. بەڵام، عوسمانییەکان سەرکەوتن و ناوچەکەیان داگیرکردووە. ماوەی پێنج سەدە، فەرمانرەوایی ئەو ناوچەیەیان کردووە.
دواتر، جەنگێکی سەختتر، لە نێوان عوسمانییەکان و « فەرەنسا » و گەلە فەلەکانی ناوچەکەدا هەڵگیرساوە. لە ئەنجامدا، عوسمانییەکان شکاون و جەنگەکەیان دۆڕاندووە. لە پاداشتیی ئەو هاوکارییەی گەلی « سرب »دا، ناوچەی « کۆسۆڤۆ »یان بە دیاریی پێشکەشکردوون. ئیدی، لەو رۆژەوە، هەموو ئەو ناوچە و گەلانە، لە بندەستی « سرب »ەکاندا ژیاون. گەلێ ئازار و دەردی نەتەوەیی و ئایینییان، بە دەستەوە چێشتوون. بۆیە، هەر تروسکاییەکیان دیبێ، لێیان یاخیبوون و راپەریوون. بەڵام، هەموو ئەو جۆرە یاخیبوون و راپەرینانە، هیچیان لێ شین نەبووە و هەر زوو دامرکێنراونەتەوە. تا، جەنگی دووەمی جیهان، بە سەرکەوتنی بەرەی دیمۆکراسیی تەواببوو. « یۆگۆسلاڤیا »ی کۆمۆنیست، بە سەرکردایەتی « تیتۆ » دامەزرا. کەمێ باری نەتەوەیی و رەوشی رامیاریی ئەو گەلانە چاکتربوو.
لە بەر رۆشنایی، ئەم پێشەکییە کورتە مێژووییەدا دەتوانین، پتر باری نەتەوەیی و رەوشی رامیاریی، هەموو گەلانی « بۆسنە و هەرسک » و « کۆسۆڤۆ » روونکەینەوە و تێبیگەین.
ئاشکرایە، پتر لە یەک ملیار موسوڵمان لە جیهاندا هەیە. ئەورۆش، بە تایبەتیی دوای ئەوەی « یەکێتیی سۆڤێت » و زۆربەی دەوڵەتە سۆسیالیستییەکانی دیکەش تێکچوون، دوای ئەوەی، شۆرشی گەلانی « ئێران » سەرکەوت و پارتە ئیسلامییەکان، دەستیان بە سەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا گرت. دوای ئەوەی، چەندین رێکخراوی ئیسلامیی ئاشکراو و نهێنیی، رامیاریی و چەکدار، لە هێندێ وڵاتانی جیهاندا دامەزرا، ئایینیی ئیسلام، بە باشترین چەکی باوەر و ئایدۆلۆژیا دادەنرێ، کە گەلە موسوڵمانە پچووکەکان، دژی گەلە سەردەستە ناموسوڵمانەکان بەکاریبێنن. جگە لەوەی، شەپۆلی بوژاندنەوەی ئیسلام و پەرەسەندنێکی لەبەرچاو هەستپێدەکرێ. رۆژبەرۆژ تا دێ، باوەری ئیسلام لە جیهاندا پتر بڵاودەبێتەوە. رێکخراوە رامیارییە ئیسلامییەکان دەیانەوێ، دەسەڵات وەرگرن. لەبەرئەوەی،

ئارەزوویەكی فراوانخوازییش، لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئیسلام و دەوڵەتە ئیسلامییەكانەوە هەیە. چونكە، ئیسلام خۆی لە سەر بنچینەی هێز و دەسەڵات دامەزراوە، بەهێزیش نەبووایە، هەرگیز بەو شێوەیە لە جیهاندا بڵاو نەدەبۆوە. هەروەها، عەرەبەكانیش گەلێكی زۆریان، لە بنچینەكانی ئایینی ئیسلام وەرگرتووە. چونكە، بە هۆی ئایینی ئیسلامەوە نەبووایە، هەرگیز نەیاندەتوانی، لە نێو ئەو چوارچێوە تەسكەی سنووری نیوەدوورگەی عەرەبدا دەرچن و بڵاوبنەوە.. بۆیە،پەلاماری هەر وڵاتێكیان دابێ، داگیریانكردووە. تەنیا هەر لە ژێر پەردەی ئایینیشدا توانیویانە، پاساوی ئەو داگیركردنە بدەن و سەركەون!

ئیسلام، خۆی لە خۆیدا باوەڕێكی ئاسمانیی و گیانیی بەرزە. موسوڵمانەكان، باوەڕیان بە كاری ڕامیاریی هەیە. ئامانجیان، ڕوون و ئاشكرایە. سەرەتا دەیانەوێ، لە هەر وڵاتێكی ئیسلامییدا، دەوڵەتێكی ئیسلامیی دامەزرێنن، پاشان، هەموو دەوڵەتە ئیسلامییەكان یەكگرن، ئیمپراتۆریایەكی پانوپۆڕی ئیسلامیی، لە جیهاندا دروسكەن. لە ڕووی دەسەڵاتی ڕامیاریی و فەرمانڕەواییەوە، باوەڕیان بە سیستێمی « خەلافەت » هەیە. لە ڕووی سیستێمی ئابوورییەوە، پێڕەوی سیستێمی ئابووریی ئیسلامیی دەكەن. لە ڕووی یاسای كۆمەڵایەتییەوە، دەقەكانی قورئان و گوتەكانی پەیامبەر دەچەسپێنن.

لەبەرئەوە، گرفتی نەتەوەیی گەلە موسوڵمانەكان، « جگە لە كورد! » لە هەر جێیەكی ئەم جیهانەدا بروسكەبدا، ئەوان پتر پەرەیپێدەدەن. تا بە تەواویی گڕگرێ، تانوپۆی ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانە ناموسوڵمانانە بگرێتەوە و ژیانیان لێ تاڵكا. چونكە، ئەوان باوەڕیان، بە پێكەوە ژیان لەگەڵ گەلانی ناموسوڵمادا نییە، ئەو گەلە ناموسوڵمانانە نابێ، فەرمانڕەوایی گەلە موسوڵمانەكان بكەن. جگە لەوەی، لە وڵاتی ئیسلامیشدا، باوەڕیان بە نیشتمانی تایبەتیی، گەل و نەتەوەی جیاواز نییە، بەڵكوو، هەموو خاكێ بە خاكی خوا، هەموو نیشتمانێ بە نیشتمانی ئیسلام، هەموو گەلە جیاوازەكانیش، بە یەك نەتەوە دەژمێرن. جا، هەر لەو ڕوانگەیەشەوە، گەلی موسوڵمانی وڵاتی « بۆسنە و هەرسك » و « ئەلبانەكانی كۆسۆڤۆ »ش، هەر بە بەشێ لە نەتەوەی ئیسلام دادەنێن. بۆیە، بە هەموو توانا و بە هەموو شێوەیە، بەپێی بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەیی خۆیان، یارمەتیی ئەو گەلە موسوڵمانانە دەدەن. كێشە نەتەوەیی و ئایینییەكە تێكەڵدەكەن و پێكەوەی گرێدەدەن، تا سەرنجی گەلانی جیهان، بە لای كێشەكەیاندا ڕاكێشن، هەست و سۆزی خەڵك بوروژێنن، یارمەتیی و كۆمەكی

نێودەوڵەتیی بۆ دابینکەن. گەلە بچووکە موسوڵمانەکانیش، هێندە زیرەکانە، بۆ چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەییەکانی خۆیان دەچن، هەموو دروشم و ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیان، لە ژێر پەردەی ئایینی ئیسلامدا دەشارنەوە. پتر باسی جیاوازیی ئایینیی و کاری خراپەی دەوڵەتە فەلە داگیرکەرەکان دەکەن، یا لە قاڵبێکی ئایدۆلۆژیای دژ بە ئیسلامدا، کێشەکەیان چڕدەکەنەوە. وەک جەنگێکی ئایینیی نێوان موسوڵمان و دەوڵەتێکی کۆمۆنیستیی گاوری دژ بە ئیسلامی لێ دەکەن. بۆیە، بە هەموو توانایانەوە هەوڵدەدەن، شۆڕشێ لە سەر ڕێباز و شێوازی ئیسلام بەرپاکەن، تا کەڵک لە توانای دەوڵەتە ئیسلامییەکان وەرگرن و بە هەر شێوەیە بێ، ئەوانیش تێوە گلێنن و بە دەنگیانەوە بچن. ئەگینا، هیچ یەکێ لەو گەلە بچووکە موسوڵمانانە، بەرگەی ڕقوکینەی ئەستووری سەربازی دەوڵەتە داگیرکەرەکانیان ناگرن. توانای بەرگریی « تانک، تۆپ، ڕاکێت و فڕۆکە » جەنگییەکانی دەوڵەتی « یۆگۆسلافیا »یان نییە. چونکە، بە شێوەیە مێشکی سەربازەکانیان شتۆتەوە، بە جۆرێ دژی ئەو گەلانە پەروەردەیان کردوون، سەر و ماڵی موسوڵمانەکان « ئەنفال ! » کەن. بۆیە، بە هەزاران هاوڵاتیی ئەو گەلانەیان زیندەبەچاڵکردووە، بە سەدان گوندیان ڕووخاندووە، بە هەزارانیان ڕوویان لە وڵاتەکانی « خۆراوای ئەورووپا » کردووە.

ئەمە کرۆکی کێشە و گرفتە سەرەکییەکەی « بۆسنە و هەرسک » و دەسەڵاتی ناوەندی « یۆگۆسلافیا »یە. جا، ئێستە ئەو ماوە، بڵێین: ئایا، « بەرزنجیی » چۆن لەم باسە گەیشتووە؟ ئێستەش وڕێنەدەکا و بە بێ ئاگامان دادەنێ! بە لای منەوە، بێ ئاگایی ئەوەیە، مرۆڤ نەزانێ، ئەو گرفت و کێشانە، چۆن سەریانهەڵداوە؟ کەی پەیدابوون؟ داوای چی دەکەن؟ کێ لە پشتەوە هانیاندەدا؟

سەیر ئەوەیە، گەلی « بۆسنە و هەرسک »، هەر لە کۆنەوە، لە « ئۆتۆنۆمیی » پتریان هەبووە، بەڵام، داوای جیابوونەوە و دەوڵەتی سەربەخۆیان کردووە، بۆیە، باجەکەیان بەو شێوەیە داوە و سەرکەوتووشبوون. چونکە، پشتیان بە خۆیان بەستووە، دەوڵەتە ئیسلامییەکان یارمەتییان داون، گەلانی ئازادیخوازی جیهان و دەوڵەتە دیمۆکراسیی و ئازادەکان پشگیرییانکردوون. بۆیە سەربەخۆییان بەدەستهێناوە.

بەڵام، کێشەی « کۆسۆڤۆ »، هەر لە بنچینەدا، لەگەڵ کێشەی « بۆسنە » کەمێ جیاوازییان هەیە. وەک پێشتر باسمانکرد، هەموو جەنگ و پێکدادانەکان، هەر لە ناوچەی « کۆسۆڤۆ » ڕوویانداوە. هێندێ لەو ئەلبانانەش، لە سەردەمی

عوسمانییەکانەوە هاتوون و لەوێ نیشتەجێبوون. دوای ئەوەش، لە ئەنجامی چەوساندنەوە و ململانێی نێوان هێزەکانی ناوچەکە، کۆچوڕەوی ئەلبانەکان هەر بەردەوامبووە. بە تایبەتیی، ئەو ناکۆکیی و ململانێیەی لە نێوان هەر دوو سەرکردەی کۆمۆنیست، « تیتۆ » و « ئەنوەر خواجە »دا هەبووە، ڕۆژبەڕۆژ تا هاتووە، ژمارەی ئەلبانەکان لە « کۆسۆسڤۆ » پتربووە. ئەو بارە بەو شێوەیە ڕۆیشتووە، تا ساڵی « 1963 »ش، ئەو ناوچەیە، هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەییان نەبووە. بەڵام، دوای ئەو مێژووە، سەرۆک « تیتۆ » دانی بە « ئۆتۆنۆمیی » هەرێمی « کۆسۆسڤۆ »دا ناوە. ئیدی، لەو کاتەوە، گەلی ئەو هەرێمە، « ئۆتۆنۆمیی »یەکی تایبەتییان هەبووە. وەک ناوچەیەکی « ئۆتۆنۆمیی »ش، چەن گرووپێکی ئیتنیی، بە هێمنیی تێدا ژیاوە.

بەڵام، ساڵی « 1989 »، « میلۆشۆڤیچ »، بە بۆنەی شەش سەدە تێپەڕبوون بە سەر جەنگی « عوسمانیی و سرب »ەکاندا، لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی فراواندا، لە پڕ بە گوتارێ، ئەو مافەی ڕەتکردووە و لێی سەندنەوە. ئیدی، لەو ڕۆژەوە، دەسەڵاتدارە شۆڤێنییەکانی « بلگراد »، بە هەموو شێوەیە هەوڵیانداوە، جگە لە کەمینەی « سرب »ەکانی « کۆسۆڤۆ »، هەموو کۆمەڵە ئیتنییەکانی دیکە قڕکەن. هەرێمەکەشیان دوولەتکردووە. واتە: پێش ئەوەی بقەومێ، موسوڵمانە ئەلبانی نەژادەکان، تا ئەندازەیەک، جۆرە مافێکی کەلتووریی و نەتەوەییان هەبووە.

موسوڵمانەکانی « کۆسۆڤۆ »، چیدیکە نەیانتوانی، بەرگەی ئەو هەموو چەوساندنەوە نەتەوەیی و ئایینییەی « سرب »ەکان بگرن. لەبەرئەوە، هەر لە سەرەتای ساڵەکانی نەوەدەوە،چەن بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی و ڕامیاریی سەریهەڵداوە. هێندێکیان باوەڕیان بە « بەرگرییکردنی ئاشتییانە » و هێندێکی دیکەشیان، باوەڕیان بە « خەباتی چەکداریی » هەبووە. تا «1992/05/24»، ڕیفراندۆمێکی ئازادیان سازکرد. زۆربەی ڕۆڵەکانی گەل، دەنگیان بۆ سەربەخۆیی دا . ئەوە بوو، کۆمارێکی سەربەخۆ دامەزرا . « برایم ڕۆگۆڤا » بە سەرۆک دانرا . بەڵام، « سرب »ەکان دژبوون و دانیان پێدا نەنا .

پاشان، هێندێ لە لاوە ئەلبانەکان، بە دەسپێشکەریی « هاشم تاتشیی »، چەن شانەیەکی چەکدارییان دروسکرد. دواتریش، « سوپای ڕزگاریخوازی کۆسۆڤۆ ــ س. ڕ. ک. »ی لێکەوتەوە. ئەم کۆمەڵە، باوەڕیان بە خەباتی چەکداریی هەبووە و بە « مارکسیی » ناویان ڕۆشتووە.

له راستییدا، موسوڵمانە ئەلبانەکان، لە سەرەتادا، داوای « ئۆتۆنۆمیی »ەکی بەرفراوانتریان دەکرد. بەڵام، دوای ئەوەی ئەو کوشتار و جینۆسایدە ڕوویدا، دروشم و ئامانجەکانیان گۆڕی. لەبەرئەوە، جەنگێکی نابەرابەر و سەخت، بۆ سەرویەری خوێناویی، لە نێوان هێزەکانی دەوڵەتی « سرب » و « س. ڕ. ک. »دا هەڵگیرسا. موسوڵمانەکان جەنگی مردن و ژیانیان لەگەڵ دوژمنە داگیرکەرەکەدا دەسپێکرد. بە شێوەیە، بە تەواویی شپرزە و ماندووبوون. گەر هێزەکانی « ناتۆ » نەبووایە، دەستیان لە کارەکە وەر نەدایە و پشگیرییان نەکردنایە، بە تایبەتیی، لە مانگی « مارسی/1999 »دا، بە فڕۆکە جەنگییەکانیان، پەلاماری « بلگراد »یان نەدایە، دوور نەبوو، بە تەواویی لەنێویانبەرن و لە خاکی خۆیان بەدەریاننێن.

بۆیە، ئێستە ناتوانن، پێکەوە بژین. کێشەکەشیان هەر وا، لە ژێر چاودێریی هێزی نێو دەوڵەتییدا ماوەتەوە. تا ئێستە لە دەس سوپای دوژمن ڕزگاریانبووە. ئەلبانەکانیش چەکیان دانا و « س. ڕ. ک. »شیان بە « پارتی پێشکەوتوخوازی دیمۆکراسیی » گۆڕی. بەڕێوەبەرێتییەکی سیڤیلیان دروسکردووە، ئاڵای نەتەوەیی ئەلبانەکان، لە هەموو « کۆسۆڤۆ »دا هەڵکراوە. « هاشم تاتشیی » سەرۆکی شالیارانی هەرێمەکەیە. بە زمانی خۆیان، دەیەیڤن و دەخوێنن.

بە کورتییەکەی، پاشەڕۆژیان بە بەرژەوەندییەکانی بەرەی خۆراوا بەگشتیی و ئەمێریکا « بە تایبەتیی بەسراوەتەوە. هەر چەندە، تا ئەندازەیەکی زۆر، دەنگی جەنگەکە لەم بەشەی « کۆسۆڤۆ »دا کپبووە، بەڵام، ماڵە ئەلبانیی نییە، چەکی تایبەتیی خۆی نەبێ. چونکە، لە ڕۆژێکی ڕەشتر دەترسن، نەبا جارێکی دیکەش، پەلاماریانبدەنەوە، تا داکۆکیی لە خۆیان بکەن!

لەم ڕۆژانەشدا، کێشەی ئەلبانەکانی « ڕۆژهەڵاتی کۆسۆڤۆ » تەقیەوە. جەنگ و پێکدادان، لە نێوان هێزەکانی « یۆگۆسلاڤیا » و « س. ڕ. ک. »ی ڕۆژهەڵاتدا دەسپێکردووە. خەڵکێکی زۆر پەرەوازەبوون و بۆ « مەکەدۆنیا » هەڵاتن.

موسوڵمانەکانی جیهانیش، تەنیا بە دەم نەبێ، بە هیچ شێوەیە، پشگیرییان نەکردوون. ئەمان خۆشیان، تێدا ماون. چونکە، هەر چەندە، بەرەی « ناتۆ » دەیانپارێزێ، بەڵام، کێشەکەیان لە نێوان ئەوان و ئەو دەوڵەتانەی دژی هێرشەکانی « ناتۆ » بۆ سەر « یۆگۆسلاڤیا » هەڵیانداوە، وەک « ڕووسیا و چین »، لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، جیا نەبنەوە. جگە لەوەی، هێزەکانی « ناتۆ » بە تایبەتیی و هەموو بەرەی خۆراواش، لە سەر ئەو ڕێکن، بە هیچ جۆرێ نابێ، دەوڵەتێکی ئیسلامیی لە هیچ جێگەیەکی « ئەورووپا »دا دامەزرێ!

راستە، رژێمە ڕەگەزپەرستەکەی « بلگراد » دەیویست، یەک ئەلبانیی نەژاد لە خاکی « کۆسۆڤۆ »دا نەهێلێ، بەڵام، لێرەدا کێشەکە ئـــــــەوە نییە، ئایا مافی « ئۆتۆنۆمیی» یان دەوێ، یا دروشمێکی دیکەیان بەرزکردۆتەوە؟ بەڵکوو، تەنانەت داوای هیچیشیان نەکردایە، « میلۆشۆڤیچ » هەر هەمان دەردی دەدانێ. چونکە، بەو پلانە شۆڤێنیست و ڕەگەزپەرستانەیە دەیەوێ، لەنێویانبەرێ. وەک چۆن، گەر گەلی کـورد « ئۆتۆنۆمیی »یە گاڵتەجارییە ساختەکەی « سەددام »یشی پەسەند کـردایە، « بەعس » هەر لە سـەر کـاری « دەربەدەرکـردن، بەعـەرەبکردن، بە بەعسییکردن، گرتن و تیرۆرکردن » بەردەوامدەبوو!
لەبەرئەوە، ئەو جۆرە گرفتە نەتەوەییـیانە، لە خـانەی جەنگی مـان و نەمـاندا، جـێگەیان دەبێـتـەوە. گـەر هێـزی نێـودەوڵەتیی و « ناتۆ »ش نەبووایە، کـورد و ئەلبانەکانی « کۆسۆڤۆ »، یەک چارەنووسیاندەبوو، یاخراپتری بەسـەر دەهات. جا پێویستە، « بەرزنجیی » لەو جۆرە جەنگ و ڕژێمانە بگا، وەک « نەعامە » سەری لە نێو خۆڵدا نەشارێتەوە و پاشووشی لە تیشکی خۆر کا!

## 7/4. یەکێتی سۆڤیێت :

پاشـان نووسیـویەتی: (قسـەکەی ئەم تەواوی قسـەی یەکێکە لەدکتۆرەکانمان کە لەکۆتایی شـەستەکاندا وتبووی: « ئەم حوکمی زاتیەی کورد ئاوا قوربانی بۆ دەدا لەیەکێتی سۆڤـیـەت بەعـەریزەیە دەدرێ! » ئەویش خوا هەڵنگارێ ڕاستی کرد، حوکمە زاتیەکانی ئەوێشمان بینی، کت و مت لە « منطقه الحکم الذاتی » لەمەڕ خـۆمـان دەچوون. خـۆ لە دواییشـدا بۆ دنیـا ڕونبـۆوە چیـچانیـەکـان وەرامی عەریزەکەیان لەمۆسکۆی پەڵسنەوە چۆن درایەوە؛ ئاگر، ئاسن،، ڕۆکێتی گرادو چاودێری ئەلکترۆنی.)«60،3»
گەر « بەرزنجیی » ترسنۆک نەبووایە، هەڵبـەتە، دوای پتر لە سی سـاڵ، ناوی ئـەو دوکتۆرەی دەبرد! یا، بە ناوێکی نادیارەوە، هەر لە خۆیەوە قسەیداتاشیوە، بۆیە، ناوی ناهێنێ! ئایا، ئەو دوکـتـــۆرە، بە دەمـــیی بە خـــۆی گـــوتووە؟ یا لـە چ سەرچاوەیەکەوە وەریگرتووە؟ چونکە، لە « یەکێتی سۆڤێت » هیچ جۆرە خەباتێکی چەکداریی خوێناویی، لە پێناوی مافـەکانی « ئۆتۆنۆمـیی ـ فیدراڵیی »دا ڕووی نەداوە! بەڵکوو، کاتێ مافی چارەنووسی نەتەوەکان، لە نێو سنووری « سۆڤێت »دا دیاریکرا، هەموو کۆمەڵە ئیتنییەکان بە کوردیشـەوە، « ئەو کاتە کوردستـانی سـوور هەبوو » مافی « ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی » خۆیان وەرگرت. ئیدی، نەک هەر پێویستی بە خوێنڕشتن نەکرد، بەڵکوو، پێویستی بە « عەریزە »ش نەبوو!

« بەرزنجیی »ەک، بەو هەموو « زانایی، دانایی، بە ئاگایی، ڕووناکبیریی، بیر و بۆچوونە فەلسەفیی »یانەوە، تا دوێنێ بوو، بە هەموو ئەندامەکانی جەستەی، پروپاگەندەی بۆ « سۆڤیێت » دەکرد و چەپڵەی بۆ دەتەقان. کەچیی، ئەمڕۆ گاڵتە بە سیستێمەکەی دەکا! دیارە، ئەمەش ئێستە باوێتی، چونکە، وەک دڵێن: یاخوا کەس گلۆڵەی نەکەوێتە لێژیی! ئەگینا وەنەبێ، ئەوانەی ئەمڕۆ دژایەتیی ئەو باوەڕ و سیستێمە دەکەن، هەر لە کۆنەوە ئەو بۆچوونانەیان هەبووبێ!
منیش، تا بە چاوی خۆم « یەکێتی سۆڤیێت »م نەدی، ساڵانێ بوو، لە ژێر کارتێکردنی پروپاگەندەی پارتەکانی کوردستان و ناسیۆنالیستەکانی کورددا، گەلێ دژایەتی ئەو باوەڕ و دەوڵەتەم دەکرد. بەڵام، دوای ئەوەی، ماوەی دە ساڵێ لەوێ ژیام، هەموو شتێکم هەڵسەنگاند و تێیگەیشتم، بۆم دەرکەوت، زۆربەی ئەو شتانەی لە کوردستان باسدەکران، درۆبوون! هەر چەندە وەنەبێ، ئێستە باوەڕم بە فەلسەفە و ئایدۆلۆژیا کۆمۆنیزم هەبێ، بەڵام، دژایەتی ناکەم، بە بیر و هۆش و زانست بەرەنگاریدەبمەوە. هەر لە خۆشمەوە کوێرانە وەک « بەرزنجیی »، قسە دەر نافڕێنم، بێ ئەوەی زانیارییەکی تەواوم هەبێت. چونکە، پێم وایە، لەو فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەدا، تا ئەمڕۆش، گەلێ شتی باشی تێدایە، مرۆ دەتوانێ، لە هەموو سەردەمێکدا، کەلکی لێ وەرگرێ!
ئێمەی خوێندکارانی کورد، لەوێ ژیاوین، بە چاوی خۆمان، هەموو خراپە و چاکەیەکی ئەو سیستێمەمان دیوە، نەک لە دوورەوە بیستبێتمان. بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: سیستێمی « ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی »، لە دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانەکانی بەرەی کۆمۆنیستی پێشووی وەک: « یەکێتی سۆڤیێت، یۆگۆسلاڤیا، چیکۆسلۆڤاکیا »، لە سەردەمی خۆیدا، باشترین چارەسەری گرفتی نەتەوەیی ئەو کەمینە و گەل و نەتەوانە بوو. چونکە، ئەو سیستێمە، لە سەر بنچینەی مافی چارەنووس داڕێژرابوو، ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانەش، لە بەر ڕۆشنایی بیری پێکەوە ژیانی هاوبەش و بە ئارەزووی نەتەوەکان خۆیان دامەزرابوو.
دەوڵەتێکی وەک « سۆڤیێت »، پتر لە سەد کەمینە و گەل و نەتەوەی تێدا دەژیا. ئەوە لە کاتێکدا، ئەو کۆمەڵە ئێتنییانە، بە مافە ڕەواکانی خۆیان گەیشتبوون، هەر کۆمارێ، « ئاڵای تایبەتیی، سنووری دیاریکراو، پارتی کۆمۆنیستی سەربەخۆ، میریی فیدراڵیی » خۆی هەبوو. بە زمانی نەتەوەیی خۆیان دەیانخوێن. بڕیاردانی جەنگ، پێوەندییەکانی دەرەوە و دیپلۆماسیی نەبێ، هەموو دەسەڵاتێکیشیان هەبوو. تەنانەت، هێندێ لەو کۆمارانە، بەپێی هەڵکەوتی جوگرافیای وڵاتەکانیان،

هێندێ دەسەڵاتی تایبەتیشیان هەبوو، تا پێوەندیی دیپلۆماسیی، لەگەڵ دەوڵەتەکانی دراوسێکانیاندا بکەن. تا ئەو ڕۆژەی، دەوڵەتە یەککگرتووەکەش هەڵوەشایەوە، ئەمانەیان هەموو هەبوو، بێ ئەوەی قوربانییان بۆ دابێ. کاتێ هەڵیشوەشایەوە، بەپێی دەستووری گشتیی « سۆڤیت »، هەر کۆمارێ مافی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی پێ ڕەوابینرا و جیابۆوە، لە جێی « یەکێتی سۆڤیت »ی یەککگرتوو، پازدە دەوڵەتی سەربەخۆی ناسیۆنال لەدایکبوو.

جا، بۆ یەکێکی نەزانی وەک « بەرزنجیی » نییە، بە هیچ جۆرێ، گاڵتە بە مافی ڕەوای گەلانی « سۆڤیت »ی پێشوو بکا. چونکە، گەر ئاگای لە شێوەی سەربەخۆیی و مافەکانیان بووایە، هەڵبەتە، ئەو قسە پووچانەی نەدەکرد و ئەو چەن دێرە خوارووخێچەی نەدەنووسی! گەر یەک تۆز ویژدان و تێگەیشتنی ببووایە، هەڵبەتە، ئەو هەڵە گەورەیەی نەدەکرد. چونکە، لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەو دوو دەوڵەتە « سۆڤیت و عێراق »، هەموو کاتێ جیاوازییان هەبووە و هەیە:

1. یەکێتی « سۆڤیت »، هەرگیز دەوڵەتێکی فاشیی نەبووە. بەلام، « عێراق » دوڵەتێکی داگیرکەری فاشیی کوردستانە.

2. « پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیت »، پارتێکی ئینتەرناسیۆنالی پێشکەوتوخواز بوو. بەلام، « پارتی بەعسی سۆسیالیستی عەرەب »، پارتێکی « ناسیۆنالی ڕەگەزپەرستی فاشیی »یە، هەرگیز ئەو دووانە پێکەوە بەراوردناکرێن.

3. ئەوەی گەلانی جیاجیا لە « سۆڤیت » بەدەسیانهێنا، یەک دڵۆپ خوێنیان بۆ نەڕشت. کەچیی، کورد ئەوا پتر لە هەشتا ساڵە، لە باشووری کوردستاندا خوێندەڕێژێ، تا ئێستەش چارەنووسی دیار نییە.

4. « یەکێتی سۆڤیت »، تەنیا لە چەن ناوچەیەکی « ئۆتۆنۆمیی » پێک نەهاتبوو. بەلکوو، (لە پازدە کۆماری فیدراڵیی، بیست کۆماری ئۆتۆنۆمیی و هەشت ناوچەی ئۆتۆنۆمیی پێکهاتبوو)«97،56». بەلام، « عێراق » نەوەتەی دامەزراوە، لە دوو گەلی سەرەکیی و چەن کەمینەیەکی نەتەوەیی پێکهاتووە، جگە لە عەرەبە سوننییەکان، هیچ گرووپێکی دیکەی ئێتنیی، مافی نەتەوەیی نییە!

5. کاتێکیش « سۆڤیت » هەڵوەشایەوە، نەتەوە سەرەکییەکان مافی سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت، هەر پازدە کۆمارە فیدراڵییەکە جیابوونەوە و دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان دامەزران. بەلام، کۆمارە ئۆتۆنۆمیی و ناوچە ئۆتۆنۆمییەکان، لە سنووری ئەو پازدە دەوڵەتە نوێیەدا مانەوە و پارێزگاریی مافی ئۆتۆنۆمیی خۆیان کرد.

## 8/4. چیچێنستان :

جا، ئێستە کێشەی « چیچێن » ماوە، کە « بەرزنجیی » بە پێخاوسیی نێو قوڕوچڵپاوی نەزانیی و بێ ئاگایی کەوتووە. گەر « بەرزنجیی » نازانێ، با باش بزانێ، « چیچێن » ەکان داوای « ئۆتۆنۆمیی » یان نەکردووە. بەڵکوو، هەر لە کۆنەوە، کۆمارێکی « ئۆتۆنۆمیی » یان هەبووە و بە یەکێ لە کۆمارەکانی ڕووسیای فیدراڵ دەژمێررا. ئەوان، لە یەکەم ڕۆژەوە، دەستیان بە خەباتکردووە، داوای سەربەخۆییان کردووە. بەڵام، لەبەرئەوەی « چیچێنستان » ئەوتێکی زۆری هەیە، ناوچەیەکی ستراتیژیی بۆ ڕووسیای فیدراڵ پێکدێنێ، ڕووسەکان هەرگیز ئامادە نەبوون و نین، واز لەو ناوچە گرنگە بێنن، گەر لەوەش پتر، قوربانیی بدەن. هەروەها، ئەو ناوچەیە وەک دیوارێکی ئەستووری نێوان سنووری « ڕووسیا و تورکیا » وایە. جگە لەوەی، وەک گەلی کورد، چۆن هەمووی داوای جیابوونەوە لە دەوڵەتی « عێراق » ناکەن، کۆمەڵێ لەوانیش دەیانەوێ، لە چوارچێوەی « ڕووسیای فیدراڵ »دا بمێننەوە و دژی ئامانجی ناسیۆنالیستەکانی « چیچێن » وەستاون.

هەمووشمان دەزانین، کێشەی نەتەوەیی و ئایین، تێکەڵ بە یەکدی کراوە و جیهانی ئیسلامییش، بەگوێرەی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، لەو کێشەیە دەڕوانن و دەیانجوڵێنن. بۆ نموونە: « تورکیا »، بە هاندانی « ئەمێریکا »، هەر لە کۆنەوە پارمەتییاندەدا، بۆ ئەوەی هەمیشە، ئاژاوە لە « ڕووسیای فیدراڵ »دا هەبێ، بە تەواویی لاوازبێ. بەڵام « ئێران و عێراق »، لەبەرئەوەی لەگەڵ « ئەمێریکا » بە تایبەتیی، بەرەی ڕۆژاوا بە گشتیی، پێوەندییان باش نییە، هەر چەندە کێشەکە ئیسلامییش بێ، خۆیانیان لێ کەڕ و کوێر و لاڵ کردووە، یا چەن جارێ گوتوویانە: ئەو کێشەیە، بە کێشەیەکی نێوخۆیی « ڕووسیا » دادەنێ، هیچ پێوەندییەکی بە ئێمەوە نییە و دەس لە کاری نێوخۆی دەوڵەتەکانی دیکە وەر نادەین. چونکە، هەر دوو دەوڵەتەکە خۆیان، هەمان گرفتی نەتەوەییان هەیە و لە کوڵان دایە! جا دوور نییە، ئەو « عەریزە »ی « بەرزنجیی » باسیکردووە، خۆی بۆ « یەلتسن »ی بردبێ. چونکە، ئەوان هەرگیز « عەریزە »یان بۆ « ئۆتۆنۆمیی » نەداوە. بەڵکوو، لە مێژە مافی « ئۆتۆنۆمیی » یان هەیە! وا خەریکە، لە سایەی کەللەڕەقیی و دەستی دزێوی دەرەوە، ئەوەشیان لەکیسدەچێ!

لە ڕاستییدا، ئەمڕۆ کێشەی « چیچێنستان »، نە بە تەواویی لە خولگەی مافی « ئۆتۆنۆمیی » و نە لە خولگەی مافی « فیدراڵیی »دا دەخولێتەوە. بەڵکوو، ئەوان داوای جیابوونەوە و دەوڵەتی ناسیۆنال دەکەن. هەر دەبێ، ڕۆژێ لە ڕۆژانیش، ئەو

مافه رەوایە بەدیبێنن. جگە لەوەی، « بەرزنجیی » کێشەی « داگستان »ی لە بیرچووە، باسیکا. چونکە، ئەوانیش ئەگبەتیی گرتنی، بە دەستی دەرەوە، ئاژاوەیەکیان نایەوە، بە قسەی ئیسلامییەکان هەڵخەڵەتان، ئەو جەنگە ماڵ وێرانکەرانەیان هەڵگیرسان، وا خەریکە، سەری خۆشیان و « چیچێن »ەکانیش، بە یەکجاریی لە قوڕدەنێن!

## 9/4. فەلسەفە و ئایدۆلۆژیاکان :

من ئێستەش پێم وایە، کێشەی مافی چارەنووسی نەتەوەکان، لە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانداندا، وەک « ئۆتۆنۆمیی ـ فیدرالیی »، هەر تەنیا فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای « مارکسیزم ـ لینینزم » دەتوانێ، بە شێوەیەکی « ئاشتیخوازانە، دادپەروەرانە و دیمۆکراسییانە »، چارەسەریکا. بەلام، گەر ئەو سیستێمە باش ڕاژە نەکرا، کەسانی خراپ دەستیان بە سەر دەزگەکانی پارت و دەوڵەتدا گرت، وردەوردە، هەستی شۆڤێنیزمی نەتەوەی باڵادەس بوژایەوە، بەرانبەریشی هەستی پیرۆزی نەتەوەیی نەتەوە ژێردەستەکان گەشەیکرد، ئەوا ئیدی دەبێ، چارەسەرێکی بنەڕەتیی بۆ بدۆزرێتەوە، هەموو هەڵەکان ڕاسکرێنەوە، لە جیابوونەوەش پتر، هیچ ڕێگەیەکی دیکە نییە. بۆیە، ئەو گەلانەی جیابوونەوە، ئێستەش هێندێکیان، بۆ باری پێشووی دەوڵەتی « یەکێتی سۆڤێت »، پەنجەی پەشیمانیی خۆیان دەگەزن. هەرگیز، لەو باوەڕەدا نیم، چ فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیزم، چ فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای ئاین بتوانن، چارەسەری کێشەی نەتەوەیی بکەن. جگە لە تواندنەوەی نەتەوەکان، لە بۆتەی نەتەوەی باڵادەسدا، هیچ جۆرە چارەسەرێکی بنەبڕیی دادپەروەرانەی دیکەیان پێ نییە. نموونەش، لە سەر کێشەی نەتەوەیی، لە دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانەکدا، لە سەر هەر سێ دید و بۆچوونەکە زۆرە و پێویست بە هێنانەوەیان ناکا.

## 10/4. ڕۆژاوای ئەورووپـــا :

ئینجا، با بزانین، سیستێمی دیمۆکراسیی و دەوڵەتەکانی ڕۆژاوای « ئەورووپا »، چییان پێیە؟ چی دەکەن؟ چۆن گرفتەکان چارەسەردەکەن؟ با زۆر دوور نەڕۆین، گەر « بەرزنجیی »، لە « بەغدا »ی خۆشەویست پتری نەدیوە، زانیارییەکانی وەک زانیاریی عەرەبێکی شۆڤێنیی « عێراق » وایە. « نەرویژ و سوید » تا سەرەتای ساڵەکانی سەدەی بیستیش، هەر یەک دەوڵەت بوون. بەلام، نەک هەر بە « عەریزەیەک! » « ئۆتۆنۆمیی »یان وەرگرت، بەڵکوو، هەر تەنیا بە « ڕیفراندۆم »ێ سەربەخۆییشیان وەرگرت و « نەرویژ » لە « سوید » جیابۆوە!

« فینللەند » لە سەردەمی « لینین »دا، بە شێوەیەکی دیمۆکراسییانە و بە دەمەتەقێ، کێشەکەیان چارەسەرکرد و لە ژێر دەستی ئیمپراتۆریای « رووسیا »ی پێشوو و « یەکێتی سۆڤیێت »ی تازە دامەزراودا رزگاربووا

« ئێرلەندەی باکوور »، چەندین ساڵە، سوپای نهێنییان دامەزراندووە، جەنگی نهێنیی سەرجادەیان پێڕەوکردووە، هەرگیز داوای مافی « ئۆتۆنۆمیی »یان نەکردووە، تا ماموستا « بەرزنجیی » وەک « تەتەر! »، خۆی ماندووکا و «عەریزەیەک!» «بۆ پەرلەمانی « بریتانیای گەورە » بەرێ! بەڵکوو، داوای رزگاریی و سەربەخۆیی « ئێرلەند » و یەکگرتنەوەی هەر دوو پارچەکەی نیشتمانیانکردووە. کاتێکیش، کار بەوە گەیشت، کێشە رەواکەیان بە ئاشتیی چارەسەرکەن، ریفراندۆمێکیان سازکرد، تا ئەندازەیەکی زۆریش، کێشەکەیان بەلاداخرا.

لە « سوید »، جگە لە کێشەی کەمینە نەتەوەیی « سام »ەکان، گرفتی نەتەوەیی دیکەیان نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، « سام »ەکان داوای چییان کردووە، هەر تەنیا بە دەمەتەقێ بۆیان جێبەجێکردوون.

لە « سوید »، نەک هەموو شارێ، بەڵکوو، هەموو گەڕەکێکی گەورەش لە نێو شارەکاندا، شێوە « ئۆتۆنۆمیی »یەکی تایبەتیی خۆبەڕێوەبردنیان هەیە، کە لە سەر شێوەی سیستێمی « کۆمۆنات » دامەزراوە.

« سویسرا »، لە سێ گەلی سەرەکیی پێکهاتووە. بە هەر سێکیان، دەوڵەتێکی یەکگرتووی فیدراڵیان دامەزراندووە. هەر سێ زمانە نەتەوەیی یەکەی « فەرەنسیی، ئەڵمانیی و ئیتالیی » بە زمانی فەرمیی دادەنرێ. باشترین ژیانیان هەیە و لە هیچیان کەم نییە. وا بزانم، نە جەنـــگ و نە خوێنڕشتنی ویستووە، نە کەسیش « عەریزە »یەکی داوە، تا ئەو سیستێمە هەڵبژێرن.

هەروەها، دوورگەی « کۆرسیکا »، ئێستە « ئۆتۆنۆمیی »یان هەیە، کەچیی، داوای سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە « فەرەنسا » دەکەن.

دوا جار، لەوانەیە لای « بەرزنجیی » و خوێنەری کورد، شتێکی سەیربێ، گەر بڵێم: دەوڵەتێکی وەک « سوید »، هێندە مافی مرۆڤی لەبەرچاوگرتووە، هەموو ئەو پەنابەرانەی، لە دەوڵەتە جیاجیاکانی جیهانەوە هاتوون، هەموو جۆرە مافێکی وەک: « قسەکردن، خوێندن و نووسین بە زمانی نەتەوەیی، خواپەرستیی لە سەر ئایینی خۆیان و مزگەوت دروسکردن ... تاد »یان هەیە.

جگە لە هەموو ئەمانەش، « سوید »ییەکان، نەک هەر بیریان لە مافەکانی مرۆڤ و چۆنێتی باشکردنی ژیانیان کردۆتەوە، بە شێوەیەکی بەردەوامیش، هەر بیری لێ

دەکـــەنـەوە، بەڵکوو، لەبەرئەوەی، « باکـــووری ســـوید »، لە ناوچەی « تەوەر »دا هەڵکەوتووە، ساڵانە بەفرێکی زۆری لێ دەبارێ و کەڵێ سارده، وولاتەکە مەترسیی ئەوەی لێ دەکرێ، هێندێ ئاژەڵی دڕندەی کـێـویی وەک « گـورگ »، لەنێـوچن و نەمێنن. لەبەرئەوە، لە زستاندا بە فڕۆکەی « هالیکۆپتەر »، خواردنیان بۆ فڕێ دەدەن، تا لە برسانا نەمرن. دە ئەوە، لە وولاتێکی وەک ڕۆژهـەڵاتی ناوەندا بووایە، نەک هەر خواردنیان بۆ دابین نەدەکردن، بەڵکوو، خوێنیشیان لە کاسە دەکردن!
شتێکی سەیر نییە، گەر دیمۆکراسیی لە دەوڵەتێکی وەک « سوید »، بەو ئاستە بەرزە گەیشتبێ، سەرۆک شالیارانی « سوید »، لە ڕێستۆرانێکی ئاساییدا نان بخوا، هـاووڵاتییـەکی « سـوید »ی هەڵسێ، قـاپێ زەڵاتە بە سـەروگوێلاکیـدا بکا. سـەرۆک زۆر بە هـێـمنیی، لێی بپـرسێ: بۆ وا دەکـەی؟ ئەویش لە وەڵامـدا بڵێ: چونکە، خۆشم ناوێی! سەرۆکیش هـیچ نەڵێ و هیچیش لە هاووڵاتییەکە نەکەن!
ڕەنگە « بەرزنجـیی » بووایە، وەک « تالە » لە بەر دەرکی سـەرا هەڵیواسیـایە!
چونکە، گەر لە سەر هەڵەکانی پێش حەفتا ساڵ لەمـەوبەر، بەو شێوەیە زەردوویی گـرتوویەتی و کـەفی چاندووە، ئـاخـۆ دەبێ، لە ســەر کـارێکی لەو چەشنـە، چی بکردایە!

## 11/4 . ئامۆژگاریـــی :

« بەرزنجیی »، لە کۆتایی سـیـپارەکەیدا، هەروا پەتـی ئەندێشـەی، بۆ ورێنـەکانی بەرەڵاکـرووە و وەک کـەوڵەکۆنێکی سـەد سـاڵەی خـاوێ ئەزمـوون، لە ڕێـی منەوە، ئامۆژکاریی هەمووانی کردووە و نووسـیوێتی: (ئەوەی مـاوە بیڵێم ئەوەیە کەزۆر شت هەن مـرۆڤ دەستیان بۆ نەبات باشتـرە، تا بەتەواوی تاوتۆو سـەرووبنی نەکاو لێی حاڵی نەبێ، بەتایبەت ئەگەر بەمـەزندەی ئەو نامۆشبوو، ئەوە دەیخاتە بارێکی داماوییەوە.)«61،3»
لە ڕاستییدا، منیش لەگەڵ ئەو بۆچوونـەدام، بەڵام، بۆ ئەوەی « بەرزنجیی » باش بزانێ، من « فیـتـەر » نیم و هـەر لە خـۆمـەوە پەلاماری « دارتـاشیی »م دابێ! یا «عـەرەبانچـیی » نیم و دەرزی لە نەخـۆش بدەم! بەڵکوو، ئەو بابەت و باسـانە، بە کاری خۆمیـان دەزانم. وا بزانم، زۆر بە جوانیی و تەواوییش، گـوتارەکەی خۆمم تاووتوێکردووە و باشیشی لێ تێگەیشتووم، یـەکێکی وەک « زێوەر » چی بووە؟ ئەو هەموو هـــۆنراوە « عێراقچێتیی »یانەی، لە چ ڕوانگەیەکـەوە گوتووە! نەک هەر بە بیـر و بۆچوونی من نـامـۆن، بەڵکوو، کـێم و زەرداویی دوومـەڵێکی پیس بوون، لە کانـی یاقـووت و ئەڵمـاسـی هۆنراوەکـانییـەوە تەقـیـون و دەرهاتوون! داماویش ئەو

کەسەیە، خۆی لە هیچدا نەبێ، دەنگی نەبێ، ڕەنگی نەبێ، بە بۆنەی هێندێ باسی دروسکراو و خۆهەڵخەڵەتاندنەوە بیەوێ، خۆی بنوێنێ! داماو ئەو کەسەیە، داکۆکیی لە هەڵە و چەوتیی خۆی و خەڵکی دیکە بکا! لە پێناوی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیدا، خۆی و خەڵکیش کوێرکا!
ڕەنگە، دوکتۆرێ بە دارتاشێ بڵێ، تۆ لە پزیشکیی نازانی، خەریکی دارتاشینی خۆت بە، یا ئاسنگەرێ بە مامۆستایە بڵێ، واز لە ئاسنگەریی بێنە و خەریکی وانەوتنەوەی خۆت بە، زۆر کارێکی ئاساییبێ. بەڵام، گەر هەر نووسەرێ، بە کوردێ بڵێ، خەریکی پیشەکەی خۆت بە، واز لە خوێندنەوە و نووسین بێنە، ئەوا جگە لەوەی، بە قسەیەکی تا بڵێی هیچوپووچ دەژمێررێ، هیچ کەسێکیش، بە هیچ شێوەیەکیش بۆی نییە، ئەو قسەیە بکا. چونکە، خوێندنەوە و نووسین، پێش هەموو شتێ بەهرە و ئارەزووی ئەو مرۆڤە دیاریدەکا، نەک خوێندنی نێو چوار دیواری خوێندنگەکان، تەنیا پێوەرێ بێ، بڕوانامە ساختەکانیش، ئەو مافە بە یەکێ بدا، بە ئارەزووی خۆی، قسەی پڕوپووچ ڕیزکا. لە هەمان کاتیشدا، ڕێگە لە وزە و توانای چەن کەسێکی خاوەن بەهرە و لێهاتوو بگرێ، دەم هەڵ نەهێننەوە و تەنیا هەر کوێ بن، دەم نەبن و هیچ نەنووسن!

### 12/4. نووسین و پیشە :

جا بەو بۆنەیەوە، گەر « بەرزنجیی » ئەو مافە بە من ڕەوا نەبینێ، وەک نووسیوێتی: (شارەزایی و پسپۆڕی مرۆڤ توانای ڕاستی درکاندنیشی دەداتێ بە تایبەت لە بوارە ئەسڵییەکەی خۆیدا.)«61،3»، ئەوا بە لانی کەمەوە، سی ساڵی تەمەنی خۆم، بە خوێندنەوەی وێژەی « کوردیی، عەرەبیی و ڕووسیی »ەوە خەرج کردووە. جگە لەوەی، هەر ئەو خۆی بوو، ساڵی « 1974 »، داوای گوتاری لێ دەکردم، بۆ خوێنەری ساوای کوردی گۆڤاری « ئەستێرە »ی بنووسم. بە داخەوە، تەنیا یەک گوتارم نووسی و ئیدی فریا نەکەوتم، درێژە بە نووسین بدەم، چونکە، سەرکردایەتی ئەو کاتەی کورد و دەوڵەتی « بەعس »، ئاگری جەنگیان لە کوردستان هەڵگیرساندەوە و منیش هەڵاتم!
هەر کەسێکیش، ئەم ڕستە و قەوانە سواوە کۆنە بێ تامە بخوێنێتەوە، زۆر باش دەزانێ، « بەرزنجیی » ویستوویەتی، پلاربهاوێژێ. گوایە، ئەو بوارە بابەتی من نییە و بە زۆر سواری شانی بووم! من لە ناخی دڵمەوە، بەزەییم بەو جۆرە کەسانەدا دێتەوە، کە بەو شێوەیە بیردەکەنەوە. چونکە، نووسین و پیشە، هیچ پێوەندییەکیان بە یەکەوە نییە. مەگەر، هەر ئەوانەی پیشە و نووسینیان تێکەڵ

کردووە و وەک سەرچاوەیەکی گرنگی ژیان، پێی دەژین. خوێندنەوە و نووسین، پێش هەموو شتێ، بە وزە و توانای ئەو کەسە دەسنیشاندەکرێ. ئەوینێکە و یەزدانی گەورە، بە هەموو کەسێکی نابەخشێ! گەر ئەو ئەوینە، بە دەزوولەی خوێنینی، نێو دڵدا نەڕۆشتایە، هەڵبەتە، ئەو کەسە یەک دێڕی نەدەخوێندەوە و نەدەنووسی. جا گەر وا نییە، بۆ هەموو کەسێ، خووی خوێندنەوە و نووسینی نییە! جۆرە کەسانێ هەن، خوا وای دروسکردوون، تاقەتی نامەنووسینیشیان نییە!

بۆ ئاگاداریی « بەرزنجیی »یش، ئەوا ماوەی چواردە ساڵی تەواوە، ئەرەتەی خوێندنەکەم تەواوکردووە، مالاوایم لە تەرخانی تایبەتیی خۆم کردووە.. خۆزگەم، وەک ئەو قسەیەی کردووە، ئامۆژگاریی خەڵکی کردووە، خۆی وەک مامۆستایەک، هێندە لە زمانی کوردییدا شارەزا و پسپۆڕ بووایە، بە کوردییەکی ڕەسەن و پەتیی، بە زمانێکی بێ گرێوگۆڵ دەینووسی. کەمێ ئازابووایە، توانای درکاندنی هەموو ڕاستییەکانی هەبووایە!

## 13/4. تۆپەڵێ ووشــــە :

پاشان نازانم، ئەم چەن دێڕەی بۆ لە سەرچاوەیەکی عەرەبییەوە وەرگرتووە، بە شێوەیەکی زۆر خراپ وەرێگێڕاوە، بە کوردییەکی ناخۆش داێرشتووە نوسیوێتی: (هەمووبان لەژێر یەک تیشکدا دەژین، بەڵام بۆچی هەر ئەم تیشکە لێرە لەسووری دەکەوێ و لەوێ بەشین یا سپی.. وەیا لەبەیەکداچوونی دووانیان پانتایی تاریک دروست دەبێ؟ حاڵی بوون لەمە زەحمەتە، هەتا ئەوە نەزانین کە لە لەرەی ئاگاو هۆشمادا ــ درز ــ یا ــ کون ــ دروستبووە)«61،3» ئایا، ئەم فەیلەسووفە گەورەیە، مەبەسی لەو تۆپەڵە ووشە بێ ئامانە چی بێ؟!!

## 14/4. نیازپاکیی :

پاشان نووسیوێتی: (گومانم لەنیازپاکی نووسەریش نیەو هەروا باوەڕیشم بەهێزە بەو پاکانە جوان و بەرزەی خوای گەورەو پەروەردگار بۆ شاعیرانی کردووە لەهەر جێیە بێ: « و الشعراء يتبعهم الغاوون الم تر انهم في كل واد يهيمون، و انهم يقولون ما لا يفعلون، الا الذين امنوا و عملوا الصالحات و ذكروا الله كثيرا و انتصروا من بعد ما ظلموا. »)«61،3»

جا هەر ئەوە مابوو، « بەرزنجیی » گومان لە نیازپاکیی یەکێکی وەک من بکا! دەبێ، من چیم لەگەڵ پیاوێکی خواناسیی وەک « زێوەر »دا هەبێ! چونکە، کاتێ من لەدایکبووم، ئەو دوو ساڵ بووە، مالاوایی لەم گەردوونە بێ فەرە کردووە! بەلام،

ئەز قسەی خۆم بۆ مێژوو کردووە، گۆمی مەنگی باسەکەم شڵەقاندووە، جا کێ، بەڵگەیەکی مێژوویی لەوەی منی بەهێزتر لا دەستدەکەوێ، فەرموو، ئەوە ئەرز و ئەوش گەز، یا بۆ منیش و ڕۆڵەکانی نەتەوەکەشمی ڕوونکاتەوە. بە چ پێوەرێ، ئەو هۆنراوە « عێراقچێتیی مانەی هۆنەر، بە ئەرکی سەرشان و نیشتمانپەروەریی دادەنرێ؟ ئەدی دەبێ، بە هۆنراوە و سروودە نیشتمانییەکانی چەن هۆنەرێکی وەک: « ئەسیری، بێکەس، بەختیار زێوەر » یا « زێوەر » خۆشی بڵێین، چی؟!!

بۆیە کورد باشی گوتووە: پیاو گەر باشی نەگووت، خراپیش نەڵێ، باشترە!

« بەرزنجیی »، ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز وەرگرتووە. بەوە ویستوویەتی، بڵێ: گەر « زێوەر » ئەوەشی کردبێ، بە هەڵەش دانرێ، ئەوا مەبەستی نەبووە و بە کردەوە، هیچی لەو بابەتەی نەکردووە. ئەمە خۆی لە خۆیدا، ئەوە دەگەیەنێ، ئەویش دان بەو ڕاستییەدا دەنێ، کە لە گوتارەکەی مندا هاتووە!

لە وەڵامی ئەو ئایەتەی سەرەوەدا، تەنیا یەک دێڕ هۆنراوەی « قانع » دێنمەوە، تا بزانین، هۆنەرێکی وەک « قانع »، دەربارەی هۆنەران چی گوتووە. هەر چەندە، زۆر باش زانیویەتی، خۆشی دەگرێتەوە! بەڵام، من لەو باوەڕەدا نیم، هەموو هۆنەرێ بەو شێوەیە بێ، کە ئەو باسیکردووە. بەڵکوو، ئەو هۆنەرانەی لە پێناوی کێشە ڕەواکەی گەلەکانیاندا ژیاون و دەژین، مردوون و دەمرن، « ناخۆشیی، برسێتیی، تێهەڵدان، گرتن و کوشتن » بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، ئەوانە هەمیشە لە یاد و لە دڵە گەورەکەی ڕۆڵەکانی نەتەوەکانیاندا دەژین! « قانع »، دەربارەی هۆنەر بە گشتیی، کەڵکی لەو پەندە کوردییە وەرگرتووە، کە دەڵێ: دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە!

بۆیە گوتوویەتی:

شاعر دەهۆڵن، لە دوور دەنگخۆشن
لە نـــــــزیکەوە دارێکی بۆشـــن «58،49»

## 5. کۆتایی:

دەگێڕنەوە، لە کۆندا، گەورە پیاوان و دەسەڵاتداران، نۆکەر و پیاوەکانی خۆیان دەخەسان، تا ناپاکییان لێ نەکەن، دەس بۆ ئابڕووی ژن و کیژەکانیان نەبەن. بەڵام ئەوڕۆ، هێندێ لە سەرانی پارتە ڕامیارییەکانی کوردستان دەیانەوێ، مێشکی ڕۆڵەکانی گەل بە گشتیی و نووسەرانی کورد بە تایبەتیی، بخەسێنن، تا کردارە خراپەکانیان لەقاو نەدەن، جەماوەری گەل وەک مێگەل لێخوڕن! بیری پیرۆزی « کوردستانیزم » لە مێشکیاندا بتاسێنن، بە بیری نامۆی « عێراقچێتیی » موتوربەیانکەن!

ڕاستیان فەرمووە: سەگ لە قەسابخانە نەمرێ، عومری بە زایە دەڕوا! جا، کوردە « عێراقچیی »یەکان، گەر لە قەسابخانەی « عێراق » نەمرن، دڵیان بۆ « بەغدا »ی پێتەختی تاوان لێ نەدا، ناحەوێنەوە و خەو لە چاوانیان ناکەوێ! چونکە، وەک سەگی کونەماسی وان، لە کوردستان دەژین، کەچیی، پاسی جڕتاوای « عێراق » دەکەن!

من لەوە دەترسم، ڕۆژێ لە ڕۆژان، چانسی کورد یاربێ، زلهێزەکانی جیهان بڕیار بدەن، دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ گەلی باشووری کوردستان دامەزرێنن، کەچیی، چەن « عێراقچیی »یەکی بێگانەپەرست دژبن و ڕەتیکەنەوە. وەک چۆن ئەوڕۆ ، لە « ڕۆژهەڵاتی تەیموور »، کۆمەڵێ میلیشیای چڵکاوخۆری بەکرێگیراوی سەر بە دەوڵەتی « ئەندەنووسیا » پەیدابوون، ئاژاوەیەکی گەورەیان ناوەتەوە، دژی ئازادیی و سەربەخۆیی نیشتمانەکەیان وەستاون. دوای ئەوەی، لە ڕێفراندۆمێکی ئازاددا، ڕۆڵەکانی گەل، بە زۆربەی دەنگ، بڕیاری سەربەخۆییان داوە!

ئێمەی کورد، لەگەڵ هەموو تیۆرییەکانی « کوردایەتیی فراوان، عێراقچێتیی، دیمۆکراسیی بۆ عێراق، برایەتیی کوردی بندەس و گەلی باڵادەسی عەرەب، ئایدۆلۆژیای خەباتی ناوکۆیی، بەرژەوەندیی هاوبەشی پرۆلیتاریای دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان، کۆماری هاوبەش، هەموو لق و بەشەکانی باوەڕی سۆسیالیزم، ئایدۆلۆژیا و فەلسەفەی مارکسیزم »دا، تاقیکردنەوەیەکی باشمان هەیە، تا ئێستەش لە هیچیاندا سەرکەوتوو نەبووین. چونکە، بیروباوەڕمان کوردستانییانە نەبووە، هەوڵ و کۆششەکانمان بۆ خۆمان و نەتەوەکەمان نەبووە، هێز و توانامان، لە ڕاژەی دوژمنان و داگیرکەراندا بووە، مێتۆدەکەشمان هەر لە « کوشتنی پیاوخراپ، جەنگی بەرەیی، گفتوگۆکردن، لەدەسدانی هەلی مێژوویی،

خەباتی دیپلۆماسیی و پروپاگەندەکردن «وە بیگرە، تا بە « جەنگی نێوخۆی نێوزراوی چەپەڵی کوردفران، نارێکیی، ناتەبایی، یەکنەگرتنی رێکخراوە رامیارییەکان و ریزەکانی گەلی کورد «دەگا، هەڵەبووە. لە رووی رابەریشەوە، هەرگیز نەتەوەی کورد هێندەی ئەورۆ، بێ « رابەر، سەرکردە و پێشەوا » نەبووە، یەکنەگرتوو نەبووە، هەرگیز هێندە لە نێوخۆدا، ناکۆک و ناتەباش نەبووە.

پێویستە، سەرانی کورد ئەوە چاک بزانن، هەروەها دەبێ، لای رۆڵەکانی گەلەکەشمان ئاشکرابێ، بۆ دۆست و دوژمن و گەلانی جیهانیشی روونکەینەوە، کێشەی کورد، لەگەڵ دڵسۆزیی بۆ « عێراق » جیاوازە. بە هیچ جۆرێ نابێ، ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە، بە دەوڵەتی خۆمان بزانین. بەڵکوو دەبێ، بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵدەین، ئەو راستییە بە گوێی سەرانی داگیرکەردا بدەین، کە باشووری کوردستان، بەشێ لە « عێراق » نییە. پێوەندیی برایەتیی گاڵتەقینە و دۆستایەتیی راستەقینە جیاوازییان هەیە. برایەتیی بێ رێزی بەرابەریی، بە کەڵکی هیچ لایەکمان نایە. دۆستایەتیی راستەقینەش، تەنیا ئەو کاتە دروستدەبێ، کە گەلی عەرەب دان بە هەموو مافە نەتەوەییە رەواکانی کورددا بنێ. چونکە، نە کورد دەبێ بە عەرەب و نە عەرەبیش دەبێ بە کورد، نە باشووری کوردستان بە بەشێ لە « عێراق » و نە « عێراق »یش بە بەشێ لە کوردستان دادەنرێ! ئەوی لەم راستییەش لابدا، ئەوا جگە لە دەردیسەریی و ماڵوێرانیی، هیچی دیکەی دەس ناکەوێ. چونکە، (« ململانێ، ناکۆکیی و بەریەرەکانێی » نێوان نەتەوەی کورد و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، تەنیا ململانێیەکی رامیاریی و چەکداریی رووت نییە، بە بەدیهێنانی چەن ئامانجێکی کاتیی وەک « ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیی » چارەسەرکرێ و کۆتاییپێبێ. بەڵکوو، لە زنجیرەیە ململانێی مێژوویی دووروودرێژ پێکهاتووە، هەر لە سەرەتای داگیرکردنی کوردستانەوە دەسپێدەکا، هەرگیزا و هەرگیز کۆتاییشی نایە، تا « دوا سەرباز، دوا دەزگەی بەرێوەبەرێتی دەوڵەت، دەسەڵاتی رامیاریی، مەکینەی سەربازیی ئیمپریالیزمی تورک، فارس و عەرەب »، لە کوردستاندا باروبارخانەیان، بنکە و بارەگەکانیان نەپێچنەوە، کوردستان چۆڵ نەکەن و نەرۆن. واتە: ململانێیەکی چارەنووسسازانەی گەورەی نەتەوەییە، بنەماکەی لە سەر بنچینەی « رزگاریی تەواو، سەربەخۆیی راستەقینە، ئازادییەکی راست و رەوان »ی بستەبەستی خاکی کوردستان و مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد دامەزراوە، کە خۆی لە دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییدا دەنوێنێ.)»291،29»

بلاوبوونەوەی بیری « مارکسیزم ـ لینینیزم » لە کوردستاندا، لە رێی دەستی دووەمەوە بووە. بۆیە، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیزم، لە رێی کۆمۆنیستە کوردستانیی و سەرانسەرییەکانەوە، کارێکی نێگێتیڤانەی گەورەی، لە رۆڵەکانی نەتەوەی کورد کردووە. هەستێکی مارکسییانەی کوردستانییانە، لە نێو مارکسییەکانی کوردا پەیدا نەبووە. زۆر هەوڵیان نەداوە، رێکخراوێکی کۆمۆنیستیی کوردستانیی نیشتمانپەروەر دامەزرێنن، تا پەرە بە بوژاندنەوەی، هەستی خۆ بەکوردزانین و خەڵکی کوردستان بدەن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، لە لایەکەوە، پارمەتییەکی زۆری بلاوبوونەوەی، گیانی « عێراقچێتیی» داوە. لە لایەکی دیکەشەوە، زیانێکی زۆری، بە بیری کوردستانچێتی، رۆڵەکانی نەتەوەی کورد گەیاندووە.

بۆیە، کارێکی زۆر سەیر نییە، گەر لە کۆندا، هێندێ « خوێنەوار، رووناکبیر، نووسەر، هۆنەر و رامیار »ی کورد، زۆر کوردستانییانە بیریان نەکردبێتەوە، بیری « عێراقچێتیی » هەموو دید و بۆچوونەکانیانی کۆنترۆڵکردبێ. تا بەو شێوەیە، هۆنراوە بۆ « عێراق » بلێن، گۆرانی بۆ « شا و ئالا »کەی بچرن! جا گەر هەستی نەتەوەیی کورد لاواز نەبووایە، هەڵبەتە، ئەم کارانە رووی نەدەدا.

جگە لەوەی، گەر بەم پێیە بووایە، گەر ئەم کردار و رەفتارانە راستبوونایە، دەبووایە، هۆنەر و مامۆستاکانی « جەزایر، ڤێتنام، هیندستان، باسک، عێراق و فەلەستین ... تاد » هۆنراوەیان بە سەر خاکی ئیمپریالیزمی « فرەنسا، ئەمێریکا بریتانیا، سپان و ئیسرایل ... تاد »دا هەڵدایە، گۆرانییان بۆ شا و سەرکۆمارەکانیان بگوتایە، بە هۆنراوەی فێرکاریی، منالانیان فێری بێگانەپەرستیی و خۆشویستنی داگیرکەران بکردایە، خۆیان بە هاونیشتمانیی ئەو دەوڵەتانە بزانیایە! ئایا، جگە لە کورد، کام نەتەوەی جیهان، بەو شێوەیە منالانی خۆیان پەروەردەکردووە؟ ئەمە، گەر سەرلێشێوایی نەبێ، چییە؟ ئەوی گۆرانیی بۆ چلەپووشێکی هەر دەوڵەتێکی داگیرکەر بلێ، بە لانی کەمەوە، هەستی نەتەوەیی زۆر لاوازە و لە بێگانەپەرستییدا نقوومبووە!

بۆیە دەبێ، منالانی کورد، لە کارتێکردنی ئەو جۆرە پەروەردەکردنە چەواشانە دووربخرێنەوە. چونکە، خۆشەویستیی راستەقینەی نەتەوە و نیشتمان، لە یەکەم هەنگاوی پەروەردەکردنی نەتەوەییەوە دەستپێدەکا. سەرەتاش لە نێو ماڵ و پاشان لە خوێندنگەکانەوە سەردەردەهێنێ. بە مەرجێ، ئەو پەروەردەکردنە، لە سەر بنچینەیەکی مرۆڤدۆستانە و رێزی بەرابەریی نێوان نەتەوەکان دارێژرابێ. منالانی

کورد، خۆیان لە منالانی هیچ نەتەوەیەکی دیکە بە کەمتر نەزانن. ئەم ڕاستییە وەنەبێ، هەر من بیزانم، بەڵکوو، وەک یاسایەکی گشتیی، هەموو نەتەوەکانی جیهان پێڕەویانکردووە و پێڕەویشدەکەن. تەنانەت، هۆنەرەکانی کوردیش، هەر لەم گۆشەنیگایەوە بووە، هۆنراوە و سروودی نەتەوەیی و نیشتمانییان، بۆ منالانی کورد داناوە. تا هەر لە منالییەوە، پتر هۆگری خاکوخۆڵی نیشتمانەکەیان بن، بۆیە، یەکێکی وەک « بێخود »، کاتێ لە « کەرکوک » بووە، هەستیکردووە، منالانی کورد سروودی « تورکمان ›ی دەخوێنن، سروودی « ئەی دلێران ›ی بۆ داناون. یا چەن هۆنەرێکی وەک: « دڵدار، پیرەمێرد، بێکەس، گۆران، بەختیار زێوەر »، تەنانەت « زێوەر » خۆشی، گەلێ سروودی بەرز و جوانی نیشتمانپەروەرییان بۆ منالانی کورد هۆنیوەتەوە. جا گەر، پەیان بەو ڕاستییە نەبردبێ، هەڵبەتە، ئەو هۆنراوانەیان نەدەگووت.

بۆیە، ئەو سروودانە، بە نەمریی ماونەتەوە، ئەوە دوای ئەوە، لە خوێندنگە و بۆنە نەتەوەییەکاندا دەیڵێنەوە. بەلام، هەموو ئەو هۆنراوە نامۆ « عێراقچیی›یانە، لە خانەی نەمرییدا جێگەیان نەبۆتەوە، هەرگیزاوهەرگیزیش، جێگەیان نابێتەوە. جا گەر وا نییە، هەڵبەتە، ئەو هۆنراوە « عێراقچێتیی ›یانەی « زێوەر » تا ئێستەش، وەک هۆنراوە و سروودە نیشتمانییەکانی دیکەی هۆنەرانی کورد، لە دڵ و دەروونی منالانی کورددا دەژیان. لە خوێندنگەکانی کوردستاندا دەخوێندران. بەلام، چونکە چەن هۆنراوەیەکی نامۆ و زۆڵەک بوون، هەر بایەکی سەر ڕووی زەویی کوردایەتیی لێی داون، زوو جوانەمەرگبوون و ئێستەش لە زبڵدانی مێژووی بیری بێگانەپەرستیی و « عێراقچێتیی »، سەردەمێکی مێژوویی ڕووناکبیری کورددا گۆڕکراون!

ڕەنگە، یەکێ ئەم نووسینە بخوێنێتەوە، وا بزانێ، هێندە ڕقم لە عەرەبە، چاوم بەر پێی خۆم نابینێ و خەریکم کوێردەبم. نەخێر، هەرگیز وا نییە. بەلام، « عێراق » بە دەوڵەتێکی داگیرکەر دەزانم. هەموو ئەو هاوولاتییە « عەرەب ›انەی، دان بە بوونی نەتەوەی کورددا دەنێن، بە بەشێ لە نەتەوەی خۆیانمان دانانێن، ئەوەی بۆ خۆیان بە ڕەوای دەبینن، وەک: « ڕزگاریی، سەربەخۆیی، یەکێتیی، ئازادیی، دیمۆکراسیی، مافی چارەنووس و دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنال »، بە کوردیشی ڕەوابیبنن، پێوەندییەکانیان لە بەر ڕۆشنایی ڕێزی بەرابەریی و یەکسانیی نەتەوەییدا دابڕێژن، ئەوانە بە دۆستێکی ئازیز و دڵسۆزی نەتەوەکەمانیان دادەنێم، کە بە داخەوە، نموونەیان لە نێو نەتەوەی عەرەبدا، لە چاو ژمارەیاندا، بە

پەنجەی هەر دوو دەس دەژمێررێن. بەڵام، هەر « کەسێ، لایەنێ، ڕێکخراوێ، پارتێ یا دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان »، باوەڕی بەو پرینسیپانە نەبێ، ئەوا بە دوژمن و داگیرکەری خاکی کوردستانی دادەنێم. کورد چۆن دەبێ، چەن کەڵە پیاوێکی مەزنی وەک: « عەزیز شەریف، ناجی تالیب، جەواهیری، هادی ئەلعەلەوی، کامیل چادرچیی، مەعمەر قەزافیی، سمایل بێشکچیی ... تاد » ی بیرچێ و هەمیشە یادیان نەکاتەوە، کە لە ڕۆژانێکی تەنگانەی نەتەوەکەماندا، چ بە دەم و چ بە کردەوە، بە هانامانەوە هاتوون، داکۆکییان لێ کردووین، مافی ژیان و چارەنووسیان پێ ڕەوابینیوین!
جا، سەیرم لێ دێ، هێندێ ساویلکە بە هەڵە لەم یاسا و باوەڕە نەتەوەییە گەیشتوون و تێدەگەن. چونکە، گەر هەر نەتەوەیەکی سەردەستی داگیرکەر، دان بە بوونی نەتەوەییماندا نەنێ، جگە لەوەی، بە دوژمنێکی گەورەی نەتەوەکەمان دادەنرێ، بە هیچ شێوەیەکیش، نە دۆست و نە برامانن. هێندێ کورد هەن، زۆر بە ئاشکرا خۆیان دەخەڵەتێنن، هەر بۆ ئەوەی بە « خوێندەوار، ڕووناکبیر، پێشکەوتووخواز، بەرچاوڕوون و شۆڕشگێڕ » ناویانبەرن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ڕاستییانەش زۆر باش دەزانن، بەڵام، خۆیانی لێ گێلدەکەن. بۆیە، ئەو جۆرە کەسانە، چ لای ڕۆڵەکانی کورد، چ لای ڕۆڵەکانی نەتەوە سەردەستەکانی کوردستان، لە « گێلەپیاو » پتر، هیچ ناوێکی دیکەیان بەسەردا ناچەسپێ!
کاتێ دەسم بە نووسین کرد، ئەوەم لە بەر دەمی خۆمدا دانابوو، دەبێ، چۆن بنووسم؟ چی بنووسم؟ لەبەرئەوە، زۆر باش دەمزانی، نووسینەکانم لە دڵسۆزییەوە بۆ کورد، دەرزیی ژان لە دڵی گەلێ کەس دەچەقێنێ. لە بری ئەو دەرزییەش، خەنجەری ژاراوییم لێ دەدەن. بۆیە، لە بەرهەمی یەکەمدا « ململانێی ئایدۆلۆژیی لە کوردستاندا » سەرەتای نووسینەکەم بە هۆنراوەیەکی « مەحویی » دەسپێکردووە و ئێستەش لێرەدا دووبارەیدەکەمەوە:

له سەر تۆم دوشمنە دنیا، قەزییەم « مانع ئەلجەمع »
که تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم چ بکەم! «232.57»

لە کۆتاییشدا دەڵێم: خوایە! من هەر هێندە زانیارییم هەیە، هەر هێندە توانای پەیبردنم بە ڕاستییە مێژوویی و ڕێژەییەکان هەیە، هەمیشە، تۆ لە هەموو کەس پتر دەزانی و ئاگاداریی هەموو نهێنییەک هەی، ڕاستیی ڕووت بۆ هەموو لایە دەرخەی، تا « بەرزنجیی »، کەمێ ویژدانی ماندوو و ڕووشاوی بحەوێتەوە، گیانی « زێوەر »یش لە گۆڕە تەنگ و تارەکەیدا، پتر ئارامگرێ! منیش، دەسەڵاتم نییە،

لەو قورە دروسکراوم، ناتوانم، جۆرێکی دیکە بم. هەرگیز حەزیشم نەکردووە و حەزیش ناکەم، لە پێستەکەی خۆم دەرچم. بەو بەش و چارەنووسەش قایلم. ناتوانم، لە ئاستی «هەڵە، تاوان، ناکۆکیی، دووبەرەکیی، جەنگی کورکوژیی و ناپاکیی»دا بێ دەنگبم. هەر وەک «بێکەس»یش گوتوویەتی:

بەڵێ، فەرموودەی تۆ لە سەر چاوم
ڕاستە، بۆیە من سووک و بەدناوم
دائیم دەربەدەر، وا نان براوم
چی بکەم، بڵێم چی، وەها خوڵقاوم
هەتا بمێنم، قسەی حەق ئەکەم
جوێن بە ئینسانی خائین، هەر ئەدەم
گەر چی ڕاست وتن، شەقی لە دوایە
خۆشە لە لای من، وەکوو حەڵوایە
ئەوەی بە ناحەق، شتێ بنووسێ
پەنجەی هەڵوەرێ و چاوی بنووسێ
مەقسەدم تەنیا، نەشری ئەخلاقە
بڕینی ڕەگی، فیتنە و نیفاقە
ئەخلاق ڕەهبەری، ڕێی پێشکەوتنە
پەیژەی تەرەققیی و زوو سەرکەوتنە
دەلیلی ڕێگەی، فەوز و نەجاتە
سەرمایەی فەخر و بوونی حەیاتە
قەومی بێ ئەخلاق، پەست و زەلیلە
هەر بەشی شەقە و سەرکز و دیلە
ئەمە پەندێکە، بۆ چاکیی ئێوە
نامەوێ، هیچم دەسکەوێ لێوە «6، 144-147».

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا گوتوویەتی:

خراپ ببینم، تەنقیدی دەکەم
ئەوی خائینە، جوێنی پێ دەدەم
ناترسم لە کەس، بێ باک و بێ غەم
هەر چی کە ئەبێ، ببێ، جەهەننەم «6، 218-220».

## 6. سەرچاوەکان:


1. ابن اسیر، الکامل فی التاریخ، ب 2.
2. احمد خواجه. چیم دی، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، بەغدا، 1968.
3. ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، پێویستی ئەو شیعرانەی پێویستنین، 1999.
4. ئەسیری ـ دیوان، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، بەغدا، 1980.
5. بێخود، دیوان، لە ئێران چاپکراوەتەوە، بێ ئەوەی هیچی لە سەربێ!
6. بێکەس، دیوان، چاپی سێیەم، چاپخانەی « حسام »، بەغدا، 1986.
7. پارتی سۆسیالیست کورد، دەربارەی فاشیزم،چاپی دووەم، 1990.
8. پیرەمێردی ئەمر، دیوان، لە بڵاوکراوەکانی انتشارات محمدی، سقز، 1369.
9. جمهوریه الخوف، الترجمه الکامله، الطبعه الاولی، القاهره، 1991.
10. جەمال نەبەز، بیری نەتەوەیی کورد، چاپی یەکەم، سوید، 1984.
11. جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، سوید، 1985.
12. جەمال نەبەز، پێوەندارێتی ی کوردی، چاپی یەکەم، ستۆکهۆلم،1986.
13. جوان بۆکانی، پێشرەوانی شیعری نوێی... ، پەیام، ژمارە 6، لەندەن، 1988.
14. حاجی قادری کۆیی، دیوان، 1986.
15. حزب البعث العربی الشتراکی، دستور حزب البعث العربی، دمشق، 1947.
16. حەمدی، دیوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆزلێست، بەغدا، 1984.
17. ح. م. عەزیز، لە پێناوی راستیدا، گ. بەربانگ، ژمارە87، سوید، 1993.
18. ح. م. عەزیز، دیمۆکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی ئێوخۆ، سوید 1994.
19. ح. م. عەزیز، ململانێی ئایدۆلۆژیی لە کوردستاندا ،چاپی دووەم، سوید1995
20. ح. م. عەزیز، فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چاپی دووەم، سولەیمانی، 1996
21. ح. م. عەزیز، مافی دیاریکردنی چارەنووس، گ. ئاڵا ژمارە30، سوید، 1998.
22. ح. م. عەزیز، چەند سەرنجێ ... ، گ. ئێستا، ژمارە 20، سولەیمانیی، 1999.
23. ح. م. عەزیز، دەربارەی فریزیۆلۆژی... ، ئاڵای ئازادیی ژمارە 320، 1999.
24. ح. م. عەزیز، « زێوەر » ... ، گ. ئایندە، ژمارە1، سولەیمانیی، 1999.
25. ح. م. عەزیز، مێژگرد، ر. کوردستانی نوێ، ژمارە 1906، 1999 سولەیمانیی.
26. ح. م. عەزیز، شێوازی... ر. کوردستانی نوێ، ژمارە1928،1999
27. ح. م. عەزیز، ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ ... ، چاپی دووەم، سولەیمانیی،1999
28. ح. م. عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی... ، چاپی یەکەم، سولەیمانیی، 1999.
29. ح. م. عەزیز، کورد و شۆڕش و ... ، چاپی دووەم سولەیمانی 2000
30. ح. م. عەزیز، خرنووکیش لە بیاباندا... ، گ. گزینگ، ژمارە28، سوید2000
31. حەمە بۆر، پاشکۆی کوردی « العراق » ـ هەفتەنامە، ژمارە10، بەغدا، 1979.

32. حەمە س. حەسەن، ناوەرۆک و شێوە لە چیرۆکی کوردیدا، سوید،1992.
33. حەمە س. حەسەن، سەرێک و حەوت سەودا،گ. گزینگ، ژمارە28 سوید2000
34. دلزار، دیوان، چاپی یەکەم، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1992.
35. دوو چاوپێکەوتنی رۆژنامەنووسی، چاپی یەکەم، سوید، 1992.
36. رەسووڵ هەمزەتۆف، داغستانی من، 1979.
37. رەفیق حیلمی، یادداشت، بەشی دووەم، 1988
38. رەفیق حیلمی، شعر و ئەدەبیاتی... ، ب. یەکەم و دووەم، چاپی دووەم،1988
39. زێوەر، هۆنراوە، سۆزی نیشتمان، چاپی یەکەم، 1958.
40. زێوەر مەلا عەبەدوڵلا، گەنجینەی مەردان ... چاپی یەکەم، 1985.
41. شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، چاپی دووەم، تاران، 1981.
42. شێرزاد حەسەن، رێگای کوردستان، « 1998/04/22 »
43. عبدالرحیم فوده، الاسلام و القومیه العربیه، 1961.
44. عبدالله ئاگرین، شیعری سیاسی کورد... ، چاپی یەکەم، هەولێر، 1996.
45. عبدالخالق علاءالدین، مەلای گەورە زانا و ... چاپی یەکەم، 1994.
46. ع. ش. وانلی، حول الاستراتیجیه ... العدد 1-2، باریس، 1985.
47. علاء الدین سجادی، مێژوی ئەدەبی کوردی، خرداد 1361 ه.
48. ف. ئیلیچ لێنین، حق الامم فی تقریر مصیرها، المنارات العربیه، المجلد 6
49. قانع، ژیان و شیعرەکانی، بورهان قانع بلاویکردۆتەوە.
50. ق. کوردۆ، هەندێک بیر و باوەری هەڵە... ، چ. یەکەم، بەغدا، 1973-1974
51. قورئان.
52. کریس کۆچێرا، مێژووی کورد.. ، چ. یەکەم، تاران، بەهاری 1369.
53. کەمالی، دیوان، چ. یەکەم، بغداد، 1986.
54. ک. رەنجدەرانی کوردستان، عێراقچێتی داگیرکەر و ...، چ. یەکەم، 1983
55. دوکتۆر مارف خەزنەدار، گولان، ژمارە « 28 »، رۆژی « 2000/05/25 »
56. د. محمد الهماوندی، الحکم الذاتی... الطبعه الاولی، القاهره، 1990.
57. مەحوی، دیوان، چاپی دووەم، چاپخانەی ئۆفلێست، بەغدا، 1984.
58. مرفتی پێنجوینی، دیوان، چ. یەکەم، بەغدا، 1990.
59. نەوشیروان م. ئەمین، سەردەمی قەڵەم و موراجەعت، چ. یەکەم، سلێمانی،1999
60. هۆراس، هونەری شیعر، چ. یەکەم، بەغدا،1979.
61. هیوا، گۆڤار، ژمارە « 2-3 »، سالی « 2 »، بەغدا، کانوونی یەکی 1959.

### 7. لە بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر :

**گوتـار :**


1. بەرەو ئازادیی، گ. ڕابوون، ژ. 2، سوید، 1991،

2. لە پێناوی ڕاستیدا، بەربانگ، ژ.87، ساڵی12، سوید 1993،

3. یەکێتی سۆڤێتی هەڵوەشاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کوردەوە، ڕابوون، ژ.7 ـ 8، سوید، 1993.

4. دەربارەی کەسایەتیی کورد، ڕابوون، ژ. 10 ـ11، سوید، 1994.

5. بەرەو ستراتیژێکی یەکگرتووی نەتەوەیی، هەنگاو، ژ.13، لەندەن،1995

6 سایکۆلۆژییەتی مرۆڤی ئاوارەی کورد و بازاڕی چاپەمەنی کوردیی، گزینگ، ژ.8، سوید، 1995.

7. لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواریی، گزینگ، ژ.9، 1995

8. کۆرپە ئاڤانە ساواکەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکەم( MedTV)، گزینگ، ژ.13، سوید، 1996.

9. هەنگاوی یەکەم و سەرەتای کارێکی مەزن، بەربانگ، ژ.102، ساڵی14، سوید، 1996

10. چەند سەرنجێ دەربارەی سەرەخۆشیی و پرسەدانان، بەربانگ، ژ. 104، سوید 1997

11. دیکتاتۆرەکان لە هەر یەک ئاوێنە قژی نەخشە و پلانەکانیان دادەهێنن، بەربانگ، ژ. 105، سوید، 1997. گ. دیمۆکراسی، ژ.30، سلێمانی، 1997.

12. کەی هۆشێ بە بەر خۆماندا دەهێنینەوە! بەربانگ، ژ. 106-107، سوید، 1998. گ. دیمۆکراسی، ژ.31، سلێمانی،1998.

13. با خۆمان چاک بناسین، بەربانگ، ژ.108، سوید، 1998.

14. سێ سەرنجی زمانەوایی، مانگنامەی پەیام، ژ. 8، 1998.

15. مافی دیاریکردنی چارەنووس، گ. ئاڵا، ژ.30، 1998.

16. بۆرە نەبێ، بازەبێ، کلکی بە ئەندازەبێ، بەربانگ، ژ. 109، 1998.

17. ئاشتیی بە دەنگ نییە، بە ڕەنگە، کوردستان، ژ.7، بەرلین،1998.

18 چەند سەرنجێ دەربارەی ئاسنامەی ئایینیی و نەتەوەیی خەلیل منەوەر، گ. ئێستا، ژ.20، سولەیمانیی، 1999.

19. زێدەڕ لە نێوان کوردایەتیی و عێراقچێتیدا، ئایندە، ژ.1، سولەیمانیی، 1999.

20. داری بەزەیی خوا، کوردستانی نوێ، بەشی یەکەم، ژ.1902، 1999/7/13. بەشی دووەم، ژ.1903، 1999/7/14، سولەیمانیی.

21. دەربارەی مەلەفی کەرکووک، کوردستانی نوێ، ژ. 1921، 999/8/11 سولەیمانی. مانگنامەی کوردستانی نوێ لە دەرەوەی وڵات، ژ.67، 1999/8/25.

22. شێوازی خەبات و مافی چارەنووسی نەتەوەکان، کوردستانی نوێ، ژ. 1928،

1999/8/18، سولەیمانیی.
23. دەربارەی فـــرێزیۆلۆژی کـــوردیی، ئالای ئازادی، ژ. 220، 1999/7/12، سولەیمانیی.
24. خرنووکیش لە بیاباندا درەختە، گزینگ، ژ.28، سوید2000.
25. ژن لە ئاوێنەری تەڵخی هێندێ هۆنراوەی کوردییدا، گزینگ، ژ.29، 2000.
نامیلکە و پەرتووک :
1. دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چ.1، سوید، 1994،
2. دوا پرۆژە، چ.1، سوید، 1994،
3. پێنج ووتاری غەمگین، چ1، سوید، 1994،
4. دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چ1، سوید، 1994،
5. ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چ.1، سولەیمانی 1993.
چ.2، سوید، 1995.
6. پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چ.1، سوید،1995.
چ.2، سولەیمانیی 1996.
7. نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، سوید، 1995.
8. کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چ.1، سوید 1996.
چ. 2، کوردستان، 2000.
9. فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ،چ.1، سوید، 1996.
چ.2، سولەیمانی، 1996.
10. بەڵێ لێکۆڵینەوە و رەخنە نەک شێواندنی راستیی، چ.1، سوید، 1996.
11. خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، چ1، سوید، 1997.
چ. 2، سولەیمانی، 1997.
12. رۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چ.1، سوید، 1997.
13. گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، سوید، 1998.
14. نۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی، چ.1، سوید، 1999.
چ.2، سولەیمانیی،1999.
15. سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چ1، سولەیمانیی، 1999.

## له بەرهەمەکانی داهاتووی نووسەر :

1. هەوێنی هۆنراوەی کوردیی.
2. جیۆپۆلیتیکی کوردستان.
3. ناکۆکیی و ناپاکیی لە مێژووی کوردا.
4. بەرکولێ لە خەرمانی بیری نەتەوەیی.
5. یادگاری ڕۆژان.

ەم هەڵانەی خوارەوە راسکەرەوە:

| د | هەڵە | راست |
| --- | --- | --- |
| 15 | خۆیتێهەڵدەقورتێنن | خۆیانتێهەڵدەقورتێنن |
| 11 | رەشەخەڵکەشکەیان | رەشەخەڵکەکەشیان |
| 7 | دەستپخەرییکردن | دەسپێشخەرییکردن |
| 11 | دەدەبڕێ | دەردەبڕێ |
| 13 | بەڕێوەبەێتییەکی | بەڕێوەبەرێتییەکی |

هەر دوو بیری ڕەسەنی « كوردستانیزم » و دەسكردی « عێراقچێتیی »، وەك بەهاری تەڕ و سەوز و پاییزی فێنك و زەرد وان، دووپشكی هاوینی گەرم و ووشكیان لە نێوان دایە. هەرگیز، نە بە یەك دەگەن و نە پێكەوە دەگونجێن!
لە كۆندا، گەورە پیاوان و دەسەڵاتداران، نۆكەر و پیاوەكانی خۆیان دەخەسان، تا دەس بۆ ئابڕووی ژن و كیژەكانیان نەبەن. بەڵام ئەوڕۆ، هێندێ لە پارتە ڕامیارییەكانی كوردستان دەیانەوێ، مێشكی ڕۆڵەكانی گەل بە گشتیی و نووسەرانی كورد بە تایبەتیی بخەسێنن، تا كردارە خراپەكانیان لەقاو نەدەن، جەماوەری گەل وەك مێگەل لێخوڕن! بیری « كوردستانیزم » لە مێشكیاندا بتاسێنن، بە بیری نامۆی « عێراقچێتیی » موتوربەیانكەن.
داگیركەری دەوڵەتی « عێراق »، هەمیشە هانی بیری « عێراقچێتیی » داوە، تا هەست و هۆشی نەتەوەیی ڕۆڵەكانی كورد، لە بیر و مێشكیاندا بتاسێنێ. نابێ، گوێ لە سەرانی پارت و دەوڵەتی « عێراق » بگرین، دەربارەی « عێراقچێتیی »، چی دەڵێن. چونكە، تەنیا ئەو بیرە، لە بەرژەوەندیی ئەوان دایە. بیری سەربەخۆیی و كوردایەتیی بۆ ئەوان، وەك تەزووی كارەبا وایە، گیانیان لەبەردەبڕێ و ووشكیاندەكا!
لەبەرئەوەی، كوردستان داگیر و دابەشكراوە، گەلی كورد لە « عێراق »دا، لە هەموو مافێكی نەتەوەیی خۆی بێ بەشكراوە، « عێراق » دەوڵەتێكی داگیركەر نەبێ، هیچی دیكە نییە! بۆیە نابێ، هەرگیز لە باسی ڕاستیی و ڕەوایی كێشەی كورددا، لەگەڵ زۆروبۆریی دەنگی هیچ عەرەبێكی « عێراق » و « عێراقچیی »یەكی كورددا بین. چونكە، ئەو گروپانە، شتێ ناڵێن، لە بەرژەوەندیی كورددا بێ!

---

# THE SEDIMENTARY OF A POISION IDEA

Dr. HUSSEIN M. AZIZ

2000 / 2700 K